مەکتووباتی

# کاك ئەحمەدی شێخ

بەرگی دووەم

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

لە فارسییەوە وەری گێڕاوەتە سەر کوردی

مەحموود حەفید زادە

پێشەکیی بۆ نووسیوە

تێبینی: بەرگی دووەمی ئەم کتێبە واتە بەرگی (٣ + ٤)ی چاپی یەکەمە

ناوی کتێب: مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ – بەرگی دووەم
وەرگێڕانی لە فارسییەوە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس
نووسینی پێشەکی: مەحموود حەفید زادە
بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٧٦٨
پیت لێدان: سەهەند سەرتیب + دەومن هادی
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + فەرهاد ئەکبەری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی دووەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٦٨٢ی ساڵی٢٠٠٨ی دراوەتێ

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

برا کوردە موسڵمانەکان!

پاش ئەوەی کە خوای گەورە یارمەتیی دام (٢٤) نامە لە نامەکانی پایەبەرزی خوالێخۆشبوو کاك ئەحمەدی شێخ، کە تەرجەمەم کردبوون، لە دوو بەرگ لە چاپ بدەم و بیخەمە بەردەست ئێوەی خۆشەویست، وا بەیارمەتیی خوا (١٨) نامەی ترم ئامادەکرد و لەم بەرگەدا پێشکەشم کردن، بە هیوای ئەوە ئەگەر عومری ئەمانەت باقی بێ و خوای گەورە ئارەزووی لێ بێ، نامەکانی تریشی کە تەرجەمەم کردوون، لە چاپ بدەم و پێشکەشتانی بکەم.

لە بارەگای بەرزی خوای میهرەبان دەپاڕێمەوە کە ئێوە لەم بەرگە و لە بەرگە پێشووەکان و لەوەیش کە لەمەوپاش ئیشەڵڵا ئامادەوە و چاپ دەکرێ، سوودی دین و دنیا وەربگرن و گیانی پاکی کاك ئەحمەدیش زیاتر بحەسێتەوە و، منیش نمێکی بارانی لوتفی خواییم بەرکەوێ.

بەرودوا سوپاس و ستایش بۆ خوای میهرەبان.

عەبدولکەریم

نامەی بیست و شەشەم

# هەندێ لە حەدیسە پیرۆزە (جوامع الكلم)ەكان

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمدللّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه سيدنا محمد وعلى آله الطاهرين وصحبه المجاهدين لاعلاء كلمة اللّه.

پاش ئەمە براكانم! لەمەوپێش هەر نامەیەكم بۆ كردەوەیەكی دیار و تایبەتی نووسیوە و بۆم ناردوون. ئێستا وام باش زانی چەند حەدیثێ لە (جوامع الكلم)ەتان بۆ بنووسم كە هەر كام لەوانە بە مانای ئاشكرا و مانای شاراوەی و بە دەلالەت و ئیشارەتی گەلێ شتتان بۆ ڕوون بكاتەوە كە ببنە هۆی ڕزگاری و بەختەوەرییان.

ڕیوایەت كراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أضمنوا لي ستاً من أنفسكم أضمن لكم الجنة: أصدقوا إذا حدثتم، وأوفوا إذا وعدتم، وأدوا أذا أؤتمنتم، وأحفظوا فروجكم، وغضوا أبصاركم، وكفوا أيديكم».

واتە: ئێوە لای خۆتانەوە شەش شتم بۆ مسۆگەر بكەن منیش بەهەشتتان بۆ مسۆگەر دەكەم: كە قسەتان كرد ڕاستگۆ بن، بەڵێنتان دا بەجێی بهێنن، شتێ درایە دەستتان بەئەمانەت بیدەنەوە بە خاوەنی، عەورەتتان لە گوناه بپارێزن، چاوتان لە تەماشاكردنی حەڕام بنووقێنن، دەستی خۆتان لە كاری خراپە بگرن.

بڕگەی یەكەمی ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) ڕاستییە. دیارە گەورەترین و پێویستترین ڕاستی ڕاستییە لە كەلیمەی تەوحیدا كە (لا إله الا اللّه)یە، واتە: ئینسان باوەڕی وەهابێ كە بێجگە زاتی (اللّه) كەس نییە شایانی ئەوەبێ عیبادەتی بۆ بكرێ؛ دیارە ئەو كەسەی باوەڕی وەهابێ هەر عیبادەتێ كە بیكا دەبێ بۆ خوا بێ و ڕیایی تیا نەكا، خزمەتی هەر كەسێ بكا دەبێ لەبەر خوا بیكا، هەر قازانجێكی پێ گەیی بە نیعمەتی خوای بزانێ، هەر زیانێكی پێ گەیی لە خواوە بناسێ، لە كاتی زویری یا ڕقگرتندا ناشوكری و كوفری بەدەما نەیێ، خۆی لەو كردەوانە دوور بگرێ كە دەبنە هۆی دووری لە

خوا، له خواردنه‌وه‌ی شه‌راب و هه‌ر هۆیه‌كی سه‌رخۆشی و مه‌ستی خۆی دووربخاته‌وه، نزیكیی پیاوی كوفركه‌ر نه‌كه‌وێ، له‌ هه‌رلایێ هه‌ر كه‌سێ خه‌ریكی خوا په‌رستی بێ به‌پێی توانا و ده‌سه‌ڵات یارمه‌تیی بدا، حه‌ز له رزقێ نه‌كا كه به‌هۆی دوورییه‌وه له خواپه‌رستی یا به‌هۆی هاوڕێیه‌تیی ئینسانی بێ دینه‌وه ده‌ستی بكه‌وێ، بۆ په‌یداكردنی ماڵی دنیا په‌ستی و ده‌نائه‌ت نه‌كا، ئیمان و باوه‌ڕی بێته سه‌ر ئه‌وه كه خوای گه‌وره ئه‌وی بۆ عیباده‌ت دروست كردووه، وه‌ك خۆی فه‌رموویه‌تی: «وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ[٥٦] مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ[٥٧] إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ[٥٨]».

واته: من په‌ری و ئاده‌مزادم بۆ ئه‌وه دروست كردووه كه بمپه‌رستن. من رزق و ڕۆزیم له‌وان ناوێ، نامه‌وێ خوارده‌مه‌نیم پێ بده‌ن، ته‌نیا خوای گه‌وره‌یه كه به‌ڕاستی رزق و ڕۆزی ده‌دا، ته‌نیا خوای گه‌وره به‌هێز و توانا و خۆگره.

ئه‌م گشت ته‌ئكیدانه له‌سه‌ر ڕۆزیدان به گیانله‌به‌ران، تا ڕاده‌یێ كه سوێندی له‌سه‌ر خواردووه، هه‌موو بۆ دڵنیاكردنی ئاده‌میزاده تا باوه‌ڕیان پێ ده‌گا و هیچ له هیچ كه‌س ناكه‌ن و هه‌ر خوا به‌پشت و په‌نا بزانن. بێگومان ئه‌گه‌ر موسڵمان دڵی بێته سه‌ر ئه‌مه ئه‌وا یه‌كێ له هۆیه‌كانی چوونه به‌هه‌شت بۆ خۆی دابین و مسۆگه‌ر ده‌كا و له به‌هه‌شته‌وه نزیك ده‌بێته‌وه.

له‌پاش ڕاستی له كه‌لیمه‌ی ته‌وحیدا، پێویسته موسڵمان له هه‌موو قسه و باسێكدا ڕاست بێ و درۆ به‌ده‌مییا نه‌یێ، بێجگه چه‌ند شوێنێ كه شه‌رع جیای كردوونه‌ته‌وه و دروسته، به‌ڵكو واجیبه درۆیان تیدا بكا له‌به‌ر پاراستنی ئاین یان نه‌فس یا نامووس یا ماڵی موسڵمانێكی به‌حورمه‌ت.

بڕگه‌ی دووه‌م وه‌فا به وه‌عده، واته: به‌ڵێن به‌جێهێنانه. ئه‌م به‌ڵێن به‌جێهێنانه‌ش دوو به‌شه. به‌شی یه‌كه‌م به‌جێهێنانی به‌ڵێنێكه كه له به‌ینی ئینسان خۆی و خوا هه‌یه، وه‌ك به‌جێهێنانی ئه‌و به‌ڵێنه‌ی له عاله‌می ڕۆحا به خوایان داوه كه ئه‌و فه‌رموویه‌تی: «أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ»

ئه‌وانیش وه‌ڵامیان داوه‌ته‌وه و وتوویانه: «بلی» واته: تۆ په‌روه‌ردگاری ئێمه‌ی و ئێمه ئاماده‌ین بۆ به‌جێهێنانی فه‌رمانه‌كانت. به‌شی دووه‌م وه‌فا به‌وه‌عده‌یه له‌گه‌ڵ موسڵماناندا. ئه‌مه‌ش دوو جۆره، یه‌كه‌میان به‌ڵێنی ده‌مییه كه به برای خۆت بڵێی ئه‌و شته‌ت بۆ ده‌كه‌م یا ئه‌و زیانه‌ت لێ ده‌فع ده‌كه‌م. ئه‌مه پێویسته به هه‌موو هێزێ تێ بكۆشێ بۆ به‌جێهێنانی ئه‌و به‌ڵێنه. دووه‌میان به‌ڵێنێكه ده‌می نییه و نه‌وتراوه، بۆ نموونه: مادام

تۆ موسڵمانی و برا ئاینییەکانیشت موسڵمانن ئەوا ئێوە برای ئاینین، ئەمەیش وەك ئەوەیە کە تۆ بەڵێنت پێ دابن کە ئامادەی بۆ بەجێهێنانی پێویستییان بەقەد دەسەڵاتی خۆت؛ کەواتە پێویستە لەسەرت لە خزمەتکردنی برایانی ئاینی قسوور نەکەی و بەهەر جۆر بێ، بە نەفس یا بە ماڵ یا بە شان خزمەتیان بکەی. خۆ ئەگەر بۆت نەکرا خزمەتیان بکەی زیانیان پێ نەگەیێنی و بە شادییان دڵشاد و لە خەم و پەژارەیاندا هاوبەش و غەمبار بێ.

برگەی سێیەم: ئەوەیە هەر کەسێ پیاو یا ژن کاتێ ئەمانەتێ درایە دەستی خیانەتی تیدا نەکا و، بەقەد توانا و لێهاتنی خۆی پاسەوانی بکا. ئەم ئەمانەتەیەش دوو بەشە، بەشی یەکەم: خیانەت نەکردنە لەو ئەمانەتەی لە بەینی بەندە و خوادایە، وەك بەجێهێنانی واجیبات بە تایبەتی ئەو پێنج ماددەیە کە ئەرکانی ئیسلام؛ یەکەم: وتنی دوو کەلیمەی شەهادەت (أشهد أن لا إله إلا اللّه وأشهد أن محمداً رسول اللّه) لەگەڵ زانین و تێگەیشتنی مانایاندا. دووەم: بەجێهێنانی پێنج فەرزەکەی نوێژ لە هەموو ساڵێکدا. سێیەم: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە هەموو ساڵێکا. چوارەم: جێبەجێکردنی زەکات و سەرفیترە و دانی بەوانەی کە پێیان ڕەوایە. پێنجەم: حەجی (بیت اللّه) لە مەککە بۆ ئەو کەسەی کە توانای هەیە. هەروەها بەجێهێنانی واجیبەکانی تری ئیسلام لە هەر بابەتێك بن و تەرکی هەموو ئەو شتانەی نەهییان لێ کراوە لە گوناهە گەورەکان کە لە حەوسەد زیاترن و، نابارتر و ناڕەواتریان نوێژ نەکردن و ڕیاکردنە لە عیبادەتدا و هەموو جۆرە زوڵم و دەستدرێژییەك و کوشتنی نەفسی بێ تاوان و خواردنەوەی عارەق و شەراب و هەر شتێ ئینسان مەست بکا یا کێشانی بەنگ و هاوچەشنەکانی و زیناکردن و نەخۆشییە دڵییەکانی ترە کە لە کتێبە گەورەکانی وەك (أحياء علوم الدين)ی ئیمامی غەزالیدا باس کراون و یەکەیەکە شەرح کراون.

برگەی چوارەم لەو شەش شتانە کە مسۆگەرکردنیان دەبێتە هۆی مسۆگەرکردنی بەهەشت لە لایەن حەزرەتەوە (د.خ) ئەوەیە کە بە جوملەی (وأحفظوا فروجكم) بەیان کراوە. ئەم پاراستنی فەرجەیش دوو جۆری هەیە، یەکەم پاراستنی لە حەرام وەك زینا و (إستنماء) واتە: هێنانەوەی ئاوی مەنی و جیماع لەگەڵ ژندا لەکاتی حەیزدا یا لەپاش منداڵ بوون. ئەمە دیارە لەگەڵ ژنی حەڵاڵی خۆیدا، ئەگینا لەگەڵ ژنی خەڵك یا ژنی بێ مێرددا هەموو جۆرە لەزەت وەرگرتنێك حەرامە. هەروەها پاراستنی عەورەت لە ڕووکردنە

قیبلە، بەبێ ئەوە کە پەردەیێ یا فاسیلێ بکەوێتە بەینینانەوە. جۆری دووەمی پارستنی عەورەت ئەوەتە بیپارێزی لە شوبهە، بۆ نموونە کاتێ دەتەوێ داوای ژنێ بکەی، کە وتیان تۆ لەگەڵ ئەو ژنەدا شیرخۆری لەبەینتاندایە، گورج دەستبەرداری ببی هەرچەند ئەو هاوشیرییەیش ئیسبات نەکرێ، چونکە لە زەمانی سەعادەتدا مادەیێ لەم مادانە ڕووی دابوو ئیسباتیش نەبوو کەچی حەزرەت (د.خ) فەرمووی: «کیف وقد قیل؟...».

هەروەها پاراستنی عەورەتە لە تەماشاکردنی خەڵك، وەك کاتی خۆشۆرین لە حەوزدا، ئەم موسیبەتە لە لادییەکاندا زۆر زۆرە و گوێ نادەنە حوکمی خوای گەورە، هەروەك لەکاتی دەس بە ئاو گەیاندندا عەورەتی خۆیان دەردەخەن لەبەرچاوی خەڵکدا دای ناپۆشن، ئەم دەردی دەرخستنی عەورەتە بە تایبەتی لە حەمامەکاندا لە پیاو و ژنی وەهاوە ڕوودەدا کە گوێ نادەنە حەرام و حەڵاڵ و ڕێوشوێنی ئاینیان خستووەتە پشتگوێ. بێ گومان ئەگەر حەمام، بەم شێوە ئیدارە بکرێ کە ئەمڕۆ باوە شوێنێکی بێ حورمەتە.

برگەی پێنجەم لەو شتانەی کە دەبنە هۆی ئەوەی حەزرەت (د.خ) بەهەشت بۆ موسوڵمانان مسۆگەر بکا، چ بەو مەعنایە کە ئینسانەکە بکەوێتە ڕێزی گشتیی ئەوانەوە کە حەزرەت لە ڕۆژی قیامەتا تکایان بۆ دەکا، یا خۆ بەو مەعنایە کە حەزرەت بەتایبەتی بیهاوێتە پەنای خۆیەوە – ئەوەیە کە فەرموودەی «وغضوا أبصاركم» بەیانی فەرمووە، واتە: چاوتان داخەن و تەماشای حەرام و ناڕەوا مەکەن چ ژن چ نێرێنەی موو لێ نەهاتوو، بەڵکو تەماشاکردنی ئەمرەد لە تەماشاکردنی ژنی نا مەحرەم زۆر ناشیرینترە.

ڕیوایەت کراوە لەسەر هەر ژنێ تاقە شەیتانێ هەیە، بەڵام لەسەر هەر ئەمرەدێ بیست شەیتان هەیە، چونکە تەماشاکردنی ئەمرەد گوناحەکەی زۆرترە، سیرِی ئەمەیش ئەوەیە ئەو ژنە نامەحرەمە لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێ بە حەڵاڵ و هاوسەری ئەوەی بۆی دەڕوانێ، بەڵام ئەمرەدی تەماشاکراو تەماشاکەی دەکێشێتەوە بۆ کردەوەی قەومی لووت، کە لە ناشیرینترین جۆرەکانی ئارەزووبازییە.

ڕیوایەت کراوە : ئەوانەی کە کردەوەی قەومی لووت دەکەن لە گۆڕا مەسخ دەبنەوە بە بەراز و، هەر ڕۆژێ حەفتا جار ئاگر لە هەردوو کونەلووتیانەوە دەڕواتە ژوور و لەپاشیانەوە دەردەچێ.

لە حەزرەتی ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ئەو کەسە کە لیواتە دەکا، بەجۆرێ لەعنەتی ناهەمواری بەسەردا دەبارێ کە شەیتان لەو شوێندا نامێنێ و لە ترسدا

ڕادەکا، کە لێی دەپرسن بۆچی ڕادەکەی؟ دەڵێ نەبادا ئەو لەعنەتە کە دەبارێ بدا بەسەر مندا، جا تەماشای ئەم وەزعە نابارە بکەن.

ئەی برادەران! زانایانی دین فەرموویانە تەماشاکردنی دنیا و خۆشەویستی و دۆستی لە دنیادا بەجۆرێ کە ئینسان لە واجیباتی ئاین دووربخاتەوە و لە کردەوەی حەرامی نزیك بکاتەوە، بە تایبەتی پەیداکردنی دنیا بە ستەم و دەستدرێژی لە فەقیر و هەژار، چ بە داگیرکردنی باخ و ئەرز و ئاو و خانوویان یا پارە و ماڵی تیجارەتیان، یا بە جەردەیی و دزی، یا بە غەش و دەسبڕین لە مامەڵەدا، یا بە خەیانەت لە ئەمانەتدا، خواهـ ماڵی ئەمانەت یا ماڵی هەتیو یا ماڵی وەقف بێ؛ ئەمانە هەموو لە گوناهی کەبیرەن و هۆی سزان و یەك لە یەك نابارتر و ناڕەواترن.

ئیمامی غەزالی (علیه الرحمة) فەرموویەتی: دنیا پەیداکردن بەم هەموو جۆرە فڕوفێڵە، مەعنای ئەوەیە کابرا عاشقی دنیا بووە و خۆشەویستیی دنیا لە دڵیا دامەزراوە و، ئەم جۆرە عیشقە یەکێکە لە ئەسبابەکانی سەلبی ئیمان لێی لە سەرەمەرگا (أعاذنا اللّه منها)، چونکە کابرا ئەوەندە دنیای خۆش دەوێ، هەرگیز حەزناکا لێی جیابێتەوە و، ناڕەزاییی خۆی لە مردن دەردەبڕێ، دیارە بەم ناڕەزاییییە، پەنا بە خوا، کافر دەبێ.

بەڵێ لەسەر ئەم بناغەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: «لاَ تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ...» واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! چاومەبڕە ئەو شتانەی کردوومانن بە هۆی ڕابواردن و لەزەتی نەفسی هەندێ کەس، چونکە ئەو ناز و نیعمەتە هۆی گیرۆدەبوونە بۆ ئەوان، حەزرەت (صلی اللّه علیه وسلم) ئۆممەتی خۆی زۆر زۆر ترساندووە لە ڕاکردن بەشوێنی دنیادا.

لەگەڵ ئەوەش خوای گەورە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا میهرەبانە و، بۆ ئارام بوونی دڵیان سوێندی بۆ خواردوون کە بێگومان ڕزق و ڕۆزییان پێ دەبەخشێ و، لەم ڕووەوە فەرموویەتی: «وَفِي السَّمَاء رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ[٢٢] فَوَرَبِّ السَّمَاء وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ[٢٣]».

واتە : ڕزق و ڕۆزیی ئێوە و ئەو شتانەی کە بەڵێنتان پێ دراوە، هەمووی لە ئاسمان و زەوی ئەم مەسەلە ڕاستە و دێتەجێ وەکو چۆن ئێوە لەناو خۆتاندا قسە دەکەن؛ واتە وەك چۆن ئێوە لە قسەی خۆتاندا شك و گومانتان نییە، وەهایش گومانتان نەبێ کە ڕزق و ڕۆزی بەش کراوە.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «قاتل اللّه أقواماً أقسم لهم بنفسه تعالى، فلم يصدقوه» واتە: خوا ئەو قەومە بکوژێ کە سوێندیان بۆ دەخوا بە خۆی و ئەوان باوەڕی پێ ناکەن.

برادەرینە! ئەگەر، بۆ نموونە، جوولەکەیێ دۆستی یەکێ بێ و بەڵێنی شتێکی پێ بدا و سوێندی بۆ بخوا بە حەزرەتی مووسا (د.خ) برادەرەکەی باوەڕی پێ دەکا و گومان لە دڵیدا نامێنێ، عەجایەب ئێوە کە موسڵمانن خوا سوێنتان بۆ دەخوا و بەڵێنی ڕزقتان دەداتێ کەچی باوەڕی پێ ناکەن؟!

براکانم مەبەست لەوەی کە وتم ئەوە نییە کە نەکەونە دوای ئەسبابی عادەتی. کارەکانی خوای گەورە لەسەر ئەسبابی عادەتی دامەزراون. مەبەستم ئەوەیە دڵتان بە خوای پەروەردگارەوە ببەستن و باوەڕتان وابێ موسەببەب لەگەڵ سەبەبدایە، نەك بە سەبەب پەیدا دەبێ، واتە ئەسبابەکان موئەسیر نین و تەئسیر هەر لە خوای گەورەوەیە.

ئەنجا نیشانەی باوەڕکردن بەو سوێندی خوایە، ئەوەیە ئەو کەسە کە خۆی بە خاوەن باوەڕ دەزانێ لەکاتی داواکردنی ڕزق و ڕۆزیدا کردەوەی حەرام نەکا و لەپێناوی پەیداکردنی دنیادا قسەی حەرام نەیێ بەدەمیدا.

ئەوە دوعای حەزرەتە (د.خ) کە ڕیوایەتم کرد لەبەرئەوەیە ئەو کەسانە باوەڕیان بە قەسەمی خوای گەورە نەبووە، دیارە کەسێ باوەڕی بە کەلامی خوا نەبێ یاخۆ گوێ نەداتە سوێندی خوا، ئەوە لە کافران حسێب دەکرێ.

لە یەکێ لە زانا ئاینییە لە خوا ترسەکان دەگێڕنەوە وتوویە: لە گەڕانەوەمدا لە سەفەری حەج هاتمە شاری بەسرە، عەرەبێ پێی وتم: ئەی برای پیر لە کوێوە هاتووی؟ وتم. لە شوێنی خوێندنی قورئانەوە، واتە: لە (بيت اللّه)وە. وتی: دە چەند ئایەتێکم لەو قورئانە بۆ بخوێنە، منیش دەستم کرد بە خوێندنەوەی سوورەتی (والذاريات) تا گەیشتمە ئایەتی «وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ» و خوێندمەوە. کە عەرەبەکە ئەو ئایەتەی بیست هەستا وشترەکەی هێنا و وتی: ئیتر بەسمە؛ وشترەکەی خۆی سەربڕی و گۆشتەکەی بەخشییەوە و تیرو کەوانەکەی شکاند و ڕۆیشت. هەروەها ئەو زانایە فەرمووی: جارێکی تر ڕۆیشتمەوە بۆ حەج، لەکاتی سووڕانەوە بەدەوری کەعبەدا کابرایەکم بینی، بەدەنگێکی کز بانگی کردم. کە چوومە نزیکیەوە و تەماشام کرد حاڵی بووم پیاوە عەرەبە پێشووەکەیە، بەڵام لەشی ئێجگار لاواز و ڕەنگی زەرد بووبوو. سەلامی لێ کردم و

سوورەتەکەی خوێندەوە تا گەیشتە ئایەتە پێشووەکە. لەوێدا هاوارێکی کرد و پێی وتم «قد وجدنا ما وعدنا ربنا حقا» ئایا هیچ ئایەتی ترت لەبەر نییە؟ منیش بۆم خوێندەوە: «فَوَرَبِّ السَّمَاء وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ» کە ئەمەی بیست هاوارێکی کرد و وتی: (سبحان اللّه) ئەوانە دەبێ چ کەسانێ بووبن کە لەبەر بێ باوەڕییان خوای گەورە سوێندی بۆ خواردبن؟!. سێ جار ئەم هاوارەی کێشا گیانی دەرچوو. الی رحمة اللّه.

بەڵام داواکردن و پەیداکردنی سامانی دنیا ئەگەر بەپێی ڕێنوشوێنی ئاین بێ، واتە: لە ڕێگەیەکی حەڵاڵ و شەرعییەوە پەیدا بکرێ و لە واجیباتدا سەرف بکری، وەکو ژیانی ماڵ و منداڵ و باوك و دایك، یا لە شتی سوننەتدا وەکو خزمەتی دەر و دراوسێ و خزمان و دەسگرۆیی ئەهلی مزگەوت و یارمەتیدانی داماوان، ئەوە زۆر باشە و هەرگیز شەرع ڕێی لێ ناگرێ؛ چونکە ڕیوایەت کراوە «لیس من حب الدنیا طلب ما یصلحك» واتە: پەیداکردنی ماڵی دنیا بۆ چاککردنی حاڵ پێی ناوترێ دنیا خۆشویستن.

بڕگەی شەشەم لەو شتانەی دەبنە هۆی مسۆگەرکردنی بەهەشتی بەرین لە لایەن حەزرەتی پێغەمبەرەوە (د.خ) بۆ موسڵمانانی ئۆممەتی ئەوەیە کە لە عیبارەتی (وکفو أیدکم) وەردەگیرێ، واتە: دەستی خۆتان بگرن لە خەریك بوونی شتی ناڕەوا وەك وەرگرتنی شتی حەرام، یا لێدانی خەڵك و کوشتنی موسڵمانان و ئازاردانیان یا کوشتنی گیانلەبەرانی بێ ئازار، تەنانەت ئەگەر گیانلەبەرێکی ئازاردەریشتان کوشت با کوشتنەکەی بە ئازار و سزادان نەبێ. هەروەها مەنعی خۆتان بکەن لە غەشکردن لەگەڵ موسڵماناندا لە کار و پیشەدا وەکو بەرگدوورین، یا دارتاشین یا خانوو دروستکردن یا هەر فرمانێکی تر کە دەدرێتە دەستتان. مەنعی دەستی خۆتان بکەن لە ئیشارەتی ناڕەوا و نووسینی ناشەرعی، وەك ئەو مەئموورانە کە زیانی جۆراوجۆر لەسەر خەڵك دەنووسن و زیانی بێ ئەندازەیان پێ دەگەیەنن یا کاتبانی سەرکارانی خەرمان هەڵگر، ئەمانە گەلێ زیان لە موسڵمانان دەدەن بەناحەق بەشێوەیێ کە ئینسان ناتوانێ بینووسێ.

بێگومان ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ئیشارەیە بۆ ئەوەی کە پێویستە موراعاتی دادپەروەری بکرێ، واتە: هەرگیز ڕەوا نییە بۆ دەسرۆیشتوو ماوەی پیاوخراپ بدا و ڕێگەی دز و جەردە و پیاوی خوێنرێژ و فاسق بدا کە لەپەنایدا بژین؛ چونکە ئەو پەنادانە دەبێتە یارمەتی و پشتگیری ئەو بەدکارانە؛ دیارە یارمەتیی پیاوخراپ خراپە.

براکانم! ئەم شەش بڕگە کە لەم حەدیسە پیرۆزەدا دەرکەوتن و بەیانم کردن بۆتان

بابەتی یەك حەدیس بوون لە (جوامع الكلم) و فەرمووده بەرزەکانی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ). بێ گومان (جوامع الكلم) زۆرن. خۆزگە ماوەم بووبووایە زۆرم لەم (جوامع الكلم)انە بۆ بەیان بکردنایە.

یەکێکی تر لە (جوامع الكلم) ئەوەیە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی (الشهرة آفة) واتە: ناوبانگ دەرکردنی ئینسان و مەشهووربوونی بە توانا و لێهاتوویی لە هەر شتێکدا دەبێتە هۆی نەگبەتی و تێکچوونی دین و دنیای ئەو کەسە، مەگەر خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی بیپارێزێ.

شایەنی باسە ئەم جوملە موبارەکە زۆر بەلیغە، تەرکیبی (آفة) لەگەڵ (شهره)دا وەکو (فلان عدل) وایە و، هەروەکو ئەم لەسەر تەقدیری موزاف دەبێ بە (فلان ذو عدل) ئەویش بە هەمان شێوە دەبێتە (الشهرة ذات آفة).

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ئافاتانە دەڵێم: بۆ نموونە کەسێ کە ناوی پیاوچاکی و لە خواترسیی دەرکرد، خەڵکێکی زۆر باوەڕیان پێ دەبێ، جا ئەو پیاوچاکە مەگەر خوای گەورە بیپارێزێ ئەگینا تووشی ڕیابازی دەبێ، ڕیایش بە شیرکی ئەسغەر ناوبراوە.

هەروەها گیرۆدەی دەردی خۆ بەچاك زانین دەبێ و، خۆی بە گەورە دەزانێ. ئەمانەیش هەموویان ڕەزیلەن. هەروەها وا دەبێ مورێدەکانی تەعریز دەکەن و هەندێ سیفەتی دەدەنە پاڵ کە بە هیچ جۆرێ تێیدا نییە، کەچی خۆی ئەوەی پێ خۆشە و دەکەوێتە بەر مەعنای ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: «لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ».

واتە: ئەو کەسانەی بە کردەوەی خۆیان شاد دەبن و، پێیان خۆشە بەرامبەر بە شتێ کە نەیانکردووە تەعریف و ستایش بکرێن، لات وانەبێ لە سزا و تۆڵە دەرباز دەبن، نەخێر، ئەوانە لە دوارۆژا ئازار و سزایەکی پڕئێشیان تووش دەبێ.

لە تەفسیری کەبیرا لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە (د.خ) فەرموویەتی: ئەگەر بە چاوی ئینساف تەماشا بکەن، دەزانن ئەمە ئەحواڵی کەسانێکە کە گەلێ فروفێڵ دەکەن لەپێناوی کۆکردنەوەی ماڵ و سامانی دنیادا و، لە عەینی کاتدا زۆریان پێ خۆشە تەعریف بکرێن، بەوەی کە پیاوچاك و خاوەن ئینساف و ڕووخۆش و دەست و دڵپاکن.

منی دۆست و خزمەتکارتان زۆرم پێ ناخۆشە و، گەلێ غەمبارم بۆ ئەحواڵی ئەو

برادەرانەی بەر ئەم هەڕەشە گەورە و سەختە دەکەون، کەچی هێشتا لەئەوپەڕ دەرەجەی عیشق و خۆشەویستی دنیادان. دیارە ئینسان بۆ مەعشووقەی خۆی هەموو کارێ دەکا و، ئەوەندە نوقمی دەریای ئەم خۆشویستنە پڕ لە خەجاڵەتییە دەبێ کە ماوەی بۆلای خوا گەڕانەوەی پێ کەم بێ و ببێتە شوێنی ڕقی خوای قەهھار (والعياذ باللّه).

هەندێ برادەر لەبەرئەوی ئیقدام دەکەن لەسەر تاوان و تاوانباری دەڵێن: خوا گەورەیە و قاپی ڕەحمەتی وازە و خوا غەفوور و ڕەحیمە، تەنانەت دۆستێکم بوو گیرۆدەی شەڕاب خواردنەوە بوو، جارێ یەکێکم ناردەسەری ئامۆژگاریی بکا، بەڵکو دەستبەردار و ببێ و تەوبە بکا و دەست لە خواردنەوە هەڵبگرێ؛ چونکە دەوامی خواردنەوەی شەڕاب هۆی سەلبی ئیمانە کەچی ئەویش هەرئەوەندە وەڵامی دابووەوە وتبووی خوا غەفوور و ڕەحیمە، قاپی خوا بەرزە. منیش وەڵامم بۆ نارد کە پێی بڵێن زاتە پایە بەرزەکان ئیسلام وەکو ئیمامی عەلی (کرم اللّه وجهه) و ئیمامی غەزالی و شێخ ئەحمەدی ئیبنو حەجەر، ڕەحمەتی خوایان لێ بێ فەرموویانە: ئەم کەلیمە قسە کە تاوانبارەکان دەیڵێن دەلیلە لەسەر نەگبەتییان، دەلیلە لەسەر توندوتیژی ڕقی خوا لێیان، هەروەها لە لایەکی ترەوە دەلیلە لەسەر بێ ڕەحمی و دڵڕەقیی ئەوان، بەڵکو دەلیلە لەسەر بێ عەقڵییان؛ چونکە بە قسەی ئەوان دەبێ ئەم هەموو ئایات و حەدیسانە کە دەربارەی هەڕەشەکردن لە گوناهباران هاتوون خاڵی بن لە ڕۆحی تەتبیق و ئەو فائیدەیان نەبێ! ئەمەیش مەعنای ئەوەیە کە شەیتان زاڵ بووە بەسەریاندا و عەقیدەیان دەگۆڕێ، ئەگینا کەس هەقی نییە بەم جۆرە لە ئەحکامی خوادا سەربەست بێ. جا هەر لەبەر وێنەی ئەم باسانە کە ئینسان وەریان دەگرێ، دەستم توانای ئەما قەڵەم بگرێ و لەمە زیاتر بنووسێ وەکو جاران.

(إنا للّه وإنا إليه راجعون).

لە حەدیسی شەریفدا هەیە: «إن أبعد الناس من اللّه القلب القاسي»

واتە: دوورترین کەس لە خوای گەورەوە کەسێکە دڵی بەهۆی گوناهەوە ڕەش و ڕەق و بێ ڕەحم و بێ مویالات بووبێ. خوای گەورە پەنامان بدا ئامین.

(١٥)ی سەفەری (١٣٩٦)ی ك، ڕێکەوتی ١٦-٢-١٩٧٦ی ز لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی بیست و حەوتەم

# باسی موعجیزەکانی حەزرەتە (د.خ)

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمدللّه رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول اللّه وآله واصحابه أجمعين.

پاش ئەمانە براکانم! عەریزەکانی دۆستی خۆتان کە بۆم نووسیون، چاکترین دیارین کە دۆست بۆ دۆستی خۆیان بنێرێ بە دەلیلی ئەو حەدیسە پیرۆزە کە حەزرەتی ئیبنوعومەر ریوایەتی کردووە، خوایان لێ ڕازی بێ: «ما أهدى مسلم لأخيه، هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده اللّه بها أو يرده بها عن ردى». واتە: هیچ موسڵمانێ دیارییەکی نەناردووە بۆ برای دینیی خۆی باشتر بێ لە کەلیمەیەکی ڕاستی وەها کە ئەو برایە زیاتر شارەزایی ڕێی ڕاستی پێ پەیدا بکا یا زیانێکی پێ لێ لادا.

براکانم! دیاریی دۆستی دڵسۆزتان هەموو لەم بابەتەن. هیوام وایە وەریانبگرن و لەبەر ڕۆشناییی ئەوان ڕەفتار بکەن و خۆتان لە سوود و سەعادەتیان بەهرەمەند بکەن، بێگومان هەر کەس گوێیان پێ نەدا تووشی زیان دەبێ. هەروەها لە حەدیثی شەریفدا هەیە کە گەورەترین خووورەوشتی ئینسانی موسڵمان ئەوەیە هەرگیز لە بیستنی خێر تێر نەبێ.

براکانم! زۆر سەرم سوور دەمێنێ! یەکێ لە ئێوە لە بەیانییەوە تا کاتی نووستنی شەو یا قسەی بێ سوود لەگەڵ خەڵکدا دەکا یا گوێ لە قسەی پڕوپووچ و بێ مەعنا دەگرێ و ماندوویش نابێ، کەچی ئەگەر گوێ لە دوو لاپەڕە ئامۆژگاریی ئاینی بگرێ مەلوول و بێ تاقەت دەبێ!

براکانم! مەعنای ئیمان ئەوەیە ئینسان باوەڕ و تەسدیقی بە تەنیاییی خوا ببێ، بەجۆرێ باوەڕەکەی بگاتە پلەی یەقین. پلەی یەقینیش ئەوەیە ئەگەر هەزار درۆزن و ناڕاست و فێڵباز و دەسبڕ ڕەدی قسەت بکەنەوە و بەربەرچی بدەنەوە تۆ هەرگیز دڵت تێك نەچێ و باوەڕت لەق نەبێ. بۆ نموونە: بەرامبەرت شاخێکی بەرز و دیارییە و سەدان جار

پێدا هەڵزناوی و شارەزای کون و قوژبنیتی، هەزار کەس بێن و بڵێن ئەوە شاخ نییە تۆ بە هیچ جۆرێ گوێی نادەیتێ و باوەڕت بەبوونی ئەو شاخە هەرگیز لەق نابێ. ئا بەم جۆرە دەبێ باوەڕت بە تەنیایی خوای گەورە نەلەقێ و هەزار کەس بەگژتدا بچێ هەرگیز ئەو باوەڕەت لە جێی خۆی نەجووڵێ.

جا ئەگەر تۆ خۆت پلەی ئیمانت وەها پتەو و جێگیر نەبێ بەداخەوە عەرزت دەکەم، پێویستە لەپێش هەموو کەسێکدا ئیمان و باوەڕەکەی خۆت ئەستوور و پتەو بکەی، ئەگەر نا خۆت هێشتا موسڵمان نیت و پێویستە ئیمانێکی ڕاست پەیدا بکەی.

هۆی ئیمان هێنان و بەهێزکردنی ئیمان، پاش کەرەمی خوای گەورە، یەکەم: بیرکردنەوەیە بە عەقڵ لەم ئەرز و ئاسمانە، لەم گوڵ و گوڵزاری ئەرزە، لەم سەرچاوە بەردەوامانە، لەم مانگ و خۆر و ئەستێرە جوانانە، یا بیرکردنەوە لە بەرزی و نزمیی خاك کە هەندێکی چیا و کێوی بەرز بەرز و هەندێکی دەشتی کاکی بە کاکییە، هەندێکی ئاودار و مێرگ و میرغوزارە و هەندێکی وشك و برنگ و بێ دار و بارە، هەندێ لە دارەکان بێ بەر و هەندێکی بەردارە، بەردارەکان هەر یەك جۆرێ بەر دەگرێ و، بەرەکان ڕەنگی جۆراوجۆریان هەیە، یا وردبوونەوە لەم سەرچاوە هەمەچەشنانە کە هەندێکیان بەردەوامن و هەندێکیان وەختین، هەندێکی ئاوی بێگەردە و هەندێکی تێکەڵ بە ئاوی کانە، کەژوکێو و سارا هەندێکیان بێ کان و هەندێکی تریان پڕکانە، نەوتە، گۆگردە، زیوە، ئاڵتوونە. بێ گومان پێویستە کەسێکی خاوەن زانست و خواست و توانا هەبێ ئەم شتانەی دروست کردبێ و هەر شتێکی لە شوێنی خۆیدا دانابێ و ئەم ڕێکوپێکییەی ڕاگرتبێ، سەیرکە ئەم هەموو گیانلەبەرەی دروست کردووە بێ زیان و زیاندار، دڕندە و بەڕندە و ئادەمیزاد. بە هەر کام لەمانە ڕەنگ و دەنگ و شێوە و خووڕەوشتێکی تایبەتی داوە، تا ئەمانە هەموو بکاتە دەلیل لەسەر ئەوەی کە شت بەبێ خالیقی کارامە و خاوەنِ زانست و خواست و هێز و توانا نابێ، ئینسانێ تاقە نانێکی بەبێ زەحمەت دەس ناکەوێ، دەبێ دنیایەکی ئاوا بە بێ هۆ و بەبێ خاوەن چۆن پەیدا ببێ؟ چۆن بێ خاوەن دەبێ؟ چۆن خاوەنەکەی بێ عەقڵ و هۆش و نەزان و ناتەوان دەبێ؟!

ئەم ئەستێرە بەرزانە کە وەکو ڕیزی کاروانی دێن و دەڕۆن، چۆن لە خۆیانەوە ڕێگا دەگرنەبەر؟ کێ دەیانجووڵێنێتەوە؟ کێ ئەو هێڵە تایبەتییەی بۆ دیاری کردوون؟ بۆچی یەکێکیان لەوی تریان ناکەوێ؟ بۆچی یەکێکیان ڕێگای خۆی ناگۆڕێ؟ بۆچی لە

ڕۆیشتنا هێزی زیاتر نابێ و ناکەوێتە پێش ئەوی تریان؟ ئەم کورەی خۆرە، کە زانایانی ئەم چەرخە دەڵێن ملیۆنێ جار بەقەدەر گۆی زەوییە، وێنەی کێوی ئاگرین بەدرێژایی مانگ و ساڵ و سەدەکان هەڵگیرساوە و پەرتەو دەدا، بە جیهاندا، کێ دروستی کردووە؟ کێ دای گیرساندووە؟ بۆ ناکوژێتەوە؟ بۆچی بوومەلەرزە لێی نادا و پارچە پارچەی ناکا؟ بۆچی ئەستێرەکانی دەوروبەری وەك ئەو زل نابن؟... بۆچی ناتوانن بەری بگرن؟ بۆچی مانگ لەو بەپەلەتر دەورە تەواو دەکا؟ واتە: هەتا جارێ دەورەیێ دەرەجاتی تەواو دەبێ، دوازدە دەورەی دەرەجاتی دەبڕێ. ئەمانە چین و لە کوێوە هاتوون؟ لە خۆیانەوە و بەبێ خاوەن یا بەهۆی خاوەنێکی مردوو، یا خاوەنێکی نەزان یا ناتەوان و بێ چارەوە؟ چۆن دەبێ خاوەنیان نەبێ؟ هەر کەسێ تۆزێ وردبێتەوە دەزانێ ئەم جیهانە خاوەنێکی تەواو و بێ کەموکوڕیی هەیە.

دووەم هۆ لە هۆکانی ئیمان مانەوەیە لەگەڵ ئادەمیزادی دڵپاکی دەروون نوورانیی خاوەن هۆش و وریایی کە بەڕێز لە ریزی مامۆستایانی تەمێ و تەربییەی وەرگرتبێ.

هاوڕێیەتیی ئەمانە و تێکەڵییان وەك نزیك بوونەوەی ئینسانی غەمبارە بۆ سەیر و سەیرانی گوڵ و گوڵزار و باغ و تاڤگە و شوێنی تەماشا، وەك هاوڕێیەتیی نەزانە بۆ ئینسانی زانا، وەك دەرمان وەرگرتنی نەخۆشە لە دکتۆری زانای خاوەن بەراورد. سەعاتێ ڕەفاقەتی ئەمانە بۆ هێزیی ئیمان وەك عیبادەتی ساڵێکە. نەخۆشیی دڵ لەگەڵ ڕەفاقەتی ئەماندا خۆی ناگرێ. سێیەم هۆ دەرس وەرگرتنە لەوانەی کە خوێندەواری کتێبەکەی سیرەتی حەزرەتن (د.خ). بێ گومان ئاگاداری لە سیرەتی حەزرەت و لەوەی کە بێ وچان بەرەی ئادەمیزادی بۆ ڕێگای خواناسی بانگ دەکرد و،

ئاگاداری لە خووورەوشتی خۆی و هاورییەکانی دەبێتە هۆی ڕواندنی گوڵ و ڕەیحانی خواناسی لە مێشکی ئینساندا، بە تایبەتی ئاگاداری بەسەر موعجیزەکانی حەزرەتی پێغەمبەردا (د.خ) کە دەورێکی زۆر گەورەیان هەیە لە تێگەیاندنی ئینسان لە پایە و مایە و دین و پێگەیاندنی ئینسان و بەرزەوەبوونی بۆ ڕیزی سەربەرزەکانی جیهان.

ئەمانەی باسمان کردن ئەو هۆیانە بوون کە ئیمان و باوەڕ بەهێز دەکەن. بەڵام ئەوانەی کە بەرەنگاری ئیمان دەبن و باوەڕ لە دڵ دەردەکەن یا ناهێڵن ئیمان لە دڵدا دابمەزرێ یەکەم: ڕەفاقەتی ئینسانی بێ باوەڕ و هاوڕێیەتی ئینسانێکە کە شەرم لە

موقەدەساتی ئیسلام نەکا، بەڵێ ڕەفاقەتی ئەم جۆرە کەسانە وەك ئاگر وایە داری باوەڕ دەسووتێنێ و تەنانەت ڕیشەکەیشی دەفەوتێنێ.

دووەم: ڕەفاقەتی کەسانێکە کە لە کردەوەی ئاینا سست بن و ئەهەمییەت نەدەنە بەجێهێنانی واجیب و سوننەتەکانی ئاین و، گوێ نەدەنە تەرکی گوناهـ . مەشهوورە: گای زەرد بە ڕەفاقەتی گای ڕەش ڕەنگی ڕەش نابێ، بەڵام خووی ئەو دەگرێ.

سێیەم، ئەوەیە کە ئینسان خۆی بکەوێتە ناو گوناهەوە، باوەڕبکەن ئینسانی گوناهکار کە موبالات بە گوناهـ نەکاو چاری خۆی نەکا، نە ئیمان و نە ئەخلاقی دانامەزرێت و زانستی بەسوود وەرناگرێ، تەمێی خەڵکیش بکا سوودی نابێ، ئەمانە چەند خاڵێکن بە بەراوردی زانایان دامەزراون.

جا مادام باسی موعجیزەکانی حەزرەتمان کرد (د.خ)، کە زانینیان دەبێتە هۆی هێزی ئیمان، ئەوا لێرەدا چەند موعجیزەیێ بەیان دەکەم کە لە سەرەتای دەرکەوتنی نووری ئیسلامەوە دەرکەوتوون:-

لە حەزرەتی ئیمامی عەلییەوە دەگێڕنەوە، (کرم اللّه وجهه)، کە فەرموویەتی: ڕۆژێ وشتر سوارێکی عەرەب هات و بەرامبەرمان ڕاوەستا و وتی: کامتان (محەمەد)ە؟ ئێمەیش ئیشارەتمان کرد بەرەو لای حەزرەت کە حاڵی بوو، ڕووی کردە حەزرەت و وتی: من ناوم غەسانە و لە (بني عامر)م، بتێکم هەبوو دەمپەرست، ڕۆژێ لە مەقامی تاعەت و قوربەتدا چووم مەڕێکم سەربڕی و لە کاتی سەربڕیندا دەستی دوعامان بەرزکردەوە لەو کاتەدا لەناو بتەکەوە بە زمانێکی ساف دەنگی وتارێکمان بیست دەیوت: «یا غسان العامري جاء الحق وزهق الباطل، قد جاء النبي الهاشمي ولناصره السلامة ولخاذله الندامة هادياً الى اللّه الى يوم القيامة».

کە ئەم وتارەی تەواو کرد لەخۆیەوە بەڕووداکەوت. هەروەها غەسانی عامیری وتی: لەپیش مندا تاریق ناوێکیش قوربانیسی بۆ بتەکانی خۆی کردبوو لەو بتەیشەوە سەدایێ بەرز بووەتەوە و وتوویە «يا طارق بعث النبيي الصادق وجاء بوحي ناطق». پێش ئەویش عاسم ناوێ، ئەویش قوربانیی بۆ بتەکەی کردبوو، لە بتەکەیەوە دەنگێ هاتووە وتوویە: (يا عاصم! جاء الأسلام وبطل الاصنام). کاتێ کە دەنگ و باسی پێغەمبەرایەتیی تۆ بە ئێمە گەیشت، ئێمە دوودڵ بووین و لە بەینی باوەڕکردن و بێ باوەڕیدا بووین، هەتا ئەم

ڕووداوانە دەرکەوتن، ئیتر هیچ شك و گومانمان نەما بەتەواوی باوەڕمان کرد، بەوەی کە ئاینی ئیسلامی پیرۆز، ڕاستە تۆش پێغەمبەری ئەم ئوممەتەی بەشێوەی گشتی.

ڕیوایەت کراوە لە سەرەتای ئیسلامەوە هەشت نۆ پیاو و ژن موسڵمان بوون، لەپاشا حەزرەتی جیبرەئیل هات و فەرمووی ئەمر هاتووە کە بڕۆیتە سەر کێوی ئەبوو قوبەیس و بە دەنگێکی بەرز بڵێیت:

«أيها الناس قولوا لا اله إلا اللّه» . واتە: خەڵکینە هەمووتان بڵێن: هیچ کەس نییە بەڕاستی عیبادەتی بۆ بکرێ ئەو خوا نەبێ کە ناوی (اللّه)یە. کاتێ ئەم ئاوازە بڵاوبووەوە و کافرەکانی قوڕەیش بیستیان هەموو کۆبوونەوە و وتیان محەمەد جنێوی بە خواکانی ئێمە داوە و دەڵێ: پێویستە هەر تەنیا خوایێك بپەرستن: ئێمە ئەو خوای محەمەدەمان نەبینیوە، چۆن دەبێ ئێمە لە سەد و شەست خوا وازبێنین؟! پیاوە گەورەکانی قوڕەیش لە (دار الندوة) کۆبوونەوە و ئەم باسەیان دووبارە کردەوە، ئەنجا ڕوویان کردە وەلید و وتیان: تۆ چی دەڵێیت؟ ڕات چۆنە؟، وتی: من دوو بتم هەیە تا دوو سێ ڕۆژی تر کە لە کاروباری عیبادەتی ئەوان دەبمەوە، ئەنجا وەڵامتان لێ دەگێڕمەوە. پاش ئەوە ڕۆیی بۆلای بتەکانی و دوو ڕۆژ عیبادەتی بۆ کردن، لە ڕۆژی سێیەمدا وەلید بانگی لە بتەکانی کرد وتی: من سێ ڕۆژە عیبادەتی ئێوە دەکەم بۆ ئەوەی لەبارەی محەمەدەوە ڕاستم پێ بڵێن: ئایا پێغەمبەرە یا نا؟، لەو کاتەدا جیننییەکی (سفره) ناو ڕۆیشتە ناو بتەکەوە و هاتە دەنگ و وتی: قەتعەن محەمەد پێغەمبەر نییە، باوەڕی پێ مەکەن. وەلید لەم دەنگ و ئاواز و بەیانە زۆر دڵشاد بوو. پاش ئەوە یەکسەر گەڕایەوە بۆ لای پیاوە گەورەکان و ئەم قسە و باسەی بۆ گێڕانەوە. ئەوانیش زۆر شاد و دڵخۆش بوون. ئەم باسە بەحەزرەت گەیشتەوە (د.خ) و زۆر دڵی نارەحەت بوو، بەهۆی غەمباری و دڵنارەحەتیی حەزرەتەوە، حەزرەتی جیبرەئیل (د.خ) هاتەخوار و عەرزی حەزرەتی کرد: عاجز مەبە، وەلید بەم زووانە دەفەوتێ و شوێنەواری نامێنێ. حەزرەت (د.خ) ئەم خەبەرەی بڵاوکردەوە و وەلید بیستی و گەلێ پێ کەنی و گاڵتەی پێ کرد. دووبارە ڕۆیشتەوە بۆ لای هوبەلی بتی و پرسیاری لێ کردەوە. هوبەل دیسان دەستی کرد بەقسەی هەلەقومەلەق و بەرامبەر بە زاتی حەزرەت (د.خ) بێ ئەدەبیی کرد. حەزرەت (د.خ) لەم کۆمەڵەدا حازر بوو، هەروەها عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودیش حازر بوو. عەبدوڵلا دەفەرموێ: من دڵم زۆر ئێشی پێ گەیشت کە چۆن ئەم دەنگە لەم بتەوە پەیدا دەبێ و چۆن ئەو بتە ئەم قسە ناڕەوا و

ناڕاستانە دەکا؟! باسی عاجزیی خۆمم لە خزمەتی حەزرەتدا کرد، فەرمووی: عاجز مەبە ئەمە حیکمەتی تێدایە و بەم زووانە حاڵی دەبی.

کاتێ گەڕاینەوە لە ڕێگەدا چاومان بە سوارێ کەوت هاتە پێشەوە و گورج لە وڵاغەکەی دابەزی و وتی: (السلام عليك يا رسول اللّه)! من لەو جینییانەم کە لە زەمانی نووحدا (د.خ) موسڵمان بوون. لەم ڕۆژانەدا لە جەماعەتی خۆم غائیب بووم: کە هاتمەوە لایان دیم دەگریان! وتم چییە، بۆچی دەگرین؟! وتیان ئەی نەتبیستووە (سفرە)ی جینی بەرامبەر حەزرەت (د.خ) چ بێ ئەدەبییەکی کردووە؟ منیش کە ئەوەم بیست زۆر عاجز بووم هاتم لە (سفرە) بدەم، لە بەینی سەفاو مەروەدا پێی گەیشتم و کوشتم و ئەمە سەری ئەوە بەدەستمەوە، شکڵی لاشەکەی لە شێوەی سەگدایە و لە جێگای خۆیدا کەوتووە، من ناوم (مهدی)یە، ڕێگام بدە هەتا بڕۆمە ناو بۆشاییی بتەکانەوە و قسەی باش بکەم، حەزرەت (د.خ) فەرمووی وا ڕێگام دای.

ڕۆژێ پاش ئەم ڕووداوە کافرەکانی قورەیش کۆبوونەوە بۆ ڕێزگرتن لە هوبەل و بانگی حەزرەتیان کرد ئەویش حازر بێ، کە هەموو لایێ کۆبوونەوە وتیان: ئەی هوبەل قسەی خۆت بکە، چی دەزانی بیڵێ با تێ بگەین محەمەد پێغەمبەرە یان نا؟ ئیمڕۆش چاو و دڵمان ڕوون بکەرەوە. هوبەل هاتە جواب وتی: ئەی ئەهلی قورەیش! ئەی ئەهلی مەککە! هەموو بزانن محەمەد ڕاستگۆیە و دینی ئەو دینێکی حەقە. کە ئەم دەنگە لەناو هوبەلەوە دەرچوو و کافرەکان بیستیان، ئەبوو جەهل ڕقی هەڵسا و جۆشی خوارد و ڕۆیشت بتەکەی دا بەعەرزا و شکاندی و پارچە پارچەی کرد.

ڕیوایەت کراوە لە سەرەتای پێغەمبەرایەتیی حەزرەتدا (د.خ) ئەبوو جەهل لەگەڵ کۆمەڵێ لە قورەیشییەکان ڕۆیشتن بۆ لای ئەبوتالیبی مامی پێغەمبەر (د.خ) و پێیان وت: ئەم پیاوە برازای تۆیە و ئێمە لەبەر تۆ دەستی لێ نادەین، ئەو گەلێ قسە بە بتەکانی ئێمە دەڵێ. پێویستە تۆ بانگی بکەی و ئامۆژگاریی بکەی با بێدەنگ بێ، ئەگینا لە بەینی ئێمە و ئێوەدا غەیری شمشێر، هیچی تر نامێنێ. ئەویش وتی: محەمەد بانگ کەن قسەی لەگەڵ بکەن، بزانن جوابی چۆن دەبێ؟ کە حەزرەتیان بانگ کرد هات و لەسەر کورسییەکەی مامی دانیشت.

کافرەکان وتیان بە ئەبوتالیب: تەماشاکە ڕێزی تۆی نەگرت و لە شوێنەکەتدا دانیشت. ئەویش وتی: ئەگەر ئەم کوڕە ڕاست بکا، ئیمڕۆ لەسەر کورسییەکەی من دادەنیشێ سبەی

لە سەرشانی ئێوە دادەنیشێ. ئەنجا پاش ئەمە کافرەکان پرسیاریان لێ کرد و وتیان: ئەی محەمەد! تۆ لەم داوای پێغەمبەرایەتییەتدا دەلیلت چییە؟

حەزرەت (د.خ) فەرمووی داوای چی دەکەن بۆتان دەکەم، ئەوانیش هەموو وتیان: دەمانەوێ ئەو بەردە کە وا لە نزیکمانەوە درەختێکی بەرزی لێ بێتە دەرەوە چەند لقی درێژی ببێ بەم لاو لادا بڵاوببنەوە.

حەزرەت لەو کاتەدا لە خوای گەورە پاڕایەوە کە یارمەتیی بدا، گورج حەزرەتی جیبرەئیل نازڵ بوو، عەرزی حەزرەتی کرد کە خوای گەورە ئەو بەردەی ڕام و موسەخەر کردووە بۆ تۆ چی ئەمر دەکەی فەرموو، حەزرەت (د.خ) ڕووی کردە بەردەکە. بەردەکە گورج لەت بوو و درەختێکی بەرز لەناویەوە دەرچوو چەند لقی لێ جیا بووەوە و بەم لاو بەولادا بڵاوبوونەوە، کافرەکان هەموو بەجارێ وتیان «ما أحسن ما جئت به؟». ئەمەی کردت شتێکی زۆر جوان و پەسەند بوو، بەڵام ئەمانەوێ درەختەکە بگەڕێتەوە بۆ ناو بەردەکە و بەردەکە گەڕایەوە سەر وەزعی پێشووی. کە کافرەکان ئەمەیان دی هەر چەند پێویست بوو، تەحسینی بکەن و قەناعەتی خۆیان دەربڕن، بە پێچەوانەوە وتیان «ما رأينا ساحراً مثلك». واتە: جادووگەری وەکو تۆمان نەدیوە! جا لەم وەزعەوە ئەوە دەردەکەوێ کە هیدایەت و کەوتنە سەر ڕێی ڕاست لای خواوەیە؛ تا خوای گەورە هیدایەتی کەسێ نەدا هیدایەت وەرناگرێ.

دەگێڕنەوە: لە سەرەتای دەرکەوتنی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتدا، جوانانی وڵاتی یەمەن لە هەموو چەند ڕۆژێکدا جارێ لە شوێنێکدا کۆدەبوونەوە، لەناکاو دەنگێ لە غەیبەوە بانگی کردن. وتی: «يا معشر الغافلين إن محمداً يدعوكم إلى الأسلام ألا تتبعونه». واتە: ئەی تاقمە بێ ئاگاکان! محەمەد بانگتان دەکا بۆ ئیسلامیەت، عەجایەب ئێوە ناچن بەدەم بانگەکەیەوە و دوای ناکەون؟! لاوەکان کە ئەو دەنگەیان بیست هەر کەس لە ئاستی خۆیدا سەری سووڕما و بڕیاریان دا تەحقیقی ئەحواڵی پێغەمبەر بکەن (د.خ). ئەنجا بۆ ئەم مەبەستە چەند کەسێکیان بە سەرۆکایەتیی زەلامێکی کارامە و لێهاتوو بە هەشت وشتری بەبارەوە ڕێك خست و پێیان وتن بڕۆن بۆ شاری مەککە و لە ئەحواڵی محەمەد بپرسن و بزانن چۆن ئینسانێکە؟ ئەگەر ڕاست هاتە پێش چاوتان وشترەکانی بە بارەوە بدەنێ و خەبەرەکەمان بۆ بهێننەوە. خۆ ئەگەر وا نەهاتە پێش چاوتان ئەوا وشتر و بارەکان بفرۆشن.

قەزاوقەدەر کە گەیشتە مەککە بەر لە هەموو کەس بە ئەبووجەهل گەیشتن. کە ئەحواڵی حەزرەتیان لێ پرسی، جوابی دانەوە کە محەمەد پیاوێکی باش نییە و دەستی کرد بە درۆکردن و هەڵدانی سیفەتی نالەبار. هەروەها پێی وتن: ئەم وشترانەتان لێ دەکڕم بە چوار هەزار دینار بەمەرجێ تا یەك مەنزڵ لە مەککە دوورنەکەونەوە نرخەکەتان پێ نادەم. ئەوانیش وشتر و بارەکانیان پێ فرۆشت و بەرەو بازاڕ ملی ڕێگایان گرت، لەوێ گەیشتن بە ئیمامی عەلی ئەحواڵی حەزرەتیان لەویش پرسی، ئەویش بە مەدح و سەنای پێغەمبەر وەڵامی دانەوە و پێی وتن: وەرن تا بتانگەیەنمە خزمەتی و خۆتان بیبینن. کە بە خزمەتی حەزرەت گەیشتن پاش بەخێرهاتنیان یەکسەر پێی فەرموون: ئەگەر حەز دەکەن پێش ئەوەی ئێوە قسە بکەن من پێتان دەڵێم ئێوە بە چ نیازێ هاتوون؟ ئەوانیش عەرزیان کرد: بەڵێ چاکتر وایە کە تۆ لەپێشا قسەمان بۆ بکەی. ئەنجا حەزرەت (د.خ) بەڕاستی و بێ زیاد و کەم نیاز و مەبەستیانی بۆ بەیان کردن، ئیتر هەموو بەم موعجیزەیە دڵیان دامەزرا و شایەتومانیان هێنا و هەریەك سەربەخۆ وتی: «أشهد أن لا إله إلا اللّه وأشهد أن محمداً رسول اللّه» و هەموو موسڵمان بوون.

ئەمجار حەزرەت (د.خ) هەستا و بەو کۆمەڵەوە ڕووی کردە ماڵی ئەبووجەهل بۆ ئەوەی قەرزەکانی لێ وەربگرێ. کە ئەبووجەهل لە دوورەوە چاوی بە حەزرەت کەوت (د.خ) لەگەڵ کۆمەڵەکەدا بە خزمەتکارەکانی خۆی وت، دەرگای حەوشە قایم بکەن با نەیێنە ماڵەوە. هەروەها پێی وتن یارمەتیم بدەن با ئەم بەردە گەورە بدەم بەسەر محەمەدا تا بمرێ و لێی ڕزگار بین! کاتێ ئەوان لە قاپیی حەوشەکە نزیك بوونەوە و، ئەمانیش بەردەکەیان هەڵگرت، دەستی ئەبووجەهل کەوتە ژان و ئێشێکی وەها ئۆقرەی لێ بڕی و دەستی کرد بە هاوار و ناڵین و بانگی لە حەزرەت کرد کە دوعای بۆ بکا لەو ئێشە ڕزگاری ببێ تا ئەویش هەموو وشتر و بارەکان بداتەوە بە خاوەنەکانیان.

حەزرەت (د.خ) دەستی موبارەکی هێنا بە دەستی ئەبوو جەهلدا و ئێشەکەی نەما، ئەنجا ئەبووجەهل ئەمری کرد دەرگایان کردەوە وشترەکانیان گەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانیان و هەرچی حوقووقی تریان بوو دانیەوە، تەنانەت ڕیوایەت کراوە لەوکاتەدا ئەبووجەهل ویستوویە هەندێ شتومەکی خاوەن وشترەکان بشارێتەوە و بۆ ئەم مەبەستە چووە ماڵەوە، لەوێ ئینسانێکی بەسامی هاتە پێش چاو کە هەڕەشەی لێ کرد و وتی: ئەگەر شتێ لە کەلوپەلی ئەوانە لابدەی بە شمشێر لە گەردنت دەدەم، ئەویش

بە ترس و لەرزەوە دوورکەوتەوە تا هەموو شتەکان درانەوە بە خاوەنەکانیان و ڕۆیشتنە دەرەوە.

ڕیوایەت کراوە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەبووجەهل لە دەرگای ماڵی خۆیاندا بیرێکی قووڵی هەڵکەند تا جارێ بە فێڵ حەزرەت بانگ کا بۆ ماڵی خۆیان و بە غەفڵەت بکەوێتە بیرەکەوە. بەڵێ ئەبووجەهل ئەمەی کرد و بە ناو خەڵکدا بڵاوی کردەوە کە نەخۆشە تا حەزرەت بڕوا سەردان و هەواڵ پرسینی و بکەوێتە ناو بیرەکەوە. هاوڕییەکانی ئەبووجەهل بەم پیلانەیان دەزانی.

کە حەزرەت (د.خ) باسی ناساغیی ئەبووجەهلی بیست، ڕۆیی بۆ هەواڵ پرسینی، لە ڕێگەدا حەزرەتی جیبرەئیل هاتە لای و خەبەری ئەم پیلانەی دایە و حەزرەت گەڕایەوە و نەڕۆیی بۆ هەواڵ پرسینەکە. کە ئەبووجەهل بە گەڕانەوەی پێغەمبەری زانی، ڕقی هەڵسا و کەفی چەڕاند و تووڕە بوو، هات بێتە دەرەوە، بەبێ ئاگایی کەوتە ناو بیرەکەوە! خەڵکی لێی کۆبوونەوە و هەرچەند هەوڵیان دا بۆیان دەرنەهات! تا لە بیرەکەوە هاواری لێ بەرزبوویەوە و وتی : ڕزگاری من بەهۆی محەمەدەوە دەبێ. چوون بەشوێنی پێغەمبەردا و بانگیان کرد (د.خ). کە تەشریفی هات، بانگی لە ئەبووجەهل کرد: ئەگەر لەم بیرە ڕزگارت بکەم موسڵمان دەبی؟ وتی بەڵێ. حەزرەت (د.خ) دەستی داهێشت و هێنایە دەرەوە، کە هاتە دەرەوە لەباتیی ئەوەی ئیمان بێنێ و مەمنوون بێ، وتی: «ما أسحرك؟» واتە: ئای چ جادووگەرێکی کارامەی؟!

براکانم! جا لەم ڕووداوەوە ئەمە بوو بە پەند کە «من حفر بئراً لأخيه وقع فيه». واتە: کەسێ بیر بۆ برای خۆی هەڵکەنێ لەباتی ئەو خۆی تێ دەکەوێ! کەسێ داوێ بۆ یەکێ بێنێتەوە لەپێشدا خۆی پێوەی دەبێ، وەك مەشهوورە «چاڵ هەڵکەن لەبنی چاڵایە».

دەگێڕنەوە جارێ ئەبووجەهل لەگەڵ نامەردێ لە هۆزی بەنی خوزەیمە ڕێك کەوت و بڕیاریان دا کاتێ کە حەزرەت لە نوێژدا سەر بۆ سوجدە دادەنەوێنێ و سەر دەخاتە سەر عەرز، بەردێ بدەن بەسەریدا، ئەبووجەهل خۆی ئامادەکرد و لەکاتی سوجدەبردنی حەزرەتدا بەردەکەی هەڵگرت کە بیدا بەسەریا. گورج دەستی لکا بە سینگییەوە و بۆی جیانەکرایەوە، کە لێیان پرسی: هۆی ئەوە چییە؟ وتی: نازانم تەنیا ئەوەندە دەزانم کاتێ ویستم بەردەکە بدەم بەسەریدا، دەستم لکا بە سینگمەوە. کە هاوڕییەکەی ئەم قسەی بیست، سوێندی خوارد، دەبێ ئەم بەردە بدەم بەسەر محەمەددا، بەردەکەی هەڵگرت و ڕۆیی بیدا

بەسەریدا. گورج حەزرەت (د.خ) لە پێش چاوی ون بوو، تەنیا دەنگی دەبیست. هاتەوە بۆلای هاورییەکانی، لێیان پرسی: چیت کرد؟ وتی: هیچم بۆ نەکرا و ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە.

ڕیوایەت کراوە: جارێ ئەبووجەهل سوێندی خوارد وتی: ئەگەر محەمەدم چاوپێ کەوت نوێژ بکا، ئازاری دەدەم، قەزاوقەدەر وابوو حەزرەت (د.خ) هات و لە مزگەوت دەستی کرد بە نوێژ. ئەبووجەهل لەسەر سوێندەکەی خۆی بەرەو لای حەزرەت ڕۆیی کە ئازاری پێ بگەیێنێ، لەناو قەدی ڕێگەدا بەترس و لەرزەوە ڕای کردەوە.کە هاوڕییەکانی لێیان پرسی: چیت لێ قەوماوە؟ وتی: خەندەقێکی گەورەم دی لە بەینی من و ئەوا هەڵکەنرابوو، پڕبوو لە ماری ناشیرین ناشیرین هەموو دەمیان کردبووەوە لێم. منیش لەترسدا خۆم پێ نەگیرا و هەڵاتم. ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەگەر نەگەڕایەتەوە مەلائیکەی خوا پارچە پارچەیان دەکرد.

لە ئەبوویەکری سیدیقەوە، خوای لێ ڕازی بێ، ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: کاتێ ڕۆیشتینە ئەشکەوتەوە لەکاتی هیجرەت و کۆچ کردنماندا لە مەککەوە بۆ مەدینە (زادهما اللّه شرفًا) پاش ماوەیێ تەماشام کرد کافرەکان بە شوێنماندا دەگەڕان و وا لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا ڕاوەستاون، پێیانم دەبینی. منیش بە پێغەمبەرم وت (د.خ): ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر ئەمانە تەماشای ناو ئەشکەوتەکە بکەن دەمانبینن. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەبووبەکر! بڕوانە! کە تەماشام کرد دەریایەکی زۆر گەورەم هاتە پێش چاو! هەروەها لە قەراخی دەریاکەوە کەشتییەکی گەورە ئامادەبوو. ئەنجا حەزرەت فەرمووی: ئەی ئەبووبەکر خوا توانایە، دنیا ببێ بە دەریا مادام کەشتی حازرە ڕزگار دەبین.

لە ئیبنوعەباسەوە دەگێڕنەوە، خوای لێ ڕازی بێ، فەرموویە: ڕۆژێ حەزرەتی جیبرەئیل بەشێوەیەکی بەسامەوە هاتووەتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی کردووە: خوای گەورە سەلامت لێ دەکا و دەفەرموێ: بڕۆیتە سەر ئەهلی شاری تائیف و بانگیان بکەی بۆ وەرگرتنی ئاینی ئیسلام. حەزرەت فەرموویەتی: جیبرەئیل! من هەرگیز تۆم بەم شێوە سامدارە نەدیوە، ئەویش وەڵامی داوەتەوە وتوویە: من لە شەوی (ليلة القدر) و ڕۆژی عەرەفاتدا بەم شێوە و سیمایەوە دێمە خوارەوە بۆ سەر ئەرز؛ چونکە ئەم دوو کاتە زۆر پیرۆز و خاوەن پایەن، هەروەها جیبرەئیل عەرزی کردووە: کە خوای گەورە فەرمانی داوە و پێویستە بڕۆت بۆ سەر ئەهلی تائیف و بانگیان بفەرمووی بۆ وەرگرتنی ئاینی پیرۆزی

ئیسلام و وەرگرتنی کەلیمەی (لا أله إلا اللَه). جا عەبدوڵڵای ئیبنو عەباس دەفەرموێ: لەپاش چەند ڕۆژێ لەم تەئریخەوە حەزرەت (د.خ) لەگەڵ چەند کەس لە هاوڕییەکانی خوایان لێ ڕازی بێ، ڕوویان کردووەتە تائیف. لە ڕێگەدا بە پیاوێکی پیر گەیشتوون. پیرە سەیرێکی حەزرەت و هاوڕییەکانی کردووە، کە هەندێکیان جوان و هەندێکیان پیرن و تێکڕا ڕێز لە حەزرەت دەگرن، لێیان دەپرسێ: ئەم جوانە کە وەها ڕێزی لێ دەگرن کێیە و ناوی چییە؟، من گومانم بۆ ئەوە دەچێ ئەو پیاوە گومڕاهە بێ لە تیهامە پەیدا بووە.

لەوێدا حەزرت (د.خ) دەفەرموێ: (حاشا) من گومڕاهـ نیم، من محەمەدم و پێغەمبەری خوام و قورئانم بۆ نێردراوە و، خوای گەورە ناردوومی تا ئەهلی ئەم شارە بانگ بکەم بۆ وەرگرتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

دوای ئەمە پیرە دەڵێ: من جاسووسم لەسەر ئێوە و چاوەڕێی ئەم دوو کەلیمە قسەی ئێوە بووم، وا حاڵی بووم. لەم کاتەدا کە قەومەکەی من بێ ئاگان بڕۆن دەعوەتیان بکەن. ئیتر ئەو گورج لای ئەمان دەردەچێ و بەرەو شاری تائیف دەکەوێتە ڕێ. کە دەگاتە شار هاوار دەکا دەڵێ: «یا آل بني شیبة ویا آل ربیعة» وا پیاوە گومڕاکەی تیهامە هات بۆسەرتان کە دینی خۆی برەو پێ بدا و ئێوە لە دین و ئاینی باوك و باپیرانتان لابدا. دەی هەمووتان چەك هەڵگرن و بڕۆن بۆ قاپیی شوورای شار!

کاتێ کە حەزرەت (د.خ) لەگەڵ هاوڕییەکانی دەگەنە شاری تائیف بەجارێ بانگیان دەکەن: ئەی ئەهلی تائیف! هەمووتان بڵێن «لا اله ألا اللَه محمد رسول اللَه». بیست شەو لە تائیف دەمێننەوە، لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا ئەم ئەمرەیان کردووە و خەڵکیان بانگ کردووە بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام. ئەهلی تائیف ئیسلام نەبوون، بەڵام جوابیان بۆ حەزرەت ناردووە (د.خ) گوایا ئەگەر ماڵی دنیای دەوێ پێی دەدەین! حەزرەت (د.خ) دەفەرموێ من تەنیا کەلیمەی تەوحیدم لێیان دەوێ، (لا اله ألا اللَه) ئیتر هیچ شتێکی ترم لێ ناوێن.

ئەهلی تائیف لەم وەزعە دڵگران دەبن و دەڵێن: ئێمە بەهۆی ئەم شەخسەوە ئەوە بیست ڕۆژە لە کاروکاسبی کەوتووین، با بڕۆین بیکوژین و ڕزگار بین. بەڵام کچی سەرۆکی تائیف کە ئاگاداری تەورات و ئینجیل و زەبوور بووە دەڵێ: سەبر بکەن با تاقیی بکەینەوە؛ ئەم شەخسە عەرەبە و زمانی سریانی نازانێ. من دەڕۆم پرسیاری هەندێ شتی لێ دەکەم لە کاروباری پێشینە کە بە سریانی نووسراون. جا ئەگەر نەیزانین ئەوا

مەعلووم درۆزنە و دەیکوژین. ئەگەر زانییشنی، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە پێغەمبەری خوایە و حەیفە بیکوژین.

کچی سەرۆکی شار لەگەڵ کەنیزەکەکانی، خۆی دەرازێنێتەوە بتێکی دەبێ دەیگرێ بەدەستیەوە و دەڕوات بۆ خزمەتی حەزرەت (د.خ) کە لێی نزیك دەبنەوە بە ئەدەبەوە دەڕۆنە خزمەتی و کچەکە عەرزی دەکا: من کچی سەرۆکی شاری طائیفم و هاتووم بۆ خزمەتت قسەت لەگەڵدا بکەم. حەزرەت دەفەرموێ: تا ئەو بتە دوور نەخەیتەوە قسەت لەگەڵ ناکەم. ئەویش بەگوێی دەکا و بتەکەی دوور دەخاتەوە و دەڕواتە پێشەوە و بە حەزرەت (د.خ) دەڵێ: ڕاستم پێ بڵێ، تۆ چ کەسێکی؟ دەفەرموێ: من محەمەدم، پێغەمبەر و نێردراوی خوام بۆ سەر جیهان و قورئانی پیرۆز بۆ من نازڵ بووە. کچەکە بەدەنگێکی بەرز پێ دەکەنێ بەجۆرێ کە خەڵکە کە دەیبیسن. حەزرەت (د.خ) پێی دەفەرموێ: بە چی پێ کەنیت؟! وتی: بەوەزعی تۆ پێ کەنیم؛ زۆر حەیفە پیاوی وەکو تۆ صاحێب سیما و جوان، قسەی درۆ بکەی! تۆ چۆن دەڵێی پێغەمبەر و نێردراوی خوام؟

حەزرەت (د.خ) دەفەرموێ: تۆ ئاگات لە کتێبە کۆنەکان هەیە پێم بڵێ کێ تەوراتی بۆ هات؟ دەڵێ: حەزرەتی مووسا. دەفەرموێ: ئەی کێ ئینجیلی بۆ هات؟ دەڵێ: حەزرەتی عیسا. ئەنجا دەفەرموێ: منیش پێغەمبەری خوام و قورئانی بۆ ناردووم. ئەنجا کچی سەرۆکی شار دەڵێ: دەی ئەگەر تۆ پێغەمبەری ئاخر زەمانی دوو ناوت هەیە لە زەبوورا بەیانیان بکە. دەفەرموێ: یەکێ لەو ناوانە (ماحی)یە، واتە: شتی بەتاڵ مەحو دەکاتەوە، وەك بت و بتپەرستی. دووەمیان (أحید)ە واتە: ڕووی ئوممەتی خۆی لە دۆزەخ وەردەچەرخێنێ، واتە: لە سزای ئاگری دۆزەخ دووریان دەخاتەوە. ئەی کچی سەرۆکی طائیف! من لە ئاسماندا ناوم مەحموودە و ، لە ئەرزا ناوم محەمەدی کوڕی عەبزوڵڵایە. کچەکە دەڵێ: دوو کەلیمەی تر هەن (طاب)و (طیب)، مانایان چییە؟ دەفەرمووێ: مانایان ئەوەیە من لە ناو هەر قەومێکدا ناوم ببرێ بە باشی دەزانن. ئەمجار کچەکە دەپرسێ: ئەی لە ئینجیلدا ناوی پێغەمبەری ئاخر زەمان چییە؟ دەفەرموێ: (فارقلیط). وتی: مەعنای چییە؟ دەفەرمووێ. بە کەسێ دەڵێن کە حەق و ناحەق لەیەك جیابکاتەوە. پاش ئەمە کچەکە دەڵێ: لە لای ئێمە نیشانەیەکی تر هەیە بۆ پێغەمبەری ئاخر زەمان، ئەویش ئەوەیە کاتێ عیسا بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان بە قەومەکەی خۆی فەرموو: لەپاش من خوای گەورە لە ئوممەتی عەرەبدا پێغەمبەر ڕەوانە دەکا کە منداڵ بووە باوکی مردووە

و ئوممەتێکی بۆ ئامادە دەکرێ کە حەمد و سەنای خوا دەکەن و، کاتێ نوێژ دەکەن وەك ریزی مەلائیکە ڕادەوەستن و، یارەکانی بەسەر کافرەکان زاڵ دەبن. ئایا ئەم سیفەتانە لە یارانی تۆدا هەن یان نا؟ حەزرەت (د.خ) دەفەرموێ: بەڵێ؛ ئەو نیشانەیە کە تۆ باست کرد ڕاستە و لە ئوممەتی مندا هەیە.

پاش مانە کچەکە عەرزی دەکا: نیشانەیەکی تر هەیە بۆ پێغەمبەری ئاخر زەمان لەم هەموو نیشانانە گرینگترە، ئەویش ئەوەیە کە لە پشتیدا نیشانەیە هەیە بریتییە لە خاڵێکی ڕەش بەقەد هێلکە کۆترێ ئاخۆ نیشانەی وەها لای تۆ هەیە؟ حەزرەت (د•خ) دەفەرموێ: بەڵێ ئەو نیشانەیشە هەیە. جا کچەکە بەسەر ڕوودا دەکەوێ و شایەتومان دەهێنێ و دەڵێ: «أشهد أن لا أله إلاّ اللّه وأشهد أن محمداً رسول اللّه». بەم شێوەیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەردەگرێ و بتەکەی خۆی وردوهان دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ ناو قەومەکەی و ئیسلامەتیی خۆی باش دەردەبرێ و، بە ئاوازی بەرز بانگ دەکا: «یا آل بني شيبة ويا آل ربيعة» بڵێن: « لا إله إلا اللّه، محمد رسول اللّه» تا لە سزای ئاگری دۆزەخ ڕزگار ببن. ئەهلی تائیف هەموو دەنگی ئەو کچە دەبیسن، بەڵام موسڵمان نابن، یەك نەفەر نەبێ لە حەبەشییەکان کە لەو کاتەدا لە تائیف بووە.

ئەو کچی سەرۆکی تائیفە، چوار برای گەورە و بەهێزی بووە، باوکیشی خاوەن دەسەڵات بووە، باوکە بە کوڕەکانی دەڵێ: چی حەز دەکەن لە سزا و ئازاردانی خوشکەکەتان بیکەن، بەڵکو لەم کارە پەشیمان بێتەوە و بگەڕێتەوە سەر ڕێی خۆمان، کوڕەکانیش بە خوشکەکەیان دەڵێن: خوشکی ئێمە زۆر لامان خۆشەویستی، هەرگیز حەز ناکەین سزات بدەین. وەرەوە سەر ئاینی خۆمان، ئەگینا تووشی سزای زۆر دەبی. ئەویش دەڵێ: باکم لە کوشتن نییە و هەرگیز لەم ئاینە ڕاستە پەشیمان نابمەوە و خوای خۆم دۆزیوەتەوە و لە گومڕاهی ڕزگاربووم. ئینجا براکانی بێبەزەییانە دەستیان کردووە بە سزادانی، بەڵام ئەوان هەرچەند سزایان داوە ئەو زیاتر سوور بووە لەسەر ئیمانەکەی و چاکتر باوەشی پێدا کردووە و پاراستوویە تاڕادەیەك هەڕەشەی سووتاندنیان لێ کرد، بەڵام ئەو لە وەڵامیاندا دەیوت: سزای ئێوە سووکە و ئاسانە، سزای خوای گەورە قورس و نالەبارە. لەدواییدا بە ئەمری باوکی چوار مێخەیان کێشا، واتە: ڕایان کێشا لەسەر پشت و دەست و پێیان بەلادا ڕاکێشا و مێخیان پێدا داکوتا تا گیانی پاکی دەرچوو و بە پایەی شەهادەت گەیشت. جا پاش شەهیدکردنی بردوویانە لە نزیکی حەزرەتەوە (د.خ) فرەیان داوە و ئەویش بە عەبای موبارەکی خۆی دای پۆشیوە و نوێژی جەنازەیان کردووە و

خستوویانەتە قەبر. پاش ئەم ئیشانە دەفەرموێ: قەسەم بەو کەسە کە گیانی منی لەدەستدایە، ئەو کچە پێش ئەوەی گیانی دەربچێ، جێگەی خۆی لە بەهەشتدا دی.

هەروەها ئەو حەبەشییەش کە بە دەنگی کچی سەرۆکەوە موسڵمان بووبوو ئەویشیان بە ئازار و سزا کوشت و شەهید بوو، فرێیاندایە خزمەت حەزرەت، بەڵام حەزرەت بۆ ئەم ماتڵ بووە، گورج نوێژی جەنازەی نەکردووە تا حەزرەتی جیبرەئیل لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە مەلائیکەکان ئامادە بووە عەرزی حەزرەتی کردووە: خوای گەورە سڵاوت لێدەکا و دەفەرمێ: ئەم حەبەشییەش لە ڕێگای مندا جیهادی کردووە، پێویستە ئامادەی نوێژ و جەنازەی ببن و دەفنی بکەن. ئینجا حەزرەت (د.خ) نوێژی جەنازەی کردووە و لەگەڵ هاوڕێیەکانی دەفنیان کردووە (رضي الله تعالی عنهما. آمین).

هەر لەو ڕۆژە تاڵەدا لەپاش نوێژی مەغریب حەزرەتی جیبرەئیل دێتە خزمەتی حەزرەت و ئاگاداری دەکا کە ئەم کافرانی تائیفە سەگی تالیمدراوی دڕندەیان هەیە و دەیانەوێ سبەینێ بەریاندەنە گیانتان ئاگاداری خۆتان بن. سبەی کە ڕۆژ دەبێتەوە حەزرەت (د.خ) سەیر دەکا کافرەکان سەگەکانیان بەرەڵا کردووە. لێیان دەڕواتە پێشەوە و دەفەرموێ: «لا حول ولا قوة إلا باللّه»، هەروەها دەفەرموێ: «یا اله السموات و الأرضین»، «یا اله النبیین! حوّل هذه الکلاب علی أصحابهن». خوای گەورە دوعاکەی قبووڵ دەکا و سەگەکان سەردەخەنە سەر ئەرز و دەست دەکەن بە کلکەلەقە و دێن بۆ خزمەت حەزرەت (د.خ) و ئەویش بانگیان لێ دەکا و دەفەرمووێ: «یا کلاب علیکن باصحابکن». ئیتر بەجارێ ئەو سەگە دڕندە تالیمدراوانە دەگەڕێنەوە بۆ سەر خاوەنەکانیان و هەر کەسیان لەوانە بەردەست دەکەوێ بریینداری دەکەن. بەهۆی ئەم وەزعەوە خەڵکی شار ڕادەکەن. لەوێدا حەزرەت (د.خ) فرسەت دەهێنێ و دەڕوا بۆ بتخانەی شارەکە و بتەکان هەموو دەشکێنێ.

کاتێ خەڵکەکە گەڕانەوە بۆ سەر بتەکان و تەماشایان کرد هەموویان شکاون لە داخاندا دار و بەردیان دا بەسەر خۆیاندا. کابرایەکی حەبەشەییش، کە بتپەرست بوو و بتەکەی شکابوو، بەدوای حەزرەتدا دەگەڕا تا پێی دەگا و ڕوخساری موبارەکی برییندار دەکا. حەزرەت لەم ڕووداوە زۆر نارەحەت دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ لای ڕەفیقەکانی، زۆر تێنووی دەبێ، داوای ئاو دەکا بیخواتەوە دەستی ناکەوێ؛ بۆیە لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە و دەفەرموێ: «اللهم اسقنا شربة من ماء» واتە: ئەی خوایا بە میقدارێ ئاو تێنوێتیمان بشکێنە.

ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: دەڵێن ئەوەندەی پێ نەچووە تەماشایان کردووە

ئاو لەناو بەینی پەنجەکانی پێغەمبەرەوە دەردەچوو (د.خ) ئاوێکی وەها لە شیر سپیتر و لە هەنگوین شیرینتر. حەزرەت (د.خ) لێی خواردەوە، هەروەها ویستی بەو ئاوە دەسنوێژ بگرێ، لە ناوکاودا پێنج مەلائیکە هاتنە خزمەتی کە هەریەك مەئمووری کارێ بوون: لە گەرمای ڕۆژ، بای توند و بەهێز، ئاو و لافاو. ئەم پێنجە داوایان لێ کرد، ڕێگایان بدا تا قەومی شاری تائیف بەرباد بکەن؛ چونکە بەهۆی ئازاردانی حەزرەت و بریندارکردنی ڕوخساری موبارەکیەوە مەلائیکە لە ئاسمانەکان زویر و دڵتەنگ بووبوون، بەڵام حەزرەت (د.خ) ڕێگای ئەوەی نەدا، ئازار بە ئەهلی شاری تائیف بگەیێنن و فەرمووی: «إن اللّه بعثني رحمة ولم يبعثني عذابا». واتە خوای گەورە منی ڕەوانە کردووە بە ڕەحمەت بۆ جیهان، نەیناردووم ببمە هۆی سزا و ئازاریان. هەروەها لەسەر حاڵی سەبر مایەوە تا نوێژی نیوەڕۆی کرد. جا کاتێ کە لەناو کۆمەڵێ ڕەفیقەکانیدا دانیشتبوو دەستی کرد بە دوعا و نزا و لە خوا پاڕانەوە و، فەرمووی: «اللهم بحرمة آدم وأبراهيم و موسى و عيسى، وبحرمة الأنجيل والزبور والتوراة والقرآن، أسألك أن ترزقهم الإيمان والإسلام فأنهم لا يعلمون ما يفعلون».

براکانم! چەند موعجیزەیەکی حەزرەتم بە شێوەیەکی کورت گێڕانەوە کە چەند مەبەستیان لێوە دەرکەوت:

یەکەم: هێزی ئیمانی ئەو موسڵمانە کە لەو ڕۆژ و چەرخەدا خۆیان بەرامبەر سزا و ئازاری دوژمن ڕاگرتووە و ڕێگای ڕاستیان بەرنەداوە و خەریکی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامی پیرۆز بوون.

دووەم: میهرەبانی و دڵفراوانی و بەزەییی حەزرەت (د.خ) تەنانەت بەرامبەر بە دوژمنی خۆی، کە لەباتی ئەوەی دوعای شەڕیان لێ بکا بە هەموو جۆرێ داواکاری قازانج و چاکە بووە بۆیان و بۆ هەموو بەرەی ئادەمیزاد. قال تعالى: «بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ». سا خوا بۆ خاتری میهرەبانیی خۆی لە مەزهەری ئیحسانی خۆیدا ڕامانگرێ و یارمەتیی هەموو لایەکمان بدا بۆ پەیڕەویی حەزرەت (د.خ) لە گوفتار و ڕەفتاریدا و، لە ڕۆژی قیامەتا لە شەفاعەت و تکاکاری ئەو بەشدار بین، ئامین.

لە ١١ی (ربيع الأول) (١٣٩٦)ی ك، ڕێکەوتی ١٢-٣-١٩٧٦ ز. دا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی بیست و هەشتەم

# باسی دراوسێیە

بسم اللّه الرحمن الرحيم

بسم اللّه، والحمدللّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه، وعلى آله وأصحابه وأتباعه بأحسان في دين اللّه.

وبعد، براکانم! دیاری ناردن دەبێتە هۆی خۆشەویستیی دیارینێر و دیاری بۆ نێرراو، وەکو حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «تهادوا تحابوا». واتە لەناو خۆتاندا دیاری بۆ یەکتر رەوانە بکەن دەبێتە هۆی خۆشەویستی لەناوتاندا، لەگەڵ ئەوەیشدا دیاریی دنیایی سوودێکی کەمی هەیە، بەڵام دیاریی برای دڵسۆتان سوودێکی زۆری هەیە؛ چونکە ئەم نامانە کە من بۆتانی رەوانە دەکەم، بەپێی فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) گەورەتر و بەسوودترن لە هەموو جۆرە دیارییەك، تەنانەت لەو دیارییانە کە پاشایان بۆ یەکتر یان دەنێرن. لە پێغەمبەرەوە (د.خ) ریوایەت کراوە: «ما أهدي مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده اللّه بها هدى أو يرده عن ردى»

واتە: هەرگیز هیچ موسڵمانێ دیارییەکی بۆ برای موسڵمانی خۆی نەناردووە باشتر بێ لە واتەیەکی ڕاست و رەوان و بەکەڵکی وەها کە شارەزاییەکی لە رێگەی ڕاستی ئایندا پێ پەیدا بکا، یا لە فەوتان و زریان و لێکەوتن بیپارێزێ.

دەگێڕنەوە حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (ر.خ) گەلێ جار لە هاوڕییەکانی دەپرسی: عەیبم چییە پێم بڵێن. هەروەها دەیفەرموو: «رحم اللّه أمرء أهدى إلي عيوبي». لەپاش فەرموودەکەیشی دەیفەرموو: دۆستی وا کە عەیبی ئینسان بە خاوەنەکەی پیشان بدا زۆر کەم و نایابە. سوپاس بۆ خوای گەورە برای خۆتان و دڵسۆزی خۆتان لەو جۆرە دۆستانەیە. کەوابێ هەروەکو دیاریی دنیایی وەردەگرن تکایە ئەم دیارییەی منیش وەربگرن؛ چونکە دیارییەکەی من لە دیاریی دنیایی بەسوودترە، نیشانەی وەرگرتنی دیارییەکەی من ئەوەیە کە بیخوێننەوە و گوێی پێ بدەن و کاری پێ بکەن. بەڵێ لە

ڕاستییدا لە لایەن خوای گەورەوە بەڵێنی چاك و موژدەی بەخێر هاتووە بۆ ئەو کەسانەی ئەم دیاریانە وەردەگرن. هەروەها هەڕەشەی توندکراوە لەوانە کە وەریان ناگرن؛ حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أيما عبد جاءته موعظة من اللّه في دينه فأنها نعمة من اللّه سيقت اليه، فأن قبلها بشكر زاده اللّه نعماً آخرى، وإلا كانت حجة من اللّه عليه...» الى أن قال: «.. ويزداد عليه بها سخطاً».

واتە: هەر بەندەیە لە بەندەکانی خوای گەورە ئامۆژگارییەکی لەبارەی ئەحواڵی ئاینییەوە لە لایەنی خواوە بۆ بێ ئەوە نیعمەتێکە لای خواوە بۆی حەواڵە کراوە، جا ئەگەر بەسوپاسەوە وەری بگرێ ئەوە زۆر مویارەك و بەجێیە و، خوای گەورە چەند نیعمەتی تری بۆ زیاد دەکا. خۆ ئەگەر وەری نەگرت دەبێتە شایەتی خراپیی ئەو لە ڕۆژی قیامەتدا و، خوای گەورە پێش ئەو کاتە لێی دەڕەنجێ، پەنا بە خوای گەورە.

براکان! باشترین هاوڕێ و هاومەجلیستان ئەو کەسەیە کە ئەم نامەتان بۆ دەخوێنێتەوە؛ حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی:- «خير جلسائكم من ذكر اللّه رؤيته، وزاد في علمكم منطقه، وذكركم الآخرة علمه».واتە: باشترین هاونشینتان و هاومەجلیستان ئەو کەسەیە کە چاوپێکەوتنی ئەو خواتان بیربخاتەوە و، قسەکردنی زانیاریتان زۆر بکا و، زانیارییەکەی ڕۆژی قیامەتتان بخاتەوە یاد. بێگومان هەر کەس گوێ بۆ ئەم نامانە بگرێ و بەو ئامۆژگارییەی ڕەفتار بکا ئەوە بە موسڵمانی ساغ حسێب دەکرێ.

ڕیوایەت کراوە لە گەورەترین خووڕەوشتی موسڵمان ئەوەیە لە بیستنی قسەی خێر تێر نەبێ.

براکان! پارێز لە گوناه و تاوانباری دەبێتە هۆی پاراستنی ئیمان و گیان دەبێتە هۆی پاداشتی چاکەی لە ژمارە نەهاتوو؛ چونکە خۆپاراستن لە گوناه ئەوەندە لای خوای گەورە بەنرخە کە پاداشتی لە هی تاعەتکردن زۆرترە، بەتایبەتی گوناه تا گەورەتربێ پاداشی نەکردنەکەی گەورەتر دەبێ.

خۆپاراستن لە گوناه سێ زیانی گەورە لە ئینسان دەگرێتەوە؛ لە فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ)، «جزاء المعصية الوهن في الطاعة والضيق في المعيشة والتعس في اللذة. قيل: وما التعس في اللذة؟ قال: لا ينال شهوة حلال إلا جاءه ما ينغصة أياها». واتە: پاداشتی بێ فەرمانیی خوا سێ شتە: یەکەم: سستییە لە خواپەرستییدا. دووەم: تەنگیی گوزەران.

سێیەم ئەوەیە خۆشی لێ دەبێ بە قوزەڵقورت و، ئەگەر نیعمەتێ یا هەر جۆرە خۆشییەکی بۆ ڕێك کەوێ بەڵایەکی لێ دەبێتە ملۆزم کە خۆشیی لێ دەکاتە ناخۆشی و شیرینی و لەزەتی دەکاتە تاڵی.

براکان! لە لایەنی حەزرەتەوە (د.خ) زۆر ئامۆژگاری کراوە دەربارەی ڕێزگرتن لە دراوسێ و، زۆری فەرمووە بۆ ڕاگرتن و پاراستنی حقووقی دراوسێیەتی، تەنانەت ئەگەر دراوسێش موسڵمان نەبێ، جوولەکە یا گاور بێ.

شێخ ئەحمەدی ئیبنوحەجەر فەرموویەتی: حەق وایە لەگەڵ دراوسێی کافردا چاکە بکرێ؛ چونکە ئەم چاکەکردنە دەبێتە هۆی خێر.

دەگێڕنەوە: شێخ سەهلی شووشتەری دراوسێی پیاوێکی مەجووسیی ئاگرپەرست بوو، کە کونێکی کردبووە ئەدەبخانەی ماڵەکەیان و هەموو شەوێك هەرچی پیسییان بووایە لەو کونەوە فڕێی دەدایە حەوشی ماڵی شێخ سەهلەوە. تا ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەم کارە ناشیرینە دەوامی کرد، لەو ماوەدا هەموو جارێ سەهل خۆی دەڕۆیی ئەو پیسسییەی لە حەوشەکەی خۆیان دەردەکرد و نەیدەهێشت کەس لە ماڵ و منداڵی بەم وەزعە بزانێ.

کە وادەی مردنی سەهل هات مەجووسییەکەی بانگ کرد لەگەڵ ئەولاد و میراتگرەکانی خۆیدا و پێی فەرموو: دەترسم ئەم واریسانەی من وەکو خۆم نەبن و ئەو وەزعەت لێ قبووڵ نەکەن و ئازارت بدەن؛ زۆرم پێ خۆشە ئاگاداری خۆت بی. پیاوە مەجووسییەکە کە ئەم میهرەبانییەی لە شێخ سەهلەوە دی گورج لەسەر دەستیدا موسڵمان بوو و لەسەر ڕەوشتێکی زۆر باش ژیا هەتا مرد.

هەندێ لە ئەهلی تەفسیر لە تەفسیری ئایەتی پیرۆزی «وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ»دا فەرموویانە: مەعنای ئەم ئایەتە ئەوەیە پێویستە لەناو ئێوەدا هەمیشە گرووهێ ببن ئولفەت و برایەتی بخەنە ناو خەڵکەوە بە تایبەتی لەگەڵ خزمانا؛ کەوابێ ئولفەت خستن و برایەتی لەناو موسڵمانان زۆر باشە و، لە ئاینی ئیسلامدا بەشێوەیەکی گشتی مەرغوویە، بە تایبەتی لەناو خزم و خۆیشاندا.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «مالكم لا تتحابون عباد اللّٰه إلا من قلة الإيمان أو كما قال» واتە: بۆچی یەکترتان خۆش ناوێ ئەی بەندەکانی خوا، چیتان دەست دەکەوێ لەم یەکتر خۆش نەویستنە کەموکوڕیی ئیمان نەبێ؟

یاخود مانای ئەوەی: ئەی بەندەکانی خوا هۆی چییە یەکترتان خۆش ناوێ؟ ئەڵبەتە هۆی کەمیی ئیمانە، ئەگەر باوەڕتان بە پاداش و جەزای کردەوە بوویوایە، وەك باوەڕتان بە کەسابەتیی دنیاتان، تەرکی دۆستی و خۆشەویستنی دراوسێتان نەدەکرد. براکانم! ئەگەر ئینسان باش تەماشای ئەم فەرموودەی حەزرەتە بکا (د.خ) دەبێ لە خەفەتدا بمرێ؛ چونکە فەرموویەتی: ئەو کەسانەی بێ مەحەببەتی لەگەڵ دراوسێدا دەکەن، ئیمانیان کەم و لاوازە.

هەروەها حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەرکەسێ ئیمان و باوەڕی بە خوای گەورە هەیە با دەرحەق بە دراوسیەکانی چاکە بکا، هەر کەسێ ئیمانی بە خوا و پێغەمبەری خوا هەیە با ئازاری دڵی دراوسێی نەدا، چونکە دراوسێ نزیکی دراوسێی خۆیەتی، پێکەوەبوونیان ڕۆژ و مانگ نییە ساڵەهای ساڵە، کە بەدرێژیی ساڵ ئینسان ئازاری دراوسێ بدا، سزاکەی نابڕێتەوە، پەنا بە خوا.

ڕیوایەت کراوە: ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) بە کۆمەڵێ لە یارانی خۆی فەرموو: ئایا ئێوە دەزانن زینا چۆنە؟ عەرزیان کرد: زینا حەرامە و خوای گەورە هەتا هەتایە حەرامی کردووە. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەگەر یەکێ لەگەڵ ژنانی بێگانەدا دە جار زینا بکا، گوناهی کەمترە لە تاقە زینایێ لەگەڵ ژنی دراوسێیدا بیکا.

هەروەها لە یارەکانی پرسیی (د.خ): ئێوە دەرحەق بە دزیکردن لە ماڵی خەڵك چی دەڵێن؟ عەرزیان کرد: دزی حەرامە؛ خوا و پێغەمبەری خوا حەرامیان کردووە. فەرمووی: ئەگەر یەکێ دە جار لە ماڵی خەڵکی دزی بکا، گوناهی کەمترە لەوە کە جارێ دزی لە ماڵی دراوسێی بکا.

پوختەی قسە: هەر گوناه و تاوانێ لەگەڵ دراوسێدا بکرێ، سزای گەلێ ناباتر و توندترە لە گوناهێ لەگەڵ خەڵکی تردا بکرێ.

براکانم! ڕەفتاری خراپ لەگەڵ دراوسێدا لە خراپیی دڵەوە پەیدا دەبێ، واتە لە کینە و بەخیلییەوە، ئەگینا ئینسانێ دڵی لە خووڕەوشتی خراپ پاك بێ، لەگەڵ هیچ کەسێکدا خراپە ناکا، نەخوازەلا لەگەڵ دراوسێدا؛ جا کەواتە با هەندێ لە فەرموودەی حەزرەتتان لە بارەی ڕق و کینە و خووی بەدی دڵەوە بۆ نەقڵ بکەم:

لە حەزرەتەوە ڕیوایەت کراوە (د.خ) کە لە شەوی بەراتا خوای گەورە بەقەد تاڵ تاڵی

خوریی هەموو مەڕی خێڵی (بنی کلب) لە ئۆممەتی تاوانبار عەفوو دەفەرموێ، بەڵام ئەو موسوڵمانەی ڕق و کینەیان دەرحەق بە موسوڵمانان ببێ، خوای گەورە عەفوویان ناکا. خۆ ئەگەر تەرکی قسە لەگەڵ یەکا بکەن لە سێ ڕۆژ زیاتر ئەوە هەر کامیان بمرێ بە ئەهلی دۆزەخ، واتە بە تاوانبار، دەناسرێ. هەروەها هەتا شانزە حەدیسم حسێب کردووە کە لە زەممی ڕق و کینە و دڵپیسیدا وتراون.

لە حەزرەتەوە (د.خ) ڕیوایەت کراوە: ئەبدالی ئوممەتی من کە دەڕۆنە بەهەشت لەبەر زۆریی نوێژ و ڕۆژوو نییە، بەڵکو لەبەر دەسودەهەندە و کەرەم و بەخششە بەداماوان، لەبەرئەوەیە کە سینە سافن و نەسیحەتی موسڵمانان دەکەن بە ئیخلاسی دڵ.

هەروەها ڕیوایەت کراوە ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) سێ جار لەسەریەك فەرموویە: قەسەم بە خوا بە خاوەن ئیمان دانانرێ، قەسەم بە خوا بە خاوەن ئیمان دانانرێ. قەسەم بە خوا بە خاوەن ئیمان دانانرێ. یارانی حەزرەت (د.خ) وتیان: خاوەن زیان و خەسارەتمەندە ئەو کەسەی کە حەزرەت (د.خ) سێ جار سوێند بخوا لەسەر ناموسڵمانیی ئەو، دەبێ ئەو کەسە کێ بێ؟ حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەو کەسەیە کە دراوسێی لە شەڕی ئەمین نەبێ.

براکان! ئەم وەڵامی حەزرەتە (د.خ) دوو ئیشارەی تێدا هەیە: یەکەم ئەوەیە فەرمووی: ئەو کەسەیە کە دراوسێی لە شەڕی ئەمین نەبێ و، نەیفەرموو: ئەو دراوسێیە کە دراوسێی لە شەڕی ئەمین نەبێ، واتە ئەو کەسە حاڵی وابێ دراوسێ نییە و نابێ بە دراوسێ ناوببرێ. دووەم ئەوەیە نەیفەرموو: ئەو کەسەیە کە زیان بدا لە دراوسێ، بەڵکو فەرمووی ئەو کەسەیە کە دراوسێ مەترسیی هەبێ لە شەڕی و لە زیانی ئەمین نەبێ، جا تەماشاکەن مادام بەتەنیا مەترسی لە خراپەی ئەو کەسە ئەو هەڕەشەیە کرابێ، دەبێ ئەگەر بەڕاستی زیان بە دراوسیەکەی بگەیێنێ حاڵی عەزابی چۆن بێ؟

ڕیوایەت کراوە: یەکێ هاتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی کرد: من خەڵقی ئەم شارەم و لە فلانە گەڕەکم و زۆربەی ئێش و ئازاری ئێمە لە یەکێکەوەیە کە لە هەموو دراوسیەکان نزیکترە لێمان. لەوێدا حەزرەت (د.خ) ئەمری فەرموو بە ئەبووبەکر و عومەر بڕۆن جاڕ بدەن بەناو شاردا: نابێ هیچ کەس زیان بە دراوسێی بگەیێنی، ئەگەر نا لە بەهەشت ناهومێد دەبێ. هەروەها ئاگاداریش بن تا چل خانوو لە چوار دەوری ماڵی ئینساندا بە دراوسێ حسێب دەکرێ.

لەم کارەدا بۆیە حەزرەتی عوسمانی نەنارد، چونکە ئەو زۆر بە حەیا و شەرم بوو، نەبادا لەبەر شەرمی خۆی ئەمرەکەی حەزرەتی پێ جێبەجێ نەکرێ و جاڕی بۆ نەدرێ بەناو خەڵکدا.

براکان! تەماشا بکەن ڕاگرتنی حوقووقی دراوسێیەتی ئەوەندە گەورە و بە ئەهەممیەتە کە حەزرەت (د.خ) دوو یاری دیاری وەك ئەبووبەکر و عومەری ناردووە بۆ ئەوەی بەناو خەڵکدا جاڕبدەن تا کەس ئازاری دراوسێی خۆی نەدا، لەگەڵ ئەوەیشدا کە جاڕدان لەناو خەڵکدا کاری پیاوی گەورە نییە.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: قەسەم بەو خوایە کە گیانی من لە دەستی قودرەتی ئەوایە هیچ کەس بە موسڵمان ناناسرێ تا دڵ و زمانی سالم نەبێ، بە موسڵمان ناناسرێ کەسێ کە دراوسێ لە ئازاری ئەمین نەبێ، واتە دراوسێکەی لەوە بترسێ کە خیانەتی لەگەڵ بکا یا زوڵمی لێ بکا. هەروەها فەرمووی: هەر کەس ئازاری دراوسێ بدا ئەوە بەڕاستی ئازاری من دەدا و، هەر کەس ئازاری من بدا بەڕاستی خوای گەورە غەزەبی لێ دەگرێ.

ڕیوایەت کراوە: ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) لە شاری مەدینەی مونەوەرە دەرچوو بۆ جیهاد و فەرمووی. هەر کەس ئازاری دراوسێی خۆی دابێ نەیێت لەگەڵماندا بۆ غەزا. لەو سوپایەدا یەکێك هاتە خزمەت حەزرەت و عەرزی کرد: من میزم کردووە بە دیواری دراوسێکەمدا و هێشتا گەردەنی خۆمم پێ ئازاد نەکردووە؛ حەزرەت (د.خ) پێی فەرموو: ڕەفاقەتی من مەکە و، ناردییەوە بۆ مەدینەی مونەوەرە.

جا تەماشا بکەن فەرق لە بەینی ئەو زەمانە و زەمانی ئێمەدا چەند زۆرە. ئەو شەخسە کە ئەو گوناهەی کردووە حەزرەت ڕەفاقەتی نەکردووە و ناردوویەتیەوە بۆ شوێنی خۆی، نەوا بە شوومیی گوناهەکەی ئەوەوە باقیی سوپاکەیش بشکێ و خوای گەورە یارمەتییان نەدا؛ چونکە بەپێی حەدیسی پێغەمبەر (د.خ) تاوان وەك بۆ خاوەنەکەی شوومە، هەروەها نەگبەتی و شوومیی بۆ دەوروپشتیشی هەیە.

ڕیوایەت کراوە: ڕۆژێ یەکێ لە خزمەتی حەزرەتدا شکاتی لە دەستی دراوسێکەی خۆی کرد، حەزرەت (د.خ) فەرمووی: هەرچی شتومەك و کەلوپەلی ناو ماڵت هەیە دەریکە دەرەوە لە ماڵەکەت و هەر کەس بەلاتا تێپەڕی باسی خراپیی دراوسێکەی خۆتی لا بکە، ئەویش ڕۆیی هەرچی شتومەکی هەبوو لە ماڵەکەی دەرکرد و، هەر کەس بەوێدا تێ

دەپەڕی باسی خراپیی دراوسیەکەی لا دەکرد؛ کابرای دراوسێ لەم وەزعە زۆر دڵگران بوو و ڕۆیی بۆ خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی کرد: فلان کەس لای خەڵك باسی منی کردووە و ئەوانیش نەفرین و لەعنەتیان لێ کردم. حەزرەت (د.خ) فەرمووی لەبەرئەوە کە تۆ لەگەڵ دراوسیەکەت خراپ بووی، پێش ئەوەی خەڵك لەعنەتت لێ بکا، خوای گەورە لەعنەتی لێ کردووی؛ ئەو شەخسە کە ئەم فەرموودەیەی لە حەزرەت بیست (د.خ) یەکسەر تەوبەی کرد و لە گوناهەکەی پەشیمان بووەوە و پەیمانی دا لەگەڵ خوای خۆیدا کە جارێکی تر ئازاری دراوسێی خۆی نەدا، ئەنجا حەزرەت (د.خ) ئەمری فەرموو بە کابرای لە خانوو دەرچوو: بگەڕێرەوە بۆ خانووەکەی خۆت و شتومەك و کەلوپەلەکەت بەرەوە ماڵ؛ چونکە ئازاری دراوسیەکەت نەما و لەمەوپاشیش ئازاری لێوە نابینی.

براکان! تەماشاکەن کە حەزرەت (د.خ) چەند خاوەن بەزەیی و میهرەبان بووە بۆ ئوممەتی خۆی، بەو وەزعە کە فەرمووی دەفعی ئازاری لە دراوسێی زیان لێدراو کرد، هەروەها ستەم و دڵ ئێشانی کابرای ستەمکاریشی دەفع کرد و؛ بەم شێوە کردارە خەڵکیش تەمێ خوارد بوون بۆ ئەوەی کەس ئازاری دڵی دراوسێی خۆی نەدا.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: کەسێ کە شەو بە تێری سەربنێتەوە و دراوسیەکەی برسی بێ، ئەوە ئیمانی بە من نەهێناوە. هەروەها لە ڕۆژی قیامەتدا دراوسێ بەرۆکی دراوسێ دەگرێ و دەیباتە حوزووری خوا و شکاتی لێ دەکا و، دەڵێ خوایا! لەم دراوسێمە بپرسە: بۆچی لە دنیادا دەرگای لەسەرم دادەخست و لە زیادە ماڵی خۆی بەشی نەدەدام.

لە حەدیسێکی تردا حوقووقی دراوسێ لەسەر دراوسێ دەژمێرێ و لەدوایی حەدیسەکەدا دەفەرموێ: ئایا ئەوەی کە من بە ئێوە دەڵێم حاڵی دەبن؟ عەرزیان کرد: بەڵێ. فەرمووی: حەقی دراوسێ لەسەر دراوسێ ئەوەندە زۆرە، کەس ناتوانێ بەجێیان بێنێ، مەگەر کەسێ خوا ڕەحمی پێ بکا.

براکان! موسڵمانەکان! سوێندتان دەدەم بەخوا لەدوایی ئەم حەدیسە کە بۆتان بەیان دەکەم. چاك تێ فکرن؛ ئەبوو هورەیرە (ر.خ) ڕیوایەت دەکا لە حەزرەتەوە (د.خ) کە فەرموویەتی: کێ ئەم چەند کەلیمە وەردەگرێ و ڕەفتاری پێ دەکا یا فێری خەڵکیشی دەکا؟ منیش عەرزم کرد: یا ڕەسوولڵلا! من حازرم بۆ ئەوەی فەرمووت. جا حەزرەت (د.خ) دەستی گرتم و یەکەیەکە پەنجەکانی ژماردم و فەرمووی: پارێز بکە لە حەرام دەبی بە عابیدترین بەندەگانی خوا، واتە: پارێز بکە لە ڕەفتاری حەرام و وتاری حەرام و خواردنی

شتی حەرام و پۆشینی شتی حەرام و لە هەموو گوناهەکانی تر. ڕازی بە بە بەشی خوا و ئەو ڕۆزییەی دەتداتێ دەبیتەوە دەوڵەمەندترین ئینسان، واتە: ئەو کەسەی قنیاتی هەبێ بەو ڕزق و ڕۆزییەی خوا بۆی دەنێرێ لە هەموو جیهان بێ نیاز دەبێ. هەروەها چاکە لەگەڵ دراوسێی خۆتدا بکە دەبیتە موسڵمانێکی تەواو. هەرچی بۆ خۆتی ڕەوا دەبینی بۆ خەڵکیش ڕەوای ببینە، واتە: هەر چۆن حەز بە خێر و چاکەی خۆت دەکەی وەهایش حەز بە خێر و چاکەی موسڵمانان بکە لە هەر شوێنێ هەبن. زۆر پێ مەکەنە؛ چونکە پێکەنینی زۆر دڵی ئینسان دەمرێنێ و ڕەشی دەکاتەوە.

لە فەرموودەی حەزرەتە: لە هەموو کەسێ دوورتر لە ڕەحمەتی خوا کەسێکە کە دڵی خاوەن قەسوەت بێ، واتە: دڵڕەق بێ و بەزەیی بە خەڵکدا نەیەتەوە.

براکان! هەر کەس بۆ گوناهباریی خۆی خەفەت نەخوا و یادی مردن نەکاتەوە، کە (هازم اللذات)ە و هەموو خۆشییەك لەبیر دەباتەوە و هەروەها لە غەفڵەت و بێ ئاگاییدا بمێنێتەوە و زۆر پێ بکەنێ، ئەوە بێگومان دڵی دەمرێ و لە ڕەحمەتی خوا دوور دەکەوێتەوە.

لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە وتوویە: ڕۆژێ لە حوزووری پێغەمبەر (د.خ) زەلامێکم دی لەسەر یەك پێ ڕاوەستابوو، ئەوەندە بەو حاڵە مایەوە من دڵم پێی سووتا. کە ڕۆیی عەرزی حەزرەتم کرد و وتم: زۆر دڵم بەو شەخسە دەسووتا کە لە خزمەتتدا لەسەر یەك پێ ڕاوەستابوو، فەرمووی ئەوە جیبرەئیل بوو و لەو ماوەدا کە ڕاوەستابوو هەر وەسیەتی بۆ دەکردم بە چاکەکردن لەگەڵ دراوسێدا و، ئەوەندەی وەسیەت کردم تەسەورم کرد دراوسێ میرات لە دراوسێ وەربگرێ و، ئەگەر سەلامی لێ بکەی لەپاش مردن جوابی سەلامەکەت دەداتەوە.

ڕیوایەت کراوە: کە جیبرەئیل نە جارێ ، نە دوو جار لای نەدەدا لەوە کە وەسیەتی دەکرد بۆ حەزرەت (د.خ) لە بابەتی دراوسێوە تا گەیشتە ڕادەیەك گومانم دەبرد بەوە کە دراوسێ میرات لە دراوسێ دەبا.

دەگێڕنەوە کە عەدیی کوڕی حاتەم، خوای لێ ڕازی بێ، نانی ورد دەکرد و دەیکرد بە شاری مێروولەدا لە ماڵی خۆیدا و دەیفەرموو: ئەمانەیش دراوسێی ئێمەن.

ڕیوایەت کراوە: سێ شت هەن لە دنیادا پشتی ئینسان دەشکێنن: یەکەم: فرمانداری ئەگەر چاکەی لەگەڵدا بکەی سوپاست نەکا و ئەگەر خراپەی لەگەڵدا بکەی لێبووردن و

عەفووکردنی نەبێ. دووەم: دراوسێیێ ئەگەر چاکەیەکی لە تۆوە بینی دای پۆشێ و ئەگەر خراپەیەکی بینی بڵاوی بکاتەوە بەدنیادا. سێیەم: ژنێ ئەگەر لای بی ئازاری دڵت بدا و ئەگەر لای نەبووی خەیانەتت لێ بکا.

ڕیوایەت کراوە: «خير أئمتكم الذين يحبونكم وتحبونهم، وشر أئمتكم الذين يبغضونكم وتبغضونهم» واتە: باشترین خاوەن فرمان و کاربەدەست لەناو ئێوەدا ئەوانەن ئێوە ئەوانتان خۆش بوێ و ئەوانیش ئێوەیان خۆش بوێ، هەروەها خراپترین خاوەن فەرمان و کاربەدەست لەناو ئێوەدا ئەوانەن کە ئێوە ئەوانتان نەوێ و ئەوانیش ئێوەیان نەوێ.

دەگێڕنەوە: جارێ یەکێ لە حوزووری پێغەمبەرا (د.خ) مەدح و ستایشی ژنی دەکرد و وتی: فلانە ژن بەڕۆژا بەڕۆژووە و بەشەوا نوێژکەرە و خێر و سەدەقەی زۆرە، بەڵام زۆر ئازاری دراوسێیەکانی خۆی دەدا. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: وا لە ئاگری دۆزەخدا. هەروەها عەرزی کرد: فلانە ژنی تر تەنیا واجیبەکانی سەرشانی بەجێ دەهێنێ، بەڵام هەرگیز ئازاری کەس نادا و سەدەقە و خێریشی زۆر کەمە. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەوە وا لە بەهەشتدا.

براکان! دراوسێی باش لە دنیا لە قەبریشدا قازانجی هەیە و بەسوودە.

ڕیوایەت کراوە کە خوای گەورە بەهۆی هاوماڵی ڕەفتار باش و لە خواترسەوە دەرد و بەلا لە دراوسێیەکانیان دەفع دەکا.

دەگێڕنەوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أدفنوا موتاكم وسط قوم صالحين، واتە مردووەکانتان لەناو کۆمەڵی چاکاندا بنێژن؛ دیارە ئەگەر دراوسێی باش قازانجی نەبووایە بۆ دراوسێ حەزرەت ئەمەی نەدەفەرموو.

براکانم! لەبەرئەوە کە لە سەرەتای ئەم نامە باسی ئەوەمان کردووە دزیکردن لە دراوسێ دە قاتی دزیکردن لە بێگانە گوناهی هەیە، لێرەدا لە بابەتی حوکم و خراپیی دزییەوە چەند حەدیسێکتان بۆ بەیان دەکەم:

خوای گەورە فەرموویەتی: «وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ» خوای گەورە ئەمری کردووە بە خاوەن فەرمانان و کاربەدەستانی موسڵمانان کە هەر کەس دزی کرد دەستی ببڕن لە جەزای ئەوەدا کە بە دەست ماڵی خەڵکی بە ناحەق هێناوە و دەرحەق بە موسڵمانان خەیانەتی کردووە.

ڕیوایەت کراوە: کەس نییە کە دزی بکا و لەکاتی دزی کردنەکەیدا موسڵمـان بێ، لە ڕۆشنکردنەوەی مانای ئەم حەدیسە پیرۆزەدا زانایان فەرموویانە: هەر کەس موسڵمان بوو و قبووڵی ئەوەی کرد بەڕاستی بەندەی خوا بێ، ئەوە حەڵقەی بەندەیی خوای کردووەتە گەردنی خۆی و، ئەو حەڵقەیە وەك ملوانکەی نوورە لە ملیدا، جا کاتێ کە خەیانەتی لەگەڵ موسڵماندا کرد و حوکمی خوای شکاند ئەو حەڵقەی بەندەیییە لە ملیدا نامێنێ و بە موسڵمانی ساغ ناناسرێ، ئەم شەخسە ئەگەر بیەوێ تۆبە بکا و بڕواتە سەر حاڵەتی پێشووی پێویستە بە دڵ تۆبەیەکی ڕاست بکا و لە بەینی خۆی و خوای خۆیدا لەو کردەوە نابارە پەشیمان بێتەوە و، بڕیاریش بدا کە هەرگیز نەگەڕێتەوە سەری، سەرەڕای تۆبەکەیش دەبێ ماڵە دزێنییەکە بەتەواوی بداتەوە بە خاوەنەکەی.

لەگەڵ ئەمەیشدا حوکمەکەی خوا کە دەسبڕینی کابرایە دەبێ هەر جێبەجێ بکرێ و، قازانجی تۆبەکە تەنیا لابردنی گوناهی ئەو کارە نابارەیە کە کردوویەتی.

هەروەها ئەگەر کەسێ دزیی کرد و ڕێگای ڕاستی گرتەبەر و تۆبەی کرد، بەڵام گەدا و نەدارا بوو دەستی نەبوو ماڵی دزێنییەکە بۆ خاوەنەکەی جێبەجێ بکا، ئەوە مادام خەریکی خواپەرستی و ئیتاعەت بێ، لەوانەیە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ساحیب ماڵەکانی لێ ڕازی بکا و لەو تاوانانە ڕزگار بێ؛ چونکە تۆبەی ڕاست و بێ غەلوغەش، بێجگە لەوە کە دەبێتە هۆی عەفووی گوناه دەشبێتە هۆی دەسکەوتنی ڕەزامەندیی خوای گەورە (جل جلالە).

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لەعنەتی خوا لە دز بێ؛ دەڕوا هێلکەیەك دەدزێ، دەستی دەبڕن؛ واتە لەبەر تەماع شتێکی بێ قابلییەتی وەها دەدزێ کە دەبێتە هۆی فێربوونی دزی تا دەگاتە ڕادەی دزینی شتێ کە بایی چواریەکی دینارێکی ئاڵتوون بێ و، لە حەددی شەرعیدا دەستی دەبڕن.

کردەوەی وەها زۆر پەست وناڕەوایە کە ئینسان دەستی خۆی لەسەر دابنێ. تف لەو خووورەوشتە ناشیرینە کە لە دنیا و قیامەتدا ئینسان ڕیسوا دەکا. بۆ تەماشای ئەوە نەکا کە ڕەفیقانی ئەو، چ وەك ئەو چ لەو کەمتر، هەموو بەهۆی کەسابەتی حەڵاڵەوە دەژین و بە سەربەستی ڕادەبوێرن، نە گوناهباری دین و نە گوناهباری دنیان؟! ئەم دزە بێ فکر و هۆشانە نازانن، بێجگە سووکی و ڕیسوایی دنیا، لە ڕۆژی قیامەتدا لەباتی دینارێ حەوت سەد نوێژی ڕەوانیان لێ وەردەگرن و ئەو سامانە پاکە ئاینییەیان بەتاڵ دەڕوا و لەوانەیە خۆیان بەبێ دەسمایە و بە نا ئومێدی دابمێنن. خۆ ئەگەر دزەکە ڕەفتاری

خواپەرستی و چاکی نەبێ، هەتا بیدەنە خاوەن ماڵە دزراوەکە، ئەوا لە گوناهـ و تاوانی ئەو دەدەن بەسەر ئەمدا و، بەقەدەر ئەو گوناهە لە ڕۆژی قیامەتدا دەیسووتێنن.

زاناکان فەرموویانە: ڕەوا نییە بە دز بڵێی سەگ؛ چونکە سەگ لای خاوەنەکەی دەژی و بەرامبەر بەو ژیانە شەو تا بەیانی پاسی ئەو خاوەنەی دەکا، بەڵام دز، لەگەڵ ئەوەدا کە خوا گەلێ نیعمەتی پێ داوە هەموو شەو تا بەیانی خاوەن نیعمەتەکەی لە خۆی دەڕەنجێنێ.

بەڕاستی هەر کەس تەماشای حاڵی دز بکا دەبێ بە شێتی دابنێ؛ چونکە ئەگەر یەکێ بێ گایێکی دە دیناربایی بە هەزار دینار بکڕێ هەر کەس پێی بزانێ پێی دەڵێ شێتە. بێگومان ئەم دزە وەك ئەو کابرایە وایە، چونکە ئەگەر گایێ بدزێ کە دە دینار بژێ و چەند ساڵ لای بمێنێتەوە بەهۆی کرێیەکەی کە دەکەوێتە سەری چەند قاتی قیمەتەکەی قەرزار دەبێ و لەئەنجاما وای لێ دێ کە گایەکی دە دینار بایی بە چەند قاتی نرخەکەی خۆی کڕیبێ! دیارە هەر کەس ماڵێ بدزێ و لەلای بمێنێتەوە بەدرێژاییی زەمان کرێی دێتە سەر.

ڕیوایەت کراوە: ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) بەشێوەی پرسیار لە هاوڕێیەکانی فەرمووی: مرۆڤی موفلیس و لات کامەیە؟ عەرزیان کرد: موفلیس بەوە دەڵێن کە درهەم و دیناری نەبێ و ماڵێکی خاوەن نرخ شك نەبا، ئینجا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: موفلیس ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕای دەگرن و خاوەن حەقەکان دێن داوای حەقی خۆیانی لێ دەکەن. یەکێ دەڵێ: ئەم شەخسە منی کوشتووە، یەکێکی تر دەڵێ: بوختانی پێوە کردووم، یەکێکی تر دەڵێ: ماڵی داگیر کردووم، یەکێکی تر دەڵێ: ماڵی خواردووم. جا هەر خێر و خواپەرستی و چاکەیەکی هەبێ دەیدەن بەو خاوەن حەقانە. سەرەڕای ئەوەیش کە چاکەکانی تەواو بوون چیتری لەسەر دەمێنێ بەقەدەر ئەوە لە گوناحی خاوەنەکەی دەدرێ بەسەردا و سزا دەخوا.

براکانم! ئینسان هەرچۆن بێ، بەلاتی لە دنیا دەتوانێ ڕابوێرێ، بەڵام لاتیی قیامەت لە کێشا نییە و لە توانای مرۆڤدا نییە، واتە بەردەوام لە نائومێدی و بێبەشی و بێ ئاسایشیدا دەمێنێتەوە و لە ئارامی و خۆشی بێبەش دەبێ.

براکانم! ئەگەر ڕەحم بە خۆتان دەکەن، خۆتان لە گوناهـ بپارێزن و، ئەگەر ڕەحم بە خۆتان ناکەن و گوناهـ دەکەن گوناهێ مەکەن کە زاوزێ بکا و، واتە ڕۆژ بەڕۆژ زیاد بکا

وەك داگیرکردنی ماڵی خەڵك و دزینی حەیوانی خەڵكی، یا نەزەری حەرام؛ چونکە لە داگیرکردنی ماڵی خەڵکا هەتا ڕزگار دەبی لەو غەزەبە ڕۆژ بەڕۆژ گوناهی تری دێتەسەر، هەروەها لە تەماشاکردنی حەرامەوە نەفسی ئینسان دەجووڵێ بۆ گوناهی خراپتر (أعاذنا اللّه)

براکان! پاش مردن پەشیمان دەبنەوە، بەڵام پەشیمانی لەو کاتەدا بێ سوودە. ئەوەی پێویست بوو عەرزم کردن، ئیتر ئارەزووی خۆتانە.

(والسلام خير ختام).

لە (١٢)ی (ربیع الثانی) ١٣٩٦ی ك، ڕێکەوتی ١٢- ٤- ١٩٧٧ی ز دا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێر

## نامەی بیست و نۆیەم

# باسی ئیحسان و چاکەکردنە

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمدللّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه، وعلى آله وصحبه المجاهدين في نشر دين اللّه.

وبـعـد. سەنـاو ستـایشی بـێ ژمـارە بـۆ خـوایـێ دەشێ کـە بـەهـۆی نـاردنـی حـەزرەتـی (ڕەسوڵڵاوە)وە (د.خ) موسڵمانانی شارەزا کردووە بۆ پیرۆزی و بەختیاریی نەبڕاوە و گەلێ جۆری کردەوەی چاکی بەسوودی دامەزراندووە تا هەر کەس بەقەدەر حاڵی خۆی لەو کردەوە باشانە جێبەجێ بکا.

هەندێ کەسی تەوفیق داوە کە تاعەتی بەدەنی بکا، هەندێ کەس بۆ پاککردنەوەی نەفسی ئەممارە، هەندێ کەسیش لەسەر سەرفکردنی ماڵ لە ڕێگای خوای گەورەدا. زانا گەورەکان ئەم جۆرە تاعەتەیان کە خەرجکردنی ماڵە لە ڕێگای خوادا، بە گەورەترینی هەموو تاعەتێ ژماردووە.

ئـیـمـامـی غـەزاڵـی (ر.خ) فـەرمـوویـەتـی: سلـووکـی ڕێـگـەی بـەخـتـیـاری تـەواو نـابـی، بـە موخالەفەی هەوا و ئارەزووی نەفس و ڕێگرتن لە نەفس لە دواکەوتنی ئارەزوو نەبێ. پـێویستـە ئـینسان بـاوەڕی بـەم قسە هـەبـێ و بشزانـێ کـە مـاڵ سەرفکردن بـەشێکە لـە تەزکیەی نەفس و پاککردنەوەی دڵ. دیارە ئەو کارە چاکانە کە بڕۆن و بە خەڵکی تر بگەن و سیرایەت بکەن باشترن لەو کارە چاکانە کە تەنیا لە ئینسان خۆیدا بن و سیرایەت نەکەن، ئەمەش دەلیلی ناوێ.

ڕیوایەت کراوە: پرسیاریان کرد لە حەزرەت (د.خ) کە خۆشەویستترین بەندە لای خوا کێیە؟ ئەویش فەرمووی: ئەو کەسەیە کە قازانجی بۆ بەندەکانی خوا زۆرتر بێ. حەزرەت (د.خ) بەگوێ نەکردنی نەفسی بە جیهادی هەرە گەورە ناویردووە، بێگومان ئەو ئەندازە

بە گوێ نەکردنی نەفسە کە لە سەرفی ماڵدا هەیە، لە شتی تردا نییە، مەگەر لە تەرکی خۆشویستنی جاهـا.

بزانن لە سەرفکردنی ماڵدا لە ڕێگەی خوادا گەلێ خاسییەت هەیە کە لە خێراتی ترا نییە؛ یەکەم ئەوەیە کە سەرفی ماڵ لەو سەدەقانەیە کە جارییەن، واتە: لەپاش مردن نابڕێنەوە، چونکە کاتێ کە ئینسان مرد ئەو چاکانە کە لە کاتی ژیانیدا کردوونی دەبڕێتەوە-و وەك درەختی بێ بەریان لێ دێ، مەگەر ئەو سەدەقە بەردەوامانە کە وەختی خۆی کردوونی وەك دروستکردنی مزگەوت یا باخ یا دوکانێ کە لە ڕێی خوا وەقفی کردبن، یا پردێ یا کارێزێ لە ڕێگایەکدا هەڵی کەندبێ و موسڵمانان سوودی لێ وەربگرن؛ ئەم جۆرە خێراتە شەو و ڕۆژ تا قیامەت دەوام دەکا و نوور و بەرەکەت و جەزای دەڕوا بۆ گۆڕی خاوەنەکەی و، فریشتەی (کرام الکاتبین)ەکان ڕۆژ بەڕۆژ پاداشەکەی دەنووسن و لە دەفتەری کردەوەی خاوەن خێرا تۆماری دەکەن.

هەروەها حەزرەت (د.خ) دەرحەق بەهیچ خێرێ ئەو دەرەجانەی نەفەرمووە مەگەر دەرحەق موجاهیدین و مورابتین واتە ئەوانەی لەناو لەشکری ئیسلامان و غەزا دەکەن یا ئەوانە کە لەسەر سنووری مابەینی وڵاتی ئیسلام و کافراندا نامادە و لەسەرپێن و حازرن بۆ پارێزگاری و بەرگری.

دەبێ ئەوەش بزانین کە خواپەرستی و تاعەت دوو جۆرە: یەکەم قاسیرە واتە تاعەتێکە هەر هی خاوەنەکەیەتی و لانادا بۆ کەسی تر، وەك نوێژ و ڕۆژوو. دووەم موتەعەددییە واتە تاعەتێکە لادەدا بۆ خەڵك و ئەوانیش سوودی لێ وەردەگرن وەك یارمەتی و خزمەتکردنی خەڵك بە هەر جۆرێ دەست بڕوا. لە تاعەتی قاسیرەدا ئیخلاس شەرتە بۆ ئەواب و قبوولکردنی لای خواوە. بەڵام لە تاعەتی سارییەدا هەرچۆن بێ سەواب هەیە و، ئەگەر لە ڕێگەیەکەوە خاوەنەکەی سەوابی پێ نەگا، لە ڕێگەیەکی ترەوە بۆی دەنووسرێ.

ڕیوایەت کراوە دوو خەسڵەت هەن خوا لەوانە گەورەتری دروست نەکردووە: یەکەم ئیمانهێنان بە خوای گەورە. دووەم خزمەتکردنی خەڵك و سوود گەیاندن بە بەندەگانی خوای گەورە. ئێوە هەتا ئەندازەی سەوابەکەی نەزانن هەوڵی بۆ نادەن؛ جا بۆ تێگەیشتن و حاڵی بوون لە سەواب و پاداشی ئەو خزمەتانە پێویستە لەگەڵ زانایانی ئاینیدا هەڵسوکەوت بکەن تا لە ئەندازەی پاداشتی حەسەناتی ساری حاڵی ببن. هەروەها ئەگەر نامەی دۆستی خۆتانیش بخوێننەوە لە ئەندازەی پاداشی ئەم خێراتە تێ دەگەن. ئاشکرایشە

گوێڕاگرتن بۆ فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) نیشانەی ئیمانە؛ لە حەدیسا هەیە گەورەترین خووڕەوشتی چاکی موسڵمان ئەوەیە کە هەرگیز لە بیستنی خێری ئاین تێر نەبێ.

نووسەری ئەم نامە کورتە سەیید ئەحمەدی کوڕی سەیید مەعرووفی بەرزنجی دراوسێی حەرەمەینی شەریفەین عەرزی ئەو برایانە دەکا کە سەخاوەتیان هەیە و بە دەس و دەهەندەن، کە ئەو کەسانە خاوەنی بەرزترین خوون، بە تایبەتی ئەو کۆمەڵە موسڵمانانەی کە لە هیندەوە هاتوون بۆ زیارەتی حەرەمەینی شەریفەین و، ئەم نامەیەم بە تایبەتی بۆ ئەوان نووسیوە.

هۆی نووسینی ئەم نامەیە ئەوەبوو کە لەگەڵ هەندێ لەوانەدا ئاشنایەتی و برایەتیم پەیداکرد، بە تایبەتی لەگەڵ (أبو الفقراء) حاجی یووسفی سیتتیدا زۆر پێوەندیم هەبوو، هەندێکیشیان ئەگەرچی هەڵسوکەوتم لەگەڵیاندا نەبووە، بەڵام دەنگوباسی سەخاوەت و بەدەس و دەهەندەییم بیستوون.

بەڵێ لە مەدینەی مونەوەرەدا نزیکەی چوار مانگ مولاقاتم لەگەڵیاندا هەبوو، ئاگام لێیان بوو، زۆربەی کاتیان لە خزمەتکردنی هەژاران و داماوان بەسەر دەبرد. کە لە شاری مەدینەی مونەوەرەوە گەڕاینەوە بۆ مەککەی موکەرەمە بە قافڵەیەکی گەورە، ئاگام لێ بوو خزمەتی قەرەباڵغێکی گەورەیان دەکرد و نان و ناو و خواردن و پێویستییان بۆ دابین دەکردن.

جا بە پێویستم زانی ئەو نامە عەرەبییەی خۆمە کە لەمەوپێش لە بابەتی خزمەتەوە نووسیومە، بیگۆڕمە سەر زمانی فارسی تا ئەمسالی ئەو کەسانە کە ناوم هێنان تەماشای بکەن و لەسەر ئەم خزمەت و ئیحسانە نیشاتیان زۆرتر بێ.

لەپێشا ویستم حەدیسەکان بە عەرەبی بنووسمەوە و بە فارسی تەرجەمەیان بکەم؛ تا بە هەڵە و خراپ نەیانخوێننەوە. بەڵام لەبەر بێ ماوەیی هەر تەنیا حەدیسەکانم نووسییەوە و سەروبۆرم بۆ کردن تا لە خوێندنەوەیان هەڵە نەکەن. تکام وایە هەر کەس ئەم نامەیە بخوێنێتەوە و ئەو حەدیثانە بنووسێتەوە، بەوردی سەروبۆری حەدیسەکان بنووسێتەوە تا موسڵمانان بپارێزێ لە هەڵەکردن لە خوێندنەوەیانا جا هەرچەند ئەوەی کە من نووسیومە بۆ شانی زانا ئاینییەکان لایق نییە، بەڵام لەبەرئەوە کە بووە بە پاروویەکی حازر و، پێویستییان بە موراجەعەی کتێبە باوەڕپێکراوەکانی نییە، هیوادارم

جێگەیەکی گەورە بگرێ بۆیان و، چ لە سەفەرا بن و چ لە ماڵ قازانجێکی زۆری لێ وەربگرن.

جا لەبەرئەوە کە زۆربەی ژیانی ئەهلی حەرەمەین لەسەر دەوڵەمەندانی هیندستانە و، ئەم نامە فارسییەش لە دڵی ئەوانا تەئسیری هەیە، هیوادارم هەژارەکانی حەرەمەینی شەریفەین دوعای خێرم زۆر بۆ بکەن. (وسميتها بترغيب الهنود في ما تعودو من الجود، أو بشرى الإسخياء من سيد الأنبياء، صلى اللّه عليه وسلم. وأسأل اللّه تعالى المعبود أن ينفعني بها من خلقه المحمود. وهذا أوان الشروع في المقصود، وامتثالا لقول اللّه تعالى الشكور الودود: «وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى») دیار و ئاشکرایە کە تەرغیبی برادەران و هاورێیان لەسەر کردەوەی خێر، گەورەترین هاوکارییە؛ (قال اللّه تعالى: «وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ» وقال تعالى: وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ...)

برادەران! چاك تێ فکرن و بزانن کە خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا چەند بە لوتف و میهرەبانی و موجامەلە ئەمری فەرمووە دەوڵەمەندەکان چاکە لەگەڵ هەژار و داماواندا بکەن: هاتووە یەکەم جار خەڵکی دڵسارد کردووەتەوە و ئاگاداری کردوونەتەوە لە مردن و بەجێ هێشتنی دۆست و کەسوکار، واتە: بنیادەم هەرچی هەیە و نییە بەجێی دێڵێ و بێجگە کفنێ هیچ لەگەڵ خۆیدا نابا، بگرە جاری وا هەیە کفنەکەشی پێ نابرێ!

هەروەها ئینسانی حاڵی کردووە و پێی دەڵێ: ئەم دنیا و خۆشیی دنیایە کە لای تۆیە ماڵی خۆمە و بە ئەمانەت لای تۆ بەجێم هیشتووە و، حەزدەکەم وەك من بە ئیحسان ئەو ماڵەم لای تۆ داناوە، تۆیش ئیحسانی لێ بکەی بە فەقیر و هەژار و داماوان تا خۆت لە پاداشی کەموکوڕی و تاوانی دنیات ڕزگار بکەی، من بێ نیازم لە ئێوە و هەر بە میهرەبانی و بەخشندەیی خۆم، ئامۆژگاریتان دەکەم و ڕێگای خێرتان بۆ ڕوون دەکەمەوە.

دیسان فەرموویەتی: «وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ...»وە «وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ...» واتە: ئەی بەندەکانی من! سەرف بکەن لەوەی داومە پێتان و تێدا کردوو من بە جێگەداری خۆم، بەو سامان و ماڵە کە خوای گەورە پێی داوی کۆشکی نەبڕاوە و نایاب و بێ وێنە بکڕە.

خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا بەبێ تونێکڵ بەڵێنی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەو کەسانەی

ماڵی خۆیان لە ڕێگەی ئەودا سەرف دەکەن بەوە کە خانووی ڕۆژی خۆیان بەئارەزووی دڵی خۆیان وەردەگرن، بێگومان خوای گەورە بەڵێنی خۆی بەجێ دێنێ «إِنَّ اللّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ». ئەمە موژدەیەکی گەورەیە بۆ ئەو کەسانە کە دەس و دەهەندەییان هەیە و لە ڕێگای خوادا ماڵی خۆیان بەخت دەکەن، بەتایبەتی لە پێنج ئایەت لە قورئانی پیرۆزدا بەڵێنی چاکە و پاداشی خۆی داوە بە مرۆڤە بەخشندەکان: یەکەم «وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ» واتە ئەوەی لە ڕێگەی خوادا بەختی دەکەن بێگومان خوا بەدەڵەکەی دەداتەوە پێیان. دووەم «مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللّهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافاً كَثِيرَةً» واتە کێیە ئەو کەسەی کە بە قەرز ماڵی خۆی دەدا بە خوا بەشێوەی قەرزێکی پاکوخاوێن و جوانی دوور لە گومانی ناڵەبار و دوور لە پێوەندیی ناشیرین هەتا خوا جەزای ئەو قەرزەی بداتەوە بە چەند قات و چەند شێوەی زۆر. سێیەم «خذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا...» واتە ئەی پێغەمبەر سەدەقە لە ماڵی ئەو موسڵمانانە وەربگرە تا بەو خێر و سەدەقەیە نەفس و گیانیان لە چڵك و پیسیی تاوان و ئارەزووی نەفس پاك بکەیتەوە. ئەم سەدەقەیە نەك تەنیا پاکیان دەکاتەوە بەڵکو هەرچەند کەمیش بێ لای خوای گەورە زۆر دەبێ و زیاد دەکا، وەکو یەکێ بەرخێ دابەستێ و گیا و خواردنی پێ بدا و ڕۆژ بەڕۆژ بەرخەکە قەڵەو ببێ و لەشی گەورە ببێ و ببێتە بەران. بێگومان ئایەتی (وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ) کە مانای ئەوەیە خوا سەدەقە گەورە دەکا و زیادی دەکا بەئاشکرا دەلالەت لەوە دەکا کە ئێستا بەیانم کرد.

دەگێڕنەوە: حەزرەتی داوود (على نبينا وعليه السلام) لەکاتی دوعا و نزا و لە خواپاڕانەوەدا عەرزی جەنابی خوای گەورەی کرد: خوایا ترازووی تاعەت کێشانم پیشان بدە، کە پیشانی درا وا هاتە پێش چاوی ئەوەندە گەورە بوو هەموو خۆرهەڵات و خۆرنشینی تێدا جێ دەبووەوە. ئەویش عەرزی خوای کرد: خوایا! ئەم ترازوویە بەچی پڕ دەبێ؟ کێ دەتوانێ ئەوەندە تاعەت بکا ئەمانە پڕ بکا؟ خوای گەورە لە وەڵامدا فەرمووی: هەر کەسێ لەبەر ڕەزای من پاروە نان بدا بە گەدایەك و بێجگە ڕەزای من داوای هیچ نەکا، من ئەو پارووە نانەی بۆ گەورە دەکەم تا تای ئەو تەرازووە پڕ دەکا.

چوارەم ئەمین بوونە لە ترس و سامی پاشەڕۆژ. خوای گەورە فەرموویەتی: «وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَراً» واتە: گرووهی خاوەن ئاین و پارێزگارەکان تیپ تیپ و چین چین بەرەو بەهەشت ڕەوانە دەکرێن.

لە حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە ڕیوایەت کراوە، خوایان لێ ڕازی بێ، فەرموویە: لە حەزرەتم بیستووە کە فەرموویەتی: (السخاء خلق اللّه الأعظم) واتە سەخاوەت و بەخشندەیی گەورەترین خووی خوای گەورەیە و لەناو ئەو خووو ڕەوشت و بەهرانەدا کە داونی بە بەندەگانی خۆی بە گەورەبەش دەناسرێ.

ڕیوایەت کراوە: «إن للّه مائة وسبعة عشر خلقا من آتاه اللّه واحداً منها دخل الجنة»، واتە: هەرچەند سیفەتەکانی خوای گەورە بڕانەوەیان بۆ نییە بەڵام لە ڕەوشتە زۆر خۆشەویستەکانی سەد و حەڤدە خوو هەیە هەرکەسێ یەکێ لەو خووانەی دەس بکەوێ، دەچێتە بەهەشت و هەتا هەتایە تێدا دەمێنێتەوە.

هەروەها ڕیوایەت کراوە: «تخلقوا بالسخاء لأن السخاء خلق اللّه الأعظم» واتە: بەدەهەندە بن؛ چونکە بەدەهەندەیی گەورەترین خووی خوایە.

لە حەزرەتی عائیشە ڕیوایەت کراوە (ر.خ) فەرموویەتی «الجنة دار الأسخياء» واتە: بەهەشتماڵی دەهەندەدارانە.

هەروەکو ڕیوایەت کراوە: «إن اللّه أستخلص هذا الدين لنفسه، ولا يصلح لدينكم إلا السخاء وحسن الخلق ألا فزينوا بهما دينكم» واتە: خوا ئەم ئاینی ئیسلامەی نیسبەت داوە لە خۆی، ئەوەیش بەکەڵکی ئەم ئاینە بێ، سەخاوەت و خۆش خوویییە، کەواتە ئاینەکەتان بەم دوو شتە جوانە بڕازێننەوە.

هەروەها فەرموویەتی: «إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ» واتە: ئاینی ڕاست لە لای خوا ئاینی ئیسلامە، جا مادام ئاینی ڕاست لای خوا ئاینی ئیسلامە و سەخاوەتیش بەشێکە لە ئاین، پێویستە مرۆڤی موسڵمان سەخاوەت بکاتە پیشەی خۆی. کەوابێ نابێ ئیسلامەتی لەگەڵ ڕژدی و بەخیلیدا کۆببێتەوە، چونکە سیفەتی ڕژدی، کە دەبێتەوە هۆی مەنعی چاکەی ڕژدەکە لە موسڵمانان، دەبێتە هۆی مەنعی خێری خوای گەورە لە نەفسی ئەو کەسە، وەکو لە حەدیسا دەفەرموێ: «أرحموا ترحموا» واتە ڕەحم بە خەڵك بکەن تا خوا ڕەحمتان پێ بکا. پێچەوانەی فەرموودەکە ئەوەیە «إن لم ترحموا لا ترحموا» واتە: ئەگەر ڕەحم بە خەڵك نەکەن خوا ڕەحمتان پێ ناکا. لە تێکڕای فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە (د.خ) دەردەکەوێ کە ئیسلاحی دین بە سەخاوەتە و تێکچوونی بە ڕژدییە. سوێند دەخۆم مرۆڤی خاوەن دڵ و ئاگادار کە تەماشای ئینسانی چرووکی پارەپیسی بێ کەڵك بکال

ئەوەندە چڵکی مەعنەوی ئەو کابرا دێت بەڕوویدا دەڵێیت لە شوێنێکی پیسایە و هەموو ئەندامی لەشی پیس بووە و پێویستە هەموو لەشی پاك بکاتەوە.

ڕیوایەت کراوە «ما محق الأسلام محق الشح شیء» واتە: هیچ دەردێ وەك ڕژدی و بەخیلی ئیسلامەتی بێ هێز و لاواز ناکا.

هۆی ئەمەش ئەوەیە ئاین ئاساری کەرەم و سەخاوەتی خوای بەخشندە و میهرەبانە، دیارە هەر کەس قابیلییەتی سیفەتی کەرامەتی نەبێ قابیلییەتی ئاینی نابێ. هەروەها ئەو حەدیسە پیرۆزە ئەوە دەگەیێنێ کە دروستکردنی بەهەشتی پایەدار لە کەرەم و سەخاوەتی خواوەیە و شایانی ئەو کەسانەیە کە لە کەرەم و سەخاوەتدا موناسەبەیان لەگەڵ خوادا هەیە و، بەو کەسانە ڕەوا نییە کە چرووك و بێ کەرامەتن، هەروەکو لە حەدیسی قودسیدا هاتووە: «وعزتي وجلالي لا يجاورني فيك بخيل» خوای گەورە ئەم قسەی لەگەڵ بەهەشتایە، واتە: بە گەورەیی و تواناداریی خۆم سوێندبێ مرۆڤی ڕژد و چرووك لەناو تۆدا ئەی بەهەشت! دراوسێیەتی من ناکا.

دیسان حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «تصدقوا فأن الصدقة فكاككم من النار» واتە: خێر و سەدەقە بکەن، چونکە خێر و سەدەقە، بێگومان، دەبێتە هۆی ڕزگاربوونتان لە ئاگری دۆزەخ. لە ڕیوایەتێکی تردا ئەم جوملەیە لێ زیاد کردووە: «ولوا بشق تمرة» واتە: با ئەو سەدەقەیە بە لەتە خورمایەکیش بێ.

دیارە مەبەستی حەزرەت (د.خ) هاندانی ئوممەتی ئیسلامە بۆ خێرکردن و بەخشینی ماڵ بە گەدا و داماوان بەقەدەر ئیمکان تەنانەت بە لەتە خورمایەکیش بێ، چونکە ئەو کەسەی سەدەقەکردن بکاتە پیشەی خۆی لەو ماڵەدا سەرفی دەکا فەرقی کەم و زۆری لا نییە؛ دیارە فەرق بە ئیخلاسە، کە خێرکردنەکە لەگەڵ ئیخلاسا بێ، ماڵی کەم لای خوا بە زۆر حسێب دەکرێ.

ڕیوایەت کراوە لە ئەبووتەمیمەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی «لا تحقرن من المعروف شيئاً ولو إن تعطي صلة حبل أو شسع نعل، ولوا أن تفرغ من دلوك في أناء المستسقي، ولوا أن تنحي شيئاً من طريق الناس وفي ريواية: أن تنحي الأذى من الطريق، ولوا أن تلقى أخاك ووجهك اليه منطلق، ولوا أن تؤنس الوحشان، وما سر أذنك أن تسمعه فاعمل به، وما ساء اذنك إن تسمعه فأجتنبه». واتە: ئەی باوکی تەمیم هیچ خێراتێ بە

کەم دامەنێ، یا ئەو خێرە بریتیش بێ لە بستێ پەت کە بخرێتە سەر گوریسێکی کورت و کاری پێ مەیسەر ببێ، یاخۆ قەیتانێ بێ، ئەم لاو لای نەعلێ بەیەکەوە ببەستێ، یا لە ئاوی دۆڵچەکەت مێقدارێ برێژیتە ناو کاسەی کەسێ کە داوای ئاو دەکا، یا شتێ یا درکێ لە رێگای خەڵك دوور بخەیتەوە، یا بە روویەکی گەش و خۆشەوە چاوت بە برات بکەوێ، یا مرۆڤێکی خەفەتبار دڵخۆش بکەی و هاوبەشی خەمی بی. هەر واتەیێ کە حەز لە بیستنی دەکەی ئەوە بەگوێی خەڵکدا بدە. هەر شتێ کە حەز ناکەی ببیبیسی مەیدە بە گوێی خەڵکیدا.

هەروەها حەزرەت (د.خ) هاندانی لەسەر خێرات گەیاندووەتە رادەیێ فەرموویەتی : «أفعلوا المعروف إلى من هو أهله وإلى من ليس من أهله». واتە: چاکە بکە چ لەگەڵ کەسێکدا شایانی بێ و چ لەگەڵ کەسێکدا کە شایانی نەبێ؛ چونکە ئەگەر کابرا چاکە لەگەڵ کراوەکە لایقی بێ ئەوا جێی خۆیەتی، خۆ ئەگەر هەڵنەگرێ و شایانی نەبێ خاوەن چاکە بەنیازی ئیسلاح و چاککردن ئەو پیاوەتییەی لەگەڵ کردووە و چاکەکەی جێگای رەوای خۆی دەگرێ.

لە ئیمامی عەلییەوە (ر.خ) ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەرم بیستووە (د.خ) کە هۆی دواخستنی سزای فیرعەون ئەوە بووە کە زۆر سەخی بووە، ماڵی زۆری بە داماوان دەدا. تەنانەت ریوایەت کراوە کە چوار هەزار میوانخانەی هەبووە، بەڵام کاتێ حەزرەتی مووسا (د.خ) موعجیزە گەورەکانی نیشان دا، فیرعەون جادووکەرەکانی کۆکردەوە، لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا، وەك قورئان دەفەرموێ: «فَحَشَرَ فَنَادَى[٢٣] فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى» واتە: خەڵکی کۆکردەوە و بانگی کردن وتی: من خوای بەرز و بالای ئێوەم. لەپاش ماوەیێکی تریش وتی: «مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي» ئینجا خوای گەورە هەقی ئەوەڵ و ئاخیری لی سەند، وەکو دەفەرموی: «فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَى».

ریوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «رأس العقل بعد الإيمان التودد إلى الناس وأصطناع المعروف إلى كل بر وفاجر» واتە: سەری هوشیاری و تێگەیشتن، پاش ئیمان بە خوای گەورە و پێغەمبەری خوا، ئەوەیە کە ئینسان مەحەبەت و خۆشەویستی لەگەڵ مرۆڤدا هەبێ، هەروەها چاکەکردن بەدەم و بەدەست، بە گوفتار و بە رەفتار لەگەڵ هەموو مرۆڤدا چاك و خراپ، هەرکام لەمانە بەگوێرەی شان و حاڵی خۆی و بەجۆرێ لە سنووری یاسای ئیسلام دەرنەچێ و نەرواتە سەر رێگای پێچەوانەی ئاین.

وعنه، رضي اللّه عنه «أحب الأعمال ثلاثة: مواساة الأخ بالمال، وانصاف المؤمن نفسه، وذكر اللّه على كل حال». واته: خۆشەویستترین کردەوەی ئینسان سێ شتەن. یەکەم: بریتییە لە یارمەتیی برای ئاینی بە ماڵ، بەخۆڕایی وەکو سەدەقە و بەخشین یا قەرزی بێ ڕیبا. دووەم: چۆن عەدالەت و ڕاستکاریی دەوێ لە خەڵك، وەها داوای ئەو عەدالەت و ڕاستکارییەیش لە خۆی بکا. سێیەم: ئەوەیە بەدەم و بەدڵ لە هەموو حاڵێکدا ئاگای لە زیکری خوای گەورە بێ. چ زیکری واجیب و چ هی سوننەت.

وعن أنس، رضي اللّه عنه «أنه ينادي المنادي: أين فقراء أمة محمد؟ قوموا وتصفحوا صفوف أهل القيامة إلى من أطعمكم أكلة أو سقاكم شربة أو كساكم خلقة فخذوا بيده وأدخلوا الجنة، فترى الصاحب قد تعلق بصاحبه وهو يقول يارب هذا أشبعني ويقول الآخر يارب هذا أرواني، فلا يبقى من أمة محمد صغير ممن فعل ذلك ولا كبير ألا أدخلهم الجنة جميعا».

واته لە ڕۆژی قیامەتا جارکێش جار دەدا و دەڵێ کوان هەژارەکانی موسڵمانانی ئوممەتی محەمەد (د.خ)؟ با دەرکەون و ڕاستەوە بن بڕۆن بگەڕێن بەناو ڕیزی ئەهلی قیامەتدا، ئەو کەسانە بدۆزنەوە کە لە دنیادا پارووە نانێ یا قومە ئاوێکیان دەرخوارد داون یا پۆشاکە شڕەیەکیان لەبەر کردوون، دەستیان بگرن و بیانبەن بۆ بەهەشت. جا لەوێدا تەماشا دەکەی هاوڕێ باوەشی بە هاوڕێی خۆیدا کردووە و دەڵێ خوایا ئەم مرۆڤە تێری کردووم لە نان و ئەم مرۆڤە تێراوی کردووم.

پوختەی قسە لە ئوممەتی پێغەمبەرا (د.خ) نە بچووك و نە گەورە نامێنێ، لەوانە کە خێریان کردووە و خێرەکەیان لێ قبوول کراوە، ئیللا دەڕۆنە بەهەشت لە پاداشی کردەوەکانیاندا.

براکان! قبووڵکردنی ئەم خێراتە لە کەرەمی خوای گەورەیە، کە بە میهرەبانیی خۆی ئەو چاکە و پیاوەتییەی بۆ حسێب دەکا. بەڵام بەپێی شەرع پێویستە ئینسان ئەو چاکەیە و ئەو خێرە لەبەر خوا بکدا نەك بۆ ڕیا و پێش چاوخستنی خەڵك. هەروەها نابێ بەو کردەوە لە خۆی بایی ببێ و خۆی لێ بگۆڕێ و خۆی بە پیاوچاك بزانێ!. پێویستە لە کاتێکدا ئەو خێرە دەکا، وەك هیوای ئەوەی هەیە کە خوای گەورە لێی قبووڵ بکا، ترسی ئەوەیشی هەبێ کە لێی قبووڵ نەکا و ڕەدی بکاتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: «وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ

مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ أُوْلَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ». واته: ئەو كەسانەی كە ماڵی پاكی خۆيان لە ڕێگەی خوای گەورەدا بە هەژاران دەدەن و لە هەمان كاتدا دڵەلەرزەيانە نەبادە خێرەكەيان لێ قبووڵ نەكرێ و، دڵنيدا لەوە كە دوايی دەگەڕێنەوە بۆ حضوری خوا، ئەوانە كەسانكن پەلە پەل دەكەن و لە خێراتدا پێش دەكەون و دەيانەوێ زووتر دەسی خۆيان بوەشێنن و يارمەتيی هەژاران بدەن.

لە حەزرەتی عايشەوە (د.خ) ڕيوايەت كراوە فەرموويەتی: كە پرسياريان كرد لە مانای ئايەتی «وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ» حەزرەت (د.خ) فەرمووی ئەوانە ئەو جۆرە كەسانەن كە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبن لە ماڵی خۆيان خێر دەكەن و ترسيشيان هەيە كە خوا ئەو خێراتەيان لێ قبووڵ نەكا.

هەروەها ئەو كۆمەڵەيە كاتێ دەچنە بەهەشت كە لەكاتی سەرەمەرگدا بە ئاخر شەڕی نەمرن، واتە: لە كاتی گيانەلآدا ئيمانيان لێ نەسەنرێتەوە (والعياذ بالله)، ياخۆ لەپاش ئەو چاكانە كە دەكەن ئەوەندە كردەوەی ناشەرعی نەكەن كە نيشانەكانی ئەو خێرە پێشووانە لەناوبەرێ.

پوختەی قسە: هەر كەس لەسەر سەخاوەت و بەخشينی ماڵی خۆی لە ڕێگەی خوادا بەردەوام بێ «ئەگەر هەندێكيشيانی لێ قبووڵ نەكرێ، ئومێد وايە هەندێكی تريانی لێ قبووڵ بكرێ؛ چونكە دوورە لە حاڵەتی موسڵمان لە سەرفی ماڵی خۆيدا ئيخلاسی بۆ خوای گەورە نەبێ، هەروەكو دوورە لە كەرەمی خواوە جەزای چاكەی عەبدی خۆی نەداتەوە لەگەڵ ئەوەشدا كە بەڵێنی بە پاداشی چاكە داوە.

لە عەبدوڵڵای كوڕی حەزرەتی عومەرەوە دەگێڕنەوە، خوايان لێ ڕازی بێ، كە فەرموويەتی: سەيرە ئەو موسڵمانانە بەندە بە پارە دەكڕن و ئازادی دەكەن كەچی بە هێزی پياوەتی و چاكەكردن مرۆڤی ئازاد ناكڕن؛ چونكە مەشهوورە (الإنسان عبد الإحسان) واتە ئينسان بەندەی چاكە و پياوەتييەو، لەگەڵ هەر كەسێكيا پياوەتی بكەی، دەيكەی بە بەندەی خۆت.

لە ئەبوو هورەيرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) كە حەزرەت فەرموويەتی «السخي قريب من الله وقريب من الجنة وقريب من الناس وبعيد من النار، والبخيل بعيد من الله وبعيد من الناس وبعيد من الجنة وقريب من النار. والجاهل السخي أحب إلى الله من العباد

البخيل». واتە: مرۆڤی بەدەس و دەهەندە لە خواوە نزیکە، لە بەهەشتەوە نزیکە، لە خەڵکەوە نزیکە و، دوورە لە ئاگری دۆزەخ. بەڵام ئینسانی ڕژد و دەس نووقاوی بێ دەهەندە لە خواوە دوورە، لە بەهەشتەوە دوورە، لە خەڵکەوە دوورە و، لە ئاگری دۆزەخەوە نزیکە.

دەگێڕنەوە یەکێ لە ڕەهبەرەکان لە ئیبلیسی پرسی: خۆشەویسترین کەس لای تۆ کێیە؟ لە وەڵامدا وتی: مرۆڤێکی عابیدە کە ڕژد و بەخیل بێ، ئەمجارە لێی پرسی: ئەی کام کەس لات ناخۆشەویسترە؟ وتی فاسقێ کە بەدەس و دەهەندە بێ. پرسی لەبەر چی؟ وتی: چونکە هیوادارنیم کە خوا عابیدی بەخیل عەفوو بکا، بەڵام هیوام زۆرە کە فاسقی بەدەس و دەهەندە عەفوو بکا، کەوابێ یەکەم هاوڕێی منە و دووەم لە منەوە دوورە.

عەبدوڵڵای مەزەنی دەگێڕێتەوە کە خوای گەورە وەحیی کردووە بۆلای هەندێ لە بەندە خۆشەویستەکانی لە ڕەهبەران فەرموویەتی: بە عیزەت و جەلالی خۆم هیچ شتێکم دروست نەکردووە لام خۆشەویستتر بێ لە ئیحسان و چاکە و پیاوەتی و، هەر کەسێکت چاوپێ کەوت کە چاکە و پیاوەتیم لا جوان کردبێ و چاکە و پیاوەتی لەگەڵ خەڵکدابکا و حەزیان لێ بکا، ئەوە بزانە کە من خۆشم دەوێ و هەمیشە بەچاوی کەرەم و میهرەبانی تەماشای دەکەم. هەروەها هەر کەسێکت دی کە پیاوەتی و چاکەم لەبەرچاوییا ناشیرین کردبێ و حەزیان لێ نەکا و بەخراپی بۆیان بڕوانێ و ڕقی لێیان بێ، ئەوە بزانە کە من خۆشم ناوێ و بە چاوی خۆشەویستییەوە بۆی ناڕوانم.

لە جابیرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «ألا أخبركم بمن تحرم عليه النار غداً: كل هين لين قريب سهل». واتە: ئایا ناتانەوێ پێتان بڵێم کێ لە قیامەتدا ئاگری دۆزەخی لێ حەرامە؟ ئەوە کەسێکە کە ئاسانکار و نەرم وتار و ئارام بێ لەگەڵ ئادەمیزادا، واتە واتەی نابار و کردەوەی ناشیرین نەبێ.

لە عومەری کوڕی خەتتابەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە خوای گەورە جیبرەئیلی نارد بۆ لای حەزرەتی ئیبراهیم (ر.خ) کە پێی بڵێ خوای گەورە دەفەرموێ من لەبەرئەوە کردوومە بە خەلیل و دۆستی تایبەتیی خۆم چونکە لە دڵی ئاگادارم و دەزانم دڵی لە دڵی هەموو موسڵمانەکان سەخیترە.

دەگێڕنەوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أقيلوامن السخي زلته فأن الله آخذ بيده كلما عثر» واتە: لە هەڵەی ئینسانی بەدەس و دەهەندە ببوورن و چاوپۆشی لێ بکەن چونکە

هەر کاتێ هەڵبخلیسکێ و لەوانەبێ بکەوێ خوای گەورە دەستی دەگرێ ، دەیپارێزێ و نایەڵێ بکەوێ.

لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێرنەوە (ر.خ) سەخاوەت دارێکە لە بەهەشتدا هەر کەس سەخی بێ، لقێ لەو دارەی دەکەوێتە دەست بەری نادا تا دەگاتە بەهەشت. بەخیلی و ڕژدیش دارێکە لە دۆزەخدا هەرکەس ڕژد بێ لقێ لەو دارەی دەکەوێتە دەست بەری نادا تا دەگاتە دۆزەخ.

هەروەها ڕیوایەت کراوە لە ئەبوو هورەیرەوە کە حەزرەت (ر.خ) فەرموویەتی: «ألا أن كل جواد في الجنة حتم من اللّه وأنا به كفيل». واتە: بەڕاستی هەموو خاوەن سەخاوەتێ وا لە بەهەشتدا، ئەمە لە لایەن خواوە واجیب کراوە و من کەفیلم لە سەری. جا کە حەزرەت (د.خ) کەفیل بێ بێگومان ئەو کەسە دەڕواتە بەهەشت.

لە حەزرەتی عەلییەوە دەگێرنەوە (کرم اللّه وجهه) کە خوای گەورە سیفەتی چاکەکردنی دروست کردووە و چەند ئادەمیزادێکی بۆ دروست کردووە و خۆشەویستی کردووە لایان و، سیفەتی پیاوەتی وەکو ئاوی ڕەوان ئاسان کردووە بۆیان و چۆن بۆ هەر زەوییەکی نەوی ڕەوانە بکرێ دەڕوا بەو جۆرە ئەم کەسانە پیاوەتی ئاسانە بۆیان و، هەروەك وڵاتی وشك و برنگ بە ئاو دەژیێتەوە، بەو چەشنە ئینسانی داماو و بێدەسەڵات و بێ دەرامەد بە پیاوەتیی ئەم ئینسانە بەدەسودەهەندانە دەبووژێنەوە.

ئاگاداربن! ئەهلی چاکە و پیاوەتی هەروەك لە دنیادا دیارن لە قیامەتیشا وەها دیار و سەربەرز و بە شان و شکۆن.

هەروەها پیاوەتی لەبەرچاوی هەندێ کەس ناشیرین کراوە و ئەوانە بوونەتە دوژمنی و نایانەوێ بیکەن و مەمنووع کراوە لێیان، وەك چۆن باران لە ساڵە قاتییا لە هەندێ زەوی مەنع دەکرێ. دیارە مەبەس ئەوەیە ئەو مرۆڤە بێ کەڵکانە بەفەتەرات بچن، وەك چۆن زەوی بێ ئاو و باران بێ بەر و بێ خێر دەبێ. دیارە ئەگەر خوای گەورە چاوپۆشی لەو کەسانە نەکا وڵاتەکەیان بەجارێ لەبەر شوومی و نەگبەتی و دڵڕەشیی ئەو ڕژدانە لەناودەچێ. لە ڕاستیدا گەلێ بەڵاو موسیبەتی ڕووی زەوی و بێ بارانی و دەردی کشتوکاڵ و بەپیت و بەرەکەتیی بەش و بارەی باغات و حەیوانات لەبێ بەزەییەتیی خەڵکەوە پەیدا دەبێ، بە تایبەتی لە زەکات نەدان و یارمەتی نەدانی یەکترییەوە، بەڵام خوای گەورە هەمیشە چاوپۆشی دەکا وەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ «وَلَوْ يُؤَاخِذُ

اللّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ» بەڵێ ئێستە گەلێ نەخۆشی و بەڵای مسیبەت لە هەندێ شوێندا و لە هەندێ کەسدا دەبینرێ، پەنا بە خوا لەم جۆرە کارەساتانە.

لەو فەرموودەی پێغەمبەرەوە (د.خ) کە فەرموویەتی خەڵکی بەدەس و دەهەندە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەهلی چاکەن، دەردەکەوێ ئەوانە کە بەدەس و دەهەندە نین و بێ بەزەیی و نامیهرەبانن لە ڕۆی قیامەتا بە ئەهلی چاکە حسێب ناکرێن و لە پاشەڕۆژدا بێ قەدر و بێ قیامەت و بێ پایە و مایەن.

ڕیوایەت کراوە: «أکثروا من الأخوان فأن لکل مؤمن شفاعة یوم القیامة» واتە: برادەری زۆر بگرن لە موسڵمانان، چونکە هەموو موسڵمانێ لە ڕۆژی قیامەتدا تکا و ڕجای هەیە بۆ تاوانباران. کەواتە ئەو قسە کە لەناو هەرەمەی خەڵقدا مەشهوورە و دەڵێن «دنیا بۆ دنیایە ئەگەر نا لە قیامەتدا کەس تکا بۆ کەس ناکا» درۆیە و قسەیەکی ناجۆرە و لەگەڵ حەدیسی پێغەمبەرا ناگونجێ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) «إن للمساکین دولة عند اللّه، فأذا کان یوم القیامة قیل لهم أنظروا من أطعمکم في اللّه لقمة أو کساکم ثوبا أو سقاکم شربة فأدخلوه الجنة».

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هەژارانی موسڵمان لە پاداشتی ئیمان و خۆگری و ڕاساڵیی دنیایان شان و پایەیەکی تایبەتییان هەیە و بانگیان لێ دەکرێ و پێیان دەوترێ: بڕوانن بەناو خەڵکدا بزانن کێ دەناسنەوە لەوانەی لە دنیادا پاروو نانێکیان پێ داون یا پارچە جلێکیان لەبەر کردوون یا قومە ئاوێکیان داونەتێ، پەلیان بگرن و بیانبەنە بەهەشت.

برادەرینە! لەم فەرموودە و فەرموودەی پێشووەوە بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێ کە بەختیاری و سەربەرزی بۆ ئەوانەیە کە لە دنیادا خزمەتی خەڵکیان کردووە و یارمەتیی هەژاران و داماوانیان داوە، ئەمانە لە ڕۆژی قیامەتدا هەژارە موسڵمانەکان بە ئەمری خوای گەورە دەستیان دەگرن و بە قەدر و عیزەت و حورمەتەوە دەیانبەنە بەهەشتی ئەبەدی.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: «وَمَن یُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ». واتە: ئەو کەسانەی لە پەستی و ڕژدیی نەفسیی خۆیان پارێزراون، ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕزگاربوون و بە مەرام گەیشتوون.

دیاره لە مەفهوومی موخالەفەی ئەم ئایەتەوە دەردەکەوێ ئەوانەی کە ڕژد و دەس نووقاو و پەستن لە سزای ڕۆژی قیامەت ڕزگار نابن.

لە ئەبولدەردائەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «ألا أخبركم بأهل النار؟ كل جعظري مستكبر جماع منوع» واتە: دەتانەوێ پێتان بڵێم لە ڕۆژی قیامەتدا کێ ئەهلی ئاگری دۆزەخە؟ ئەوانەی کە خاوەن فیز و دەمارن و بێ بەزەیی و نامیهرەبانن و ماڵی زۆر کۆدەکەنەوە و بەشی داماوانی لێ نادەن.

لە مەعاذی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی «ألا أنبئكم بشر الناس؟ من أكل وحده ومنع رنده وضرب عبده. ألا أنبئكم بشر من ذلك؟ من يبغض الناس ويبغضونه» واتە: پێتان نەڵێم کە خراپترین کەس کێیە؟ ئەوەیە کە خوا پارووبە نانی دایە بەتەنیا بیخوا و خێر و خۆشیی خۆی لە خەڵك مەنع بکا و ئازاری بەندەی ژێردەستی بدا. ناتانەوێ لەمەیش خراپترتان پێ بڵێم؟ ئەو کەسەیە لەبەر بەدخوویی ڕقی لە خەڵك بێ و ئەوانیش ڕقیان لەو بێ.

لە ڕاستیدا مرۆڤی بەدەس و دەهەندە خەڵکی خۆش دەوێ و خەڵکیش ئەویان خۆش دەوێ، وەك مەشهوورە «الحب من الجانبين والبغض هكذا» واتە: خۆشەویستی لە دوو لاوە دەبێ و ڕقیش هەروەها. واتە: هەرکەس بە ڕەوشت باشی خەڵکی خۆش بوێ خەڵکیش لەبەرئەو ڕەوشت باشییە ئەویان خۆش دەوێ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «إن الصدقة لا تزيد المال إلا كثرة» واتە: خێراتکردن و سەدەقەکردن هەر ماڵەکە زۆر دەکا؛ چونکە بەهۆی ئەو خێرە خوای گەورە ئەو خاوەن ماڵەی خۆش دەوێ و نیعمەتەکەی بۆ زۆر دەکا. هەروەها بەهۆی خێرکردنەوە خەڵکی دوعای زۆری بۆ دەکەن و خوای گەورە دوعاکەیان قبووڵ دەکا و ئەو خێرۆمەندە دەوڵەمەند دەکا و بەرەکەت دەخاتە ماڵەکەی.

ئەبوو هورەیرە (ر.خ) دەگێڕێتەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أن ملكاً بباب من أبواب الجنة يقول كل يوم: من يقرض اليوم يجز به غداً. وملكا ببان آخر يقول: أللهم أعط منفقا خلفا وأعط ممسكا تلفاً.» واتە: لە یەکێ لە دەرگاکانی بەهەشتدا مەلائیکەیەك هەموو ڕۆژێ بانگەواز دەکا و دەڵێ: هەر کەس ئیمڕۆ قەرز بە خوای گەورە بدا سبەینێ خوا جەزای دەداتەوە، لە دەرگایەکی تریشەوە مەلائیکەیەکی تر لە خوا دەپاڕێتەوە دەڵێ: خوایا ئەوەی لە ڕێگەی تۆدا ماڵی خۆی بە داماوان دەبەخشی، بۆی پڕ بکەرەوە و پاداشی

بدەرەوە و، ئەویش بەشی کەس نادا ماڵی بفەوتێنە. دیارە دوعای مەلائیکە گیرایە و خوای گەورە زوو قبووڵی دەکا.

ئەگەر یەکێکتان دی کە خزمەتی خەڵکی دەکرد و ماڵی دەفەوتا و زیانی لێ دەکەوت، ئەوە یا تاقیکردنەوەیەکە لای خواوە بۆی یاخۆ لە نییەتی ئەو خێر و چاکەدا کە کردوویە غەش بووە ئەگەرنا خوای گەورە بەڵێنی خۆی بەجێ دەهێنێ.

هەروەها ئەگەر یەکێکتان دی کە ڕژد و بەخیلە و لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەمەند و خاوەن پایە و دەسەڵاتە، ئەوە بزانن ئیستیدراجە، واتە: خوای گەورە بەو نیازە ئەو ماڵ و سامانەی پێ داوە کە زوو بەزوو لێی بسێنێتەوە یا بەرزی دەکاتەوە هەتا لەپڕ بیدا بەعەرزدا یا ئەو کەسە لەو ماڵ و سامان و پایەیە ناحەسێتەوە بە دەلیلی حەدیسێکی پێغەمبەر (د.خ) کە فەرموویەتی: «واذا کان همه الدنیا أفشی اللّه، سبحانه، علیه نعمه وجعل الفقر بین عینیه». واتە: ئەگەر یەکێ هیممەت و مەبەستی هەر بۆ دنیا بێ و ئەوە خوای گەورە نیعمەتی زۆر دەکا، بەڵام فەقیری دەخاتە پێش چاوی بەجۆرێ لەو ماڵ و سامانەی لەزەت نەبینێ و ئیستیراحەتی لێ نەکا.

شێخ ئیبنو حەجەر دەفەرمووێ: دەوڵەمەندیی ئینسانی دەست نووقاو و پارە پیس، نیشانەی نەگبەتییەتی و هۆی غەزەب لێگرتنی خوایە بۆ ئەو کەسە، ئەگەر نا بەو سامانە کارێکی خێری دەکرد!

لە جابیرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە وتوویە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «کل نفقه أنفقها المسلم فعلی اللّه خلفها واللّه ضامن إلا نفقة في بنیان أو معصیة». واتە: هەر مەسرەفێ موسڵمان بیکا، خوای گەورە بڕیاری داوە تۆڵەی باشی بداتەوە و شوێنی بۆ پڕ بکاتەوە، مەگەر مەسرەفێ کە لە دروستکردنی خانووی زیاد لە پێویستدا کرابێ یا لە گوناهـ و نافەرمانیی خوادا کرابێ.

جا ئەگەر یەکێ مەسرەفێکی کرد و لە ڕێگای خوادا و بەشوێن ئەو چاکەدا پاداشی چاکی نەدی با پەلە نەکا؛ بێگومان پاداشەکەی پێ دەگا. بەڵام یەکێ بۆ ڕیا و فەخر ماڵی خۆی سەرف کرد، ئەوە مەگەر خوای گەورە لێی خۆش بێ، ئەگەر نا یا لە دنیادا یا لە قیامەتدا تووشی زیان دەبێ.

«وعن أبي ذر، رضي اللّه عنه، أن المکثرین هم المقلون یوم القیامة، إلا من أعطاه اللّه

خيراً فنفخ فيه يمينه وشماله وبين يديه ووراءه وعمل فيه خيراً»

واته: ئەو کەسانەی کە هەر ماڵی دنیا زۆر دەکەن و هەمیشە هەوڵ دەدەن کۆی بکەنەوە و لە ڕێگەی خوادا بەختی ناکەن ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا نەدارن و پاداشیان کەمە، مەگەر ئەوانە کە خوای گەورە دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە ئەوانیش چاکی مەردایەتی لێ دەکەن بەلادا و لێی دەبەخشنەوە و لە ڕێگەی خوادا بەڕاست و چەپدا و لە هەموو لایەکەوە دەستگرۆیی هەژاران و داماوان دەکەن، یا کارێکی چاکی نەبڕاوەی پێ دروست دەکەن.

«عن واثلة، رضی اللّه تعالی عنه، أول من يلحقني من أهل بيتي أنت يا فاطمة، وآول من أشفع له من أمتي أهل المدينة وأهل مكة وأهل الطائف، وأول من يلحقني من أزواجي زينب وهي أطولكن يداً».

واتە: لە کۆمەڵی خانەدانی من یەکەم کەس بمگاتێ لە ڕۆژی قیامەتدا تۆی ئەی فاتیمە! یەکەم کۆمەڵ کە تکایان بۆ بکەم ئەهلی مەککە و مەدینە و تائیفە. لە ژنەکانیشم یەکەم کەس بمگاتێ لە ڕۆژی قیامەتدا زەینەبە؛ ئەو لە هەمووتان بەدەس و دەهەندەترە. دیارە کە لە باسی حەزرەتی زینەبی حەرەمیدا فەرمووی «وهی أطولکن یداً» واتە: لەبەرئەوەی لەپێش هەموو حەرەمەکانی ترمدا پێم دەگات؛ چونکە بەخششی زۆرە بۆ خەڵکی، نەك لەبەر زیادە گەورەیی بەسەر حەرەمەکانی تریدا، چونکە بە ئیتیفاقی هەموو حەزرەتی خەدیجە (ر.خ) لە هەموو ژنانی جیهان گەورەترە لە حەزرەتی مەریەمی کچی عیمرانی دایکی حەزرەتی عیسا نەبێ (د.خ) کە خیلافێ هەیە لەوەدا. پاش حەزرەتی خەدیجە گەورەترین ئافرەتی جیهان عائیشەی حەرەمی حەزرەتە، خوا لە خۆی و سیدیقی باوکی ڕازی بێ. پوختەی قسە حەزرەتی زەینەب (ر.خ) لەبەر سەخاوەت و بەدەهەنەیییەکەیەتی کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەپێش هەموو کەسێکدا بە خزمەتی حەزرەت (د.خ) دەگا و لە ترس و بیمی ئەو ڕۆژە ڕزگار دەبێ.

هەروەها لەسەر ئەم قیاسە دەردەکەوێ هەر کەس لە موسڵمانان لە دنیادا بەخششی زۆر بووبێ و خاوەن نان و ئاو و بەرچاو فراوان و بەدەسودەهەنە بووبێ لە ڕۆژی قیامەتا لەپێش خەڵکی تردا بە خزمەتی حەزرەت دەگا (د.خ).

خزمەتکردنی موسڵمانان زۆر بەسوودە بۆ ڕزگاربوون لە ئازاری ڕۆژی قیامەت. دیارە

ئازاری قیامەت ئەوەندە گران و بەئەرکە تەنانەت پێغەمبەران (د.خ) لەو ڕۆژە پڕ ترسەدا «نفسي نفسي»یانە؛ جا لە جێگایەك ئەوان بەو پایە بەرزەوە حاڵیان وەهابێ، دەبێ باقیی خەڵکی تر حاڵیان چۆن بێ؟! ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە خوای گەورە لەبارەیەوە فەرموویەتی «كَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْماً يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيباً». واتە: ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکە لەوانەیە منداڵ و بێگوناهان لە ترسی یاخۆ لە درێژی ئەو ڕۆژە پیر ببن. جا بزانن مادام خزمەتکردن بە موسڵمانان ئەوەندە بەسوودبێ، پێویستە ئینسان لە خزمەتکردن دەسبەردار نەبێ.

زانا گەورەکانی ئاینی ئیسلام فەرموویانە: گەورەترین هۆی ڕزگاری ئینسان لە سزای قیامەت چوار شتە، یەکەم خۆ لە گوناهـ پاراستن. دووەم چارکردنی ناساغیی دەروون، واتە دووری لە کینە و حەسوودی و خۆ بەباش زانین و بەدگومانی بە خەڵك و وێنەی ئەمانە. سێیەم ڕازیکردنی دڵی موبارەکی حەزرەت (د.خ) بەهۆی سەلەوات بۆ لێدانی. چوارەم خزمەتکردنی ئینسان، لەسەر ئەو ڕێوشوێنەی ئیسلام دای ناوە، بەهەرجۆرێ کە لە توانادا بێ؛ بۆ نموونە: کەسێ لە کارێکدا ناشارەزا بێ و تۆ شارەزای بکەی. یا دوو کەس دوو کۆمەڵ لەیەك عاجز بن و تۆ تێ بکۆشی و هەوڵ بدەی ئاشتیان بکەیتەوە. یەکێ نزیك بێ، گیرۆدەی زیانێ ببێ و تۆ ڕزگاری بکەی. یەکێ بێدەست بێ و تۆ دەستگرۆیی بکەی و یارمەتیی بدەی. بە تایبەتی ماڵ بەختکردن لە ڕێگەی خوادا دەبێتە گەورەترین هۆی ڕزگاریی ئینسان.

لە حەدیسایە کە هۆی گەورەتر لەم چوار شتە نییە بۆ ڕزگاری، مەگەر دەوامکردن لەسەر ذکری (لا اله الا اللّه) بە زمان و بەدڵ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە، خوایان لێ ڕازی بێ، «إن العبد آخذ من اللّه أدباً حسناً أذا وسع عليه وسع» واتە: ئەو بەندەی کە خوای گەورە دەرووی لێ کردەوە و نیعمەتی بەسەردا ڕژاند ئەگەر بەخشندە و بەدەس و دەهەندە بوو، ئەوە لە خوای خۆیەوە فێری ڕەوشتێکی جوان بووە؛ خوا دەرووی لەو کردووتەوە و ئەویش دەرووی لە خەڵك. بێگومان لەم حەدیسەوە تێ دەگەین هەر کەس دەستی بڕوا و خوا دەرگای ڕۆزی لێ بکاتەوە، پێویستە بەقەدەر ئەو دەسەڵاتە میوانداری بکا و دەستگرۆیی هەژاران و داماوان بکا و پێوەندیی خوێشایەتی و خزمایەتی بەجێ بێنێ. هەروەها بۆ ماڵ و منداڵی خۆیشی باش بێ و هەرگیز ماوەی ئەوە نەدا کە ژیانیان لێ تەنگ و تاڵ بکات.

یا ئەگەر لێقەوماوێکی بینی، بە تایبەتی لە ئەولادی پێغەمبەر (د.خ) یا عولەمای ئاین یا خانەدانێکی لێکەوتوو یا مرۆڤێکی باشی دیندار ئەوە زۆر بەجێیە خزمەتیان بکا. لە حەدیسی پیرۆزایە: تەعامی خۆتان بدەن بە ئەهلی تەقوا و خواپەرست، واتە خزمەتی ئەمانە خێری زۆرترە.

لە حەزرەتی عەلییەوە دەگێڕنەوە (کرم اللّه وجهه) کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «من صنع إلى أهل بيتي يداً كافأته يوم القيامة».

واتە: کەسێ لەگەڵ یەکێ لە ئەهل و بەیتی مندا چاکەیێ بکا پاداشی دەدەمەوە و منیش لە ڕۆژی قیامەتدا چاکەی لەگەڵ دەکەم. دیارە لەم چاکە و پاداشەدا تەماشای پایەی ئەو کەسە دەکرێ کە لەسەر بناغەی عەلاقەیەتی بە حەزرەتەوە (د.خ). بێگومان عالمیش بێ و لە خواترسیش بێ ،ئەوە بەشێوەی بەرزتر شایانی خزمەتکردن و ڕێزلێگرتنە، چونکە چەند هۆیەکی ڕێز و قەدرگرتن و خزمەتکردنی تیا کۆبوونەتەوە.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أكثروا من الأخوان فأن لكل مؤمن شفاعة يوم القيامة» واتە: بەهۆی چاکەوە برا و برادەری زۆر بۆ خۆتان پەیدا بکەن، چونکە هەموو موسڵمانێکی بەڕاستی موسڵمان پایەیەکی تکاکردنی هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا.

هەر کەس دەیەوێ بەدرێژی ئەم باسە بزانێ با بڕوا سەیری کتێبی (توثيق العرى)ی تەئلیفی (قاضي القضاة)ی بارزی بەسری و تەئلیفەکانی (أبن الجوزی) یا سەواعیقی ئیبنو حەجەر بکا تا ئەم باسە بەتەواوی وەربگرێ و بەرچاوی بەجوانی ڕووناك بێتەوە.

لە حەزرەتی ئەنەسەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «إن مفاتيح الرزق منوطة إلى العرش فينزل اللّه تعالى للناس، رزاقهم على قدر نفقاتهم فمن كثر كثر له ومن قلل قلل له».

واتە: کلیلی ڕزق و ڕۆزیی جیهان بە عەرشدا هەڵواسراوە و، خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیی هەموو ئینسان بەگوێرەی خەرج و سەرفیان، دەنێرێتە خوارەوە. جا هەر کەسێ دەستی بکاتەوە بۆ خێرات لەگەڵ موستەحەق و میواندا و، لەگەڵ پەککەوتە و داماواندا، یا بۆ مزگەوت و مەدرەسە و شوێنی قازانجی ئاینیی موسڵمانان، یا بۆ خێزان و ماڵ و منداڵی خۆی ئەوە خوای گەورە دەرگای ڕزق و ڕۆزیی بەفراوانی بۆ دەکاتەوە. هەر کەسێکیش دەست بکا بە کەمکردنەوەی بەشی بەشداران و ژن و منداڵان، ئەوە خوای گەورە بەشە ڕزق

و ڕۆزییەکەی کەم دەکاتەوە، واتە یا ماڵی پێ نادا، یا ئەگەر پێی بدا، نایکا بە نسیبی و بێ سوود و بەرباد دەبێ، پەنا بە خوای گەورە.

«وعن بديل، رضي اللّه عنه، لأن أطعم أخاً في اللّه مسلماً لقمة أحب إلي من أن أتصدق على مسكين بدرهم. ولأن اعطي أخاً في اللّه مسلماً درهماً أحب إلى من أن أتصدق على مسكين بعشرة دراهم، ولأن أعطيه عشرة أحب إلي من أعتق رقبة».

واتە: لە بەدیلەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ئەگەر پاروویێ نان بدەم بە برایەکی ئاینی خاوەن تەقوام، لام باشترە لەوە کە درەمێ بدەمە گەدایەکی عادەتی کە ئەهلی تەقوا نەبێ و، ئەگەر درەمێ بە برایەکی ئاینیم بدەم، لام باشترە لەوە کە دە درەم بدەمە گەدایەکی عادەتی کە ئەهلی تەقوا نەبێ و، ئەگەر دە درەم بە برایەکی ئاینی لە خوا ترس بدەم لام باشترە لەوە کە بەندەیێ ئازاد بکەم.

بەکورتی خێر هەر خێرە، بەڵام هەتا خێر بە کەسێك بێ کە شەخسیيەتێکی ئاینی و سوودێکی کۆمەڵایەتی و ئاینیی هەبێ باشترە و بەجێترە لە خێر بە کەسێ کە وەها نەبێ، بە تایبەتی ئەگەر ئەو کەسانە بەکاربن بۆ چاککردنی ئەخلاق و خووورەوشتی گشتی. (اللهم أجعلنا من المحبين في اللّه لأهل دين اللّه ولآل بيت رسول اللّه، صلى اللّه عليه وسلم، آمين).

ئەی برادەرانی ئاینی! ئەو دەوڵەمەندانە کە بێ تاعەت و بێ عیبادەتن و بەهۆی خزمەتکردنی موسڵمانی پایەدارەوە خوای گەورە ئیرشادیان دەکا بۆ بەختیاری. خوای گەورە حیکمەتێکی دامەزراوی هەیە لەوەدا کە ڕزق و ڕۆزیی هەندێ کەس زۆر دەکا و هی هەندێ کەس کەم، نەك لەبەرئەوە کە زویرە لە هەژار و حەزی لێ ناکا یا دەوڵەمەندی خۆش دەوێ. سیری قەزا و قەدەر لەلای عیلمی خوایە. کەوابێ هەق نییە ئینسانی هەژار و بێ دەرامەد ناشوکر بێ، هەروەها حەقیش نییە دەوڵەمەند یاخی ببێ و لە خۆی بگۆڕێ و سوپاس گوزەرایی خوای گەورە نەکا، بەڵکو پێویستە بەهۆی ئەو نیعمەتەوە کە خوای گەورە پێی داوە کەفارەتی گوناهەکانی جێبەجێ بکا و ئەوەندە چاکە لەگەڵ داماواندا بکا کە خوا ئەویش بباتە ڕیزی پیاوە باشە دڵپاکە کردار چاکەکانەوە؛ چونکە کەم کار هەیە بەقەدەر سەرفکردنی ماڵ لە ڕێگای خوادا ببێتە هۆی میهرەبانیی خوا لەگەڵ مرۆڤدا. هەر لەبەر ئەمەیە مرۆڤی خێرومەند زۆر دوژمنی شەیتانە و، شەیتان کام زوریيەتی کە زۆر بەهێز بێ، دەیکاتە گیانی مرۆڤی خاوەن سەخاوەت تا تەفرەی بدا و لە خشتەی بەرێ و

مەنعی خێری لێ بكا. لە حەزرەتی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە، خوایان لێ ڕازی بێ، كە حەزرەتی پێغەمبەر فەرموویەتی: «أن أبليس يبعث أشد أصحابه وأقوام إلى من يصنع المعروف في ماله». واتە: شەیتان بەهێزترین و توندترین هاوڕێی خۆی دەنێرێتە سەر ئەو كەسانەی ماڵیان لە ڕێگای خوادا بەخت دەكەن.

ئەم هەوڵ و تێكۆشانی شەیتانە، لەبەرئەوەیە ئەو كەسانە كە ماڵی خۆیان لە ڕێگەی خوادا بەخت دەكەن، زۆر خێریان دەگا و ئەویش بەهەموو جۆرێ هەوڵ دەدا ڕێگای ئەو چاكەیان لێ بگرێ و لەو پاداشە زۆرە بێ بەشیان بكا.

دەگێڕنەوە كە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أن أبليس طلاع رصاد». واتە: شەیتان زۆر ئاگادارە و زۆر موراقەبەی بنیادەم دەكا و دەیەوێ دەس بنێتە ڕێگای خێرومەند و لە پاداش ناهومێدی بكا.

لە حەزرەتی عائیشەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) كە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أسرع الخير ثواباً البر، وأسرع الطاعات قبولا إلا الإنفاق بالمال». واتە: لە هەموو چاكەیێ چاكتر لەلایەنی پاداشەوە خزمەتی باوك و دایكە و، لە هەموو تاعەتێ نزیكتر لە قبووڵەوە بەختكردنی ماڵە لە ڕێگەی خوادا بەبێ بیركردنەوە لە سوودی دنیایی.

لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی «الصلاة تسود وجه الشيطان، والصدقة تكسر ظهره، والتحابب في اللّه، والتوادد في اللّه يقطع دابره، فأذا فعلتم ذلك تباعد عنكم كطلوع الشمس من مغربها».

واتە: نوێژ كردنی موسڵمانان ڕووی شەیتان ڕەش دەكا و، صەدەقە و خێر كردن پشتی دەشكێنێ و، یەكتر خۆشویستن لەپێناوی ڕەزای خوادا كلكی دەبڕێ و هێزی تیا ناهێڵێ. جا كە ئەم كارە خێرانەتان كرد، شەیتان ئەوەندەی دووریی نێوانی خۆرهەڵات و خۆرنشین لێتان دوور دەكەوێتەوە.

ئەی برادەران! بزانن نوێژ كردن بە شێوەیەكی ساغ و بە ئەدەب و سەدەقە و خێر كردن لە ڕێی خوادا لە گەورەترین چەكی مرۆڤە بۆ بەگژاچوونی دوژمن. هەروەها بەپێی ئایەتی قورئانی پیرۆز شەیتان دوژمنێكی زۆر نابار و بەدكاری مرۆڤە و، چەند كەمەندی ئەستووری هەیە بۆ دیلكردنی. یەكەم ئارەزووی نەفسە. دووەم حیرسە لەسەر ماڵی دنیا و باوەڕ كردن بە جوانیی ئەم دنیایە و پاڵدانەوەی بەم دیمەنەوە كە هەیەتی.

جا پێویستە ئینسان بەرانبەری ئەم دوژمنە بەدکارە خراپە ئاگادار و هۆشیار بێ، واتە: شەیتان لە هەر لایەکەوە و بە هەر شێوەیێ خۆی مەلاس دەدا بۆ زاڵبوون بەسەریدا، ئەمیش چەك و قەڵغانی خۆی بۆ ئامادە بکا و نەهێڵێ بەسەریدا زاڵ ببێ. یەکێ لەم چەکانە سەرفکردنی ماڵە لە ڕێی خوادا. یەکێکی تریان بەجێهێنانی واجیباتە لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج. یەکێکی تریان خۆپاراستنە لە زیان گەیاندن بە نەفس و ماڵ و نامووسی خەڵك. یەکێکی تریان دەوامی یادی خێر و ناوهێنانیەتی بە تایبەتی شەو نوێژ کردن بەشێوەی دڵسۆزانە. یەکێکی تریان سەبر و خۆگرتنە لەبەر ئازار و موسیبەتا، یەکێکی تریان بڵاوکردنەوەی دۆستی و خۆشەویستییە لەناو موسوڵمانانادا، بە تایبەتی بە سەرفی ماڵ و ناندان بە خەڵك ئەوەندەی دەسەلات؛ چونکە ماڵ سەرفکردن دەبێتە هۆی دۆستی و خۆشەویستی و لابردنی ڕقی دڵ. بێ گومان شەیتان کە حەز لە چاکە و بەختیاریی ئادەمیزاد ناکا، زۆر عاجز دەبێ لە کاتێکدا ئینسان بیەوێ ماڵی خۆی لەپێناوی خوادا بەخت بکا و هەوڵی ئەوە ئەدا کۆسپ بێنێتە ڕێگای. جا ئینسانی بەختیار ئەوەیە هۆشیار بێ و بەسەر نەفس و ئارەزوویدا زاڵ ببێ. بەم جۆرە دەتوانێ بەسەر شەیتاندا زاڵ ببێ و پشتی بشکێنێ.

لە ئەبووسەعیدی خەدرییەوە ڕیوایەت کراوە (ر.خ) کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «أن اللّه يقبل الصدقة ويأخذها بيمينه فيربيها لأحدكم كما يربي أحدكم مهره حتى أن اللقمة لتصير مثل أحد».

واتە: بێگومان خوای گەورە خێر و سەدەقەی ئێوە قبووڵ دەکا و بە دەستی ڕاست وەری دەگرێ، واتە بەحورمەت و ئیعتیبار. ئەنجا ئەو سەدەقەیە، هەر چەند کەمیش بێ، پەروەردە دەکا و پێی دەگەیێنێ و زۆری دەکا، وەکو یەکێ لە ئێوە جوانوو ماینی خۆی خزمەت بکا بە دڵ و بە گیان. بەڵێ خوا ئەو خێرە پەروەردە دەکا و گەورەی دەکا تا ئەوەندەی کێوی ئوحودی لێ دێ.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، خوایان لێ ڕازی بێ، «قال: قلت يا رسول اللّه! رغيف أتصدق به أحب إلى اللّه أم مائة ركعة تطوعاً؟ فقال: رغيف تصدقت به أحب إلى اللّه من مائتي ركعة تطوعاً. فقلت: قضاء حاجة المسلم أحب إلى اللّه أم ثلاثمائة ركعة تطوعاً؟ فقال: قضاء حاجة المسلم أحب إلى اللّه من مائة الف ركعة تطوعاً. قلت: ترك لقمة حرام أحب الى اللّه أم مائة الف ركعة تطوعاً؟ فقال: ترك لقمة حرام، أحب إلى اللّه

من الفي ركعة تطوعاً. [هكذا رأيت الحديث في الكتاب، ولكن الظاهر من سياق الحديث هكذا: «قلت، ترك لقمة حرام أحب إلى اللّه أم مائة الف ركعة، قال: ترك لقمة حرام أحب إلى اللّه من مائتي الف ركعة»]. قلت: يا رسول اللّه قضاء حاجة الأرملة أحب إلى اللّه أم عشرة آلاف ركعة تطوعاً؟ قال: قضاء حاجة الأرملة أحب إلى اللّه من ثلاثين الف ركعة تطوعاً. وفي آخر الحديث يقول: بر الوالدين أحب إلى اللّه من عبادة الف ركعة تطوعاً».

واته: ئەنەسی کوڕی مالیك، خوایان لێ ڕازی بێ، وتی: عەرزی پێغەمبەرم کرد (د.خ): نانێ بە خێر بدەم بە گەدایێ لای خوا چاکترە یا سەد ڕکات نوێژ سوننەت؟ فەرمووی: نانێ بیدەیتە خێر لای خوا چاکترە لە دوو سەد ڕکات نوێژی سوننەت. عەرزم کرد: جێبەجێکردنی پێویستی و ئیحتیاجیی موسڵمانێ لای خوا چاکترە یا سێ سەد ڕکات نوێژ سوننەت؟ فەرمووی: جێبەجێکردنی پێویستی موسوڵمانێ لای خوای گەورە لە سەد هەزار ڕکات نوێژی سوننەت چاکترە. ئەنجا عەرزم کرد: وازهێنان لە پارووێیەکی حەرام و نەخواردنی چاکترە لای خوا یا سەد هەزار ڕکات؟ فەرمووی وازهێنان لە پاروویێ حەرام و نەخواردنی چاکترە لای خوا لە دوو سەد هەزار ڕکات. دوای ئەوە عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا جێبەجێکردنی پێویستی و ئیحتیاجیی بێوەژنێ چاکترە لای خوا یا دە هەزار ڕکات سوننەت؟ فەرمووی: جێبەجێکردنی پێویستی و ئیحتیاجیی بێوەژنێ (واتە خزمەت کردنی خۆی و منداڵە وردەکانی) چاکترە لای خوا لە سیی هەزار ڕکات نوێژی سوننەت. ئینجا لە پایانی فەرموودەکەیدا دەفەرموێ: خزمەتکردنی باوك و دایك و چاکە لەگەڵ کردنیان چاکترە لای خوا لە عیبادەتی هەزار هەزار ڕکات نوێژی سوننەت.

براکانم! بەجێهێنانی پێویستی و ئیحتیاجیی ئەوانەی کە باسمان کردن یا بە جێگەداری و پایە دەبێ یا بە سەرفکردنی ماڵ بۆیان. بێگومان سەرفی ماڵ خێری زیاترە.

هۆی پاداشی زۆری نەخواردنی پارووی حەرامیش ئەوەیە کە لە سێ لاوە قازانجی هەیە، یەکەم پارێزکردن لەو کارانەی کە نەهییان لێ کراوە و دوور کەوتنەوە لە کارێ کە خوای گەورە مەنعی کردووە و حەزی لێ ناکا. دووەم ئەوەیە کە تەرکی حەرام دەبێتە هۆی بەجێهێنانی واجیب؛ چونکە تەرکی حەرام واجیبە. سێیەم ئەوەیە کە بە وازهێنان لە حەرام دڵی موسوڵمان ڕووناکی پەیدا دەکا و لە لوتفی خوای میهرەبان نزیك دەبێتەوە، بەڵام پارووی حەرام دڵ ڕەش دەکاتەوە و ئینسان دڵ ڕەق دەکا. فەرموودەی حەزرەتی

پێغەمبەریشە (د.خ) دوورترین ئینسان لە خوای گەورە دڵی ڕەش و ڕەق و بێ ڕەحمە. دیارە دڵی ڕەق بێ و ڕەش بووبێتەوە ڕەحمەتی خوا تێ ناچێ.

لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «الصوم جنة، والصدقة تطفيء الخطيئة كما يطفيء الماء النار». وعن عقبة أن الصدقة تطفيء عن أهلها حسر القبور».واتە: ڕۆژوو گرتن دەبێتە قەڵغان لە سزای دۆزەخ و صەدەقە کردن گوناهـ و تاوانی تاوانباران دەکوژێنێتەوە وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە. هەروەها لە ڕیوایەتی عەقەبەدا دەڵێ: سەدەقە گەرماوی گۆڕ لە خاوەن صەدەقەکە دەکوژێنێتەوە. سیڕی ئەمە ئەوەیە وەکو چۆن ئەم خێرومەندانە لە دنیادا گەرما و پەرووزەی دڵی گەدا و داماوان و بێ دەستەڵاتان دەکوژێننەوە ئەو خێر و چاکانەیش لە قەبر و قیامەتدا گەرمیی گۆڕ و تینی ئاگری دۆزەخ لەو خێرومەندانە دوور دەخەنەوە، ئەمەیش (جزاء وفاقا)یە، واتە پاداش بەپێی کردارە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «لا حسد ألا في أثنين رجل آتاه اللّه القرآن فهو يقوم به آناء الليل وآناء النهار، ورجل آتاه اللّه مالا فسلطه على هلكته في الحق». دیارە وشەی (حسد) لەم فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەردا (د.خ) مەعنای داواکردنی لاچوونی نیعمەتی خەڵك نییە، بەڵکو مەبەس خۆش لێهاتن و حەز کردنە لەوە کە ئەمە نیعمەتە بەنسیبی ئەمیش ببێ، وەك بەنسیبی مەحسوودەکە بووە. واتە: حەسەد پێ بردن ناشێ بە دوو جۆرە خەڵك نەبێ، یەکەم ئینسانێ کە خوای گەورە قورئانی پێ فێر کردبێ و ئەویش بەشەو و بەڕۆژ خەریکی خوێندنەوە و کارپێکردنی بێ. دووەم ئینسانێ کە خوای گەورە ماڵ و سامانێکی پێ بەخشیبێ و دڵ و دەروونیشی فراوان کردبێ کە بەقەد توانا لە ڕێگەی خوا و ڕەزامەندییدا بەختی بکا.

لە ئەبووسەعیدەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «أيما رجل أكتسب مالا من حلال فأطعم نفسه وكساها ، ومن دونه من خلق اللّه فأنها زكاة وبركة في المال وطهرة للذنوب».

واتە: هەر پیاوێ ماڵێکی حەڵاڵ پەیدا بکا و خۆی لێی بخوا و لێی بپۆشێ و بەشی خەڵکیشی لێ بدا، ئەوە ئەو سەرفکردن و بەخشینە دەبێتە هۆی زۆربوونی ماڵەکەی و خوا بەرەکەتی بۆ تێ دەخا، هەروەها دەبێتە هۆی پاکبوونەوەی لە گوناهـ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە، خوایان لێ ڕازی بێ، کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «أستعينوا على الرزق بالصدقة» واتە: ئەگەر حەزتان لەوەیە کە ڕزق و ڕۆزیتان زۆر بێ و زاڵ بن بەسەریدا و بەئاسانی بێتە دەستتان، سەدەقە و خێر بکەن و یارمەتیی داماوان بدەن.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت فەرموویەتی: واتە: «رحم اللّه حميراً افواههم سلام وأيديهم طعام» خوای گەورە ڕەحم بە هۆزی حیمیەر بکا و چاکیان بۆ بکا، چونکە هەمیشە دەم بە سەلام و دەست بە تەعامن. ئەم دوعای حەزرەتە (د.خ) بۆ هۆزی حیمیەر لەبەر ئەم دوو سیفەتە بووە یەکەم سڵاوکردنیان لە خەڵکی گەورە و بچووك. دووەم یارمەتیدانی داماوان و هەژاران و دەستگرۆیی کردنیان.

دەگێڕنەوە کە یەکێ لە حەزرەتی پرسی (د.خ): کام کردەوە دەبێتە هۆی چوونە بەهەشت؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: «أفشاء السلام، وأطعام الطعام، والصلاة بالليل والناس نيام» واتە: هۆی چوونە بەهەشت یەکەم: ئەوەیە هەمیشە دەم بە سەلامەوە بی، واتە بە هەر کەس بگەی سەلامی لێ بکەی، چ بیناسی و چ نەیناسی. دووەم: ناندان بە خەڵك، بە تایبەتی ئەوانەی کە داماو و هەژار و دەستکورتن. سێیەم: شەو نوێژ کردن لەو کاتەدا کە خەڵك نووستوون، واتە: لە کاتێکدا کە خەڵك شەو لە پرخەی خەوان و ئیسراحەت دەکەن تۆ خەریکی نوێژ کردن و پاڕانەوە بی و لەزەت لەوە وەربگری کە لەگەڵ خوای خۆتدا بی و عیبادەتی بۆ بکەی.

لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: «التهجد مطردة للداء» واتە: شەو نوێژ کردن دەرد و بەڵا لە ئینسان دوور دەخاتەوە، بەڵام بەمەرجێ کە بەردەوام بێ. ئەگەر لە لەشی ئەو کەسەدا ناساغی هەبێ، بە پیرۆزیی ئەو شەونوێژەوە لێی دوور دەکەوێتەوە و ساغ دەبێتەوە. تاقی کراوەتەوە ئەوانە کە بۆ نوێژ کردن و خواپەرستی شەونخوونی دەکێشن و خەریکی ناوی خوا هێنان و یادی خوا کردنن و شەو بەلای نەخۆشەوەن، لەشیان ساغە.

لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، خوای لێ ڕازی بێ، کە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی «في الجنة غرف يرى ظاهرها من باطنها وباطنها من ظاهرها، فقال أبو مالك: لمن هي يا رسول اللّه؟ قال: لمن أطاب الكلام واطعم الطعام وبات قائماً والناس نيام». واتە: لە بەهەشتدا چەند ژووری ناسك و جوانی وەها هەیە کە دیوی دەرەوەیان لە ناوەوە و دیوی ناوەوەیان لە دەرەوە دەبینرێ، ئەبوو مالیك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو

ژوورانه هی کێن؟ فەرمووی: هی ئەوانەن قسەیان لەگەڵ خەڵکدا خۆش بێ و، نان بدەن و لە شەووا کە خەڵك نووستوون ئەوان خەریکی شەونوێژ بن.

لە جابیرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «إن من موجبات المغفرة أطعام الطعام المسلم السغبان». واتە: یەکێ لەو شتانە کە دەبنە هۆی خوا لێخۆشبوون ناندانە بە موسوڵمانی برسی، چ هەژار بێ و چ دەوڵەمەند؛ چونکە ڕیوایەت کراوە: «أعطوا السائل وأن جاء علی فرس». واتە: یەکێ لەو شتانە کە دەبنە هۆی خوا لێخۆشبوون ناندان بە موسوڵمانی برسی، چ هەژار بێ و چ دەوڵەمەند؛ چونکە ڕیوایەت کراوە: «أعطوا السائل وأن جاء علی فرس». واتە: بەشی ئەوانە بدەن کە دێن و داوای شتتان لێ دەکەن با بەسواریی ئەسپیش بێن بۆ لاتان، چونکە لەوانەیە هەندێ کەس هەبن نەتوانن بە پیادە بێن بۆ لاتان و بە سواری بگەڕێن؛ ئەو حاڵە نابێتە مانیع کە ئینسانی خێرومەند خێریان پێ بکا.

ڕیوایەت کراوە: «أصنع المعروف إلی من هو أهله وإلی غیر أهله، فأن أصبت أهله أصبت أهله، وأن لم تصب أهله کنت انت أهله!». واتە: پیاوەتی و چاکە لەگەڵ هەموو کەسێکدا بکەن، چ شایان بن بۆ ئەو پیاوەتییە یا شایان نەبن، جا ئەگەر وا ڕێکەوت شایان بوون ئەوا زۆر چاکە. خۆ ئەگەر وا نەبوو قەی ناکا، تۆ خۆت شایانی ئەوەی چاکە لەگەڵ خەڵکدا بکەی. واتە: ئینسان بە چاکەکردن هەر پایەی بەرز دەبێ لای خوا ئیتر کابرای خێر پێکراو هەرچۆن بێ. بەڵام بەپێی ڕێوشوێنی شەرع ئینسان کە هات و خێری کرد دەبێ تا یەکێکی موستەحەقی دەس نەکەوێ ماڵی خۆی بۆ ناموستەحەق سەرف نەکا، تەنانەت لەناو ناموستەحەقەکاندا فەرقی ئینسانی بێ سوود و بەسوود بکا، فەرقی ئینسانی منداڵدار و بێ منداڵ بکا. هەروەها فەرقی ئینسانی کردەوە چاك و کردەوە خراپ بکا، ئەگەرچی هەموو هەر خێرە، مادام بە نییەتی خێربێ و بەو نیازە یارمەتیی نەدا کە لەسەر کردەوەی خراپ هێز پەیدا بکا.

لە (أبو الدرداء)ەوە ڕیوایەت کراوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «الضیف یأتي برزقه ویرتحل بذنوب القوم». واتە: میوان ڕۆزی خۆی لەگەڵ خۆی دەهێنێ و کە ڕۆیی گوناهەکانی خانەخویەکەی لەگەڵ خۆی دەبا؛ چونکە دەبێتە هۆی عەفووی گوناهەکانی و دایان دەماڵێ.

خوا لە هەموو کەس زاناترە. لەوانەیە ئەم فەرموودە شیرینە دەرهەق بەو پیاوچاك و

خاوەن بەخششانە بێ کە ناندان بە میوان و گەدا و داماویان کردووەتە پیشەی خۆیان و، بەرە دوای بەرەیان لەسەر ئەو خووڕەوشتە دەمێنن و ماڵی خۆیان کردووەتە میوانخانە بۆ هەژاران و بێکەس و لانەوازان.

لە حەزرەتەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی «الخير أسرع إلى البيت الذي يأكل منه الضيف، من الشفرة الى سنام الأبل». واتە: خێر و بەرەکەت و پیرۆزی بەپەلەتر و زووتر دەگاتە خانەدانی میواندار لە تیژیی چەقووی تیژ بە دووگی سەرپشتی وشتر. واتە: چەقۆ چۆن ئەو دووگە باش دەبڕێ پیرۆزی لەوە زووتر دەچێتە ئەو ماڵە و موبارەکی دەکا.

لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «تداركوا الهموم والغموم بالصدقات؛ يكشف الله تعالى ضركم وينصركم على عدوكم». واتە: بەخێر و بەخشش خەم و خەفەت لە دڵی خۆتان دەرکەن؛ ئەگەر وابکەن خوای گەورە زیانتان لێ دوور دەخاتەوە و بەسەر دژمنەکانتاندا زاڵتان دەکا.

دەگێڕنەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أن صدقة السر تطفيء غضب الرب، وان صنائع المعروف تقي مصارع السوء، وان صلة الرحم تزيد في العمر وينفي الفقر. واكثروا من قول لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم؛ فأنه كنز من كنوز الجنة وان فيها شفاء من كل داء وأدناها الغم».

واتە: بەخشش و خێرکردن بە پەنامەکی ئاگری ڕقی خوای گەورە دەکوژێنێتەوە و، چاکەکردن و پیاوەتی لەگەڵ موستەحەقاندا دەبێتە هۆی پاراستنی ئینسان لە کەوتنی خراپ و، بەجێهێنانی پێوەندی و ڕاگرتنی شیرازەی خزمایەتی و نەپچڕاندنی، تەمەنی ئینسان زیاد دەکا و ڕێگا لە هەژاری دەگرێ. هەروەها (لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم) زۆر بخوێنن؛ چونکە ئەم زیکرە خەزێنەیەکە لە خەزێنەکانی بەهەشت و دەبێتە هۆی شیفا و ڕزگاریی لە هەموو دەردێ، کە بچووکتریان خەفەتە، ئیتر خوا دەزانێ چی تریش لادەبا؟.

ڕیوایەت کراوە کە سەدەقە بەڵا دەگێڕێتەوە.

هەروەها لە حەزرەتی عەلییەوە ڕیوایەت کراوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «الصدقة على وجهها، وأصطناع المعروف وبر الوالدين وصلة الرحم تحول الشقاء سعادة، وتزيد في العمر وتقي مصارع السوء». واتە: بەخشش و چاکە، بەڕاستی و پیاوەتی

لەگەڵ خەڵکدا و خزمەتی باوك و دایك و خزم دۆستی و ڕاگرتنی پێوەندیی خوێشایەتی نەگبەتی و بەدبەختیی ئینسان دەکاتە بەختیاری و شادمانی و تەمەن زیاد دەکا و مرۆ لە لێقەومانی نابار و ناشایستە دەپارێزێ.

لە حەزرەتی عەلییەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە یەکێ پرسیاری لە حەزرەتی پێغەمبەر کرد (د.خ) دەربارەی مەعنای ئایەتی «مْحُو اللّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ». واتە خوای گەورە ئەوەی بیەوێ مەحوی بکاتەوە مەحوی دەکاتەوە و ئەوەیشی بیەوێ بیهێڵێتەوە دەیهێڵێتەوە و ئەو زانینەی کە سەرچاوەی هەموو نووسراوێکە لای خوای گەورە.

پوختەی پرسیارەکە ئەوە بوو شتێ کە خوا لە ئەزەلدا بڕیاری دابێ ببێ چۆن قابیلە مەحو بکرێتەوە؟ خوایش لە وەڵامی خاوەن پرسیارەکەدا فەرمووی: «لأسرنك ولیسر بها أمتي من بعدي: الصدقة على وجهها وبر الوالدين وأصطناع المعروف يحول الشقاء سعادة».

واتە: ئەی پرسیارەکەر من دڵی تۆ خۆش دەکەم و با کۆمەڵێ پەیڕەوانی منیش لەپاش من دڵیان خۆش ببێ بەوە کە سەدەقە بەڕاستی و لەبەر ڕەزای خوا ماڵ بەخشین و خزمەتی باوك و دایك و پیاوەتی کردن و ئیشی باش بەدبەختیی ئینسان دەگۆڕن و دەیکەنە بەختیاری، واتە: بەختیاری دەهێنن بۆ خاوەن خێر و بەدبەختییەکەی لادەبەن.

ئەوانە کە نەزانن وا حاڵی دەبن هەر شتێ بە عیلمی خوادا ڕابووردبێ هەر ئەو شتە بەتەنیا بە عیلمی ئەودا ڕابووردووە، نازانن خوای گەورە جیهانی لەسەر ئەسباب داناوە و، وەکو دەرد و نەخۆشیی داناوە، سەبەبێکی بۆ ئەو دەرد و نەخۆشییەش داناوە وەکو سەرما و گەرما و گیرۆدەبوون بە ئازاری ژاری مار و دووپشك و کەڵبەی سەگ و بڕینی تیغ، هەروەها دەرمانیشی بۆ ئەو دەردانە داناوە، و بەو دەرمانانە دەفعی زیانیان دەکا. هەروەها هۆیەکانی بەدبەختی، نەزانین، بێ شەرمی، نامەردی تاوان کردن، پەیڕەویی نەفسی ئەممارەیە و، چارەکانیشی تەوبەکردن، پەشیمانی لە تاوان، بڕیاری نەگەڕانەوە بۆی، لەگەڵ سەدەقە و بەخشش و یارمەتیدانی داماوان و خزمەتی باوك و دایك و ئینسانی لێقەوماوی بێ دەرەتان و هەتیو و بێکەس.

بەڵێ لەم بەیانەوە دەرکەوت کە خوای گەورە عیلمی وەها ڕابووردووە فلان کەس لەسەر ئارەزووی نەفسی خۆی ماوەی چەند ساڵ هەرچی هۆی بەدبەختییە دەیکا و بەدبەختییەکەی باش دادەمەزرێ، هەروەها عیلمی ڕابووردووە کە ئەو کەسە بەهۆی

خەوێکە کە دەیبینی یا ئامۆژگاریێکەوە کە دەیبیسێ لەو کردەوە بەدانە پەشیمان دەبێتەوە و هەرچی هۆی بەختیارییە جێبەجێی دەکا؛ ئەوا بەدبەختی نەما و مەحو بووەوە و لە شوێنیدا بەختیاری دامەزرا و ئەو زەلامە بە بەختیارییەوە مرد و بە ئاخیر خێری سەری نایەوە.

ئەم ئەسبابانەیش کە ناومان بردن، هیچ کامیان سەبەبی تەواو نین، بەڵکو تەنیا سەبەبی عادەتین و خواستی خوا لەسەریان هەوێنی تەواوبوونی سەبەبەکەیە؛ جا ئەگەر جارێ لە جاران سەبەبێ هاتەجێ و موسەببەبەکە پەیدا نەبوو ئەوە لەبەرئەوەیە خواستی خوای لەسەر نەبووە، لەگەڵ ئەوەیشدا لەم حاڵەتەدا خەریك بوون بەو سەبەبی خێرەوە کە خوا ئەمری پێ فەرمووە جەزای خێری لەسەرە و بێ پاداش نابێ.

لە حەدیسا هەیە ئەگەر سەدەقەکە ئەو بەلآیە رەدنەکردەوە کە بۆی کراوە ئەوە بەلآیەکی تر رەد دەکاتەوە. دیارە ئەگەر بەلآکە هەر هات و سەدەقە کاری نەکرد دەردەکەوێ کە حوکمی قەتعیی خوای لەسەرە، بێگومان ئەو جۆرە شتانە هیچ شتێ چاریان ناکا، بەڵکو سەدەقە و دوعا و دەرمانی دوکتۆر چاری هەندێ شت دەکەن کە خوای گەورە بڕیاری دابێ، بەم جۆرە شتانە چاربکرێ. ئیتر ئەمە نابێتە هۆی ئەوە کە ئینسان بەجارێ دڵی ساردبێتەوە و واز لە سەدەقە و دوعا و دەرمانی دوکتۆر بێنێ، بۆ نموونە گەلێ جار رێك دەکەوێ خاوەن کشتوکاڵ و ، خاوەن باغ و بێستان و حەیواندار و خاوەن دووکان ماوەیێ هیچ سوود لە کارەکەیان وەرناگرن لەگەڵ ئەوەیشدا هەر لەسەر نیشەکەی خۆیان بەردەوام دەبن تا رۆژێ دێ و هەلیان بۆ هەڵدەکەوێ و بە ئامانجی خۆیان دەگەن قازانج دەکەن و دەبووژێنەوە و دەحەسێنەوە.

لە حەزرەتی عائیشەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «لا یغنی حذر من قدر، والدعاء ینفع مما نزل ومما لم ینزل». واتە: پارێز کردن و خۆ لادان چاری ئەو کارانە ناکا کە خوای گەورە بە قەتعی بڕیاری بوونی داون، لەگەڵ ئەوەیشدا دوعا و نزا و پاڕانەوە، سوودی هەیە بۆ چاری بەلآ چ ئەوانەی کە ئێستە هاتوونەتە خوار و خەڵکی پێیانەوە گیرۆدەیە و چ ئەوانە کە هێشتا نەهاتوون، دیارە مەبەست لەوانەیە کە خوای گەورە بڕیاری داوە بە نزا و پاڕانەوە چاربکرێن.

ریوایەت کراوە: «لا یزال الدعاء والبلاء یقتتلان إلی یوم القیامة».

واتە: هەمیشە هەندێ بەڵا لەگەڵ هەندێ دوعا و نزادا دێن بەیەکا و شەڕ دەکەن و، بەڵاکە دێتە خوارەوە بەسەر دوعاکەدا و دوعاکەیش بەڵاکە بەرز دەکاتەوە تا ڕۆژی قیامەت، دیارە لێرەدا مەبەست بەڵایەکە بە دوعا چارە بکرێ.

ئەو زانایە کە مەعنای ئەم فەرموودەی ڕوون کردووەتەوە فەرموویەتی: لەم فەرموودەوە دەردەکەوێ کە پاڕانەوە لە خوای گەورە و سەدەقە و خێرکردن لە ڕێگای خوای گەورەدا، هەردووکیان دەرد و بەڵا دەگێڕنەوە و ماوەی نادەنێ بێتە خوارەوە. هەروەها ئەو زانایە فەرموویەتی: هەموو کەس ڕێگەیەکی تایبەتی هەیە بۆ بەرزبوونەوەی کردەوە و ڕۆحی بۆ ئاسمان و، هەر لەو ڕێگەوە ڕزق و ڕۆزی و بەخت و پیرۆزی و دەرد و بەڵای بۆ دێتە خوارەوە. جا هەر کاتێ بەندەی ڕاساڵ دەستی بە خواپەرستی و فەرمانبەرداری کرد و خێر و صەدەقەی لە ڕێگەی خوادا کرد ئەو ڕێگە وەها پڕ دەبێ ڕێگای دەردوبەڵا دەبەستێ و هەرگیز نایێڵن ئەوانە بێنە خوارەوە؛ چونکە دوعا و بەڵا یا سەدەقە و بەڵا بەگژی یەکدا دەچن و بەرەنگاری یەك دەبن، بەڵام ڕێگەی ڕزق و ڕۆزی ناگرێ چونکە ڕۆزری پایەیەکی تایبەتی هەیە و مەنع ناکرێ.

جا دیارە هەر کام لەم دوژمنانە زاڵ ببێ بەسەر ئەویتردا پەکی دەخا و ناهێڵێ ئیشی خۆی بکا، واتە: ئەگەر خێر و سەدەقە زاڵ بن مەنعی بەڵا دەکەن و، ئەگەر بەڵاکان زاڵ بن دێنە خوارەوە بەسەر دوعا و خێرەکاندا. کەوابوو ئەگەر جارێ لە جاران دوعا کاری نەکرد یاخۆ سەدەقەکردن بێ سوود بوو، ئەوە لەبەرئەوەیە کە قەزای خوا لەو ئیشە بڕیاردراوە کە بە هیچ شتێ نەگۆڕێ، یاخۆ سەدەقەکە بە ئیخلاسی دڵ نەبووە، یا ئەوەندە نەبووە کە بەرەنگاری بەڵاکە بێ و مەنعی بکا.

ڕیوایەت کراوە: «ما من مسلم يدعو بدعوة ليس فيها أثم ولا قطيعة رحم إلا أعطاه اللّه أحدى ثلاث خصال: أما أن يعجل دعوته، وأما أن يدخرها له في الآخرة، وأما أن ينصرف عنه من السوء مثلها. قالوا: أذن نكثر. قال: اللّه أكبر ولا حول ولاقوة إلا باللّه العلي العظيم».

مەعنای «لا حول ولا قوة إلا باللّه... الخ» لێرەدا ئەوەیە کە هیچ وەرگەڕانەوەیێ لە گوناه و هیچ هێزو تینێ لەسەر فەرمانبەرداری بۆ خوای گەورە بەهێز و یارمەتیی خوا نەبێ نایەتە جێ. بەڵێ پێویستە ئەم ویردە لەگەڵ ئاگاداریی دڵ و لەگەڵ هۆشیاریدا بخوێنرێ؛ چونکە خوای گەورە زۆریەی دوعا و نزا لە ئینسانی دڵ ئاگادار و هۆشیارەوە

قبووڵ دەکا و دوعا و نزای بێ ئاگایان وەرناگرێ. زاناکان فەرموویانە ئیخلاسی دڵ بریتییە لە خۆ کز کردن و پاڕانەوە و داواکردنی عەفوو و میهرەبانی لە خوای گەورە بە ترس و لەرزەوە.

دەگێڕنەوە یەکێ لە خەڵکی شاری مەدینەی مونەوەرە (زادها اللّه شرفاً) کوڕێکی بوو ناوی زەید بوو، بە ڕێگەی دەریادا ناردبووی بۆ بازرگانی و، سەفەرەکە درێژەی کێشا و کوڕەکە هیچ خەبەرێکی نەبوو. باوکی زۆر پەرێشان بوو، بۆیە ڕۆژێ لە ڕۆژان هات بۆ خزمەتی ئەبوو هورەیرە و (ر.خ) و تکای لێ کرد دوعای خێری بۆ بکا، بەڵکو کوڕەکە بگەڕێتەوە. ئەبوو هورەیرە فەرمووی بەڵێ دوعا قازانجی هەیە، بەڵام خێر و سەدەقە کردن لە دوعا سوودی زۆرترە. پیاوەکە کە لای ئەبوو هورەیرە گەڕایەوە لە ڕێگەدا تووشی گەدایێ بوو و تاقە درەمێ پارەی پێ بوو پێی دا و، لە دڵی خۆیدا وتی: خوایا ئەم تاقە درەمە سەدەقەی سەری کوڕەکەم بێ. پاش ئەوە بە چەند ڕۆژێ قافڵەکە گەڕایەوە کوڕەکەیشی بە سەلامەتی لەگەڵیاندا هاتەوە. ڕۆژێ باوکە لە کوڕەکەی پرسی: لەو سەفەرەدا وەزعتان چۆن بوو؟ لە فلانە ڕۆژا من یادی تۆم کرد، زۆر بۆت پەرێشان بووم، نازانم بۆچی وابوو؟ کوڕەکە وتی! بابە! لەو ڕۆژا کە تۆ زۆر پەرێشان بووی ئەهلی قافڵەکە هەموو لە کەشتییەکەدا گیرۆدەی شەپۆلی دەریا بووین و زۆر پەرێشان و بێ حاڵ بووین هەموومان بەتەمای خنکان بووین و چاوەڕوانیی مەرگمان دەکرد و خەریکی دوعا و نزا و قورئان خوێندن بووین. لەناکاو ئاوازێ لەسەر کەشتییەکەمانەوە هات وتی: موژدەبێ بە ئێوە ئەو سەدەقەیە کە باوکی زەید کردی خوا قبووڵی کرد. ئیتر لەپاش ئەو دەنگە چاومان بە چەند تارمایییەکی سپی و جوان کەوت کە هەموو لای کەشتییەکەیان گرت و لەو گێژاوە دەریان کرد و ئێمەیش هەموومان ڕزگار بووین.

پاش ئەمە ئەهلی کەشتییەکە وتیان: لەناو ئێمەدا تەنیا تۆ ناوت زەیدە و وا تۆ بووی بەهۆی ڕزگار بوونی ئێمە. منیش وتم: بەخوا منیش وەکو ئێوە پەرێشان بووم و دەگریام. هەڵبەتە باوکم لەم کاتەدا سەدەقەیەکی کردووە و خوای گەورە قبووڵی کردووە بووەتە هۆی ڕزگار بوونمان.

جا باوکەکە کوڕەکەی بردە خزمەتی ئەبوو هورەیرە و ئەو سەرگوزەشتەی بەتەواوی بۆ گێڕایەوە و دانیشتووانی مەجلیس هەموو سوپاسی خوایان کرد لە سەر ئەوە کە بە پیرۆزیی حەزرەتی فەخری عالەمەوە (د.خ) و بە پیرۆزیی شەریعەت و ئاینەکەیەوە

شارەزای خێر و سەدەقەکردن بوون و، ئەو سەدەقە و خێرانەش بوونە هۆی ڕزگاریی موسڵمانان لە بەڵا و ئازاری دنیا. خۆزگە بە حاڵی ئەو موسڵمانانە کە بەپێی ڕێوشوێنی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام ڕەفتار دەکەن.

دەگێڕنەوە پیاوێکی ڕێبوار بە دەشتێکدا ڕادەبووورد، لەناکاو پارچەیێ هەوری بە ئاسمانەوەی دی، لەناو ئەو پارچە هەورەوە دەنگێ دەهات و ئەمری بە هەورەکە دەکرد کە بەپەلە بڕۆ باخی فلان کەس ئاو بدە پاش بیستنی دەنگەکە ئەوەندەی نەبرد باران دای کرد بەسەر باخێکدا لەو شوێنەدا و زۆر چاك ئاوی دا. کابرای ڕێبوار بەرەو باغەکە ملی ناو لەوێ چاوی بە پیاوێك کەوت، لێی پرسی: تۆ ناوت چییە؟ وتی: ناوم فلانە و ئەم باخە باخی منە. کابرای ڕێبوار حاڵی بوو کە ئەم پیاوە پیاوی چاکە و بارانەکە لەبەر خاتری ئەو باریوە بەسەر ئەو باخەدا. ئینجا لە خاوەن باخەکەی پرسی وتی: توو خوا پێم بڵێ: تۆ بەری ئەم باغە چۆن سەرف دەکەی؟ وتی: مادام سوێندت دام ڕاستت پێ دەڵێم. من بەرهەمی ئەم باخە دەکەم بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خزمەتی باخەکە و بەشێکی بۆ ژیانی خۆم و ئەو بەشەکەیش لە ڕێگەی خوای گەورەدا دەبەخشمەوە.

بێجگە خوای گەورە کەس بەم حاڵەی نەزانیوە و ئەوەی کردوومە تەنیا لەبەر خوا بووە.

لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أيكم مال وارثه أحب اليه من ماله؟ قالوا: يارسول الله ما من واحد الا وماله أحب إليه من مال وارثه. قال: فأن ماله ما قدمه ومال وارثه ما أخره».

واتە: کێ لە ئێوە ماڵی میراتبەرەکانی لا خۆشەویستیترە لە ماڵی خۆی؟ عەرزیان کرد: کەس نییە ماڵی خۆی لە ماڵی میراتبەرەکانی خۆشتر نەوێ. جا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ماڵی خودی ئینسان ئەوەیە کە لەپێش خۆیەوە دەینێرێ بۆ قیامەت و، ماڵی میراتبەرەکانی ئەوەیە کە دەیهێڵێتەوە بۆ میراتبەرەکانی، ئەوان دەیبەن بۆ خۆیان. لەم فەرموودە پیرۆزەوە دەردەکەوێ ئەو ماڵە کە ئینسان لە ژیانی خۆیدا لە ڕێگەی ڕەزای خوای گەورەدا سەرفی دەکا ئەوە بە ماڵی ئەو حسێب دەکرێ و، ئەوەی دەمێنێتەوە و دەکەوێتە پاش مردنی ماڵی ئەو نییە.

خوای گەورە دەفەرموێ: «وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ». مەبەست لەوەی کە پێشی دەخەن کردەوەی چاکەیە کە لەپێش مردنی خۆیاندا دەیکەن بە توێشووی پاشەڕۆژ، دیارە

باشترینی ئەو کردەوانە ماڵ سەرفکردنە لە ڕێگای ڕەزای خوادا. مەبەستیش لە (آثار) شوێن هەنگاوێکە کە لە ڕێگەی خوادا دەنرێ، چ بۆ مزگەوت و عیبادەت، یا بۆ سەفەری پەیداکردنی زانستی بەسوود، یا بۆ حەج یا بۆ زیارەتی قەبری حەزرەتی فەخری عالەم (د.خ) یا بۆ بەجێهێنان و ڕاگرتنی پێوەندیی خزمایەتی یا بۆ دامەزراندنی ڕیشە و بناغەی خۆشەویستی و دۆستایەتی لەناو خەڵکدا لەبەر ڕەزای خوای گەورە.

دەگێڕنەوە: دەروێشێ ئامۆژگاریی پاشایەکی دەکرد، پێی دەگوت: تۆ ماڵی خۆت خۆش دەوێ یا ماڵی دوژمنەکانت؟ پاشا وتی: ماڵی خۆمم خۆش دەوێ. دەروێشەکە وتی: پاشام! ماڵی خۆت ئەوەیە کە لە ڕێگەی خوادا بەختی دەکەی و لە ڕۆژی قیامەتدا سوودی بۆت هەیە. ئەو ماڵەی بێ کەڵك لای خۆت ڕای دەگری بەشی زۆری دەستی ئەو دوژمنانەت دەکەوێ بە سەرتدا زاڵ دەبن و بە تالان دەیبەن یاخۆ لەپاش مردنت دەکەوێتە دەستی میراتبەری بێ وەفا کە دەیخۆن و خێریشی لێ ناکەن.

ڕیوایەت کراوە لە حەزرەتەوە (د.خ) کە فەرموویەتی: «يقول العبد مالي مالي، وانما ماله ثلاث ما أكله فأفنى أو لبس فأبلى أو أعطى فأبقى، وما سوى ذلك فهو ذاهب وتاركه للناس».

واتە: بەندەی خوا هەمیشە بۆ ماڵ و سامانی خۆی بە پەرۆشە و هەر دەڵێ: ماڵەکەم، ماڵەکەم! نازانێ ئەوەی کە ئەو پەرۆشە بۆی هەمووی ماڵی ئەو نییە؛ بەڵکو ماڵی ئەو سێ جۆرە ئەوەی دەیخوات و دەیفەوتێنێ و، ئەوەی دەیپۆشێ و دەیدڕێ و دەیرزێنێ و، ئەوەی دەیدا لە ڕێی خوادا و بۆ ڕۆژی قیامەتی پاشەکەوت دەکا، ئیتر هەرچی هەیە لە کیسی دەچێ و بۆ خەڵکی بەجی دەهێڵێ!

لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «الأخلاء ثلاثة، فاما خليل يقول أنا معك حتى تأتي قبرك فذلك أهلك، وأما خليل يقول أنا لك ما أعطيت وما أمسكت فليس لك فذلك مالك. وأما خليل يقول أنا معك حيث دخلت وحيث خرجت فذلك عملك، فيقول والله لقد كنت أهون الثلاثة علي».

واتە: دۆستایەتی تۆ سێ جۆرن، یەکەم دۆستێکە دەڵێ وام لەگەڵتدا تا دەڕۆیتە ناو گۆڕەکەتەوە، ئەم جۆرە خزم و کەسوکارتە. دووەم دۆستێکە دەڵێ من هی تۆم ئەگەر لە دنیا بمدەی بە موستەحەقان و، ئەوەی لای خۆت ڕای دەگری هی تۆ نییە، ئەو جۆرە ماڵی

دنیایە. جۆری سێیەم دۆستێکە دەڵێ: من لەگەڵتدام لە دەر و لە ماڵدا، لە ژیانت و لە مردنتدا، ئەم جۆرە کردەوەی خۆتە کە تا ڕۆژی قیامەت لەگەڵتدایە، جا ئینسان لە ڕۆژی قیامەتدا بەکردەوەکەی خۆی دەڵێ: قەسەم بەخوا لە دنیادا تۆ لە هەموو جۆرە دۆستەکانم بێ نرختر بووی لام و موبالاتم پێ نەدەکردی، وا ئێستا دەزانم کە هەر تۆی زیانت هەیە و هەر تۆی سوودت هەیە و ئەوەی بە کەڵکی ئینسان بێ کردەوەی خۆیەتی.

لە حەزرەتەوە (د.خ) فەرموویەتی: «لا یجتمع ایمان وبخل في قلب رجل مؤمن، ولا غبار في سبیل اللّه ودخان جهنم» واتە: لە دڵی ئینسانی موسڵماندا ئیمان و بەخیلی و ڕژدی کۆنابنەوە، واتە: ئینسانی موسڵمان نابێ ڕژد بێ. هەروەها تۆز و ماندوویەتی لە ڕێگەی خوادا، واتە: غەزا و جیهاد بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی پاکی ئیسلام، لەگەڵ دووکەڵ و سزای ئاگری دۆزەخدا کۆنابنەوە، واتە ئەوەی لە ڕێگای خوادا جیهاد بکا و تۆزی ڕێی غەزای لێ بنیشێ لە ئاگر و دووکەڵی دۆزەخ ڕزگار دەبێ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «طعام السخي دواء وطعام الشحیح داء» واتە: خواردەمەنییەك لە ئینسانی بەدەس و دەهەندەوە پێت بگا، دەبێتە دەرمانی دەرد و نەخۆشی و نۆشی گیانە، بەڵام خواردەمەنییەك لە ئینسانی ڕژدەوە پێت بگا، دەبێتە دەرد و نەخۆشی و گرێی سەر دڵ، یەکەم هۆی خۆشییە و دووەم هۆی ناخۆشی. کەوابێ ئەگەر ئینسان بەدەس و دەهەندە یەکێکی دەعوەت کرد، ئەگەر قبووڵ کردنی دەعوەتەکەی واجیبیش نەبێ، دەبێ قبووڵ بکرێ، بەڵام ئەگەر ڕژدێ دەعوەتی یەکێکی کرد پێویست نییە قبووڵ بکرێ، بەڵام نابێ قبووڵ نەکردنەکە بەشێوەی دڵشکاندن بێ، بەڵکو دەبێ بە شێوەیەکی جوان و ناسك بێ.

ڕیوایەت کراوە لە حەزرەتەوە (د.خ) فەرموویەتی: «أي داء أدوأ من البخل؟» واتە: کام دەرد لە دەردی بەخیلی دەردترە؟ ئەوەتا تەنانەت ئەو خواردەمەنییەی لە بەخیلەوە بێ دەبێتە هۆی ناساغیی ئینسان وەك باسمان کرد.

لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «لا یدخل الجنة بخیل». واتە: ئینسانی ڕژد ناچێتە بەهەشت.

دەبێ مەبەست لە وشەی (بەخیل) لەم فەرموودەدا کەسێ بێ کە واجیبەکانی زەکات و سەرفیترە و نەزر نەدا بە موستەحەقان لەبەرئەوە کەباوەڕی وابێ ئەمانە واجیب نین، دیارە ئەو بەخیلە کافر دەبێ و کافریش ناچێتە بەهەشت.

بەڵام ئەگەر مەبەست لە بەخیل کەسێ بێ کە وەك موسڵمانی سەخی و بەخشندە ماڵی خۆی بۆ خێزان و میوان و داماوان سەرف نەکا ئەوە مەعنای فەرموودەکە ئەوەیە موسڵمانی بەخیل لەگەڵ موسڵمانە سەخییەکاندا ناچێتە بەهەشت بەڵکو لێیان دوادەکەوێ.

خۆ ئەگەر مەبەست لە بەخیل کەسێ بێ هەرچەند باوەڕی بە واجیبیی زەکات و سەرفیترەیش هەبێ هەر جێبەجێیان نەکا، ئەوە مانای فەرموودەکە بەم جۆرە دەبێ:– ئەو موسڵمانە بەخیلانە کە ئیمانیان بە واجیبی زەکات و سەرفیترە هەیە، بەڵام جێبەجێیان ناکەن ئەوانە بە قەدەر جەزای تەرکی ئەو واجیبانە سزا دەدرێن، ئینجا ڕێگەی ئەوەیان دەدرێ بچنە بەهەشت. بە هەرحاڵ بەخیل یا لە بەهەشت بێ بەشە یا مەحروومە لەوەی کە لەگەڵ موسڵمانە باشەکاندا زوو بچێتە بەهەشت.

ڕیوایەت کراوە کاتێ کە خوای گەورە بەهەشتی دروست کرد پێی فەرموو: «تكلمي». واتە: ئەی بەهەشت قسە بکە، «قالت: قد أفلح المؤمنون بك يارب، فقال تعالي: وعزتي لا يجاورني فيك بخيل» . واتە: بەهەشت عەرزی خوای گەورەی کرد: بەڕاستی ئەو کەسانە کە باوەڕیان بە تۆ هەیە، ئەی پەروەردگار، لە ئازاری دۆزەخ ڕزگارن و بە ئاسایشی ناو بەهەشت دەگەن. جا خوای گەورە سوێندی خوارد و فەرمووی: بە گەورەیی خۆم قەسەم ئەوانەی کە بەخیل و ڕژدن نابنە دراوسێی من لە بەهەشتدا؛ واتە: من هەمیشە بە چاوی جیلوە و میهرەبانی تەماشای بەهەشت و ئەهلی بەهەشت دەکەم و ئەوانەی لە دنیادا ڕژدن و واجیباتی مالییە و دارایی خۆیان بە خاوەن بەشەکان ناگەیێنن ئەوانە لەو جیلوە و میهرەبانییەی من بێ بەشن.

ڕیوایەت کراوە کە ئینسانی سەخی لە قیامەتا وا لە پەنای خوادا و لە بەهەشتایە و، ئینسانی ڕژد لە دۆزەخایە و دوورە لە ڕەحمەتی خوا و نزیکە لە شەیتان و ئەهلی سزا.

برایان! بزانن مەبەست لە بەخیل کەسێکە بوخل بووبێتە خووڕەوشتی و بووبێتە هۆی نەدانی واجیبات. دیارە کە بوخل گەیشتە ئەو ڕادەیە دەبێتە مایەی بەدبەختیی دنیا و قیامەت و دەبێتە بناغەی گەلێ بەدخوویی. باسی زیانی بەدخوویی‌یم لە نامەیەکی سەربەخۆدا نووسیوە.

خوایا! پەنامان بدە لە بەدخوڵکی و لە ڕژدی و لە ڕیاکردن و تاوانەکانی تری نەفسی نالەبار و لە شیرکی پەنهان.

پێویستە هەموومان دەوام بکەین لەسەر ئەم دوعای حەزرەتە کە فەرموویەتی: «اللهم اني أعوذ بك أن أشرك بك شيئاً وأنا أعلم وأستغفرك لما أعلم» و هەموو ڕۆژێ دە جار بیخوێنین. واتە: خوایا پەنا دەگرم بە تۆ لەوە کە لە کردەوەی خۆمدا ڕیا بکەم و کردەوە نیشان بدەم بە خەڵك. جا ئەم ڕیایە لە دوو سەرەوە زیانی هەیە، یەکەم خێری کردەوەی باش ناهێڵێ، دووەم دەبێتە هۆی سزای ڕۆژی قیامەت.

(اللهم لك الحمد حتى ترضى، ولك الشكر إذا رضيت وقبلت الرسالة منا. اللهم عمم نفعها وأجعلها معمولا بها بين الأخوان. وتقبل منهم فعل الخير والجود والأحسان. وإحفظ لهم الأعمال والإيمان. وأدخلنا وأياهم بفضلك وكرمك فراديس الجنان يا حنان يا منان).

وصلى اللّه على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين وأتباعه بأحسان إلى يوم الدين. وآخر دعوانا ان الحمد للّه رب العالمين.

لە (٢٥)ی جومادای یەکەمی (١٣٩٦)ی ك ڕێکەوتی ٢٤-٥-١٩٧٦ی ز لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی سێیەم

# باسی (مخوفات)ە

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمدللّه رب العالمين، والصلوة والسلام على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين وأتباعه بأحسان إلى يوم الدين.

پاش ئەوەی براکانم! لەمەوپێش نامەیەکی ڕەسام پێشکەش کردن، لەو نامەدا باسی پەرێشانیی خۆم و دڵتەنگیم لە ئەحواڵی ئێوە نووسیبوو کە بۆچی ئێوە ئەوەندە لە خوا غافڵ و بێ ئاگان؟ بۆچی شەو و ڕۆژ تەنیا بە هۆی ئەم نوێژە رووتە و ئەم ڕۆژووە سادەوە لە خۆتان بایی بوون و وادەزانن کە هەموو واجیباتی زیممەی خۆتان تەواو کردووە و حەقی بەندەییی خۆتان بۆ خوا بەجێ هێناوە؟

براکان! موسڵمانانی ئەمڕۆ گەلێ لە دین غافڵن و، گەلێ لە مانای بەندەییی بێ ئاگان و، ئەم بێ ئاگاییشە زۆر زیانی هەیە؛ بۆیە بە پێویستم زانی کەمێ لە زیانی غەفڵەتتان بۆ بنووسم، بەڵکو بیرێ بکەنەوە. خوای گەورە فەرموویەتی: «وذكر فأن الذكرى تنفع المؤمنين».

براکان! سوێندتان دەدەم بە خوای خاوەن توانا و دەسەڵات، ئایا ئەم حاڵەتە کە ئێمەی تێاین، ئەم بێ ئاگاییە لە ئەوزاعی مردن و پاش مردن و ئەحواڵی ڕۆژی قیامەت، بۆ موسڵمان شێتی نییە؟ ئەگەر ئەم بێ ئاگاییە شتێی نەبێ، ئەی شێتی چییە؟! بە خوای گەورە سوێندتان دەدەم ئایا گەڕانەوە لەم بێ ئاگاییە مەسڵەحەت نییە؟! ئایا بوونی یەکێکی وەها کە ئاگادارتان بکاتەوە و ڕووتان بۆ لای خوا هەڵسووڕێنێ، مەسڵەحەت نییە؟ سوێندتان دەدەم بە خوا، ئایا خەفەتی پێغەمبەران (د.خ) لەترسی خوا و، پەرێشانیی دۆستانی خوا و زانا گەورەکانی ئاینی ئیسلام لە ترسی سزای خوا لە خۆڕایی بووە؟! جا تکایە تۆزێ بیر بکەنەوە لەو ڕۆژەوە بوون و خۆتان ناسیوە غەیری ئەم نوێژە بێ گیانە زاهیرییەو ئەم ڕۆژووە پڕ غەفڵەتە ئێمە چ خواپەرستییەکمان کردووە ڕووی

ئەوەی هەبێ بچێتە بەردەرگای خوای گەورە؟ چ تۆشەیەکی جوان و ڕێکوپێکمان بۆ ڕێگای دووورودرێژی قیامەت ئامادە کردووە؟ ئەگەر تاوانەکانمان بە تەرازووی ڕاستی لەگەڵ کردەوەی باشدا کێشانە بکەین دەردەکەوێ تاوانمان زۆر زیاترە. من لەم نامەدا لەسەر بەجێهێنانی فەرمانی خوای گەورە، کە ئەمری کردووە بە ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان، کەمێکتان لە ئەحواڵی ساڵحان و پیاوچاکانی ئیسلام بۆ دەگێڕمەوە تا چاك بزانن کە کردەوەکانمان چەند کەموکوڕن و خێراتمان چەند کەمن و، چاکە حاڵی ببن کە پێشینان لە خاوەن کەرامەتەکان چەندێ پایەیان لە عیبادەت کردندا بەرز بووە و، چەندێ ئامادە بوون بۆ لێپرسینەوەی خۆیان، لەگەڵ ئەوەیشدا چەندێ ترس و بیمی خۆیان لە سزای ڕۆژی قیامەت دەربڕیوە؟.

با بیر لە حاڵی ئەوان بکەینەوە تا کەموکوڕیی خۆمانمان بۆ ڕوون بێتەوە؛ چونکە ئەگەر ئەحوالی ئەوان بزانین بۆمان دەردەکەوێ کە ئێمە لە دوو ڕێگاوە گیرۆدەی بەڵاو موسیبەتین، یەکەم ئەوەیە بەم کردەوە کەموکوڕییە کە دەیکەین وادەزانین لە کۆمەڵی (السابقين إلى الخيرات) حسێب دەکرێین.

دووەم ئەوەیە بە هۆی کەمێ کردەوەی باشەوە تووشی (عوجب) و لەخۆبایی بوون دەبین خۆمان بە باش دەزانین و ڕەفیقەکانمان بە کەم هیممەت دادەنێین، دیارە عوجبیش یەکێکە لە خووە ناشیرینەکان و ئەوەی تووشی عوجب دەبێ تووشی گوناهی گەورە دەبێ و، بەهۆی ئەو عوجبەوە ئەگەر کردەوەیەکی باشیشی ببێ مەحو دەبێتەوە و بێ سوود دەبێ.

بەپێی ئامۆژگاریی ئاین پێویستە هەرگیز ئینسان خۆی بە باش نەزانێ و هەمیشە لە بەینی ترس و هیوادا بێ و لە خوای گەورە بێ ئاگا نەبێ و، بۆ بەردەوام بوونی ئەم سیفەتە باشانە پێویستە ئینسان بەپێی توانا لەگەڵ پیاوچاکاندا کاتی خۆی بەرێتە سەر و تەماشای کردەوەی ئەوان بکا و خووڕەوشتی ئەوان بکاتە سەرمەشقی خۆی.

دەگێڕنەوە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ر.خ) فەرموویەتی: «ليس شيء أنفع للقلب من مخالطة الصالحين والنظر إلى أعمالهم». واتە: بۆ ڕووناکیی دڵی ئینسان هیچ شتێ لەوە چاکتر و بەکەڵکتر نییە کە لەگەڵ پیاوچاکان و خواناساندا هەڵسێ و دانیشێ و سەیری کردەوە و خووڕەوشتیان بکا و دوایان بکەوێ.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «خيار الله في ما أنبأني الملأ الأعلى،

قوم يضحكون جهراً في سعة رحمة ربهم، ويبكون سراً من عذاب ربهم بالغداة والعشي في البيوت الطيبة المساجد، يدعون ربهم بألسنتهم رغباً ورهباً».. إلى أن قال: «أرواحهم في الدنيا ووقلوبهم في الآخرة، ليس لهم هم إلا ما أمامهم، أعدوا الجهاز لقبورهم والجواز لسبيلهم والأستعداد لمقامهم». ثم تلا هذه الآية: «ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ».

واتای فەرموودەكە ئەمەیە: وەك خەڵكی جیهانی بالاّ خەبەریان داوەتیّ، چاكان و خواناسانی ڕاست ئەوانەن بە ئاشكرا پیّ دەكەنن و هیوایان بە میهرەبانیی خوای خۆیانەوە هەیە و، بە پەنامەكی لە ترسی سزای بەتینی خوا بە كوڵ دەگرین و، بەیانی و ئێوارە لە ماڵە خاوێنەكانی خوادا، لە مزگەوتەكاندا لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە لایەك لە سزای خوا دەترسن و لایەك دڵ پڕ لە هیوای میهرەبانین. ژیانیان بەدەیمەن لە دنیا دایە و دڵ و دەروونیان بەلای قیامەتەوەیە. پێویستیی قەبر و جەوازی ڕێگایان ئامادە كردووە و تەیار و ئامادەی حەسانەوەی دواڕۆژن.

خوای گەورە دەفەرموێ: «إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ». واتە: سزای خوا لەوانە نییە كەس لێی ئەمین بیّ؛ چونكە خوای گەورە حوقووقی بەسەر بەندەكانی خۆیەوە زۆرە و ترسی لە كەس نییە؛ كەوابیّ دەبیّ ئینسان هەمیشە لە خوا بترسیّ.

«روي أنه أوحى اللّه إلى داود: قل لبني أسرائيل بأي طريق وصل اليكم أني قد غفرت لاحدكم ذنبه حتى يترك الندم؟ وعزتي وجلالي لأذيقن كل مذنب على ذنبه يوم القيامة».

واتە: خوای گەورە وەحیی بۆ حەزرەتی داوود نارد (د.خ) و فەرمووی: ئەی داوود! بە بەنی ئیسرائیلەكان بڵیّ: ئەوە لە كام ڕێگاوە خەبەریان پیّ گەیشتووە كە یەكیّ لەوان گوناهـ بكا من ئەو گوناهەی دەبەخشم پێش ئەوەی تەوبە بكا و لەو تاوانە پەشیمان ببێتەوە؟ بە گەورەیی و دەسەڵاتی خۆم سوێن بیّ هەموو تاوانباریّ تالاّوی تاوانەكەی لە ڕۆژی قیامەتا پیّ دەچێژم، هەر هیچ نەبیّ تاوانەكەی دەهێنمە پێش چاوی تا شەرمەزار ببیّ، جا ئەوسا یا سزایشی دەدەم یا تاوانەكەی دەبەخشم.

براكان! هەر بەهۆی تاوان و گوناهبارییەوەیە كە ئینسان هەمیشە لە عیبادەتدا سست و تەمەڵە و، ئەگەر خواردەمەنییەكی خۆشی دەست بكەویّ بە ڕەحەتی بۆی قووت نادریّ و لەسەر زمانی تاڵ دەبیّ، شتێكی وەها دێتە پێشەوە ئەو خواردنە خۆشەی لیّ دەكاتە قوزەڵقورت و بەئاسانی و خۆشی بۆی ناخوریّ.

دەگێڕنەوە حەزرەتی یەحیا (د.خ) لە ترسی خوادا ئەوەندە گریابوو بەهۆی فرمێسکی سوێرەوە خەتی ڕەش لەسەر هەردوو کوڵمی پەیدا بوو بوو، جا حەزرەتی زەکەریای باوکی پێی فەرموو: ڕۆڵە! من بۆیە لە خوا پاڕامەوە کوڕم بداتێ تا دڵم خۆش و شاد بکا و چاوەکانم ڕوون بنەوە، ئێستا بەم گریانی تۆیە من دنیام لەبەرچاو تاریك بووە. حەزرەتی یەحیا لە وەڵامدا عەرزی کرد: باوکی گەورەم! حەزرەتی جیبرەئیل باسی ئەوەی بۆ کردووم کە گیروگرفتێ لە بەینی بەهەشت و دۆزەخدا هەیە کەس لێی ڕزگار نابێ مەگەر کەسێ لە ترسی خوادا بگری. ئینجا حەزرەتی زەکەریا پێی فەرموو: کەواتە ڕۆڵە ئەوەندە بگری کە لە قیامەتدا نەگری؛ چونکە گریانی ئەمڕۆ قازانجی هەیە نەك گریانی ڕۆژی قیامەت. پاش ئەوە حەزرەتی زەکەریا بە حەزرەتی یەحیای وت، دروودی خوایان لەسەر بێ، کوڕی خۆم! نیشانەی ترس لە خوا ئەوەیە ئینسان زۆر موشتاقی ڕەزای خوا بێ و ئارەزووی پێگەیشتنی بکا و لەسەر نارەحەتیی عیبادەت کردن سەبر بکا و خۆی ڕابگرێ و بەقەدەر دەسەڵات لە حەقی بەندەیی خۆی بۆ خوا غافڵ نەبێ.

براکان! ئاشکرایە کە پێغەمبەران خۆشەویستی خوان، جا مادام ئەوان ئەوەندە لە خوا بترسن و ئەوەندە بگرین کە فرمێسك شوێنی خۆی دیاری بکا لە ڕوومەتیاندا، دەبێ ئێمە لەگەڵ ئەم غەفڵەتە بێ ئەندازە و ئەم هەموو کەمتەرخەمییەدا حاڵمان چۆن بێ کە بیر ناکەینەوە لە ڕۆژی قیامەت و لە سزای دۆزەخ؟ بەڕاستی ئەگەر ئینسان باش بیر لە وەزعەم بکاتەوە لەوانەیە زاڵەترەك ببێ.

خوای گەورە لە قورئاندا سەبارەت بە یارانی پێغەمبەر دەفەرمووێ: «رضي اللّه عنهم ورضوا عنه». هەروەها لە هەمان ئایەتدا فەرموویەتی: «ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ». واتە: خوا ڕازییە لەوان و دەیەوێ ئەوانیش لەو ڕازی بن، ئەم ڕەزای خوایە بەشی کەسێکە کە لە خوای خۆی بترسێ و فەرمانی بەجێ بهێنێ.

لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێ کە ڕەزای خوای گەورە لە هەر کەسێ بەسراوە بە ترسی ئەو کەسەوە لە خوای خۆی؛ واتە: تا بەندە زۆرتر لە خوای خۆی بترسێ خوای گەورە زۆرتر لەو بەندە ڕازی دەبێ و، تا بەندە زۆرتر کەمتەرخەم و بێ موبالات بێ، بەرامبەر بە ئەمر و فەرمانی خوا ئەوە خوای گەورەش ئەوەندە لەو کەسە ناڕازی و بێ موبالات دەبێ.

دەگێڕنەوە ڕۆژێ حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (ر.خ) گایەکی دی نووستبوو، ئەویش فەرمووی: ئاخ من ئەو گایە بوومایە کەوا بەبێ خەم نووستووە؛ بەڵکو لە ترسی

حیسابی کردەوەی ڕۆژی قیامەت ڕزگار بوومایە. دەگێڕنەوە ڕۆژێ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحیش (ر.خ) مەڕێکی پێش چاو کەوت سەریان دەبڕی، فەرمووی: چی دەبوو ئەگەر من ئەو مەڕە بوومایە و لە ئازاری قەبر و گرفتاریی قیامەت و ئاگری دۆزەخ ڕزگار بوومایە. لەم نموونانەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم غافڵ بوون لە خوایە کە ئێمە هەمانە شێتییەکی ڕووتە و پێویستە عاقڵ خۆی لەم بێ ئاگاییە ڕزگار بکا.

براکان! من ناڵێم ئێوە واز لە دنیا بێنن و خەریکی کشتوکاڵ و بازرگانی و کاروکاسبی مەبن، نەخێر؛ ئەمە خیلافی ڕێوشوێنی ژیانی ئادەمیزادە، من ئەوەندەتان پێ دەڵێم کە ئێوە لە دین و لە ئادابی دنیا خاوەن فام بن بەجۆرێ کە دینەکەتان لە کیس نەچێ.

دنیا و دین وەك دوو باڵ وان بۆ ئینسان و، ئینسان وەك پەلەوەرە، جا هەروەکو هەر پەلەوەرێ دوو باڵی ساغی هەبێ بەئاسانی بە ئاسماندا دەفڕێ، هەروەها هەر ئینسانێ کە کاری دین و دنیای هاوسەنگ و ڕێك بێ ئەو کەسە لە دین و دنیادا بەختیار و سەرکەوتووە.

دەگێڕنەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئوممەتی من دوو غەمیان هەیە. یەکەم غەمی دنیاداری، دووەم غەمی پەیداکردنی توێشووی قیامەت؛ کەوابێ ماڵوێران ئەو کەسەیە کە بەتاڵ و بێ کارە و نە بە کاری دنیا دێ و نە بە کاری دین.

سەهلی شوشتەری کە یەکێ بووە لە پیاوە باشەکان فەرموویەتی: دەردێ کە لە هەموو دەردێ ناشیرینتر بێ ئەوەیە ئادەمیزاد نە بە کاری دنیا بێ و نە بە کاری دین، بەڵام بەداخەوە ئەوانەی کە هەست بە واجیباتی خۆیان دەکەن کەمن.

لە باسی خووڕەوشتی حەزرەتدا (د.خ) دەگێڕنەوە: «کان رسول اللّٰه دائم الحزن ويسمع من صدره أزيز كأزيز المرجل». واتە: حەزرەت هەمیشە خەمبار بووە و جار جار لە سینەی موبارەکیەوە دەنگێ دەبیسرا وەکو دەنگی مەنجەڵ لەسەر ئاگر لە کاتی کوڵاندا و، ئەم دەنگە وەکو دەنگی جۆشی سینگە لە کاتی گریاندا، بێگومان ئەم کوڵانی سینگی حەزرەتە (د.خ) لەبەر ترسی خوای گەورە بوو.

یەکەم جاری پەیدابوونی ئەم دەنگە لە سینگی حەزرەتەوە ئەوە بوو کە جارێ حەزرەتی جیبرەئیل لە کاتێکی ناعادەتییا بە شێوەیەکی پەرێشان هاتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) و لە خزمەتیدا دانیشت، لەو کاتەدا دەنگێکی نابار و زۆر بەشیددەت و ترسناك پەیدا بوو، حەزرەت گومانی برد کە ئەو دەنگە یەکێ بێ لە نیشانەکانی قیامەت؛ بۆیە لە جیبرەئیلی

پرسی ئایا ئەم حاڵە نیشانەی قیامەتە؟ جیبرەئیل وەڵامی دایەوە: نەخێر نیشانەی قیامەت نییە بەڵکو ئەو دەنگە دەنگیّ بوو لە دۆزەخەوە هات بە فەرمانی خوا تۆ بیستت تا لە وەزعی سزای دۆزەخ ئاگادار بی.

براکان! پیاوە ساڵحەکان لە سەرەتای ئەحواڵیانەوە ترسی ئەوەیان بووە لەبەر تاوانباریی خۆیان لە رۆژی قیامەتدا سزا بدرێن و، لە ئاخیری ئەحواڵیاندا ترسیان لە سزا نەبووە، بەڵکو هەر لەبەر هەیبەت و جەلالی خوا ترساون. دیارە ترسی حەزرەت (د.خ) لەبەر گوناه و تاوان نەبوو، چونکە خوای گەورە موژدەی عەفووس و مەغفیرەتی پیّ داوە و پێغەمبەران پارێزراون لە گوناه، بەڵکو ترسەکەی لەبەر گەورەیی خوا بووە. ئەم جۆرە حاڵە حاڵێکی ویجدانییە و دەشوبهێتە گریانی باوك و دایك لەکاتێکدا چاویان بە رۆڵەی دوورەوڵاتیان دەکەویّ، کە لەو وڵاتە دوورەوە دێنەوە بۆ لایان، یا بە گریانی دۆستیّ کە دۆستی خۆی دەبینیّ کە پێی دەڵێن گریانی مەحەببەت، یا دەشوبهێتە گریانی ئینسان لە کاتێکدا کارەساتێکی زۆر گەورە لە جیهاندا ڕوویدا.

دەگێڕنەوە کە (عطاء اللّه)ی سەلەمی، ماوەی چل ساڵ وابوو کە لەترسی خوای گەورە سەری بەرز نەکردووەتەوە بڕوانیّ بۆ ئاسمان و پیّ نەدەکەنی و تێر نانی نەدەخوارد، هەر کاتیّ قاتوقڕی و گرانییەك ڕووی بدایە دەیوت ئەوە هەمووی لە نەگبەتیی منەوەیە.

براکان! دەوام کردن لە غەفڵەت و بیّ ئاگایی بەم ڕادەیە کە ئێستا موسڵمانان لەسەری دەڕۆن لە ئادابی ئاینی ئیسلامەوە زۆر دوورە و، خوای گەورە زۆر عاجزی و نارەزایی بەرامبەر بەو کەسانە دەردەبڕیّ کە بە تەنیا ناوی ئیمان و ئیسلام قەناعەت دەکەن و نیتر هیچ سەعی و کۆششیّ لە ڕێگەی ئایندا ناکەن.

تەماشاکەن خوای گەورە فەرموویەتی:«الم[١] أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ[٢] وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ».

واتە: ئایا خەڵکی وادەزانن بە تەنیا ئەوە کە بڵێن ئێمە موسڵمانین وازیان لیّ دەهێنین بەبیّ ئەوەی لە ڕێگەی ئیسلامییەتا تووشی ئازار ببن و بەبیّ ئەوەی لە ڕێگای ئایندا تیّ بکۆشن، ئێمە بەو ناوی ئیسلامەتییە ڕووتە لێیان ڕازی نابین، بەڵکو بە پێی بەسەرهاتی موسڵمانانی پێشوو پێویستە تووشی زەحمەت ببن و تاقی بکرێنەوە، ئەوسا ئەوانە کە دڵسۆزی و ڕاستییان دەرکەوت و جیابوونەوە لەوانەی کە ئیمانیان بیّ هێز و لاوازە، بەپێی پایەی خزمەت کردنیان جەزای کردەوەکانیان دەدەینەوە.

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: «أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى». واتە: ئایا ئینسان لای وایە کە بەبێ ئەوەی لە دنیادا، لە ڕێگەی دنیا تێ بکۆشێ و لە ڕۆژی زەحمەتا خۆی بگرێ، وازی لێ بهێنین؟! ئەم وازلێهێنان و پشتگوێ خستنە لەگەڵ ڕێوشوێنی کاری خوای گەورە ناگونجێ. چۆن بە بەتاڵی و لێ نەپرسراوی وازی لێ دەهێنرێ؟! واتە پێویستە بەندەیی کردن بۆ خوا و فەرمانبەرداری و بە گوێکردنی فەرمانەکانی خوا بە شێوەی ڕاستی دەربکەوێ و، ئینسان دەبێ بە هەر جۆرێ لەباریدا هەبێ زەحمەت بکێشێ، ئەوسا خواش بە گەورەیی و چاکی و میهرەبانیی خۆی پاداشتی دەداتەوە.

براکان! دەخیلتان بم، دەستم بە دامێنتان، ئاگاتان لە خۆتان بێ و، تا گیانتان لەبەرایە و بە سەر زیندوون و هێزێکتان تیایە بیری مردنتان هەبێ و، تا لەشتان ساغە ئاگاتان لە کاتی ناساغی و نەخۆشی بێ. خوا دەفەرمووێ: «فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلاً وَلْيَبْكُواْ كَثِيراً». واتە: با موسڵمانان زۆر بگرین و کەم پێکەنن. دیارە ئەم ئایەتە زۆر زۆر هەڕەشەی تیایە بۆ ئەوانەی غافڵن و ئاگایان لە مردن و لە ڕۆژی قیامەت نییە.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێ ئیبراهیمی ئەدهەم لە شوێنێکدا بەبێ دەنگی دانیشتبوو، عەرزیان کرد: بۆچی وەها بێدەنگی و ئامۆژگارییەکمان ناکەی؟ فەرمووی: تو خوا وازم لێ بێنن، دڵم بە بیرکردنەوە لە چەند شتێ داماوە؛ یەکەم: نازانم لەو کاتەدا کە خوای گەورە پرسیاری لە ڕۆحەکان کرد و فەرمووی: «أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ»، جوابی ڕۆحی من چی بوو، (نعم) بوو یا «بلی»؟ دووەم: لەو کاتەدا کە خوا فەرموویەتی:«هؤلاء إلى الجنة وهؤلاء إلى النار» من لە کام تیرەیان بووم. سێیەم: لەو کاتەدا خوای گەورە فریشتەی نارد و فووی کرد بە لەشمدا و گیانم تێدا دروست بوو و ئەحواڵی منی نووسی ئاخۆ من لە بەختیارەکان نووسراوم یا لە زومرەی چارەڕەشەکان. چوارەم: نازانم لە کاتێکدا گیانم دەردەچێ و دەستم لە هەموو لایێ دەبڕێ، بێ ئیمان دەڕۆم و ماڵئاوایی لەم جیهانە دەکەم یاخۆ بە ئیمان و ئاخر خێرییەوە. پێنجەم لەو کاتەدا کە فریشتەکان بانگ لە ئەهلی عەرەسات دەکەن، پاش کۆبوونەوەیان و پێیان دەوترێ: «وأمتازوا اليوم أيها المجرمون». واتە: ئەی تاوانبارەکان خۆتان لە ئەهلی ئیمان و باوەڕ جیابکەنەوە، بەڵێ ئاخۆ لەو کاتەدا من لە کام بەشیان دەبم؟.

برا عەزیزەکانم! وەك پێویستە زۆر سوپاسی خوای (أرحم الراحمين) بکەین لەسەر ئەوە کە ئیمان و باوەڕی پێ داوین و بەو ئیمانە ڕزگار بووین لە ئاگری نەبەدیی دۆزەخ،

وەهاش پێویستە لەسەرمان کە هەمیشە ترسی خوامان لە دڵدبی و لە ئازاری قەبر و قیامەت و دۆزەخ بترسین، چونکە دەوام لەسەر ئیمان و عاقیبەت خێری لە ئێمەوە دیار نییە؛ ئەوەتە تەماشا دەکەن کاتێ کە موسیبەت و بەڵایێ دێ بەسەرماندا چۆن دڵمان تێکدەچێ و چەند خەیاڵی ناشیرین دەکەین. خوا بە میهرەبانیی خۆی چاوپۆشیمان لێ نەکا، هەرگیز ڕزگار نابین، هەروەها کاتێ کە دارایی و نیعمەت و پایەیەکمان پێ دەدا، چەند لە خۆمان بایی دەبین و چەند یاخی دەبین و لە ڕێگای ڕاست لادەدەین، کە ئەگەر خوا بە لوتف و ئیحسانی خۆی چاوپۆشیمان لێ نەکا، حاڵمان خراپ دەبێ.

براکانم! پێویستە هەمیشە لە بەینی ترس و هیوادا بین؛ چونکە ڕۆژی قیامەت نابڕێتەوە و، سزای ئەبەدی کە بەهۆی بێ ئیمانییەوە بەسەر ئینساندا دێ تەواو نابێ، پەنا بە خوا. هەروەها ڕەحمەتی خوا و نیعمەتی بەهەشتیش، کە بە هۆی میهرەبانیی خوا و ئیمان و باوەڕ و دەوام لەسەر خووڕەوشتی حەزرەتی پێغەمبەرەوە دەستی ئینسان دەکەون، نابڕێنەوە.

براکان! باشترین حاڵی ئینسان (اعتدال)ە، واتە میانەڕەوی. یەعنی هەمیشە ئینسان تەماشای دوو حاڵ بکا بۆ خۆی؛ چاوی لە ئیمان و کردەوەی باش و ڕەوشتی باشەوە بێ بۆ وەرگرتنی پیرۆزی و بەختیاریی نەبڕاوە. هەروەها چاویشی لە پەیداکردنی دنیای حەڵاڵ و فێربوونی زانست و پیشەی بەرز و پاکەوەش بێ، بۆ دەستخستنی سامان بۆ خزمەت کردنی ئینسان خۆی و کەسوکاری و بۆ خزمەت کردنی ئاینی ئیسلام و وڵاتی ئیسلام و چارکردنی گیروگرفتیان. ئادەمیزاد وەك پەلەوەرە کە بە دوو باڵ دەفڕێ، ئینسانیش بەو دوو جۆرە باڵی تر کاری تەواو دەبێ؛ باڵێ بۆ حاڵی دین و باڵێ بۆ حاڵی دنیا.

خوای گەورە سەد دەرەجە ڕەحمەتی هەیە تەنیا یەکێکیانی بۆ دنیا و ئەهلی دنیا داناوە، ئەو نەوەد و نۆ دەرەجەکەی بۆ قیامەت هەڵگرتووە.

لە خوای گەورە و میهرەبانم دەوێ کە بە ڕەحمەتی خۆی وەك ئیمانی پێ بەخشیوین دەوامیشمان پێ ببەخشێ، لەسەر ئەو ئیمانە و لەسەر کردەوەی چاك و ڕەوشتی بەرزی فەخری عالەم (د.خ).

لە (٤)ی جومادای دووەمی (١٣٩٦)ی ڕێکەتی ١-٦-١٩٧٦ی ز لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا

وەرگێر

## نامەی سی و یەکەم

# باسی کوفرە - والعیاذ باللّه

بسم اللّه الرحمن الرحیم

الحمد للّه رب العالمین. والصلاة والسلام علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه أجمعین وأتباعه بأحسان إلی یوم الدین.

پاش ئەمانە براکان! بزانن خۆپاراستن لە گوناهـ گەورەتر و چاکترە لە عیبادەت و تاعەت کردن و، دوورکەوتنەوە لەو شتانەی نەهییان لێ کراوە پاداشتی زۆرترە لە بەجێهێنانی ئەو شتانەی ئەمریان پێ کراوە، بە تایبەتی خۆپاراستن لەو گوناهە گەورانە کە بە (أکبر الکبائر) دەژمێردرێن و نۆ گوناهن و لە غەیری ئەمانەش لە گوناهە گەورەکان کە حەوت سەد گوناهن.

دیارە گەورەتر و خراپتر و ناشیرینتر لە هەموو گوناهێ کوفرە، پەنا بە خوا، چونکە بە تەواوی و هەتا هەتایە ئینسان دەفەوتێنێ. پێویستە بزانن هەر وتارێ یا هەر کردەوەیێ ببێتە هۆی کوفر، چ لەسەر عەقیدە و باوەڕ بێ یا لەسەر عەناد و سەرکێشی بێ، یا بە گاڵتەوگەپ بێ یا لە ڕووی ئیستیهزا و بە سووکی تەماشاکردن بێ، ئەوە خاوەنەکەی دەگاتە (مرتد) واتە: لە دین وەرگەڕاو و دەیخاتە ڕیزی کافرانەوە، دیارە هەر شتێ کە هۆی تەکفیری خاوەنەکەی بێ لە یەکێ لە سێ بەش دەرناچێ واتە: ئیعتیقاد، عەناد، ئیستیخفاف. جا هەر کەس ئەم نامەیە دەخوێنێتەوە بە شێوەی ئیرشاد و ئامۆژگاری بۆ موسڵمانان پێویستە ئەوەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە ئەوەی ئینسان کافر دەکا چ ئینسانەکە باوەڕی لەسەر ئەو شتە بێ، یا باوەڕی وا نەبێ بەڵام بە عەناد و سەرکەشی ئەو قسە یا ئەو کارە بکا، یا بە شێوەی ئیستیخفاف و بە سووك تەماشکردنی بێ، ئەوە خاوەنەکەی کافر دەکا. لەم ڕووەوە لەسەر پێشەوای موسڵمانان پێویستە لەپێشدا داوای تەوبە و پەشیمان بوونەوە لەو کەسە بکا، جا ئەگەر کابرا تەوبەی نەکرد و پاش مۆڵەتی سێ ڕۆژ نەهاتەوە سەر ڕێگای ڕاست، بۆ ئەو پێشەوا و فەرمانڕەوای موسڵمانانە دروستە ئەو کەسە بکوژێ.

جا ئەگەر لەسەر ئەم شێوەیە کوژرا ئەو کەسە وا دادەنرێ کە هەرچی عیبادەت و خواپەرستی بووە هەمووی بەخۆڕایی دەچێ و بە کوفرەوە ڕوودەکاتە جیهانی قیامەتی نەبڕاوە (والعیاذ باللّه). خۆ ئەگەر تۆبەش بکا خێر و جەزای ئەو خواپەرستییانەی کردوونی هەر ناگەڕێتەوە بۆی، تەنانەت لای هەندێ لە زانایانی ئاین لە کاتی تەکلیفەوە تا ئەو کاتە هەرچی واجیباتی کردووە، پێویستە هەموویان بگێڕێتەوە، بەڵام لای ئیمام حەنیفە، خوای لێ ڕازی بێ، هەر حەجەکەی پێویستی بە قەزا هەیە و دەبێ بیگێڕێتەوە. هەروەها لە مەزهەبی ئیمامی شافعیدا، خوای لێ ڕازی بێ، هەر واجیباتێ کە کردوویەتی قەزای واجب نابێ و بەهۆی کوفرەکەیەوە بەتاڵ نابنەوە.

هەروا ئەگەر مارەبڕاوێکی بوو نەچوویبووە لای ئەوە بە هۆی کوفرەکەیەوە کتوپڕ بائینە دەبێتەوە و بە ژنی حیساب ناکرێ. بۆیە پاش موسڵمان بوونەوەی واجیبە دووبارە مارەی ببڕێتەوە. بەڵام ئەگەر چووبووە لای واجبە لێی جیابێتەوە. جا ئەگەر لەپێش تەواوبوونی عیددەی ژنەکەی موسڵمان بوویەوە، ئەوە دێتەوە ژێر نیکاحی. خۆ ئەگەر پاش تەواوبوونی عیددەی موسڵمان بوویەوە ئەوە عەقدی نیکاحێکی تازە نەبێ بۆی حەڵاڵ نابێتەوە، واتە: ئەگەر بەبێ عەقدی نیکاحێکی تازە بچێتە لای، ئەوە ئەو چوونە لایە بە زینا دەژمێردرێ.

جا ئەگەر هەر بەو حاڵەوە بمرێ، واتە پێش تەوبەکردن و گەڕانەوەی بۆ دینی ئیسلام ئەوە بە کافری جەهەنەمیی ئەبەد دەناسرێ و دروست نییە لە قەبرستانی موسڵماناندا دەفن بکرێ. هەروەها میراتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خەزینەی (بیت المال) و بە پێی ڕێوشوێنی شەرعی سەرف دەکرێ.

شایەنی وتنە تەوبەی ئەم لە دین وەرگەڕانە بەوە دەبێ کە بە دڵ لەو کوفرە پەشیمان بێتەوە و عەزمی وابێ کە تا ماوە لە دنیادا نەڕواتەوە سەر ئەو کوفرە و، بە زمان لەگەڵ ئاگادارێی دڵدا دوو کەلیمەی شەهادە بڵێ کە (أشهد أن لا اله إلا اللّه وأشهد أن محمداً رسول اللّه)ن. هەروەها بڵێ: من بەریم و دوور لە هەموو جۆرە ڕەفتارێك و لە هەموو جۆرە وتارێ کە موخالیفی ئاینی پاکی ئیسلام بێ.

ئەگەر یەکێ بە زمان کەلیمەی کوفری وت و لەپاشدا ئیددیعای کرد کە (توریە)ی کردووە، واتە وتی لەو لەفظە کوفرە مەعنا دیارییەکەم نەگرتووە کە کوفرە بەڵکو مەعنایەکی ترم مەبەست بووە، بۆ نموونە بڵێ (من کافرم) و ئیددیعای ئەوە بکا کە

مەبەستی لە (کافر) فەللاح بووە کە تۆو لە عەرزا دادەچێنی و دەیشارێتەوە و، (کافر) لە زمانی عەرەبیدا بەو کەسەش دەڵێن کە شتێ بشارێتەوە، ئەوە بە زاهیری شەرع کافر دەبێ، بەڵام لە باتیندا ئەگەر ئەو مەعنایە مەبەست بووبێ کە خۆی دەڵێ ئەوە موسڵمانە و، ئەگەر ئەوەی مەبەست نەبووبێ کافرە.

ئەگەر یەکێ لە دڵدا باوەڕی لەسەر شتێ بێ کە هۆی کوفر بێ، بۆ نموونە: باوەڕی وابێ کە خوا نییە، یا فریشتەکانی خوا نین، یا پێغەمبەران نین، یا خوا کتێبی بۆ نەناردوون، یا ڕۆژی قیامەت نییە و نابێ، یا بەهەشت و دۆزەخ نین، یا پێنج فەرزەی نوێژ واجیب نین، یا ڕۆژووی ڕەمەزان یا زەکاتدان یا حەج کردن واجیب نین ئەوە کافر دەبێ هەرچەند ئەو باوەڕەش دەرنەبڕێ و هەر لە دڵیدا بێ. بەڵام ئەگەر بە وەسوەسە و وتووێژە ئەم شتانەی بە دڵدا بێن و، لە نەفسی خۆیدا مەلوول و عاجز بێ، لێیان و ڕقی لێیان بێ، ئەوە کافر نابێ، چونکە ئەو زویریی دڵە دەلیلە لەسەر ئەوە کە موسڵمانە و، ئەو وتووێژەیە لە لایەنی شەیتانەوە خراوەتە ناو دڵی و، بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) مادام کابرا بە دڵ عاجز و نارازی بێ لەم خەیاڵاتە خراپانە، ئەوە لە ڕاستیدا بە موسڵمانێکی تەواو دەناسرێ.

ئەگەر کەسێ کردەوەیەکی لێی ڕوویدا، بە دەسەنقەست یا بە گاڵتە، کە دژی ئیسلامییەت بێ، وەك سوجدەبردن بۆ بت یا زەننار بەستن یا سەلیب هەڵگرتن یا هەر شتی تر لەو شتانەی نیشانەی جیابوونەوەی کافرن لە موسڵمانان یاخۆ بێ ئیحترامی لەگەڵ قورئانی پیرۆز بکا، ئەوە ئەو کەسە بە کافر دەناسرێ، هەر چەند لە دڵدا ئیمان و باوەڕی ئیسلامییەتی هەبێ؛ چونکە ئەوانە کە وتمان بۆ کافران دەبن و بۆ موسڵمان دەست نادەن.

بەڵام ئەگەر کەسێ سوجدەی بۆ ئینسانێ برد، چ لەبەر گەورەییی دنیایی یا لەبەر گەورەییی ئاینیی، وەك کردەی هەندێ لە نەزانان لە مورید و مەنسووبی شێخەکان، ئەوە ئەگەر مەبەستی لەو سوجدەیە، سوجدەی عیبادەت بێ، وەك سوجدە بۆ خوای گەورە، ئەوە کتوپڕ کافر دەبێ و پێویستە حاڵی بکرێ تا تەوبە بکا و پەشیمان بێتەوە و، لەو شەریك بۆ خوا دانانە ڕزگار ببێ، چونکە کەس شایانی ئەوە نییە سوجدەی عیبادەتی بۆ ببرێ زاتی خوای گەورە نەبێ (وحده لا شریك له).

خۆ ئەگەر مەبەستی سوجدەی عیبادەت نەبوو بەڵکو هەر بۆ خۆشەویستی یا بۆ

ڕێزلێنان بوو ئەوە کافر نابێ، بەڵام ئەو کارەی بە گوناهی گەورە دادەنرێ؛ بۆیە پێویستە ئەو کەسە ئاگادار بکرێ کە زوو لێی پەشیمان بێتەوە و جارێکی تر نەیکا؛ چونکە کردەوەیەکی مەشبووهـ و ناشیرین و ناڕەوایە و هەرگیز دروست نییە بەرامبەر بە کەس شتێ بکرێ کە لە عیبادەتی خوا بکا، بەڵێ پێویستە زاناکانی ئاین ئاگایان لەم مەسەلەیە بێ و ئامۆژگاریی موسوڵمانە نەزانەکان بکەن.

لەم بابەتەوە هەندێ قسە هەن کە ناشیرین و ناڕەوان بەڵام بۆتانی باس دەکەم، چونکە گەلێ کەس پێیانەوە گیرۆدە بوون، بەڵکو تەرکیان بکەن.

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێ بڵێ (بێ دین) یا (کافر) پێویستە پێی بڵێن مەبەستت لەم قسە چییە؟ ئەگەر وتی مەبەستم ئەوەیە ئەو وەزعە ئەو لەسەریەتی دین نییە و ئیسلامییەت نییە، لە کاتێکدا کە کابرا موسوڵمانە، پێی بڵێن: وا کافر بووی و پێویستە گورج پەشیمان ببیتەوە و نەگەڕێیتەوە سەر ئەم جۆرە قسانە؛ ئەگینا خۆت کافر دەبی، چونکە موسڵمان بە کافر کردن مەعنای ئەوەیە کە ئیسلامییەت کوفرە، ئەمەش دژی ئاینی ئیسلامە.

خۆ ئەگەر وتی: مەبەستم ئەوە بووە کە کردەوە و ڕەوشتی لە کردەوە و ڕەوشتی موسڵمانان ناکا پێی بڵێن: کافر نەبووی بەڵام پێویستە لەسەر ئەم قسەیە تەعزیر بکرێی و تەمێت بکەن؛ چونکە حەرامە کەلیمەی گومان لێکراو و ناشیرینی وا بڵێی بە ئینسانێ کە موسڵمان بێ، هەر چەند فاسقیش بێ.

بەڵام ئەگەر وتی: هیچ نییەتێکم نەبووە و هەروا ئەو کەلیمەم بە زماندا هاتووە، لێی بپرسن تۆ بەرانبەر بە لەفزی وەها ئیعتیقادت چۆنە؟ ئەگەر عەقیدەی وایە کە بەکارهێنانی ئەم کەلیمانە بەرامبەر موسڵمانان دروستە، ئەوە کافر دەبێ، چونکە حەرام بە حەڵاڵ دەزانێ. خۆ ئەگەر عەقیدەی وابوو کە دروست نییە و وتی هەر بەدەممدا هات و، عوزری هێنایەوە، ئەوە تەنیا پێویستە تەوبە بکا و لێی پەشیمان بێتەوە.

براکان! هەر کەلیمەیێ ئیحتیمالی ئیعتیقاد و عەناد و ئیستیخفاف و غەیری ئەم سێیانەیش هەڵبگرێ، پێویستە کاتێ بە کوفر حسێب بکرێ کە بە یەکێ لەو سێ شێوە بێ کە بەهۆی کوفرمان دانان، نەك بەشێوەی غەیری ئەوانە بێ؛ چونکە نیسبەتی کوفردان لە موسڵمان زۆر زەحمەتە و، ئەگەر بەشێوەیێص‌ص ڕاست نەبێ دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو کەسە کە نیسبەتەکەی داوە؛ پێویستە ئاگادار بن لەمە.

براكان! كەسێ بە درۆ بڵێ بە یەکێ: خوا دەزانێ من تۆم خۆش دەوێ، یا خوا دەزانێ ئەو کارەم کردووە، یا ئەو قسەم وتووە، یا ئەو کارەم نەکردووە، یا ئەو قسەم نەوتووە، ئەوە ئەو کەسە کافر دەبێ؛ چونکە قسەکەی دەبێتە هۆی نیسبەتی غەڵەتدان بۆ لای عیلمی خوا، چونکە مادام ئەو قسەکەی نەوتبێ و بڵێ: خوا دەزانێ وتوومە ئەوە مەعنای وایە کە عیلمی خوا بە خیلافی واقیعەوە پێوەندیی بەستووە.

هەروەها ئەگەر بڵێ: خوایش ئەو ئەمرە یا ئەو نەهییە بکا باوەڕی پێ ناکەم، یا پێغەمبەر یا جیبرەئیل یا فریشتەکان ئەو قسە بکەن باوەڕ ناکەم پێی، ئەوە کافر دەبێ، چونکە باوەڕ نەکردن بە خوا و بە پێغەمبەری خوا و بە جیبرەئیلی ئەمین یا بە هەموو فریشتەکان، کە جیبرەئیلی ئەمین یەکێکیانە، بە کوفر دادەنرێ.

وە ئەگەر بڵێ: خوا شایەتی بدا لەم کارەدا یا پێغەمبەر شایەتی بدا قبووڵی ناکەم، ئەوەش کوفرە؛ چونکە ڕەددی شایەتی ئەمانە مەعنای باوەڕ پێ نەکردنیانە و ئەوەش کوفرە.

ئەگەر بڵێ، هەرچی ئادەمیزاد هەیە هەموو شایەتی بدەن قبووڵی کەم ئەمەش هەر کوفرە، چونکە عیبارەتی (هەرچی ئادەمیزاد هەیە) پێغەمبەرانیش دەگرێتەوە و ڕەدی شایەتیی پێغەمبەرانیش کوفرە.

ئەگەر یەکێ بڵێ: من بەبێ مەیل و مەشیئەتی خوا ئیش دەکەم، بڵێ با خوا مەیلی ئەو ئیشەش بکا من نایکەم، دەبێتە کوفر، چونکە بوونی شتێ بەپێچەوانەی خواستی خواوە مەحاڵە.

هەروەها گاڵتەکردن بە وەعدی خوای گەورە کوفرە. بۆ نموونە: خوا بەڵێنی بەهەشت و ناز و نیعمەتی بە نوێژکەران داوە کەچی یەکێ گاڵتە بەم بەڵێنە بکا. گاڵتەکردنی گوناهبارانیش بە هەڕەشە (وعید)ی خوای گەورە هەر کوفرە؛ وەك ئەوەی خوا گەورە هەڕەشەی کردووە لەوانەی گوناه دەکەن و سزای خەڵك دەدەن و، یەکێك گاڵتەی بەم هەڕەشەیەی خوا بێ، (والعیاذ باللّه).

ئەگەر کەسێ بە شێوەی ئیستهزا یا سەرکەشی بڵێ: ئەو خانووە یا ئەو مزگەوتە ببێ بە قیبلە ڕووی تێ ناکەم، یا بڵێ خوا ئەگەر بەهەشت بدا بەمن ناڕۆمە ناوی، یا بە شێوەی بە سووك زانین تەماشای عیبادەتێ بکا وەك نوێژ یا ڕۆژوو، یا بڵێ: خوای گەورە فلان کەس

بکا بە پێغەمبەر باوەڕی پێ ناکەم و ئیمانی پێ ناهێنم، یا کاغەزێ فڕێ بداتە ناو شتێکی پیسەوە کە ئەو کاغەزە ناوی خوا یا پێغەمبەر یا ناوی مەلائیکە یا ئایەتێکی قورئان یا فتوای زانایەکی ئاینیی باوەڕپێکراوی لێ نووسرابێ، ئەوە بەم شتانە کافر دەبێ. هەروەها ئەگەر کەسێ فتوای عالمی شەرع بە شێوەی سەرکەشی فڕێ بداتە ناو شوێنی ناشیرین یا بیکوتێ بە عەرزا کافر دەبێ. هەندێ لە زاناکانی ئاین فەرموویانە: ئەگەر یەکێ مەسەلەکانی عیلمی نەحویش بەسووکی و تەحقیرەوە فڕێ بدا هەر کافر دەبێ.

ئەگەر ژنێ لە مێردەکەی بێزار بێ و بڵێت کافرببم باشترە لەوە لەگەڵ تۆدا بم، ئەوە کافر دەبێ.

ئەگەر یەکێ ناوێکی بەپێی ئاین گەورە لە ئەنگوسیلەکەیدا بوو و بەو دەستەی کە ئەنگوستیلەکەی تیایە لە کاتی دەس بە ئاو گەیاندندا خۆی پاك بکاتەوە ئەوە کارەکەی حەرامە. خۆ ئەگەر بە شێوەی سووکی و بەکەم زانینی خاوەن ناوەکە خۆی پێ پاك کردەوە کافر دەبێ. ئەگەر کەسێ جنێو بە حەزرەتی محەمەدی مستەفا (صلیٰ الله علیە وسلم) بدا کافر دەبێ، تەنانەت لای ئیمامی ئەعزەم ئەبوو حەنیفە و لای هەندێ لە زانایانی شافیعی مەزهەب ئەم جۆرە کەسە ئەگەر تەوبەش بکا، پێویستە بە حەددی شەرعی بکوژرێ، واتە با بە تەوبەکە موسڵمان بێتەوە، بەڵام وەك حەددی شەرع دەکوژرێ هەروەکوو زیناکەری (محصن) واتە ئافرەتی شووکردوو و پیاوی ژنهاوردوو کە زینایان کردبێ.

کەسێ ئینکاری پێغەمبەرایەتیی یەکێ لە پێغەمبەران بکا، کافر دەبێ، بەڵام ئینکاری پێغەمبەرایەتی کەسێ کە ئیختلاف لە پێغەمبەرایەتییدا هەبێ ، وەك حەزرەتی لوقمان و خزر، کوفر نییە، بەڵێ حەرامە بە جەزمی بڵێ پێغەمبەر نین، دەبێ بڵێ: هەندێ لەو زانایانە لایان وایە پێغەمبەر نین.

ئەگەر کەسێ بە شێوەی خۆزگە بڵێ: کاشکی من لەباتی (محەمەدی امستەفا)، یا پاش زەمانی ئەو پێغەمبەر بوومایە، ئەوە کافر دەبێ.

ئەگەر یەکێ تەکزیبی پێغەمبەر بکا لە قسەیەکدا کە سابت بێ، قسەی پێغەمبەرە، ئەوە کافر دەبێ.

پوختەی قسە: هەر کەسێ نیسبەتی عەیبێ یا نەقسێ لە یەکێ لە پێغەمبەران بدا کافر دەبێ.

ئەگەر یەکێ ئینکاری زیندووبوونەوەی دوارۆژ، یا ئینکاری حیساب و میزان، یا ئینکاری عەزابی قەبر بکا کافر دەبێ، هەروەها ئەگەر ئینکاری رەفاقەتی ئەبوبەکری سددیق بکا بۆ حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ)، یا باوەڕی بەو بوختانە هەبێ کە بۆ حەزرەتی عائیشە هەڵبەسترا، یا باوەڕی وابێ یەکێ لە خەلیفەکان لە یەکێ لە پێغەمبەران گەورەترە، یا یەکێ لە دۆستانی خوا (أولیاء) لە یەکێ لە پێغەمبەران گەورەترە، کافر دەبێ. جنێودان بە یەکێ لە هاوریەکانی پێغەمبەر وەك حەزرەتی مەعاویە یا هاوڕێیەکی تر گوناهی گەورەیە و بەو جنێودانە مرۆ فاسق دەبێ، بەڵام بەڕای هەندێ لە زانایانی شافیعی مەزهەب مرۆ بە جنێودان بە هاوڕێیانی پێغەمبەر کافر دەبێ. خۆ ئەگەر جنێودانەکە لەبەرئەوە بێ کە ئەوانە هاوڕێی پێغەمبەر بوون ئەوە بە ئیتیفاقی هەموو لا، دەبێتە هۆی کافری. هەروەها جنێودان بە یەکێ لە ئالی پێغەمبەران (د.خ) لەبەرئەوە کە لە ئالی پێغەمبەرە، کوفرە؛ چونکە دەبێتە تەحقیر و بێ ئەدەبی لەگەڵ پێغەمبەرا (د.خ).

بە شێوەیەکی گشتی، هەر سوننەتێ لە سوننەتەکانی حەزرەت (د.خ) کە سابت بێ، هەر کەسێ ڕەخنەی لێ بگرێ یا بە باشی نەزانێ کافر دەبێ؛ چونکە ئەمە دەکێشێتەوە سەر باوەڕ نەکردنی بە حەزرەت (د.خ). هەر کەسێ عەیبێ بداتە پاڵ یەکێ لە پێغەمبەران بەجۆرێ کە دژی قەدر و حورمەتی بێ ئەوە کافر دەبێ.

هەر کەسێ خۆی ببەستێ بە شتێکەوە و، بەزمان یا بە عەزمی ڕاستی دڵ، بڕیاربدا، بۆ نموونە: هەر کاتێ بڵێ فلان کەس بمرێ کافر دەبم، ئەوە تەنیا بە بڕیارەکە کافر دەبێ. یا ئەگەر بڵێ هەر کاتێ فلان کەس زوڵم لە من بکا، کافر دەبم، ئەوە گورج کافر دەبێ، پەنا بە خوا.

بەڵام ئینسان بە (حدیث النفس) یا بە خەڵات و خەتەراتی شەیتانی کافر نابێ؛ چونکە ئەم جۆرە خەیاڵاتە بە دەستی ئینسان نییە و بە ناچاری دێن و دەڕۆن، تەنانەت ئەگەر ئەو خوتوورە و خەیاڵاتە ببنە نەخۆشییەکی هەمیشەییش مادام کابرا بە دڵ عاجز بێ، لێیان و پێیان ڕازی نەبێ کافر نابێ.

هەر کەسێ باوەڕی بە پێچەوانەی حوکمێ لەحوکمەکانی دین هەبێ، بۆ نموونە: شتێك یا کارێکی حەرام بە حەڵاڵ بزانێ، حەڵاڵێ بە حەرام بزانێ، مادام ئەو حوکمە لە دیندا ئیجماعی لەسەر بێ و لەوانەبێ کە هەموو موسڵمانان بیزانن، ئەوە کافر دەبێ.

هەر کەس ئینکاری ئەو نوێژە سوننەتانە بکا کە بە ئیجماع سوننەتن، ئەوە کافر دەبێ؛ چونکە ئەمانە بەئاشکرا لە دیندا زانراون.

ئەگەر کەسێ بە یەکێکی وت: لەعنەت لە تۆ و باوك و باپیرت تا ئادەم، ئەگەر ئەو کەسە مەبەستی هەموو ڕشتەی باوك و باپیری بێ، بە پێغەمبەرەکانیشەوە ئەوە (فوراً) کافر دەبێ. بەڵام ئەگەر مەبەستی غەیری پێغەمبەرەکان بێ، ئەوە کافر نابێ، تەنیا گیرۆدەی گوناهی گەورە دەبێ چونکە لەو ڕشتەدا پیاوی موسڵمان زۆرە و موسڵمانی عادل و پیاوچاکیان تیدا بووە؛ دیارە لەعنەتیش لەوانە گوناهی گەورەیە.

ئەگەر لەعنەت بکا لە هەرچی زانایە، ئەوە کافر دەبێ، ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ کەسی لێ بەدەر نەبێ؛ چونکە پێغەمبەرەکانیش لە زانایان حسێب دەکرێن، خۆ ئەگەر مەبەستی غەیری پێغەمبەران بێ، ئەوە کافر نابێ، بەڵام کارەکەی گوناهێکی گەورەیە.

هەر کەس باوەڕی وابێ کە لەوانەیە پاش پێغەمبەری ئاخر زەمان (د.خ) پێغەمبەرێ بێت ئەوە کافر دەبێ؛ چونکە بە نەصی قورئانی پیرۆز حەزرەتی (محەمەدی مستەفا) دروودی خوای لێ بێ، دوا هاوەری پێغەمبەرانە، ئیتر حەزرەتی عیسا، کە لە زەمانی دەجاڵدا دێتە خوارەوە و دەجاڵ دەکوژێ، بە شەرعی حەزرەتی محەمەد ڕەفتار دەکا و بە پێی ئاینی ئیسلام دەجوولێتەوە.

ئەگەر کەسێ تەمەننا بکا و بڵێ: خۆزگا زینا و قەتل و دەسدرێژی کردن لە خەڵق، کە لە هەموو ئاینێکدا حەرام بوون، لەم عەسرەدا حەڵاڵ بوونایە، ئەوە کافر دەبێ. بەڵام بە تەمەننا حەڵاڵ بوونی شتێ کە لە هەندێ ئایندا حەڵاڵ بوویێ و لە هەندێکدا حەرام، وەکو شەراب خواردنەوە، ئەوە کافر نابێ، چونکە لە هەموو ئاینێکدا حەرام نەبووە.

ئەگەر کەسێ بڵێ: گۆرانی وتن لە قورئان خوێندن قازانجی زیاترە بۆ دڵ و کار زیاتر دەکا بۆ ساف کردنی دڵ ئەوە کافر دەبێ.

ئەگەر کەسێ بڵێ: بەم چاوانی خۆمە خوام چاویێ کەوتووە یا ڕوویەڕوو قسەم لەگەڵا کردووە، ئەوە کافر دەبێ؛ چونکە ئەم قسانە دەچنە سەر نیسبەتدانی حودوس و سیفاتی حەوادیس بۆ زاتی خوای گەورە وەکو ڕەنگ و لەش و تەرکیب و ئیحتیاج، خواش لەمانەوە دوورە و بەرییە.

ڕازی بوون بە کوفر، کوفرە، ئەگەرچی ئەو ڕازی بوونەش ڕاستەوخۆ نەبێ بە شێوەیەکی وەهابێ کە مانای ڕازی بوون بگەیێنێ، بۆ نموونە: کافرێ بێتە لای موسڵمانێ و پێی بڵێ موسڵمان دەبم و دەمەوێ فێرم بکەی و، ئەوەش کە کافرەکەی هاتووەتە لا بۆ ئیسلام بوون، ئادابی ئاین بزانێ و فێری نەکا و بڵێ: سەبر بکە تا ڕۆژێکی

تر سەعاتێکی تر، ئەوە، لەبەرئەوەی دەبێتە ڕازی بوون بە بەکافری مانەوەی ئەو کافرە لەو ماوەدا، پێی کافر دەبێ.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسە کە کافرەکە دێتە لای، بۆ فێرکردنی ئادابی ئیسلام بوون لەناو نوێژا بوو، واتە خۆی بە واجیبی عەینییەوە خەریك بوو، ئەوە ئەگەر دەترسا لەوە کە ئەگەر گورج فێری نەکدا مانیع پەیدا ببێ بۆ ئیسلام بوونی، ئەوە لەسەری واجیبە نوێژەکەی ببڕێ و ئیسلامەتییەکەی فێر بکا. خۆ ئەگەر ئەو ترسەی نەبوو ئەوا واجیب نییە، نوێژەکەی ببڕێ و دروستە فێرکردنەکەی بخاتە دوای نوێژەکەی. (صرح بهذا الشبراملسي في بحث حرمة الكلام في الصلاة).

ئەگەر کەسێ بە کەسێ بڵێ: کافر ببە، هەرچەند بە ئیشارەش بێ، ئەوە کافر دەبێ.

ئەگەر یەکێ بڵێ بە ژنێ، کە لە مێردەکەی بێزار بێ، خۆت کافر بکە لە مێردەکەت جیابیتەوە و شوو بکە بە هەر کەس خۆت دەتەوێ، ئەوە ئەو کەسە (فوراً) کافر دەبێ؛ چونکە ژنەکەی ڕێ بەدێیی کردووە بۆ کوفر، پەنا بە خوا.

ئەگەر کەسێ بە نوێژنەکەرێ بڵێ: نوێژ بکە، ئەویش لە وەڵامدا بڵێ: ئەگەر خوا لەسەر نوێژ نەکردن سزای من بدا ئەوە ستەمم لێ دەکا؛ چونکە بۆ نموونە، من کەوشم نییە، ئەوە بەو قسەیە کافر دەبێ.

ئەگەر هەژارێ ئایەتی «وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ» بەسەر دەوڵەمەندێکدا بخوێنێتەوە و، دەوڵەمەندەکە بڵێ برۆ شەڕ لەگەڵ خوا بکە و پێی بڵێ بۆچی ماڵی دنیات بە فلان کەس داوە؟ ئەوە کافر دەبێ. هەروەها ئەگەر کەسێ بە شێوەی بە سووکی تەماشاکردنەوە وتی من لە قورئان خوێندن یا لە نوێژ کردن تێرم خواردووە، کافر دەبێ. هەروەها ئەگەر بڵێ ئەوەندەم قورئان خوێندووە دڵم تەنگ بووە، ئەوەش کافر دەبێ؛ چونکە ئەم عیبارەتە بە سووکی سەیر کردنێکی زۆری تیایە.

ئەگەر کەسێ، پاش گیرۆدە بوون بە هەندێ دەردوبەڵا، وتی: خوایا! چی ماوە پێم بکەی؟ گەلێ ئازارت دام، من شایانی ئەمانە نەبووم، ئەوە کافر دەبێ، مەگەر مەبەستی ناز و گلەیی بێ، ئەوە بە گوناهی گەورە دادەنرێ و بە کوفر حسێب ناکرێ.

ئەگەر کەسێ بە کەسێ بڵێ، سوننەتەکانی بەرسمیڵ کردن نینۆك کردن و ئەمسالی ئەمانە جێبەجێ بکە، ئەوەش لە وەڵامدا بە سووکییەوە بڵێ: من سوننەت ناکەم، ئەوە کافر

دەبێ. ئەگەر یەکێ مەنعی کەسێ بکا لە کردەوەی حەرام و پێی بڵێ لە سزای ڕۆژی قیامەت بترسە، ئەویش بە سووکییەوە بڵێ ترسم لە ڕۆژی قیامەت نییە، قیامەت چییە؟ ئەوە بەم عیبارەتە کافر دەبێ. بەڵێ ئەگەر مەبەستی ئەوە بێ بڵێ خوا ڕەحمی زۆرە بۆیە لە سزای قیامەت ناترسم، ئەوە کافر نابێ، بەڵام قسەکەی بێ ئەدەبییە.

ئەگەر کەسێ بە شێوەی عەناد بڵێ گوزەرانی دنیایی لە هەموو عیلمە ئاینییەکان چاکترە، ئەوە کافر دەبێ، خۆ ئەگەر بڵێ لە عیلم بە زات و صیفەتەکانی خوا چاکترە ئەوە (مطلقاً)کافر دەبێ. ئەگەر یەکێ ئینکاری واجیبێ لە واجیبەکانی دینی ئیسلام بکا، وەك نوێژ، ڕۆژوو، حەج.. تاد، کافر دەبێ.

ئەگەر یەکێ ئامۆژگاریی یەکێکی دەکرد، ئەویش ڕقی هەڵسا و بە سووکییەوە وتی من ئەم قسانەم زۆر بیستوون، ئەوە کافر دەبێ.

ئەگەر یەکێ بانگی بیست و وتی دەنگی زەنگ (ناقوس) لەمە باشترە ئەگەر بە شێوەی سووکی وتی پێی کافر دەبێ و، ئەگەر تەنیا لە ڕووی ناخۆشیی دەنگی بانگدەرەکەوە بێ، ئەوە پێی کافر نابێ، بەڵام کردنی قسەکە حەرامە.

ئەگەر کەسێ بە سووکییەوە وتی: کێ دەتوانێ ئەم نوێژانە بکا؟ یا بڵێ ئەگەر نوێژ بکەم پیاوخراپ دەبم، ئەوە کافر دەبێ. ئەگەر کەسێ وتی هەروەختێ من نوێژ بکەم، پیاوخراپ دەبم، ئەوە کافر دەبێ. ئەگەر کەسێ وتی هەروەختێ من نوێژ بکەم، تووشی زیانێ دەبم و، ئەم نوێژ و تاعەتە هۆی نەگبەتیی ئادەمیزادە، ئەوە کافر دەبێ.

ئەگەر کەسێ وتی بە یەکێ بۆچی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە ناکەی؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە چییە؟ یاخۆ وتی واجیب نین و ئەم قسانە هەمووی فەساد و غەوغان، ئەوە (فوراً) کافر دەبێ.

ئەگەر حەزرەت (د.خ) ئەمری بە شتێ کردبێ و، یەکێ بێ شتی لێ زیاد بکا، بەبێ ئوسووڵی ئیستینباتی شەرعی، ئەوە کافر دەبێ. هەروەها هەر کەس حوکمێ لەسەر حوکمی شەرعی زیاد بکا، کافر دەبێ؛ بۆ نموونە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «لا تشد الرحال إلاَ الى ثلاثة مساجد...» کەچی یەکێ بێ مزگەوتێ لە سەر ئەو سێ مزگەوتە زیاد بکا ئەوە کافر دەبێ.

ئەگەر کەسێ بە یەکێ بڵێ: من کافرم بە تۆ چی؟ هیچ زیان بە تۆ ناگا، یاخۆ بڵێ: ئەم

زەمانەی کوفرە و زەمانەی ئیسلام نییە و، مەبەستی ئەوە بێ کە لە واقیعەن ئیسلامییەت بەکارنایێ، ئەوە کافر دەبێ، بەڵێ ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ کە خەڵکی دینیان بێ هێز و لاواز بووە و، حەز لە تاعەت و خواپەرستی کەم بووە، ئەوە پێی کافر نابێ. ئەگەر موریدێ بڵێ عەبدولقادری گەیلانی یا شاهی نەقشبەند لە یەکێ لە پێغەمبەران گەورەترە، یا پایەی وەك پایەی ئەو وایە، ئەوە کافر دەبێ. ئەگەر کەسێ باوەڕی وەهابێ کە یەکێ لە چوار یاری پێغەمبەر لە پێغەمبەرێ گەورەترە کافر دەبێ.

دەربارەی ئەو کەسانەش کە عەقڵیان بێ هێزە و زیادەڕەوی دەکەن و باوەڕیان خراپە، پێویستە لەسەر ئەو کەسانە کە بە ئەحواڵیان دەزانن ئامۆژگارییان بکەن تا ئەو بێ چارانە بێننەوە سەر عەقیدە و باوەڕی بێگەردی ئیسلام کە هیچ کەس لە غەیری پێغەمبەران (د.خ) لەوان گەورەتر نییە و پایەی غەیری پێغەمبەران ناگاتە پایەی پێغەمبەران (د.خ)

ئەگەر یەکێ گوناهێکی بچووك بکا، وەك تەماشایەکی حەرام و، یەکێ پێی بڵێ: لەو گوناهە پەشیمان بەرەوە، ئەویش بە شێوەی ئیستیخفافەوە بڵێ: چیم کردووە، بۆچی تۆبە بکەم؟! ئەوە کافر دەبێ.

براکانم! ئەو وتار و کردەوانەی دەبنە هۆی کافربوونی ئینسان زۆرن، بەڵام من لەم نامەدا هەر ئەمانەم پێشکەش کردن؛ چونکە ئەغڵەب موسڵمان لە وتاری درێژ ماندوو و زویر دەبن!، کەچی ئەگەر ماوەیەکی زۆر گوێ لە حیکایەت وئەفسانەی پڕوپووچ بگرن هیچ ماندوو نابن.

ئەوەندە بزانن پاراستنی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلام لە پاراستنی گیان گرینگترە؛ چونکە دینداری هۆی بەختیاریی هەتاهەتایە.

(والسلام على من أتبع الحق والهدى).

لە (١٠)ی جومادای دوایی ١٣٩٦ی ك ڕێکەوتی ٨-٦- ١٩٧٦ی ز لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی سی و دووەم

# باسی تاوانی کوشتن دەکا

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمد للّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه وعلى آله وصحبه وأتباعه الحافظين لحدود اللّه إلى يوم الدين.

براکان! یاخوا هەرچی ماڵ و دارایی من هەیە بەقوربانی ئەوە بێ کە ئێوە ڕێگەی ئاین بگرن و گیرۆدەی بیروباوەڕی نابار و تاوانی ناهەموار نەبن.

خوای گەورە فەرموویەتی: «وليخش الذين لو تركوا من خلفهم ذرية ضعافاً خافوا عليهم، فليتقوا اللّه وليقولوا قولا سديداً».

مانای زاهیری ئەم ئایەتە ئەوەیە، خوای گەورە تەمێ و ئامۆژگاریی موسڵمانان دەکا بۆ ئەوەی چاودێریی هەتیوی داماو و لێقەوماو بکەن و، ئەوە دێنێتە پێش چاویان کە وابزانن ئەو هەتیوانە منداڵی خۆیانن و لە دوایان بەجێ ماون و داماون و چاوەڕوانی دەستوەهەندە و کەرەم و میهرەبانیی خەڵکین. چۆن دڵیان دێتە جۆش بۆیان، وەهایش دەربارەی هەتیوی خەڵکی ڕەفتار بکەن. براینە! گەلێ ئیشارەی بەسوود لەم ئایەتە پیرۆزەدایە، یەکێ لەوانە ئەوەیە هەر کەس لە خوا بترسێ و لە فەرمانبەرداریی ئەو نەپرسێ و کارێکی وا بکا کە منداڵەکانی فێری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری خراپ ببن و ئەوە بە دەستی خۆی ئەو نەوە بێچارانەی خۆی بەدبەخت دەکا و کارێك دەکا ببن بە کۆمەڵە ئینسانێ هەموو ئینسانێکی ژیر و دڵسۆز بەزەیی پێیاندا بێتەوە و، هەندێ کەسیش بە هۆی ئەو ڕەفتارە خراپانەوە کە لە باوکیانەوە وەریان گرتوون نەفرینیان لێ بکەن.

ئەو باوکانەش کە بیروباوەڕیان باشە و منداڵەکانیان فێری بیروباوەڕی باش دەبن لێیانەوە، دەبنە هۆی بەختیاریی نەتەوەکەیان، بەڵکو دەبنە هۆی ئەوە کە خوای گەورە لەبەر چاك ڕەفتاریی ئەوان و لەبەر ئیخلاصی ئەوان، لەگەڵ نەوەکانیاندا میهرەبانی بکا

و ئیشی چاکیان بۆ ڕێك بخا و لەگەڵیٚ مەینەت دووریان بخاتەوە، هەروەکو لە جوملەی «وکان أبوهما صالحا»ەوە دەردەکەویٚ، کە لە تەفسیری ئایەتەکەدا ڕیوایەت کراوە: ئەو باوکە ساڵحە باپیری نۆیەمیان بووە.

زانایانی ئاین وەکو باوکی موسڵمانانن و واجیبە زۆر بە دڵسۆزی ئامۆژگاری و تەمێیان بکەن، بۆ بیروباوەڕی پاك و کردار و ڕەفتاری چاك. ئەگەر خوانەخواستە بەم شێوە نەبن خۆیان و کۆمەڵەیان بەدبەخت دەکەن. خۆ ئەگەر ئەوان باش بن و واجیبی سەرشانیان بەجیٚ بێنن و کۆمەڵەکەیان بە گوێیان نەکردن ئەوا ئەمان لای خوای گەورە دەگەنە پایە و پاداشی خۆیان، ئیتر کۆمەڵ بەدبەخت دەبیٚ، گوناهی خۆی بە ئەستۆی خۆیەتی.

لەسەر هەموو زانایەکی ئاینی پێویستە بەقەدەر حاڵ و توانا ئامۆژگاریی موسوڵمانان بکا. هەروەها لەسەر هەموو کەسیٚ پێویستە لە دۆستە ڕاستە دڵسۆزەکانی خۆی بپرسیٚ کە چ عەیبێکی تێدایە بەبیٚ شەرم و لەڕوودامان پێی بڵێن تا ئەمیش هەوڵی چارەکردنی ئەو عەیبەی خۆی بدا.

لەسەر ئەم شێوەیە کە وتمان حەزرەتی عومەر (ر.خ) هەموو جاریٚ لە سەلمانی فارسی و حوزەیفەی کوڕی یەمان و ئەبوو زەڕی غەفاریی دەپرسی (ر.خ) و پێی دەوتن: هەرچی عەیبێکم تێدایە پێم بڵێن.

هەروەها هەموو جاریٚ دەیفەرموو: «رحم اللّه أمرءا أهدى إلى عيوبي».

واتە: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بیٚ کە عەیبەکانم دەدۆزێتەوە و بەدیاری بۆمیان دەنێریٚ. ئەم جۆرە دۆستانە کەمن.

جا عەرزتان دەکەم: منی دڵسۆزتان لەو جۆرە دۆستە کەمانەم کە حەزرەتی عومەر (ر.خ) فەرموویەتی؛ چونکە عەیبەکانتان بەدیاری بۆ دەنێرم و لێیانتان ئاگادار دەکەم.

ڕیوایەت کراوە: «من أحبك نهاك ومن أبغضك أغراك» واتە: ئەوەی تۆی خۆشبویٚ لە کاری خراپ و ناڕەوا مەنعت دەکا و، ئەوەش ڕقی لێت و دوژمنت بیٚ، هانت دەدا و کردەوەی خراپت لەبەرچاو جوان دەکا. بەم ڕیوایەتەیشدا دەردەکەویٚ کە من لە دۆستانی ئێوەم و دڵسۆزتانم.

کەواتە ئەی براینە! زۆر تکاتان لیٚ دەکەم و دەستم دامێنتان، ئەگەر هەر مەیلتان لەسەر

ئەوە نییە کە کار بەم نامەیەم بکەن، تەنیا یەك جار گوێ بگرن بۆتان بخوێننەوە، ئەوەندەم حەق لەسەرتان هەیە تکاتان لێ بکەم تاقە جارێ ئەم نامەی دۆستی خۆتانە بخوێننەوە یا گوێی لێ بگرن، با ئەو ڕەنج و زەحمەت و ماندوویەتییەی لە کۆکردنەوە و نووسینەوەی ئەم نامەدا کێشاومە، زایە نەبێ و لە کیستان نەچێ.

براکانم! من لە خوای میهرەبان داواکارم ئەوەندەتان عەقڵ بداتێ لە گوناهی وا ڕزگارتان بکا لەوانەبێ بتانفەوتێنێ.

براکان! دەخیلتان بم لە پێناوی پەنجا ساڵ ڕابواردنی دنیای بڕاوەدا، سزای نەبڕاوەی قیامەت بۆ خۆتان مسۆگەر مەکەن. لە فەرموودەی پێغەمبەردایە: «إنما مثل الدنيا في الآخرة كما يغمس أحدكم أصبعه في اليم فأنظر بم يرجع». واتە: دنیا و ژیانی دنیا لەچاو قیامەت و ژیانیدا وەکو ئەوەیە یەکێ لە ئێوە پەنجەی بکا بە دەریایەکی گەورەدا، سەیر بکەن دەبێ ئەو تاقە پەنجەیە چەند ئاو لەو دەریایە لەگەڵ خۆی بهێنێ؟!

خۆزگا ئینسان لەم تەمەنە کەمەدا بە ئازاری ئاگری دنیا یا پێوەدانی دوویشك و مار گیرۆدە بووایە، نەك بە گوناهێ کە ببێتە هۆی سزای قیامەت و ڕیسوایی ناو کۆمەڵی موسڵمانان.

لە خودای گەورە دەپاڕێمەوە کە عەقڵێکی وەهاتان بداتێ ببێتە هۆی خۆپاراستن لە گوناه، بە تایبەتی ئەو گوناهانەی کە زۆر ناهەموارن و هۆی بەدناوی و بەدبەختیی دنیا و قیامەتن.

براکان! یەکێ لەو گوناهە گەورانە (قتل)ە، واتە: کوشتنی کەسێ بە ناحەق. کوشتنی ئینسان لەپاش کوفر لە هەموو گوناهێ گەورەتر، ناشیرینترە و تاوان و سزای زۆرترە. گوناهی گەورەیان ژماردووە کە حەوسەد گوناهە و، ئەم کوشتنی نەفسە بێجگە لە کوفر لە هەموویان سزای زۆرتر و قورسترە.

ڕیوایەت کراوە: «كل ذنب عسى اللّه أن يغفره إلا الرجل يموت مشركاً أو يقتل مؤمناً متعمداً». واتە: هەرچی گوناهە لەوانەیە خوا چاوپۆشی لێ بکا و خاوەنەکەی عەفوو بکا، ئەوە نەبێ کەسێ بە کافری بمرێ یا بە عەمدی موسڵمانێ بکوژێ، واتە: یەکەمیان هەرگیزا و هەرگیز عەفوو ناکرێ و دووەمیان بە قەتعی تۆڵەی لێ دەسەنرێ.

براکان! لەوانەیە ئینسانی ژیر و بەفام زراوی لەوە بتەقێ کە حەزرەت (د.خ) لەناو حەو

سەد گوناهی گەورەدا، کوشتنی ناحەقی جیا کردووەتەوە و لەگەڵ کوفرا حسێبی کردووە.

لە ڕیوایەتێکدا حەزرەت (د.خ) لەناو ئەو حەو سەد گوناهە گەورانەدا نۆ گوناهی جیاکردووەتەوە. لەم نۆ گوناهەیش حەوتیان بە سەبعەی مووبیقە ناو دەبرێن، واتە حەوت گوناهی ئەوەندە نالەبارن کە خاوەنەکانیان بە فەتەراتدا دەبەن و دەیانفەوتێنن و، لەناو ئەم حەوتەشدا ئینسان کوشتنی بە گوناهێکی زۆر ناهەموار و نالەبار حسێب کردووە، بە جۆرێ کە هەندێ لە زانایانی ئاین ئینسان کوشتنیان وا داناوە کە خاوەنەکەی هەمیشە و هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە. ئەم زانایانە تەماشای زاهیری ئەم ئایەتەیان کردووە کە خوا فەرموویەتی: «وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُّتَعَمِّداً فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً».

بەڵام جومهووری زانایانی ئاین ئەم ئایەتەیان تەئویل کردووە بەوە کە مەبەست قاتلێکە کوشتنی موسڵمانەکە بە حەڵاڵ بزانێ یا لەبەرئەوە بیکوژێ کە موسڵمانە، ئەگینا خوای گەورە خۆی فەرموویەتی هەموو گوناهێك لە گەورە و بچووك لەوانەیە چاوپۆشی لێ بکرێ، کافر بوون نەبێ، واتە مرۆ شتێکی وەها بکا بە شێوەیەکی قەتعی ببێتە کوفر. هەندێکیش مەعنای (خلود)یان بە درێژیی ماوە تەئویل کردووە، واتە موسڵمان کوژ سزایەکی زۆر و دوورودرێژ دەدرێ و لەگەڵ داروەستەی گوناهباراندا لە دۆزەخ دەرباز دەبێ.

هەرچۆن بێ، ئەم هەڕەشە توندوتیژە کە لە بکوژی عەمدی کراوە، مانای ئەوەیە قاتیل لەوەوە نزیکە کە بەبێ ئیمان بمرێ (والعياذ بالله)، جا ئەگەر کەسێ عەقڵ و فامی هەبێ خۆی لەم گوناهە ناهەموارە دەپارێزێ و توخنی ناکەوێ.

براکان! زۆر چاك بزانن و لەوە دڵنیابن کە خوای پەروەردگار هەیە و پێغەمبەر هەیە و ئاین ڕاستە و ئادەمیزاد لە ڕۆژی قیامەدتا پرسیاری لێ دەکرێ، بێگومان سزا و ئازاری ڕۆژی قیامەت زۆر سەختە و، ئەوانەی کە دۆزەخین سەعات بە سەعات و کات بە کات سزایان زیاد دەکا؛ خوای گەورە دەفەرمووێ: «فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَاباً» واتە: سزا بچێژن، دە بخۆن ئەوە دەردتان بێ، لەمەوپاش هەر تەنیا سزاتان بۆ زیاد دەکەین. لە حەدیسی شەریفدا ڕیوایەت کراوە کەوا لەم ئایەتە تیژتر دەربارەی ئەهلی دۆزەخ نییە. ئەم ئایەتە گەلێ هەڕەشەی توندی تێدایە.

ڕیوایەت کراوە: ئەهلی دۆزەخ لە درێژیی ماوەی سزا ئەوەندە پەرێشان دەبن ئەگەر

فریشته بێ، بێت و پێیان بڵێ: مژده بێ ماوەی سزای ئێوه بەقەدەر ژمارەی ورده بەردی ڕووبارەکانه، لەو کاتەدا ئەوان ئەو مژدەیه بەدڵ و گیان وەردەگرن و پێی دڵشاد دەبن، چونکه ئەوان ترسی نەبڕانەوەی سزایان هەیه. جا ورد ببنەوه له حاڵی وا ئەو خەبەره به مژده بزانرێ.

براکان! هەر بەڵایێ له دنیادا بەسەر ئینساندا بێ، له نەفس یا ماڵ یا حاڵ، هەمووی بڕانەوەی هەیه. بەڵام سزای کوفر، پەنا به خوا، بڕانەوەی بۆ نییه، جا کەوابێ زۆر پێویسته هەمیشه ئینسان خۆی لەو گوناهانه بپارێزێ که لەوانەبێ ڕای بکێشن بۆ کوفر، پەنا به خوا.

بێ گومان هیچ سزایەکی دنیا لەچاو سزای قەبر و قیامەتدا به سزا ناژمێررێ. ماڵوێرانی بەو گوناهانه دەبێ که دەبنه هۆی بێ ئیمانی و نەمانی باوەڕی ڕاست له دڵی ئینساندا.

براکان به خوای گەورەتان سوێند دەدەم ڕەحمێ به حاڵی خۆتان بکەن و خۆتان گیرۆدەی ئەو سزایانه مەکەن که ئەرز و کێو و ئاسمان هەڵیان ناگرن. بەڕاستی ئینسان له بیستنی هەندێ سزای قیامەت دڵی بێ تاقەت دەبێ، چ جایێ که بەتەواوی بکەوێته ناو ئاگری دۆزەخ و سزای بدرێ.

ڕیوایەت کراوه: ڕۆژێ حەزرەتی جیبرەئیل هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (د.خ) له کاتێکدا که وەخت و وادەی هاتنی جارانی نەبوو. که دانیشت کوتوپڕ دەنگێکی زۆر گەورەی بیست، حەزرەت (د.خ) تەماشای جیبرەئیلی کرد زۆر تێك چوو، ئینجا پرسیاری کرد و فەرمووی: ئایا ئەم دەنگه نیشانەی هاتنی قیامەت بوو؟ ئەویش عەرزی کرد: نەخێر ئەوه دەنگی بەردێ بوو له قەراخی دۆزەخدا بوو که له ماددەی گۆگرد بوو به ئەمری خوا کەوته ناو دۆزەخ، بەردێکی زۆر خراپ و بۆگەنه. ئینجا حەزرەت (د.خ) لێی پرسی: تۆ بۆچی له بیستنی دەنگەکه ڕەنگت گۆڕا؟ ئەویش عەرزی کرد: ماوەیەکی زۆره من لەگەڵ فریشتەکاندا مەئموورین بۆ هەڵگیرساندنی دۆزەخ. دوای ئەوه گەلێ ئەوسافی دۆزەخی باس کرد تا حەزرەت پێی فەرموو: ئیتر بەسه لەمه زیاتر باسی مەکه.

پوختەی خەبەر که حەزرەتی جیبرەئیل دەستی کرد به گێڕانەوەی دەنگوباسی سزای دۆزەخ، حەزرەت (د.خ) دەستی کرد به گریان و بەکوڵ دەگریا تا فریشتەیێ له لایەنی خوای گەورەوه هات و مژدەی پێ دان که ئێوه، واته: حەزرەتی پێغەمبەر و جیبرەئیل،

خوای گەورە ئەمینی کردوون لە سزای دۆزەخ؛ ئینجا هەردووکیان دڵیان دامرکایەوە و ئارام بوون. پاش ئەم ڕووداوە گەلێ جار ئاوازی سینگی حەزرەت (د.خ) دەهات، بەهۆی جۆش و خرۆشیەوە لە ترسی سزای دۆزەخ، تا کۆچی دوایی کرد.

براکان! بزانن شەیتانی لەعنەتی کە هەشتا هەزار ساڵ لە ئاسمانەکاندا عیبادەت و خواپەرستیی کرد و گەلێ سوجدەی تەعزیمی بۆ خوای گەورەی برد، بە یەك ملپێچی و نافەرمانیی خوا لە دەرگای ڕەحمەتی خۆی دەری کرد و نەفرینی لێ کرد، ئێستە ئێمە بەچی پشت ئەستوور و دڵقایم بووین کە خوای گەورە لەسەر ئەم گوناهـ و تاوانە یەك لە دوای یەکانەی دەیانکەین غەزەبمان لێ ناگرێ و لە قاپی ڕەحمەتی خۆی دەرمان ناکا؟ ئایا نامەی ئازادیمان لە ئاسمانەوە بۆ هاتووە؟ لێرەدا تەنیا ئەوەندە هیوا هەیە کە بڵێین ئەم گوناهە بە نەفامی و بێ شعووری کراون ئەگینا حاڵمان زۆر پەرێشان دەبێ.

براکان! تکاتان لێ دەکەم لەم نەزانییە بگەڕێنەوە و هەمیشە لە بەینی ترس و ئومێدا بن و، لای کەمی با هەموو ڕۆژێ سبەینان و ئێواران دەستی نزا و پاڕانەوە بەرز بکەینەوە لە خوا بپاڕێینەوە کە چاوپۆشیمان لێ بکا؛ چونکە ڕیوایەت کراوە خوای گەورە سەد دەرەجە ڕەحمەتی هەیە و یەك دەرەجەی لەوانە داوە بە هەموو گیانلەبەران و بەشی هەمووشیان دەکا. ئەویتری هەمووی لای خۆیەتی و هەڵی گرتووە بۆ ڕۆژی قیامەت، جا پێویستە ترسی خوامان هەبێ تا خۆمان لە گوناهـ بپارێزین و نەیکەین. هەروەها تکای عەفووشمان هەبێ بەڵکو لەو نەوەد و نۆ دەرەجەی ڕەحمەتە نائومێد نەبین. ئەمە پێویستی سەرشانی هەموو بەندەیەکی خوایە. ڕیوایەت کراوە: ئەگەر کەسێ ئەمر بە کەسێ بکا بۆ ئەوەی ئینسانێ بکوژێ و ئەویش بڕوا و بیکوژێ، ئەوە کە ڕۆژی قیامەت زیندوو دەکرێتەوە بە قەڵەمی قودرەت لە نێوچاوانی دەنووسرێ: «آیس من رحمة اللّه»، ئەمە مانای ئەوەیە ئەو پیاوکوژە لەو نەوەد و نۆ دەرەجە ڕەحمەتە کە لای خوا گەورەیە و بۆ ڕۆژی قیامەتی هەڵگرتووە بەشی نادرێ؛ جا بزانن حاڵی مرۆی مرۆڤکوژ تا چ ڕادەیێ نالەبار و دژوارە؟!.

بۆ ئاگاداری: ئەم تەقریرەی کردوومان بۆ کەسێکە ئەو کوشتنە ناحەقەی بە حەڵاڵ زانیبێ و لە ماوەی ژیانیشیدا لێی پەشیمان نەبووبێتەوە و تەوبەی لێ نەکردبێ، ئەگینا بێجگە شەریك بۆ خوا بڕیاردان هەموو گوناهێ لەوانەیە بەر عەفووی خوای گەورە بکەوێ.

ڕیوایەت کراوە شەیتانی مەلعوون ڕۆیشت بۆ لای حەزرەتی مووسا (د.خ) کە تکای بۆ بکا لای خوای گەورە کە عەفووی بفەرمووێ. خوای گەورە فەرمووی: باشە بە مەرجێ بڕوا بۆ سەر قەبری ئادەم و سەر شۆڕبکاتەوە بۆی، کە حەزرەتی مووسا ئەم وەڵامەی هێنایەوە شەیتان دەهری بوو وتی: من بەزیندوویی سەرم بۆ شۆڕ نەکرد، ئێستە پاش مردنی چۆن سەری بۆ شۆڕ دەکەم؟ نا.. شتی وا ناکەم، بەڵام ئەی مووسا! مادام ئەم زەحمەتەت بۆ کێشام فەرموو با پاداشت بدەمەوە. حەزرەتی مووسا فەرمووی: پاداشتەکەت چییە؟

وتی: ئەی مووسا! ئاگاداری خۆت بە من لە سێ حاڵدا بەسەر ئادەمیزاددا زاڵ دەبم و فرسەتیان لێ دەهێنم و لەبەردەستمدا دەکەون. یەکەم لە حاڵێکدا غەزەب سواری دڵیان ببێ و توورە ببن. لەم حاڵەدا ئەوەی بمەوێ پێیان دەکەم و هەر گوناهێ ئارەزووم لێ بێ بەسەریاندا دەهێنم؛ ئەوەتە لەکاتی غەزەب و توورەییدا موسڵمان موسڵمان دەکوژێ و ژنی خۆی تەڵاق دەدا و خەڵەوخەرمان و خانووی خەڵك دەسووتێنێ و ئاگری فیتنە و ئاژاوە و ئاشووب لە دنیادا هەڵدەگیرسێنێ. (باقیمەندەنیی ئەم واقیعەمە لە مەکتووبێکی تردا نووسیوە).

بەڵێ حەزرەتی محەمەد (د.خ) فەرموویەتی: غەزەب ئیمانی ئینسان دەفەوتێنێ وەك چۆن تاڵی شاری هەنگوین خراپ دەکا. هەروەها فەسادی دەروون، واتە تاریکیی دڵ و کەم نووری و بێ هێزیی ئیمان، دەبێتە هۆی ئەوە کە موسڵمان دڵی لە برای خۆی دووربکەوێتەوە و یەکتریان خۆش نەوێ و دڵسۆزی بۆ یەکتر نەنوێنن، کەچی وەك خوای گەورە دەفەرموێ: «إنما المؤمنون اخوة»، واتە: موسڵمان برای یەکترین. دیارە ئەگەر موسڵمان بەگوێرەی ئەم ئایەتە ڕەفتاریان بکردایە ئەم عالەمە وەها خراپ و بێ فەڕ نەدەبوو.

ڕیوایەت کراوە: دوورترین موسڵمان لە ڕزگاری کەسێکە بە ناحەق خوێنی خەڵكی بڕێژێ. هەروەها ڕیوایەت کراوە: «أول ما يحاسب عليه العبد الصلاة، وأول ما يقضى بين الناس حق الدماء».

واتە: یەکەم شتێ کە موحاسەبەی بەندەی تێدا بکرێ لە ڕۆژی قیامەتدا نوێژە و، یەکەم شتێ کە حوکمی تێدا جێبەجێ بکرێ و حەقی تێدا بسەنرێ حوقووقی خوێنە.

ڕیوایەت کراوە: تێکچوونی هەموو دنیا لای خوای گەورە لەوە سووکترە کە خوێنێ

بەناحەق برێژرێ. هەروەها ڕیوایەت کراوە: ئەگەر هەموو ئەهلی ئەرز و ئاسمان بە کۆمەڵ یەك ئینسان بکوژن خوای گەورە هەموویان دەخاتە ناو ئاگری دۆزەخ و تۆڵەی ئەو کوژراوەیان لێ دەسێنێ.

براکان! جا باش تەماشا بکەن ئەم دنیایە ئا بەم گەورەیی و فراوانییەو، ئەم ئاسمانە بەم پانی و درێژی و بەرزییە و، ئەم ئەستێرانە بەم زۆرییە، ئەگەر بە قەدەر هەموو ئەمانە ئادەمیزاد ببێ و بەکۆمەڵ یەك ئینسان بکوژن خوای گەورە لە تۆڵەی کوشتنی ئەو تاقە کەسەدا هەموویان فڕێ دەداتەوە نێو دۆزەخەوە.

بێگومان ئەمە هەموو لەبەرئەوەیە کە ژیان خۆشەویستە و ئادەمیزاد قەدری لای خوای گەورە زۆرە و، یەکێ ژیانی یەکێ دوایی پێ بێنێ شایانی سزای گران و تۆڵەی سەختی ڕۆژی جەزایە.

وە ئەگەر تاقە کەسێ ئینسانێ بکوژێ، هەموو ئەو تاوانە کە دەدرا بەسەر هەموو ئەهلی ئەرز و ئاسماندا دەدرێ بەسەر ئەو تاقە کەسەدا.

هەڕەشەیەکی تری زۆر ناهەموار دەربارەی خەڵك کوشتن ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێ: «مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْس أَوْ فَسَادِ فِي الأَرْض فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً». واتە: هەر کەسێکی باڵغی عاقڵ کەسێ بکوژێ، بەبێ ئەوە کە کوشتنەکەی لە تۆڵەی کوژراوێکدا بێ و، بەبێ ئەوە کە کوژراوەکە خراپەکاری بکا لە وڵاتدا، بۆ نموونە وەك جەردەیی و خەڵك تاڵان کردن، ئەوە ئەو کوشتنە وەکو ئەوەیە کە هەرچی ئادەمیزادی سەر زەوی هەیە هەمووی کوشتبن. واتە: وەك چۆن ئەگەر یەکێ هەرچی ئادەمیزاد هەیە هەموویان بکوژێ زۆر تاوانبارە، ئەویش کە تاقە کەسێکی بێ تاوان بکوژێ هەر بەو جۆرە تاوانبارە. ئەمە مانای زاهیریی ئایەتەکەیە.

ئیمامی (مجاهد) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: مەبەس ئەوەیە مادام ئەو ئینسانە بەدڕەفتاری و ناپاکیی خۆی پاڵی پێوەناوە ئینسانەکە بکوژێ هەر کاتێ بۆی ڕێك بکەوێ ڕقی لە هەر ئینسانێ هەستێ، دەیکوژێ تا هەموو ئادەمزاد تەواو دەبن. کەوابێ ئەو قاتیلە وەکو ئەو کەسەیە کە قاتیلی هەموو بەرەی ئادەمیزاد بێ، ئیتر خوا مەیلی خۆیەتی کە بەقەدەر کوشتنی هەموو ئادەمیزاد سزای بدا، لەسەر ئەو قابیلییەت و ئیستیعدادە کە تێدایە، یا هەر لەسەر کوشتنی تاقە کەسەکە کە بەڕاستی کوشتوویەتی سزای بدا. ڕیوایەت کراوە: «نية المرء خير من عمله». واتە: قەست و نیازی ئینسان لە

کاری خێردا چاکترە لەوە کە کارە خێرەکە بکا، چونکە لە قەست و نییەتەکەدا ڕیا و بەرچاوینی و دیمەنکاری نییە. هەروەها قەست و نیازی کاری شەڕ و خراپ لە کردەوە شەڕە خراپەکە خراپترە؛ چونکە کردەوە خراپەکە تاقە کردەوەیەکە و دەبڕێتەوە، بەڵام قەست و نییەت و قابلییەت درێژەدارە و نابڕێتەوە و تا ئەو کەسە بەسەر زیندوو بێ ئەو نییەتە بەردەوامە، واتە: ئەو ئیستیعدادی بەدکارییەی دەوامدارە.

ڕیوایەت کراوە موسڵمان هەمیشە بەرچاوی گوشاد و فراوانە تا ئەو کاتەی بەناحەق کەسێ دەکوژێ. کە ئەم گوناهەی لێ قەوما ئیتر ئەو فراوانییەی و ئەو بەرچاو گوشادییەی بۆ نامێنێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دڵی ڕەش دەبێ و دەروونی تاریك و بەرچاوی لێڵ دەبێ و وای لێ دێ دەڵێی دنیای بەسەردا ڕووخاوە! ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: بەناحەق کەس مەکوژن با دنیاتان لێ نەیێتە یەك، ئەگینا دنیاتان لەسەر تەنگ دەبێ و لە پاشەڕۆژیشدا ناڕەزایی خواتان دێتە سەر.

ڕیوایەت کراوە هەر کەس لە دنیادا ببێتە هۆی ئەوە کە مشتێ خوێنی ئینسانێکی بێ تاوان بڕژێ ئەو خوێنە لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە دیوارێ لەبەینی ئەو و دەرگای بەهەشتدا و هەر کاتێ ڕووبکاتەوە دەرگای بەهەشت ئەو دیوارە مەنعی دەکا لە چوونە ژووری بۆ بەهەشت تا خوا سزای دەدا و تۆڵەی ئەو خوێنەی لێ وەردەگرێ، کەواتە دەبێ ئینسان بفامێ لە دنیادا چی بکا؟.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەتی عەبدوڵلای کوڕی عەباس ڕای لەسەر ئەوە بووە کە هەر کەس بە دەسەنقەست و بە ناحەق ئینسانێ بکوژێ، تەوبەی لێ قبووڵ ناکرێ. جارێ یەکێ لەم بابەتەوە پرسیاری لێ کرد: ئایا قاتیل تەوبەی هەیە یا نا؟ ئەویش هەر بەتەعەججوب و ئیستیغرابەوە دەیفەرموو: چی دەڵێی و، هەرچەند کابرا پرسیاری لێ دەکرد ئەو هەروەها جوابی دەدایەوە.

ڕیوایەت کراوە کە ڕۆژی قیامەتدا کوژراوەکە دێ و سەری خۆی دەگرێ بەدەستەوە و لە حوزووری خوادا شکات دەکا و لە ڕەگەکانی سەریەوە بەفوارە خوێن دێ. جا خوای گەورە فەرمان دەدا کە قاتیلەکەی بەرن بۆ دۆزەخ. ڕیوایەت کراوە کە دۆزەخ لە ڕۆژی قیامەتدا بە ئەمری خوا دێتە زمانێکی فەسیح جاڕ دەدا و دەڵێ من ئیمڕۆ مەئموورم بەسەر سێ تائیفەدا، یەکەم ئەوانە کە شەریك بۆ خوا قەرار دەدەن. دووەم ئەوانە کە ستەمکارن و زۆر لە داماوان دەکەن. سێیەم ئەوانە کە بە ناحەق خەڵك دەکوژن. بەڵێ دۆزەخ پێنسەد ساڵ

پێش لە خەڵك پرسینەوە ئەم سێ گرووهە ڕادەکێشێتە ناو خۆیەوە، واتە ئەم سێ گرووهە ئەوەندە لای خوای گەورە ناشیرین و بەدفەساڵ و دوورن لە چاوپۆشی، بەبێ ئەوە پرسیار لە کرداریان بکرێ و بەبێ بەراوردکردنی چاکە و خراپەیان حەواڵەی دۆزەخ دەکرێن. هەروەها هەر کەسێ کردەوەیەکی زۆر نابار و ناهەموار و شەرم هاوەر بکا، ئەوەندە بێ فەڕ دەبێ کەس تەماشای کردەوەی چاکەی پێشووی ناکا.

هەندێ لە زانایانی ئاین فەرموویانە لە پاش گرووێ کافران خەڵك کوژەکان لە هەموو تاوانبارێ لای خوای گەورە بێزراوترن. هەروەها وتوویانە ئایەتی پیرۆز «ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَنِ عِتِيًّا» لە پاش کافران بەسەر خەڵك کوژاندا جێبەجێ دەکرێ. واتای ئایەتەکەش ئەمەیە: بە گەورەیی خۆم سوێند دەخۆم لەناو تاوانبارەکاندا کامیان لە هەموو زیاتر ڕەگی تاوانباریی داکوتابێ و خۆی بە تواناتر بزانێ بەهێزی خۆم هەڵی دەکەنم و فرێی دەدەمە ناو دۆزەخەوە. دیارە کۆمەڵە تاوانبارێ کە لە هەموو کۆمەڵە تاوانبارەکان بێ شەرمتر و لە خوا نەترستر بێ، کۆمەڵی پیاوکوژەکانن و، بە پێی ئەو ئایەتە لەپاش کافرەکان ئەوانە لەپێش خەڵکی تردا دەخرێنە ناو دۆزەخەوە.

خاوەنی کتێبی (روضة الواعظين) ئەم فەرموودەی حەزرەتەی ڕیوایەت کردووە: «إن أكبر الكبائر عند الله قتل النفس، ولا يحل تعذيب النفس بغير حق».

هەروەها حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی کە خوای گەورە فەرموویەتی: «وعزتي وجلالي لا يجاوزني ظلم ظالم ولو لطمة بكف أو ضربة بيد، ولآقتصن للجماء من القرناء». دیسان فەرموویەتی: «ولا يدخل الجنة من عليه مظلمة حتى يؤديها من حسناته، وأن لم يكن له حسنات حمل عليه ذنوب المظلومين ومضى إلى النار». واتە: لە هەموو تاوانێ گەورەتر پاش کوفر، کوشتنی نەفسە، ڕەوا نییە سزادانی هیچ نەفسێ بە ناحەق. بە گەورەیی خۆم سوێند دەخۆم ستەمی هیچ ستەمکارێ بەسەر مندا تێ ناپەڕێ، بەو مانایە کە موبالاتی پێ نەکەم و لێی نەپرسمەوە، ئەگەرچی لای خەڵکیش ستەمێکی بێ بایەخ بێ، وەك ئەوە شەپازللەیێ یا مشتەکوڵەیەکی لە یەکێ دابێ، سوێند دەخۆم کە تۆڵەی حەیوانی بێ شاخ لە حەیوانی شاخدار دەسێنمەوە (واتە: کە ئەو دووانە شەڕە قۆچیان کردووە و شاخدارەکە ئێشی بەبێ شاخەکەوە گەیاندووە).

هەروەها هەر کەس زوڵمێکی لە یەکێ کردبێ ناڕواتە بەهەشت تا تۆڵەی ئەو زوڵمە لە خێرات و کردەوە چاکەکانی وەرنەگیرێ بۆ زوڵم لێکراوەکە. خۆ ئەگەر ستەمکارەکە

کردەوەی چاکەی نەبوو ئەوا لە تاوان و گوناهی زوڵم لێکراوەکەی دەخرێتە سەرشان و حەواڵەی دۆزەخ دەکرێ و بە قەدەر ئیستیحقاق سزا دەدرێ.

لە جوملەی ئەو فەرموودانەیە کە خوا فەرمووني: پرسیار دەکەم لە لقەدارێ لەناو باخێکدا یا لە حەوشێکدا کەسێ بەناحەق بریندارى کردبێ، دەڵێم ئەو ستەمکارە بۆچی بریندارى کرد یا بۆچی بڕیی. بە ڕاستی ئەم فەرموودە دڵی ئینسانی ژێر دەتوێنێتەوە؛ چونکە خوای گەورە نایەوێ کەس دەست بۆ باخی کەس و بۆ نەمامی کەس بەرێ و بە ناحەق بیبڕێ یا توێکڵەکەی لێ بگرێتەوە و وشکی بکا.

ڕیوایەت کراوە: هەموو گوناهێ نزیکە لە عەفووی خوای گەورەوە کوفر و کوشتنی موسڵمانان نەبێ. تەنانەت دروست نییە دەست ببەی بۆ کوشتنی ئەهلی زیممەیش بەرامبەر بە حودوودی شەرع نەبێ وەك دروست نییە دەست ببەی بۆ کوشتنی موسسڵمان.

ڕیوایەت کراوە شەیتانی لەعین هەموو ڕۆژێ لە شەبەقا دەستەوبەستەی خۆی بەسەر ئەرزا بڵاو دەکاتەوە بۆ ئەوەی موسڵمانان گومراه بکەن و لەخشتەیان بەرن و، وەعدەیان پێ دەدا لەسەر ئەو کردەوەیە کە خۆی پێی خۆش بێ. کاتێ دەگەڕێنەوە بۆ لای یەکێ دەڵێ: من کارێکم کرد کە فلانە ژن و مێرد لەیەك جیابنەوە و پیاوەکە ژنەکەی تەلاق دا. شەیتان دەڵێ ئەمە شتێکی ئەوتۆ نییە؛ لەوانەیە کابرا جارێکی تر ژنەکەی مارە بکاتەوە. یەکێکی تریان دەڵێ: من لەناو فلانە کۆمەڵە ئاشووبەم نایەوە و دامن بەگژی یەکتردا. شەیتان دەڵێ: ئەمەش شتێکی وا نییە؛ نزیکە یەکێ بکەوێتە بەین و ئاشتیان بکاتەوە و دۆستیی بخاتەوە ناویان. یەکێکی تریان دەڵێ: من کارێکم کرد کە فلانەکەس فلانەکەسی کوشت. شەیتان بەم قسەیە زۆر دەگەشێتەوە و دڵشاد دەبێ و بە نێرراوەکەی دەڵێ: بەڕاستی تۆ مەردی، بۆیە خەڵاتی دەکا و پایەی پێ دەدا!

ڕیوایەت کراوە کاتێ بە ئیرادەی شەڕ و ئاشووب دوو کەس ڕوویکەنە یەك و یەکێکیان پێشدەستی بکا و ئەویتریان بکوژێ، ئەوە بکوژ و کوژراو هەردووکیان لە ئاگری دۆزەخدان؛ بکوژ لەبەرئەوە کە یەکێکی کوشتووە، کوژراوەکەیش لەبەرئەوە ئەگەر ئەوی تر پێشدەستیی نەکردایە، ئەم ئەوی دەکوشت. بەڵام ئەگەر هەر یەکێکیان قەستی کوشتن بکا و، یەکێکیان لەسەر ئەو فکرە نەبێ ئەوە کابرای بکوژ وا لە ئاگری دۆزەخدا و ئەوەی کوژراو لە بەهەشتایە و پایەی شەهیدی هەیە.

ئەگەر یەکێ ڕووی کردە یەکێ تا ڕووتی بکاتەوە ئەوە ئەگەر بێ دەستەکە زانیی بە ڕاکردن ڕزگار دەبێ، واجیبە ڕابکا، یا ئەگەر زانیی بە پاڕانەوە ڕزگار دەبێ، پێویستە لێی بپاڕێتەوە و تکای لێ بکا کە وازی لێ بێنێ. خۆ ئەگەر بە هاوارکردن ڕزگار ببێ، واجیبە هاوار بکا تا خەڵك بێن بە هاواریەوە. ئەگەر بەم شێوانەش چار نەدەکرا، ئەوا دروستە شەڕی لەگەڵدا بکا، جا ئەگەر ستەمکارەکە ئەمی کوشت ئەوا دەڕوا بۆ دۆزەخ و ئەم شەهیدە و دەڕواتە بەهەشت. ئەگەر خوای گەورەش بۆی کرد ئەم ئەوی کوشت ئەوە کوژراوەکە وا لە ئاگری دۆزەخدا و بکوژەکە پاداشتی خێر وەردەگرێ لەسەر ئەوە کە ئەو ستەمکارەی کوشتووە و عالەمی لە زوڵمی ڕزگار کردووە.

ئەگەر یەکێ هاتە سەر یەکێ بە ناحەق بیکوژێ، ئەوە چاکتر بۆ ئەم کەسە دروستە بە هەر جۆرێ ببێ دەفعی ئەو نامەردە بکا، تەنانەت بۆیشی هەیە بیکوژێ و، بەڵکو وەك وتمان خێریشی دەگا.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: گەورەترینی گوناهە گەورەکان شەریك بۆ خوا دانانە و، پاش ئەو کوشتنی نەفسە بە ناحەق. هەروەها فەرموویەتی: وەك تکاکردن بۆ کافر نییە هەروەها تکایش بۆ خەڵك کوژ ناکەم و، هەروەکو خوای گەورە لەعنەتی لە ئەهلی شیرك کردووە، وەهایش لەعنەتی لە خەڵك کوژ کردووە. ئینجا لەپاش ئەو فەرموودەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: «وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً».

براکان! ڕیوایەت کراوە کاتێ یەکێ موسڵمانێکی کوشت و لەپاشا شانازیی بەو کوشتنەوە کرد، ئەوە نە فەرزی لێ قبووڵ دەکرێ ، نە سوننەت، واتە: مادام کابرا حاڵی وابێ ئەوە پەشیمان نەبووەتەوە لەو گوناهە گەورە کە کردوویەتی، کەوابێ وا لەبەر غەزەب و نارەزایی خوادا، پەنا بە خوا.

براکان! ئەم ئایەتانە و ئەم حەدیسانە کافین بۆ کەسێ هۆشیار بێ و بیەوێ لە سزای خوای گەورە ڕزگاری ببێ. (والسلام على من أتبع الهدى).

لە (٢٥)ی جومادای دوایی ١٣٩٦ی ك، ڕێکەوتی ٢٤-٦-١٩٧٦ لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێر

## نامەی سی و سێیەم

# باسی تاوانی زوڵم و دەستدرێژی کردن دەکا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه وأتباعه المجاهدين في دين الله.

پاش ئەمانە براکان! دوعا دەکەم و لە خوای گەورە دەپارێمەوە وەکو نەفسی ئێوە ئارەزووی ئەوە دەکا گوێ ڕابگرێ بۆ واتەی پڕوپووچ و بێ سوود، هەروەها دڵتان هەڵسووڕێنێ بۆ بیستنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ)، بەڵکو بە دڵ ڕووبکەنە خوا و بەختیاریتان دەسگیر ببێ.

براکان! ئەو نامانەی بۆ خزمەتی ئێوەیان دەنێرم لەو دیارییە زۆر بەنرخانەن کە دۆست بۆ دۆستیان دەنێرێ بە دەلیلی ئەو حەدیسە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، خوایان لێ ڕازی بێ، لە حەزرەتی پێغەمبەریەوە ڕیوایەت کردووە. حەدیسەکە ئەمەیە: «ما أهدى مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده بها هدى أو يرده بها عن ردى»

واتە: موسڵمان هەرگیز دیارییەکی بۆ برای موسڵمانی نەناردووە کە باشتر بێ لە وتارێکی خێری وەها ببێتە هۆی زیادیی نووری ئیمان و شانازیی ڕێگەی ئاینی یا ببێتە هۆی لادانی زیان و ماڵوێرانییەك لێی.

ئەم نامانە کە دۆستی دڵسۆزتان پێشکەشتانی دەکا، لەم بابەتە دیارییانەن و موسڵمانان لە عەیب و کەموکوڕییان ئاگادار دەکەنەوە و، ئەم ئاگادار کردنەوەیش مەرجی ئەوەیە لە ڕووی کینە و حەسوودی و ئابڕوو بردنەوە نەبێ، دڵنیا بن دڵسۆزتان دوور لەو شێوانە عەرزتان دەکا.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەتی عومەر کوڕی خەتتاب هەموو جار پرسیاری عەیبی خۆی دەکرد لە حوزەیفە و سەلمانی فارسی و ئەبووزەڕی غەفاری، خوایان لێ ڕازی بێ،

دەیفەرموو: «رحم اللّه إمرءآ أهدى الى عيوبي». واتە: خوای گەورە ڕەحم بەو کەسە بکا کە عەیبەکانی خۆمم بە دیاری بۆ دەنێرێ و ئاگادارم دەکاتەوە لێیان، هەروەها لەپاش ئەم قسانە دەیفەرموو: « ئەم جۆرە دۆستانە نایابن و کەمن». بەڵێ دۆستی خۆتان لەو جۆرە دۆستە نایابانەیە کە حەزرەتی عومەر فەرموویەتی.

براکان! گوناهە گەورە ناهەموارەکان لە حەوسەد زیاترن و هەموو ئەمانە دوو جۆرن، یەکەم (حق الناس) واتە هەقی ئادەمیزاد بەسەر ئادەمیزادەوە کە زۆر خراپە. دووەم (حق اللّه)یە واتە هەقی خالسی خوا بەسەر بەندەوە، وەك هەقی نوێژ و ڕۆژوو و خواپەرستییەکانی تر یا وەك بەشی هەقی خوا لە هەموو تاوانێکی (حق الناس)دا. ئەوەیش بزانن (حق اللّه) بێجگە کوفر، پەنا بە خوا هەر گوناهێ بێ لە (حق الناس) سووکترە؛ چونکە زاتی خوای گەورەی میهرەبان و خاوەن کەرەمە و گوناهـ بەخش و سرپۆشە. بەڵام سەبارەت بە (حق الناس) بەهۆی دادپەروەریی خۆیەوە هەموو هەقێ دەداتەوە بە خاوەن هەق، کەموزۆر، بچووك و گەورە، تەنانەت ئەوەندەی باڵی مێشوولە و لەوەیش کەمتر و، کەس لەژێر دەستەڵاتی خوای گەورە دەرناچێ؛ دیارە بەبێ هوودە خوای گەورە ناوی خۆی نەناوە (منتقم) واتە: هەقەوەسێن. بێگومان خاوەنی ڕاستەقینە لە هەموو شتێکدا هەر خوایە و، ئەم خاوەن موڵکانە کە دەیانبینین مالیك و خاوەنی مەجازین، واتە بە پێی شێوەی شەرع خاوەن و مالیکن، ئیتر مالیکی بەڕاستی هەر خوایە، واتە ئەو کەسە ماڵ لە خەڵك داگیر دەکا، ئەوە وەك ئەوەیە عەناد لەگەڵ خوادا بکا و، پێی بڵێ: تۆ ئەی خوا ئەو ماڵەت بۆچی بە فلان کەس داوە؟ بۆ ئەو ناشێ و بۆ من باشە، ئیتر بە زۆری لێی دەسێنێ. جا تۆڵەی ئەم عەنادی کردنە لەگەڵ خوای گەورە زۆر گرانە.

هەر کەس ماڵی یەکێ داگیر بکا لە ڕۆژی قیامەتدا خوا هەقی لێ دەستێنێ و، ئەگەر خێر و خواپەرستییەکی قبووڵی بووبێ، خوا لێی دەسێنێتەوە و بە کابرای ماڵ داگیرکراو دەدا. خۆ ئەگەر کرداری چاکەی نەبوو ئەوا خوا لە تاوان و گوناهی کابرای ماڵ داگیرکراوی دەدا بەسەردا و لە ئاگری دۆزەخدا سزای دەدا.

لەسەر ئەم بناغەیە کە خوای گەورە زۆر نارەزایی خۆی لە ستەمکاران دەربڕیوە و مەنعی موسڵمانانی کردووە لە نزیك بوونەوە لێیان و مەیل کردن بۆ لایان و فەرموویەتی: «وَلاَ تَرْكَنُواْ إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللّهِ مِنْ أَوْلِيَاء ثُمَّ لاَ تُنصَرُونَ» واتە: ئەی بەندەکانی من! هیچ جۆرە مەیلێ مەکەن بۆ لای ستەمکاران نە

مەیلی کەم و نە مەیلی زۆر و، ستەمەکەیان زۆر بێ یا کەم، تا ئەو ستەمکارانە لەو زۆر و ستەمە پەشیمان دەبنەوە، ئەگینا بەهۆی ئەو مەیل و حەزەی ئێوەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاگری دۆزەخ لێتان دەدا و پێتانەوە دەلکێ، لە کاتێکدا هەرگیز دۆستێ، یارێ، یاریدەرێکتان دەست ناکەوێ سوودی هەبێ بۆتان و لەو ئازار و سزایە ڕزگارتان بکا. ئیتر لەپاش هەموو هەوڵ و تەقەلایێ بۆ ڕزگار بوون ڕزگار ناکرێن و کۆمەکتان پێ ناکرێ.

ئەم ئایەتە بەرزە گەلێ هەڕەشەی تێدایە لە ئەهلی ستەم و ئەوانیش یارمەتییان دەدەن یا بە دڵ خۆشیان دەوێن، چ جایێ ئەوانە کە دەبنە یاریدەدەری ڕاستەوخۆی ستەمکاران و، خەڵکیان بۆ تالان دەکەن و پیاویان بۆ دەکوژن و پڕوپاگەندەیان بۆ دەکەن.

بە کورتی ئاینی ئیسلام ئاینێکی حەددی و جیددییە و ئەو کەسە کە موسڵمان بێ دەبێ خزمەتکاری ڕاستی و ڕاستاڵی بێ و دوژمنی لاری و ساختەکاری بێ.

شایانی باسە زاڵم و ستەمکار زۆرن. جۆرێ لەوانە ئەوانەن بیروباوەڕی نابار و ناڕەوا بەناو موسڵمانانداندا بڵاو دەکەنەوە و منداڵانی موسڵمان و پیاوان و ژنانی نەزان تێك دەدەن و لە ڕێگەی ڕاستیان لادەدەن. بێ گومان هەر کەس یارمەتیی ئەم جۆرە ستەمکارانە بدا ئەوانە بەپێی ئەو ئایەتە بە موستەحەقی ئاگری دۆزەخ دەناسرێن. پەنا بە خوا، ئەمجارەش پەنا بە خوا.

جۆرێکی تر ئەوانەن کە بە ناهەق خەڵك دەکوژن یا ماڵی خەڵك داگیر دەکەن یا بەرەنگاری نامووس و کەرامەتی خەڵك دەبن، یا بەبێ ئینسافی پڕوپاگەندەی خراپ دەربارەی ئینسانی باش بڵاو دەکەنەوە، یا ڕێگەی زانست و مەعریفەت لە ئینسان دەگرن.

جۆرێکی تر ئەوانەن کە بە فڕوفێڵ و دەغەڵی زیان بە خەڵك دەگەیێنن وەك ئەو مامەڵەچییانەی بە غەش و خەیانەت خراپ بە چاك پیشان دەدەن و کەم دەکەن بە زۆر، یا لە کاتی قاتوقڕی و گرانیدا ڕزق و ڕۆزی لە ئەهلی شار و ئەهلی لادێ دەشارنەوە تا بە گران بیفرۆشن یان بە پیلان و هەلپەرستی ماڵ و موڵکیان لە دەست وەرگرن.

جۆرێکی تر ئەوانەن دەستی موسڵمانان دەبڕن؛ ئەهلی سەلاح نین و خۆیان بە ساڵح نیشان دەدەن، زانا نین و خۆیان بە زانا دەزانن و لەم ڕووەوە خەڵکی خزمەتیان دەکەن، هەر دیارەییەك بەم هۆیەوە وەربگرن پێیان حەرامە و پێویستە لەسەریان بیگێڕنەوە بۆ

خاوەنەکانیان.

جۆرێکی تر ئەوانەن کە ماڵی دنیایان هەیە کەچی داوای شت لە خەڵك دەکەن. ئەوە هەرچی بەو داواکردنە پەیدا بکەن حەرامە و پێویستە بیدەنەوە بە خاوەنی. هەروەها سواڵکەرێ کە بڵێ پێڵاوم نییە و موسڵمانێ پارەی بداتێ بۆ پێڵاو ئەو بچێ بیدا بە شتێکی تر ئەوەش حەرامە، سا مەگەر کابرای خێرومەند هەر مەبەستی ڕفاهییەت و گوشادیی حاڵی سواڵکەرەکە بێ، ئەوە لەم حاڵەدا بە هەرچی بدا حەڵاڵە و بۆی ڕەوایە. ئەم مەسەلە زۆر هەڵدەکەوێ ، خەڵك پێی نازانن.

ئەگەر کەستێ بە کەسێ بدا بەنیازی ئیحسان و ئەویش وەری بگرێ و وەها تێ بگا کە ئەمانەتە و پاش ماوەیێ بیداتەوە بە کابرای خاوەن ماڵ، ئەوە حەرامە وەری بگرێتەوە؛ چونکە کاتی خۆی بە نیازی تەملیك پێی داوە. ئەم مەسەلەش هەموو کەس لێی حاڵی نابێ.

ئەگەر یەکێ دیارییەکی بۆ یەکێ برد بەهیوای ئەوە کە تکایەکی بۆ بکا و کارێکی بۆ ڕاپەڕێنێ، کەچی ڕای نەپەڕاند، یاخۆ پارەیەکی بە یەکێ دا تا دوعایەکی بۆ بنووسێ نەخۆشەکەی، چاك بێتەوە، کەچی چاك نەبوویەوە ئەوە ئەو دیاری و پارانەی پێ حەڕامە، چونکە نە ئەو کارەکەی بۆ ڕاپەڕاند و نە بە دوعای ئەمیش نەخۆشەکە چاك بوویەوە. بەڵێ ئەگەر دوعانووس خاوەن نەخۆشەکەی تێ گەیاند کە ئەم دوعایە هیچ مەعلووم نییە قبووڵ ببێ و تەئسیری بۆ چاك بوونەوەی نەخۆشەکە ببێ، کەچی ئەو هەر بەنیازی خێرو سەدەقە پارەکەی پێ دا، یا کابرای خاوەن دیاری هەر تەنیا بەرامبەر تکا بۆ کردنەکە دیارییەکەی دا، ئیتر کارەکە جێبەجێ ببێ یا نا، ئەوا پارە و دیارییەکەیان پێ حەڵاڵە.

جا لەسەر بەیانە پێشووەکە وەرگری ماڵی حەرام، با زۆر کەمیش بی، بە زاڵم دادەنرێ و هەر کەس مەیلی سیفەتی ئەو زاڵمانە بکا دەکەوێتە بەر ئەو هەڕەشەی خوای گەورەیە کە لە ئایەتی (وَلاَ تَرْكَنُواْ... الآية)دا دەردەکەوێ.

یەکێ لەو هەڕەشانە کە لەو ئایەتەوە دەردەکەوێ، ئەوەیە کە فەرموویەتی بە هیچ جۆرێ بەلای ئەو کەسانەدا مەیل مەکەن کە زالمن و نزمترین پایەی زوڵم و ستەمیان لێوە دەرکەوتووە. بێگومان کە کەمترین مەیل ڕەوا نەبێ چاکتر نابێ مەیلی زۆر بەلای زاڵمی ناوبراوا بکرێ. دیارە ئەوەی چاکتر لێ دەردەکەوێ کە نابێ کەمترین مەیل هەبێ

بۆ ستەمكاریێ كە گەورەترین پلەی ستەمی لێ وەشابێتەوە، هەروەها لەمەیش چاكتر ئەوەی لێ دەردەكەوێ كە نابێ مەیلی زۆری هەبێ بۆ ستەمكاری ناوبراو.

بەڵێ لەم ئایەتەدا چەند جۆرە هەڕەشەیەكی تر دەردەكەوێ؛ چونكە ئەو كەمترین مەیلە كە نەهیی لێ كراوە، چەند پایە و پلەی هەیە و چەند حاڵ و شێوەی تێدایە و، لە هەموو حاڵ و شێوەیێكا ئاگر لێكەوتنی تێدایە. جا ئەو حاڵانە كە لە هەموویاندا ئاگر لێ كەوتن دێتە جێ ئەمانەن: (الأتصاف بهواهم، والأنقطاع اليهم، ومجالستهم، ومصاحبتهم، وزيارتهم، ومصادقتهم، ومراءاتهم، ومداهنتهم، والتشبه بهم، والتملق لهم، والرضا باعمالهم، والتزيي بزيهم، ومد العين إلى زهوتهم وزينتهم، وذكرهم بما فيه تعظيمهم). واتە: وەرگرتنی خووورەوشتی ئەو ستەمكارانە، بە تەنیا لەگەڵ دانیشتنیان، دانیشتن لە مەجلیسیاندا. هاوڕێیی كردنیان. سەرلێدانیان. دۆستایەتی لەگەڵ كردنیان. ڕیا بۆ كردنیان. لەگەڵ ڕێكەوتنیان. خۆ وەك ئەوان پیشاندان. ماستاو بۆ كردنیان و زوبان لووسی لەگەڵیاندا. ڕازی بوون بە كرداریان. جلوبەرگی وەك جلوبەرگی ئەوان لەبەركردن.چاوبڕینە دەسەڵات و داراییان و حەز لێكردنی، ناوبردنیان بە شێوەیێ گەورەیی و ڕێز لێگرتن پیشان بدا.

بەڵێ بە هەریەك لەم حاڵانە مەعنای (ركون)ی ئایەتە پیرۆزەكە دێتەجێ، بەڵام هەندێ جۆر لەم ڕكوون و مەیلانە لە هەندێكیان سەختترن. بۆ نموونە ڕازیبوون بە كردەوەی ناشیرین و ناهەمواریان لە كاتی چاوپێكەوتنیاندا.

یەكێ لە هەڕەشەكانی ئایەتەكە ئەوەتە كە خوا فەرموویەتی: (فتمسكم النار) بە حەرفی (ف) كە دەلالەت لە سەبەبییەت دەكا، واتە: مەیلی ئێوە بۆ لای زاڵمان سەبەبە بۆ ئەوە كە ئاگری دۆزەخ لێتان بكەوێ و دیارە لێكەوتنی ئاگریش دەبێتە هۆی سووتان. لەم لێكەوتنەیشدا ئیحتمالی سزای گەورە هەیە بە دەلیلی ئایەتی (لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ) واتە ئاگر لێكەوتن هەڵدەگرێ ئازاری سووك بێ و هەڵیش دەگرێ زۆر گران بێ.

لە لایێكی ترەوە ئایەتەكە هەڕەشەیەكی گەورە تێدایە بۆ ستەمكاران خۆیان؛ چونكە ئەگەر خەڵك بەهۆی تێكەڵی و مەیل لەگەڵ ئەواندا تووشی سزای خوای گەورەی ببن دەبێ سزای ستەمكاران خۆیان چۆن بێ و چۆن تۆڵەیەكیان لێ بسەنرێتەوە؟!

«عن فضيل، قال: لو أن رجلا لا يخالط هؤلاء يعني السلاطين وأعوانهم، ولا يزيد على

الفرائض فهو أفضل من رجل يخالط السلطان ويصوم النهار ويقوم الليل ويجاهد». واته: ئەگەر كەسێ تێكەڵیی پادشایان و داروودەستەكانیان نەكا و تەنیا واجیبەكانی سەرشانی جێبەجێ بكا گەورەترە لە یەكێ تێكەڵیی ئەوان بكا و ڕۆژ بە ڕۆژوو و شەو خەریكی خواپەرستی بێ و لە ڕێگەی خوادا جیهاد بكا.

براكان! ئەو ئایەتی هەڕەشەیەم بۆ باس كردن كە دەرحەق بەوانە هاتووە مەیلیان هەیە بەلای ستەمكاراندا. وا ئێستە هەندێ لەو حەدیسانەتان بۆ باس دەكەم كە دەرحەق بەوانە وتراون كۆمەكی ستەمكاران دەكەن و یارمەتییان دەدەن؛ بەڵكو زیاتر پەند و عیبرەت وەربگرن، بێ گومان ئەم خزمەتی منە، خزمەتێكی گەورەیە بۆ ئێوە و سوودێكی زۆری تیایە بۆتان ئەگەر پەیڕەویی ئامۆژگارییەكانم بكەن.

لە حەدیسێكدا حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أهل الجور وأعوانهم في النار». واتە: ستەمكاران خۆیان و یارمەتیدەرەكانیشیان لە ئاگری دۆزەخدان.

دەگێڕنەوە: بەرگدروویێ لە زانایەكی خاوەن دڵی پرسی: مادام من كەوا بۆ ستەمكاران بدوورم ئاخۆ لە یارمەتیدەرانیان حسێب دەكرێم؟ من زۆر دەترسم لەو حەدیسە شەریفە كە دەفەرمووێ: «أعوان الظلمة كلاب». زاناكە فەرمووی: بەڵێ تۆ خۆت بە زالم حسێب دەكرێی و ئەو كەسانەیش كە دەرزیت پێ دەفرۆشن بۆ دروومان كردن كارەكەیان كۆمەكیی زاڵمە.

براكان! وەڵامی زاناكە لەو لایەنەوە بووە كە بەرگدرووەكە پارەی حەرام وەردەگرێ و بەوە دەبێتە زاڵم نەك لە ڕووی ئەوەوە كەواكەی دووریوە؛ چونكە نەفسی كەوا دوورین گوناح نییە.

ڕیوایەت كراوە: «من مشي مع ظالم ليعينه وهو يعلم أنه ظالم فقد خرج عن الأسلام» وە ڕیوایەت كراوە: «من أعان على خصومة بظلم لم يزل في سخط اللّه، ومن أعان ظالما ليدحض بباطله حقا فقد برئت منه ذمة اللّه وذمة رسوله». واتە: كەسێ لەگەڵ ستەمكارێكدا بەڕێگادا بڕوا، بەمەستی ئەوەی یارمەتیی بدا و، بزانێ ستەمكارە، ئەو كەسە لە ڕێگای ڕاستی ئیسلام دەرچووە. هەروەها كەسێ یارمەتیی ستەمكارێ بدا لە كردنی ناحەقێكدا بە حەق بۆی، ئەوە لە ژێر باری نارەزاییی خوادا دەمێنێتەوە و، تا ئەو كەسە حاڵی وابێ خوا لێی نارازی دەبێ. كەسێكیش كۆمەكیی ستەمكارێ بكا بۆ ئەوە بەهۆی

هێزی ناشەرعیی ئەوەوە حەقیٚ بفەوتێنیٚ ئەوە خوا و پێغەمبەری خوا لەو کەسە بەری دەبن و لێی عاجز دەبن.

براکان! ئەم ئەندازە ئایەت و حەدیسانە بەسن بۆ پەند وەرگرتن و ئاگاداربوونەوە و بۆ ئەوە ستەمکارەکان ڕەحم بە خۆیان بکەن ، بە جاریٚ تەوبە بکەن و لەو زوڵم و زۆرە دەست هەڵگرن.

وا ئێستەیش هەندیٚ حەدیستان بۆ باس دەکەم کە هەڕەشەیان تیایە بۆ ستەمکاران:

ڕیوایەت کراوە: پارێز بکەن لە ستەم؛ بە ڕاستی ستەم تاریکیی ڕۆژی قیامەتە. هەروەها ڕیوایەت کراوە: پارێز بکەن لە دوعا و نزای ستەم لێکراو؛ بە ڕاستی پەردە لە بەینی ستەم لێکراو و زاتی خوادا نییە، تەنانەت نزای کافری ستەم لێکراو دەگاتە خوا، ئینجا ئاخری حەدیسەکە دەفەرمووێ: ئەی ستەم لێکراو! بە عیزەت و جەلالی خۆم قەسەم یارمەتیت دەدەم، با زۆریشی پیٚ بچیٚ، یا لە دنیا یا لە قیامەتدا تۆڵەت دەسێنم و حەقت نافەوتێنم. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵیٚ: ئەو دوعایە وەکو پڕیشکی ئاگر بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان.

لە ڕیوایەتێکی ترا دەفەرمووێ: غەزەبی خوا زۆر توندوتیژە دەرحەق بە کەسیٚ ستەم لە یەکیٚ بکا کە غەیری خوا کۆمەك و یارمەتیدەریٚ شك نەبا.

ئەی ستەمکارە بیٚ ئینسافەکان! دیارە ئێوە لەبەرئەوە ستەمی لە توانابەدەر لە فەقیر و هەژارەکان دەکەن، چونکە ئەوان یارمەتیدەروپشت و پەنایان نییە، ئەگەر کەسێکیان شك ببردایە ئێوە ئاوها نەتاندەتوانی ستەمیان لیٚ بکەن! جا بزانن چۆن هەقیان دەسێنم؟!

حاکمی ئەم زەمانە ئەوانیش بوونەتە بەڵا و موصیبەت بۆ هەژاران و لەباتی ئەوەی یارمەتییان بدەن باریان قورس دەکەن و ڕەحمیان پیٚ ناکەن. بە ڕاستی ئەمانە ڕەحم بە خۆیان ناکەن؛ چونکە لەسەر ئەم حاڵەیان خوای گەورە غەزەبیان لیٚ دەگریٚ، لە کاتێکدا پەشیمان دەبنەوە کە پەشیمانییەکەیان سوود و قازانجی نەبیٚ بۆیان! خۆیان دەگەیێننە سزای توندی خوای گەورە و، هەموو مەئموور و بەردەستەکانیشیان، کە دەبنە هۆی ستەمکاریی ئەوان و یارمەتییان دەدەن، ئەوانیش موستەحەققی سزای دنیا و قیامەت دەبن.

ڕیوایەت کراوە: «أشد الناس عذاباً عند اللّه يوم القيامة أشد الناس عذاباً للناس في الدنيا» واتە: ئەوانەی لە ڕۆژی قیامەتدا سزایان لە هەموو کەس زۆرتر و سەختتر و

ناهەموارترە، ئەوانەن کە لە دنیادا تیژترین سزای نابار و ناهەمواریان بووە بەرانبەر خەڵکی.

ڕیوایەت کراوە: خوای گەورە مۆڵەتی ستەمکار دەدا تا وادەی تۆڵە لێ سەندنەوەی دێ، جا کە وادەی هات ئیتر مۆڵەتی نادا.

«في البخاري: عن أبي موسى الأشعري قال: قال رسول اللّه صلى اللّه عليه وسلم: «إن اللّه سبحانه وتعالى ليملي للظالم حتى اذا أخذه لم يفلته.». ثم قرأ: «وكذلك أخذ ربك أذا أخذ القرى وهي ظالمة أن أخذه اليم شديد». واتە: خوای گەورە ماوەیێ مۆڵەتی ستەمکار دەدا تا وەعدەی سزا و تۆڵە لێ سەندنەوەی دێ، ئیتر کە گرتی بەرەڵای ناکا. ئینجا حەزرەت (د.خ) بەشوێنی ئەو فەرموودەیەدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە مانای ئەوەیە: هەروەهایە گرتنی خوا کە ئاوەدانییەکی ستەمکاری گرت، تۆڵەسەندنەوەی خوا توندوتیژە و ئازاری سەختە.

وروي: حتم على اللّه أن لا يستجيب دعوة مظلوم ولأحد قبله مظلمته. واتە: خوای گەورە بڕیاری داوە دوعا و نزای ستەم لێکراوێ قبوڵ نەکا کە لە پێش ئەو ستەمەی لەو کراوە ئەو ستەمی لە کەسێ کردبێ؛ واتە دوعای ئەو جۆرە ستەم لێکراوانە کە قبووڵ ناکرێ لەبەرئەوەیە ئەو ستەم لێکراوە لەپێشدا خۆی ستەمکار بووە و لەبەر شوومیی ئەو ستەمە خۆی کردوویە ئەو دوعایەی کە لە ستەمکارەکەی دەکا قبووڵ ناکرێ.

ڕیوایەت کراوە: پارێز بکەن لە ستەم کردن؛ بە ڕاستی ستەم دڵ وێران دەکا و خراپی دەکا. هەروەها ڕیوایەت کراوە: خاوەنی ئەم جۆرە دڵە لە هەموو کەس دوورترە لە خوای گەورە.

ڕیوایەت کراوە: قەسەم بەخوا پێویستە لە قیامەتدا حەق بدرێتەوە بە خاوەن حەق. تەنانەت لەو ڕۆژەدا حەقی حەیوانی بێ شاخ لە حەیوانی شاخدار دەسەنرێتەوە.

براکان! مەڕ و بزن موکەللەف نین. جا مادام خودا لەناو ئەواندا حەق بسێنێتەوە، دەبێ لە نێوان ئادەمیزادا کە ئەهلی تەکلیف و خاوەن هۆشن ئەم تۆڵە سەندنەوەیە چۆن بێ؟.

دەگێڕنەوە: گەنجێکی بەنی ئیسرائیلی تەوبەی لە گوناهکردن کرد و، گەڕایەوە بۆ لای خوا و بە ڕۆژ خەریکی ڕۆژوو دەبوو و شەو بە نوێژ و، هەرچی ئارەزووی نەفس بوو وازی لێ هێنا، تەنانەت تا مرد لە سێبەرا دانەدەنیشت. لەپاش مردنی یەکێ لە خەوا چاوی پێ

کەوت و لێی پرسی: خودای گەورە چیی لەگەڵ کردی؟ وتی: موحاسەبەی کردم و لە ئەنجاما لێم خۆش بوو و لە هەموو شتێ عەفووی کردم لە حەقی خەڵك نەبێ، تەنانەت لە پووشێ کە جارێ لە ماڵی یەکێ بەبێ پرس بردبووم و دانم پێ ئاژنیبوو، عەفووی نەکردم و تائێستە مەنع کراوم لە بەهەشت .

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: بەڕاستی ستەم لێکراوەکان ئەهلی نەجاتن، واتە: خەڵکی ستەم لێکراو رزگار دەبن، بەڵام ستەمکار ڕزگار نابێ. دیارە لەبەرئەوەیە کە ستەم لێکراوان حەقی کەسیان لەسەر نییە و ستەمکار باریان قورسە و حەقی خەڵکیان لەسەرە. هەروەها لەبەرئەوەیە کە ستەمکارەکە ئەگەر کردەوەی چاکەی هەبێ دەدرێتە ستەم لێکراوەکە و خۆی بەبێ دەسمایە دەمێنێتەوە.

ڕیوایەت کراوە: کەسی وا زۆرە کە لە ڕۆژی قیامەتدا وادەزانێ ئەهلی نەجاتە چونکە خێر و کردەوەی چاکی زۆرە کەچی نەجاتی نابێ، چونکە یەکە یەکە ئەو کەسانە کە حەقیان لەسەریەتی دێن لە چاکەکەی وەردەگرن بۆ خۆیان ئەو خۆی بە داماوی و بێ دەستی دەمێنێتەوە. پاش ئەویش هەر ڕزگار نابێ، چونکە کە حەسەناتی نەما و هێشتا قەرزار بوو ئەمجارە لە تاوان و گوناهی ئەوانەی ستەمی لێ کردوون بەسەردا دەدرێ و ئەمر دەکرێ ببرێ بۆ دۆزەخ و، لە تۆڵەی تاوانی خۆی و تاوانی ئەوانیشدا کە زوڵمی لێ کردوون سزا بدرێ.

ڕیوایەت کراوە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو ستەم لێکراوانە کە لە دنیادا کردەوەیان چاك بووە، تەمەننا دەکەن لە دنیادا ماڵیان زۆر بوایە و هەموویشی ستەمکار ببیردایە.

ڕیوایەت کراوە: لەو کاتەدا کە ئینسانی ستەم لێکراو هاوار دەبا بۆ لای خوا و داوای یارمەتیی لێ دەکا و، کەس نییە یارمەتیی بدا، خوای گەورە دەفەرموێ: «لبيك يا عبدي!» واتە: ئەی بەندەی خۆم من ئامادەم بۆ یارمەتیدانت. قەسەم بە عیزەت و جەلالی خۆم لە دنیا و لە قیامەتا یارمەتیت دەدەم. براکان! ئەم میهرەبانیی خوای گەورەیە لەبەرئەوەیە کابرای ستەم لێکراو هاوار و هانای بۆ لای خودا بردووە، دیارە ئەویش حەقی دەسێنێتەوە.

ڕیوایەت کراوە خوا بە گەورەیی خۆی سوێندی خواردووە کە حەق دەسێنێ لە هەر کەس زوڵم بکا و لەو کەسانەیش کە دەتوانن مەنعی زاڵم بکەن لە زوڵم بەڵام بێدەنگ دادەنیشن و هیچ ناکەن.

ڕیوایەت كراوە ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) فەرمووی بە هاوڕییەكانی: دەزانن لات و موفلیس كێیە؟ عەرزیان كرد: بەڵێ ئەو كەسەیە كە درهەم و دیناری نەبێ. فەرمووی: نەخێر. موفلیس لە ئوممەتی مندا ئەوەیە كە مرد خاوەنی نوێژ و ڕۆژوو و واجیبەكانی تری دین بێ، بەڵام ڕۆژی قیامەت لە هەموو لایەكەوە خاوەن حەق دەوری لێ بدەن و داوای حەقی خۆیانی لێ بكەن و ئەمەیش بێجگە عیبادەتەكانی هیچ شك نەبا بیانداتێ. جا یەكێ دێ نوێژەكەی دەبا. یەكێ دێ ڕۆژووەكەی دەبا. یەكێ حەجەكەی دەبا...تاد؛ چونكە لە دنیادا جوێنی بە یەكێ داوە و بوختانی بۆ یەكێ هەڵبەستووە و ماڵی كەسێكی تری خواردووە، یا بە ناحەق خوێنی یەكێكی ڕشتووە... تاد.

(روي: من أخذ شيأً من الأرض بغير حق، خسف به يوم القيامة الى سبع أرضين). واتە: دەگێڕنەوە لە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) كە فەرموویەتی: هەر كەسێ ئەندازەیێ لە زەوی بە ستەم داگیر بكا، خوای گەورە دەیباتە خوار بە ناخی ئەو زەوییەدا تا حەوت چینی زەوی.

براكان! من تا ئەم حەدیسەم چاو پێ نەكەوتبوو لە مانای حەدیثی «طوقه اللّه بين سبع أرضين» تێ نەدەگەیشتم و نەمدەزانی چۆن ئەم حەوت زەوییە دەكرێتە تەوقی گەردنی؟ كە ئەم حەدیسەم چاو پێ كەوت تێ گەیشتم كە مانای تەوقەكە ئەوەیە ئەو كەسە بەناو زەویدا دەبرێتە خوارەوە و لوول دەخوا تا حەوت چین؛ دیارە كەسێ بە زەویەكدا ببرێتە خوارەوە ئەو زەوییە وەك بازنە لە سەرەوە تا خوار دەوری ملی دەدا.

ڕیوایەت كراوە: «بين العبد والجنة سبع عقبات أهونها الموت وأصعبها الوقوف بين يدي اللّه إذا تعلق المظلومون بالظالمين». واتە: لە مابەینی بەندە و بەهەشتدا حەوت پلەی ناهەموار هەیە، ئاسانتریان سەرەمەرگە و، گرانتریان ڕاوەستانە لەبەردەمی خودای گەورەدا لەوكاتەدا كە ستەم لێكراوان یەخەی ستەمكارەكان دەگرن و داوای حەقی خۆیان دەكەن.

براكان! ئەو كەسانەی زەویوزاری دەوڵەتی و حوقووقی حكومەت بەرامبەر بە ئەندازەیەك دەگرنە ئەستۆی خۆیان و لەپاشاندا خۆیان بەشێنەیی حیسابی خۆیان لەگەڵ خەڵكدا دەكەن، ئەمانەیش هەر ستەمكارن. بۆ نموونە كەسێك حەقی مەڕانە و بزنانەی ناوچەیێ دەگرێتە ئەستۆ دە هەزار دینار دەدا بە حكومەت، ئینجا خۆی زۆر بەوردی مەڕ و بزنی ناوچەكە دەژمێرێ و، جاری وا هەیە بێجگە لە ئازاردانی مسكێنەكان دوو سەد

هەزار دیناریان بەرامبەر بەم مەڕانە و بزنانەیە لێ دەسێنێ.

زۆر و ستەمی ئەمانە گەلێ جۆرە و ئەم ستەمکارانە بە چەند جۆر گیرۆدەی زیانی ئاینی دەبن. یەکەم کە خۆیان زۆر و ستەم دەکەن و ئازاری خەڵك دەدەن. دووەم کە بەردەستەکانیان بە زەبری زۆری ئەوان ستەم لە خەڵکی دەکەن و ئازاریان دەدەن. سێیەم ئەم زوڵمە زوڵمی تری لێ دەبێتەوە؛ چونکە ستەم دوو جۆرە، یەکەم نەزۆکە وەکو ئەوە کە دە دینار پارە لە یەکێ بە زۆر وەربگری ئەمە زیاد ناکا. دووەم زاوزێ دەکا و ستەمی تری لێ دەبێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر باغێ لە یەکێ زەوت بکەی ئەوە هەتا قیامەت هەر بەرێ لەو باغە بێتە بەرهەم ستەمکار پرسیاری لێ دەکرێ و سزای لەسەر دەنووسرێ. هەروەها ئەگەر دە سەر مەڕ داگیر بکەی لە زاوزێی ئەو مەڕانە پرسیارت لێ دەکرێ. هەروەها ئەگەر یەکێ بارە بەرێ لە یەکێ زەوت بکا تا ئەو بارە بەرە دەمرێ ئەو ستەمکارە پرسیاری کرێ، باری ئەو بارە بەرەی لێ دەکرێ. وە ئەگەر خانوویێ داگیر بکا لە کرێی ئەو خانووە بەرپرسیارە. دیارە ستەمێ کە ستەمی تری لێ پەیدا بێ لە ستەمێ گرانترە کە نەزۆك بێ وەك پارەیەك سەرف بکرێ لە خواردەمەنیدا.

بێگومان ئەگەر ئینسان هۆشیار بێ و شعووری هەبێ، هەرگیز بۆ مەڕێ کە نرخی دە دینار بێ، خۆی ناخاتە ژێر باری قەرزی دوو سەد دینارەوە، واتە: لە تۆڵەی خوری و دۆ و ڕۆن و بەرخی ئەو حەیوانەدا هەتا بمێنێ. بە کورتی کارێکی وا ناکا بۆ دە دینار دوو سەد دینار یا زیاتر بێنێتە سەر خۆی.

شایانی باسە لە هەموو جۆرە زۆر و ستەمێکدا ئەگەر ستەمکارەکە ستەمەکە بە حەڕام بزانی، ئەوە کەمێ ئەهوەنە. بەڵام ئەگەر بە حەڵاڵی بزانێ (والعیاذ باللّٰه) ئەوە دەبێتە هۆی کوفر و ئینسان بەو بیرو باوەڕەوە کافر دەبێ؛ چونکە حەرام بە حەڵاڵ زانین باوەڕنەکردنە بە خوا و بە پێغەمبەری خوا؛ ئەوان فەرموویانە حەرامە و ئەم ستەمکارە دەڵێ حەڵاڵە؟

لەلایەکی ترەوە ئەو نیشتمانەی ستەمی تێدا بکرێ بە لای زۆرەوە هەموو دانیشتووانی تاوانبار دەبن؛ چونکە بە شێوەیەکی گشتی لەسەریان واجیبە مەنعی ئەو ستەمکارانە بکەن و نەهێڵن دەستدرێژی بکەن. دیارە مادام هەموویان مەنعیان نەکردن و لە ئاستی ئەو ستەمکارییانەدا بێدەنگ بوون هەموویان تاوانبار دەبن، بەڵام هەر کەس بە قەدەر شان و باڵی خۆی و بە ئەندازەی دەست ڕۆیشتنی. شایانی باسە پاداشی ستەمی ئەم

کۆمەڵە بێدەنگە تەنیا سزا و لێپرسینەوەیە و ناگاتە ئەوە کە چاکەیان لێ وەربگیرێ و بدرێتە ستەم لێکراوەکان؛ چونکە ئەمانە ماڵی خەڵکیان نە خواردووە و تەنیا لە ستەمکاری حەرام خۆر و حەرام کردەوە بێدەنگ بوون.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «کلکم راع و کلکم مسؤول عن رعیته والرجل راع في أهله ومسؤول عن رعیته. والمرأة راعیة في بیت زوجها ومسؤولة عن رعیتها». واتە هەمووتان شوان و چاودێرن و هەمووتان لەوەی لەبەر دەستاندایە و لەژێر دەسەڵاتتاندایە لێپرسراون؛ پیاو شوانی ماڵ و منداڵی خۆیەتی و دەبێ چاودێریی کۆمەڵە بچووکەکەی خۆی بێ و، دەربارەی ئەو کۆمەڵە لەلایەن خوای گەورەوە بەرپرسیارە. هەروەها ژنی خاوەن خێزان و خاوەن مێرد لە حوقووقی مێردەکەی و مەسرەفی خێزان و ئەحواڵی خێزان بەرپرسیارە، هەر کەس بە قەدەر حاڵی خۆی و توانای.

ئەم فەرموودە بەرزە هەرەشەیەکی گشتیی تێدایە کە واتە پێویستە لەسەر فەرمانداڕەکان چاودێریی مەئموورەکانی بەردەستیان بکەن و ماوەی ئەوەیان نەدەنێ دەستدرێژی بکەنە سەر خەڵك.

ڕیوایەت کراوە: «ان اللّه یسأل عن کل راع عما أسترعاه حفظ أم ضیع». واتە: بەڕاستی خوای گەورە لە هەموو شوانێك و لە هەموو چاودێرێ دەپرسێ، سەبارەت بەو شتەی داویەتە دەستی و خستوویەتییە ئەستۆی، ئاخۆ پاراستوویەتی یان لە کیسی داوە و فەوتاندوویەتی. ڕیوایەت کراوە خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتتاب، خوای لێ ڕازی بێ، کەسێکی کردە سەرکار و کاربەدەستی وڵاتێ بۆ بەجێهێنانی واجیباتی ئیسلامی. لەپاش دوو سێ ڕۆژ کابرای چاوپێ کەوت نە ڕۆیشتبوو بۆ سەر ئیشەکەی؛ حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئایا تۆ نازانی لەسەرت پێویستە فەرمانی ئێمە وەربگری؟ ئەویش عەرزی کرد: بەڵێ دەزانم، بەڵام ئەم دوو سێ ڕۆژە لە ترسی ئەو فەرموودەیە دواکەوتم کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «من ولي شیأً من أمر المسلمین أوتي به یوم القیامة حتی یوقف علی جسر جهنم، فأن کان محسناً نجا وأن کان مسیئاً وقع. أو کما قال». واتە: کەسێ فەرمانێ لە فەرمانەکانی موسڵمانانی بدرێتە دەست لە ڕۆژی قیامەتدا حازر دەکرێ و لەسەر پردی سیرات ڕادەوەستێنرێ کە بەسەر دۆزەخدا ڕاکێشراوە، جا ئەگەر ڕەفتاری لە دنیادا باش بووبێ و کارەکەی بە چاکی و پاکی جێبەجێ کردبێ، ئەوا ڕزگار دەبێ و بە سەلامەتی دەپەڕێتەوە. خۆ ئەگەر خراپ بووبێ و کارەکەی بە ناپاکی و

ناتەواوی ڕاپەڕاندبێ، ئەوا لەو پردەوە بەردەبێتەوە ناو قووڵایی دۆزەخ و سزای دەدرێ.

پاش ئەمە ئەبووزەڕی غەفاری، خوای لێ ڕازی بێ، بە ڕێکەوت چاوی بە حەزرەتی عومەر کەوت، خوای لێ ڕازی بێ، تەماشای کرد مات و مەلوولە. عەرزی کرد بۆچی عاجزی؟ ئەویش فەرمووی ئەم حەدیسەم لە فلان کەس بیست دەربارەی حاڵی فەرمانداری کاری موسڵمانان. ئینجا ئەبووزەڕ فەرمووی: ئەو حەدیثە کە بیستووتە، ڕاستە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) و حەدیسێکی تریشی لەم بابەتەوە فەرمووە کە هەردووکیانم لە حەزرەتیەوە بیستووە. جا هەر کامیان ئێش دەگەیێنێ بە دڵت باشە. حەزرەتی عومەر فەرمووی: هەردووکیان تەئسیر و ئێش بە دڵم دەگەیێنن.

ڕیوایەت کراوە خزمەتی ڕۆژێ لە لایەن حاکمی دادپەروەرەوە خێر و پاداشتی لە عیبادەتی شەست ساڵ زۆرترە. هەروەها بەجێهێنانی حەددێ لە حەددەکانی ئیسلام سوودی زۆرترە لە بارانی چل بەیانی لەکاتی پێویستیی خەڵك بە باراندا.

براکان! هەر کەسێ لە شوێنێکدا دەستی بەسەر دوو ماڵدا بڕوا، مانای ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر (د.خ) دەیگیرێتەوە، واتە: ئەگەر ڕەفتاری لەگەڵیاندا باش بێ، ئەوە پاداشی چاك دەبێ، بەڵام ئەگەر خراپ بێ، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا گیرۆدەی سزا دەبێ.

لە فەرموودەیەکی حەزرەتدا هەیە (د.خ) کە جەور و ستەمی حاکمێ بۆ تاقە ڕۆژێ گوناهی زۆرتر و سزای توندترە لە تاوانی عادەتیی ئینسانێ لە ماوەی شەست ساڵدا.

ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەروویەتی: پێنج گوناهـ هەن ئەگەر لەناوتاندا پەیدا بوون پەنا بە خوا حاڵتان زۆر خراپ دەبێ.

یەکەم: زیناکردن لە هەر کۆمەڵێکدا پەیدا ببێ خوا تاعوون و دەردی وا لەناویاندا بڵاو دەکاتەوە کە لەوەپێش نەبووبێ. دووەم: هەر کۆمەڵێ زەکاتی ماڵیان دەرنەکەن خوای گەورە بارانیان لێ دەگرێتەوە، یا هەر ناباریێ یاخود لە کاتێکا دەبارێ کە سوودی نەبێ، مەگەر هەر بۆ بێ زمان سوودی ببێ کە گیای بۆ بڕوێنێ. سێیەم: هەر کۆمەڵێ لە کێشانەو پێوانەدا کەموزۆر بکەن و خیانەت لەگەڵ خەڵکدا بکەن خوای گەورە گیرۆدەیان دەکا بە گرانی، خۆ ئەگەر گرانی پەیدا نەبێ لە نێوانیاندا ئەوا بە ئەنواعی ئازار و سەخڵەتیی ژیان گیرۆدە دەبن و ئاسایشیان نامێنێ. چوارەم هەر کاتێ کاربەدەستان و

فەرمانداڕانی وڵات ئەمر بکەن بە شتێ کە خوا پێی ڕازی نەبێ و حوکمی پێ نەکردبێ و نەیناردبێ بۆ خەڵك، ئەوە خوا دوژمنیان بەسەردا زاڵ دەکا. هەر بە هۆی ئەمەیشەوەیە کە کافرانی نامەرد عەزمی ئەوە دەکەن شەڕ لەگەڵ ئوممەتی ئیسلامدا بکەن. قەسەم بە خوا ئەگەر فەرمانداڕانی ئیسلام لەسەر ڕێگەی خوا بمانایە هەرگیز کافر تەماعیان نەدەکردە وڵاتی ئیسلامی؛ چونکە ئەگەر فەرمانداڕانی ئیسلام بە حەق ڕەفتاریان بکردایە لە بەینی خۆیاندا هاوڕاز و هاونیاز دەبوون و سوپا و هێزیان ئامادە دەکرد بەرامبەری کافرەکان و، ئەوانیش جەسارەتی ئەوەیان نە دەکرد لەگەڵ موسڵمانانندا بجەنگن. پێنجەم هەر کاتێ فەرمانداران بێنە سەر ئەو بیروباوەڕە کە حوکمی خوا ڕاگرن و لەناوا نەیهێڵن و کاری پێ نەکەن خوای گەورە شەڕ و ئاژاوە دەخاتە ناویان و هەر لایەك دەبێتە هۆی گرفتاری بۆ ئەو لاکەی تر و لەبەر پەشێویی خۆیان نایانپەرژێتە سەر کاری چاك ئەنجامی پاکیان دەسگیر نابێ.

ڕیوایەت کراوە کە فەرمانداران وایان لێ دێ خێری نوێژ و ڕۆژوویان بۆ خۆیان نەبێ، واتە لەبەر ستەمکاریی خۆیان ئەو نوێژ و ڕۆژووەی دەیکەن خێر و پاداشەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا بەو کەسانە دەدرێ کە لە دنیای ڕۆشندا ستەمیان لێ کردوون و ئازاریان داون.

ڕیوایەت کراوە: «لن تهلك الرعية، وأن كانت ظالمة مسيئة إذا كانت الولاة هادية مهدية. ولكن تهلك الرعية، وأن كانت هادية مهدية، وأذا كانت الولاة ظالمة مسيئة». واتە: ڕەشەخەڵك و هەڕەمەی بنیادەم، هەرچەند ستەمکار و بەدڕەفتار بن، نافەوتێن ئەگەر فەرماندارەکانیان بیروباوەڕیان لەسەر خێر و دادپەروەری بێ؛ چونکە ئەمانە دەتوانن بیانگەڕێننەوە سەر ڕێگا و شوێنەواری ئاین و خواپەرستی و مەنعیان بکەن لە لادان لە ڕێگەی ڕاست. بەڵام ئەم ڕەشەخەڵك و هەڕەمەی بنیادەمە، هەرچەند ڕەفتاریان باش و کرداریان پەسەند بێ، ئەگەر فەرماندارەکانیان ستەمکار و بەدڕەفتار بن دەفەوتێن؛ چونکە ئەفرادی ڕەشە خەڵکەکە دەستیان ناڕوا و ناتوانن دەفعی خراپیی گەورەکان بکەن و لەم حاڵەدا لایەنگری گەورەکان زۆر دەبن و ئەمان کەم و بێ هێز دەبن و دەفەوتێن. بێجگە لەوە ستەمکردن لە ئینسانی باش دەیفەوتێنێ و بێ هێز و دەسەڵاتی دەکا و قسەی ناڕوا بە جۆرێ بە حاڵ سوودی بۆ نەفسی خۆیشی دەمێنێ. کەوابوو چاك وایە گەورەکان خۆیان چاك بکەن و ڕێگەی ڕاست بگرنەبەر تا خۆیشیان و بەردەستەکانیشیان و هەڕەمەی خەڵکیش چاك بن و لە سزای دواڕۆژ ڕزگار بن.

ڕیوایەت کراوە کە وەهب وتوویە: کاتێ کە فەرماندار نیازی هاتە سەر ئەوە ستەم بکا خوا کەموکوڕی دێنێ بەسەر وڵات و بازاڕ و کشتوکاڵ و ئاژەڵ و شتی تردا. بەڵام کە نیازی لەسەر دادپەروەری و ڕاستی بوو خوای گەورە پیتوبەرەکەت دەخاتە هەموو شت و هۆی پیرۆزی و بەختیاریی ئەهلی وڵات ئامادە دەکا.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: خوایا! هەر گەورە و کاربەدەستێ کە ئیشی ئوممەتی لە دەستایە هەر کاتێ چاکە و میهرەبانی کرد لەگەڵیاندا، تۆیش لەگەڵ ئەوا میهرەبانی بفەرموو. وە ئەگەر ناپیاوی و نامیهرەبانی لەگەڵیاندا کرد، تۆیش لەگەڵ ئەو نامیهرەبان بە.

لەسەر فەرماندارەکان پێویستە کاتێ بیانەوێ مەئموورێ بۆ وڵاتێ بنێرن یەکێ بنێرن کە خوا لێی ڕازی بێ و کردەوەی باش بێ و هەرگیز ئەوانە نەنێرن کە ناویان بە زاڵم و ستەمکار و بەدخوو دەرکردووە؛ چونکە ئەو جۆرە مەئموورە بەدخووانە خووی ئوممەت خراپ دەکەن و تۆوی فەساد و بەدکاری لەناو کۆمەڵدا دەچێنن و خەڵکەکەیش دڵیان لە عاستی گەورەکان کرمێ دەبێ.

لەم بابەتەوە گەلێ ڕیوایەت هەیە؛ بۆ نموونە ڕیوایەت کراوە: کاتێ فەرمانداری مەئموورێکی خووڕەوشت باشی دەست کەوت و کاروباری پێ نەسپارد و، مەئموورێکی بەدخووی دیاری کرد و ئیشوکاری بەو سپارد، ئەوە ئەو فەرماندارە بە خائینی خوا و پێغەمبەری خوا و ئوممەت دادەنرێ و فەرز و سوننەتی لێ قبووڵ ناکرێ و خوا لەعنەتی لێ دەکا. لەم چەشنە حەدیسانەم گەلێ جار بەسەر فەرماندارەکاندا خوێندووەتەوە، بەڵام شەرمم کردووە لەوە کە حەدیسی لەعنەتەکەیان بۆ بخوێنمەوە. بەڵێ بە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (د.خ) دەردەکەوێ کە زوڵم و ستەم دەبێتە هۆی قبووڵ نەبوونی دوعا و پاڕانەوە و سەرنەکەوتن بەسەر دوژمندا. هەروەها لە فەرموودەکانیەوە دەردەکەوێ کە (حق الناس) تەنیا ماڵ نییە، بەڵکو لێدان و کوشتن و جنێودان و بوختان کردن و وێنەی ئەمانەیش دەگرێتەوە و لە ڕۆژی قیامەتدا لە تۆڵەی ئەم گوناهانەدا بەقەدەر پێویست لە چاکەی ستەمکارەکان دەدرێ بە ستەم لێکراوەکان. ڕیوایەت کراوە: دوو سیفەت هەن لەوانە بەرزتر لای خودا نییە، یەکەم باوەڕهێنان بە خوای گەورە. دووەم سوود گەیاندن بە بەندەکانی خوا. براکان! لە مەفهوومی موخالیفی ئەم ڕیوایەتەوە دەردەکەوێ کە خراپترین سیفەت لە دنیادا یەکەم کوفر و بێ ئیمانییە و دووەم زیان گەیاندن بە خەڵك.

ڕیوایەت کراوە خواپەرستێ وەفاتی کرد. پاش دەفن کردنی دەستی کرد بە پاڕانەوە لە حوزووری خوای گەورەدا. ئەویش لە هەموو گوناهەکانی خۆش بوو بەشی یەك جەڵدە نەبێ، کە ئەو تاقە جەڵدەیان لێ دا قەبرەکەی پڕ بوو لە ئاگری دۆزەخ، ئەویش هاواری کرد: من بەم هەمووە خواپەرستییەوە کە بووم بۆچی وا سزام دەدەن، لە غەیبەوە وەڵامی درایەوە کە تۆ جارێ بەسەر ستەم لێکراوێکدا ڕابووردی و ئەو هەرچی هاواری کرد تۆ هیچ یارمەتیت نەدا، هەروەها جارێکیش بەبێ دەستنوێژ نوێژێکت کردووە. ئینجا براکانم! باش بیرکەنەوە مادام خواپەرستێ کە ماوەیەکی دوورودرێژ عیبادەتی کردبێ کەچی بە هۆی ئەوەوە کە تاقە جارێ یارمەتی ستەم لێکراوێکی نەداوە بەستەمکار حیساب بکرێ و ئازار بدرێ، دەبێ پایەی ئەم ستەمکارانە چۆن بێ کە هەمیشە خەریکی زۆرداریین و ئازاری بێ دەس و هەژاران دەدەن؟

براکان! هەرەشەی لە هەموو گرانتر ئەوەیە کە لە کتێبی (روضة الواعظين)دا هەیە. لەو کتێبەدا ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «إن أكبر الكبائر عند اللّه قتل النفس. ولا يحل تعذيب النفس بغير حق. وإن العصفور إذا عذبة إنسان حتى مات ولم يذبحه أو ذبحة بغير حاجة يوم القيامة وله دوي كدوي الرعد يقول: يارب! سل هذا لم ذبحني بغير حاجة؟ فيقول اللّه، عز وجل: أنا آخذ حقك وعزتي وجلالي لا يجاوزني ظلم ظالم. لأعذبن روح كل من عذب روحاً بغير حق، وإلا فأنا ظالم أن لم أستوف للمظلوم. ثم يقول اللّه سبحانه وتعالى: أنا الملك الديان، لاظلم اليوم. وعزتي وجلالي لا يجاوزني ظلم ظالم ولو لطمة بكف أو ضربة بيد، ولأقصن من القرناء للجماء، ولأسألن العود لم خدشت. ولا يدخل الجنة من عليه مظلمة حتى يؤديها من حسناته، وأن لم يكن له حسنات حمل عليه ذنوب المظلومين ومضى إلى النار» والسلام على من أتبع الهدى.

واتە: گوناهی لە هەموو گوناهە گەورەکان گەورەترە لای خوا خەڵك کوشتنە. سزادانی نەفس بە ناحەق، ڕەوا نییە. تەنانەت چۆلەکەیێ کە لە ژێر سزادا بەبێ سەربڕین بمرێ، یا بێ ئەوەی موحتاجی بن سەری ببڕن، ڕۆژی قیامەت دێتە پێشەوە و ناڵەیەکی گەورەی لێ دێ وەك ناڵەی هەورە تریشقە و دەڵێ: خودایا! لەم سەربڕەم بپرسە بۆچی بێ ئەوەی موحتاجم بێ سەری بڕیم؟ خوایش دەفەرموێ: بە گەورەیی خۆم قەسەم حەق دەسێنمەوە و، ستەمی هیچ ستەمکارێ بەبێ تۆڵە بە سەرما تێ ناپەڕێ. هەر کەسێ گیانی یەکێکی بە ناڕەوا سزادابێ سزای دەدەمەوە. من ئەگەر حەقی ستەم لێکراو لە ستەمکار نەکەمەوە،

ستەمکار دەبم. لەپاشاندا خوا دەفەرموێ من پاشای دادوەرم. ئەمڕۆ (واتە: ڕۆژی قیامەت) ستەم نییە. بە شکۆ و گەورەیی خۆم قەسەم، هیچ ستەمێ بەبێ تۆڵە لێم تێپەڕ نابێ، با شەپازلەیێ یا مشتە کوڵەیەکیش بێ. تۆڵەی حەیوانی بێ شاخ لە شاخدار دەسەنمەوە (کە لەکاتی شەڕە قۆچدا شاخدار ئازاری بێ شاخی داوە). لە لقەدارێ دەپرسم و بەسەر دەکەمەوە کە بۆچی برینداری کراوە. ئەوەی ستەمێکی کردبێ تا لەباتی ستەمەکەی لە کردەوە چاکەکانی بریتی ستەم لێکراو نەداتەوە سەر بە بەهەشتدا ناکا. خۆ ئەگەر کردەوەی چاکی نەبوو ئەوا لە گوناهی ستەم لێکراوەکەی بە کۆڵدا دەدرێ و بەرەو دۆزەخ ملی ڕێگا دەگرێ.

(والسلام علی من أتبع الهدی).

لە (٧) ڕەجەبی ١٣٩٦ی ك، ڕێکەوتنی ٥-٧-١٩٧٦ی ز دا، لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی سی و چوارەم

# باسی ئازاردانی دڵی باوك و دایك دەكا

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمد للّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه وعلى آله وصحبه وأتباعه أجمعين.

وبعد، براكان! نامەكانی دڵسۆزتان لە هەموو دیارییەك لەو دیارییانە گەورەتر و بەنرختترن كە لە دۆستەكانتانەوە وەریان دەگرن، بەڵكو لە دیاریی نێوان پاشاهانیش گەورەترن. ڕیوایەت كراوە «ماأهدى مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده اللّه بها هدى أو يرده بها عن ردى». دیارە مەبەست لە حكیمەت وتارێكی ئاینییە هەروەها ئیمامی عومەر (ر.خ) هەموو جارێ بە ڕەفیقەكانی خۆی دەوت هەر عەیبێكی هەیە پێی بڵێن. هەروا دەیفەرموو ئەم جۆرە دۆستانە كە عەیبی ئینسان بۆ خاوەنەكەی دەربخەن، زۆر كەمن.

هەر نامەیەكی من كە لە بابەتی گوناهێكەوە بینووسم، لەبەرئەوەی كە دەربڕینی عەیبێكە لە عەیبەكانی ئەم هاوچەرخانەی خۆمان، دیارییەكی گەورەیە بۆ ئێوە. جا عەرزتان دەكەم ئەو گوناهانە كە گەورەن و دەبنە هۆی فەوتانی ئینسان، پەنا بە خوا، زۆرن، بەڵام یەكێ لەوانە كە لە چاوی ئەوانی ترا زۆر گەورەیە و دەبێتە هۆی ئەوەی تاعەتی ئینسانێ مەقبووڵ نەبێ و گوناهەكانی كەفارەتیان نەبێ (عقوقی والدین)ە، واتە: ئازاردانی دڵی باوك و دایك و بێ گوێیی كردنیان.

براكان! بزانن تەركی گوناه سەوابی لە تاعەت كردن زۆرترە و ، هەر كەس گوناهێكی گەورە بكا ئەوە لەو سەوابە مەحرووم و نائومێدە و تووشی زیان دەبێ. هەروەها تووشی ئەم سێ زیانەیش دەبێ كە لە فەرموودەی پێغەمبەرا هاتوون: «جزاء المعصية الوهن في الطاعة والضيق في المعيشة والتعس في اللذة. قيل: وما التعس في اللذة؟ قال: لا ينال شهوة حلالا إلا جاءه ما ينغصه أياها». واتە: تۆڵەی ئەنجامی گوناهكردن سێ شتە؛ یەكەم دەبێتە هۆی سستی و تەمەڵی لە خواپەرستیدا. دووەم دەبێتە هۆی تەنگیی گوزەران و دەستكورتی. سێیەم ژیان لە ئینسان تاڵ دەكا؛ واتە كە پاروویەكی حەڵاڵی دەست كەوت

شتێکی لێ ڕاست دەبێتەوە ئەو پارووەی لێ دەکا بە قوزەڵقورت و بە خۆشی سوودی لێ وەرناگرێ. بەڵێ ئەمڕۆ سستی لە عیبادەت و تاعەت کردندا زۆرە و، تەنگیی گوزەرانیش ئەوەیە کە حاڵەتێکی دەروونیی وەها بۆ خەڵك پەیدا بووە لە هەر دەوڵەمەندێ دەپرسی حاڵی چۆنە؟ بەشی زۆریان سکاڵا لە ناهەمواریی ژیان دەکەن و بێزاری لە بێ دەرەتانی دەردەبڕن. ئەو کەسانەیش کە خاوەن ئاو و نان و جێگا و پایەن و دیوانیان هەیە وەزعێکی وەها ڕوویان تێ دەکا کە دنیایان لێ تەنگ دەکا. دیارە ئەمە هەموو ئەنجامی نەگبەتی و شوومیی گوناهە.

جا ئەگەر هەندێ کەس لەگەڵ گوناهکاری و تاوانباریدا هەر بە شادی و پایەبەرزی ڕابوێرن، ئەوە ئەو پایەو مایە و ڕابواردن و سامانە چەند ساڵ و مانگێکە و تەواو دەبێ. بێجگە لەوەیش ئەو پایە و مایە بە ئیستیدراج دادەنرێ، واتە جڵەو بۆ شل کردن. خوا فەرموویەتی: «واملي لهم أن كيدي متين». واتە: من ماوەیێ مۆڵەتیان دەدەم تا وادەی ئازاریان دێ؛ بە ڕاستی کار و داوی من توند و بەهێزە.

لە بابەتی نەهی لە ئازاردان و بێ گوێیی باوك و دایکدا گەلێ ئایەت و حەدیس هەن. بۆ نموونە خوا فەرموویەتی: «وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً». واتە: بەندەیی خوا بکەن و لەو بەندەییەدا کەس بە هاوبەشی خوای گەورە دامەنێن؛ چونکە هەر تەنیا خوا لایقی ئەوەیە عیبادەتی بۆ بکرێ و بپەرسترێ. لەگەڵ ئەوەیشدا دەرحەق بە باوك و دایکتان پیاوەتی و چاکە بکەن؛ چونکە لە خوا بەولاوە کەس لە باوك و دایك زیاتر حەقی بەسەر بەندەوە نییە. مانای ئیحسان کردنیش لەگەڵ باوك و دایکدا ئەوەیە کە لە دڵتاندا حورمەتیان بگرن وتەیەکی وەها بەدەمتاندا نەیێ کە بێ ئیحتیرامییان بگەیێنێ. بە زمان قسەی خۆش و بە کردەوە کارێ بکەن دڵیان خۆش بکا. هەرگیز نە بە زمان و نە بە دەست شتێکی وەها مەکەن دڵیان پێی بڕەنجێ. هەرگیز بە ڕووی ڕقاوییەوە لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو مەبن. ئەگەر کارێکیان لێتان ویست، بۆیان جێبەجێ بکەن. هەرگیز ئۆف بە دەمتان نەیێ بەرامبەریان. لە ڕێگەدا پێشیان مەکەون. دەنگتان بەسەر دەنگیاندا بەرز مەکەنەوە. پوختەی قسە ئەوەی ببێتە هۆی ئازاری دڵیان، لێی دووربکەونەوە و ئەوەی ببێتە هۆی بەرزی و شادمانییان بەپێی توانا بۆیان جێبەجێ بکەن.

ڕیوایەت کراوە: جارێ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (ر.خ) دەنگی بەسەر دەنگی دایکیدا بەرز کردەوە و لەپاشاندا لەوە پەشیمان بووەوە و لە کەفارەتی ئەو بێ ئەدەبییەدا دوو بەندەی ئازاد کرد.

هەروەها دەگێڕنەوە کە حەزرەتی عائیشە دایکی موسڵمانان، خوای لێ ڕازی بێ، جارێ عەرزی حەزرەتی کرد: چ کەسێ لە هەموو کەس شایستەترە بۆ ئەوەی خزمەت بکرێ؟ ئەویش فەرمووی: دایك لە هەموو کەس زیاتر شایانی ڕێزلێگرتن و خزمەت کردنە.

وقال سبحانه وتعالى: «وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً[٢٣] وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً».

واتە: خوای گەورە ئەمری کردووە کە عیبادەت هەر بۆ خوا بکەن و کەسی تر نەکەن بە هاوبەشی خوا لە عیبادەتدا و کەسی تر نەپەرستن. هەروەها ئەمری کردووە بەوە کە لەگەڵ باوك و دایکتاندا چاك بن. ئەگەر یەکێکیان یا هەردووکیان پیر بوون و لێکەوتن هەرگیز لە ڕوویاندا ئۆف مەکە و بەڕوویاندا هەڵ مەکاڵێ و قسەی باشیان لەگەڵ بکە و بەنەرمونیانی لەگەڵیاندا بجووڵێرەوە و، هەمیشە باڵی کزی و پڕ بەزەییان بۆ دانەوێنە و بیانخەرە ژێر باڵی بەزەیی و میهرەبانی و، لە خوای گەورە بپاڕێرەوە و بڵێ: خوایا! وەك ئەوان منیان بە منداڵی بەخێو کرد تۆیش ڕەحم بەوان بفەرموو.

تەماشای ئەم ئایەتە پیرۆزە بکە و لێی وردبەرەوە کە خوای گەورە ئەمری فەرمووە بە چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکدا پێش ئەوەی پیر ببن، واتە لە کاتی گەنجییاندا. هەروەها ئەمری فەرمووە بە زیادە چاودێرییان کە چوونە ساڵەوە، تەنانەت ڕەوا نابینێ ئۆفیان بەرامبەر بکرێ. ڕیوایەت کراوە: ئەگەر لەناو ئەو شتانەدا کە دەبنە هۆی ئازاری باوك و دایك لە ئۆف کەمتر شتێ هەبووایە خوای گەورە نەهیی لێ دەکرد. هەروەها تەماشای ئەوە بکەن کە خوای گەورە ئەمر بە چاکەکردنی لەگەڵ باوك و دایکدا کردووە بە هاوڕێی ئەمر بە عیبادەتی خۆی؛ واتە: هەرچۆن پەرستنی خوا واجیبە چاکەکردنیش لەگەڵ باوك و دایکدا وەها واجیبە. لە گەلێ ئایاتی تردا خوای گەورە ڕەزامەندیی باوك و دایکی کردووەتە هاوڕێی ڕەزامەندیی خۆی و شوکر و سوپاسی بۆ ئەوان کردووەتە هاوڕێی شوکر و سوپاس بۆ خۆی و عاجز کردنی ئەوانی کردووەتە هاوڕێی عاجزکردنی خۆی. هەروەها لە کتێبە گەورە پێشووەکاندا، وەك تەورات و زەبوور و ئینجیل ئەم بابەتە زۆر جار دووپات کراوەتەوە و، مەنعی ئینسان کراوە لە ئازاردان و بێ گوێیی کردنی باوك و دایك. بەڵێ لەناو خزمەت کردنەکاندا هیچ خزمەت کردنێ لە دوعا و نزا و پاڕانەوە ئاسانتر نییە کە خوا قبووڵی بکا ئەنجام و بەرهەمەکەی لە هەموو شتێ زیاترە، ئەوەتە

خوای گەورە ئەم خزمەتە ئاسانەیشی لە بەردەم ئادەمیزادا داناوە، تا هیچ کەسێ بەهانەی نەمێنێ بەرامبەر بە خزمەت کردنی باوك و دایك؛ چونکە کەس ناتوانێ بڵێت نەمتوانی تەنانەت دوعایان بۆ بکەم، واتە: لەسەر ئادەمیزاد پێویستە لە خزمەت کردنی گران و ئاسان ئەوەی بۆی دەکرێ و لە توانایدا هەیە دەربارەی باوك و دایك هیچ کۆتایی نەکا و لە ماوەی ژیانیدا ئامادە بێ بۆ خزمەت کردنیان. تەماشا بکەن خوای گەورە بۆ دووپات کردنەوەی حوقووقی باوك و دایك ئەوەی هێناوەتەوە یادمان کە چۆن لەکاتی خۆیدا ئێمە لاواز و بێ هێز و بێ هەست بووین و پێویستمان بەوان بوو کە شیر و خواردەمەنی و ئاو و داودەرمان بکەن بەدەممانەوە و بەرگ و پۆشاکمان لەبەربکەن و لەش و بەرگمان بشۆن. بەڵێ ئەوان بە هەموو جۆرێ هەوڵیان داوە بۆ بەخێوکردن و پەروەردەکردنی ئێمە و لە کاتی لاوازی و بێ هێزیماندا لە خوا پاڕاونەتەوە هەر چۆن بێ ئێمە بژین و، بۆ مەبەستی ژیان و مانمان خۆیان کردووەتە سوپەر و ویستوویانە هەر دەردو بەڵایێ بۆ ئێمە بێ، بەر ئەوان بکەوێ. جا لەگەڵ ئەم هەمووە خزمەتەدا کە ئەوان دەربارەی ئێمە کردوویانە کەی ڕەوای حەقە، ئێمە بێ وەفا بین لەگەڵیاندا؟

لە قورئانی پیرۆزدا لە چەند شوێنێکدا خوای گەورە ئامۆژگاریی ئادەمیزادی کردووە بە ڕەفتار و کرداری باش دەرهەقی باوك و دایك و لە هیچ حوکمێکی تردا وەها دووبارەی نەکردووەتەوە. بێجگە لەمە تەنانەت ئەگەر خوای گەورەش دەربارەی خزمەتی باوك و دایك وەها ئامۆژگاری نەفەرمووایە، پێویست بوو ئینسان بە عەقڵ و هۆشی خۆی هەست بکات کە خزمەتیان واجیبە و، پێویستە ئینسان پێچەوانەی فەرمانی ئەوان نەکا . بێ گومان موخالەفەیان ناشیرینە چ جایێ کارێ یا قسەیێ کە ئازاریان بدا.

ڕیوایەت کراوە: خوای گەورە وەحیی نارد بۆ حەزرەتی مووسا (علی نبینا وعلیه السلام) کە ئەگەر لەبەر خاتری موسڵمانەکانتان نەبووایە دۆزەخم بەسەر بەنی ئیسرائیلدا زاڵ دەکرد. هەروەها ئەگەر لەبەر عابیدەکان نەبووایە یەك سەعات مۆڵەتی گوناهبارەکانم نەدەدا. ئەی مووسا! تاقە کەلیمەیەکی ئەوانەی (عاق)ی باوك و دایکن کە ببێتە هۆی ئازاری دڵی دایك و باوك بەئەندازەی کێشانەی بەرد و لمی دنیا لام گرانە. مووسا عەرزی کرد: (عاق)ی باوك و دایك کێیە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەو کەسەیە کە باوکی یا دایکی فرمانێکی پێدا دەدا ئەو دەڵێ (لا لبیك) واتە: بەڵێ نەبێ، من ئامادە نیم بۆ بەجێهێنانی فرمانی تۆ! خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزا دەفەرموێ: «وَوَصَّيْنَا

الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً» له شوێنێکی ترا دەفەرموێ: «وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً». هەروەها مەدحی ئەو کەسانەی کردووە کە بەم ئایەتانە ڕەفتار دەکەن و ئامۆژگاریی خەڵك دەکەن بۆ جێ بەجێکردنی ئەوەی لەو ئایەتانەدا بەیان کراوە. لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی: «وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَرَ اللّهُ بِهِ أَن يُوصَلَ ». هەروەها فەرموویەتی: «وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ» واتە: وەسیەت و نەسیحەتی ئادەمیزادمان کردووە کە خزمەتی دایك و باوك بکەن و خاکینە بن لەگەڵیاندا؛ چونکە حوقووقی بەخێوکردنیان هەیە لەسەریان، بەتایبەتی دایك کە بە حاڵی زەعیفی و بێ هێزی منداڵەکەی لە سکیدا هەڵدەگرێ و بەردەوام دەبێ تا دەیبێ و ئینجا لە باوەشیدا بەخێوکردن و شیرپێدانی تا ماوەی دوو ساڵ درێژە دەکێشێ. سوپاسی من بکە کە لە نەبوونەوە دروستم کردووی و سوپاسی باوك و دایکیشت بکە کە بەمهیرەبانی هەنگاو هەنگاو بەخێوت دەکەن و وەك مۆم لە پێناوی خۆشویستنتدا دەتوینەوە؛ باوك شەو و ڕۆژ خەریکی ڕۆزی پەیدا کردنە بۆت و دایکیش لە ماڵەوە بێ وچان ڕەنج دەدا و شەونخوونی دەکێشێ بەدیارتەوە تا پێ دەگەیت و لە خەم دەرەخسێیت.

براکان! مانای زساهیریی ئەم ئایەتە ئەوە بوو کە وترا. بەڵام بە شێوەی لێکۆڵینەوەیش دەردەکەوێ هەروەك چۆن ڕۆژی پێنج جار فەرزی خوای گەورە جێبەجێ دەکرێ و ئینسان ناوی خوا دەبا و زیکر و تەسبیحاتی بەجێ دەهێنێ، پێویستە ڕۆژی پێنج جار ئینسان دوعای خێر بکا بۆ ئەوە خوا لەسەر خزمەتکردنی باوك و دایکی تەوفیقی بدا.

جا ئەگەر باوك و دایکی زیندوو بوون بڕوات ئەحواڵیان بپرسێ و ئەگەر ئیشێکی پێویستیان هەبوو بۆیان جێبەجێ بکا، ئەگەر مردبوون ڕۆژی پێنج جار لەپاش نوێژەکان دوعای خێریان بۆ بکا و بڵێ: خوایا عەفوویان بفەرموو و ڕەحمیان پێ بکە، وەك ئەوان منیان بە منداڵی و بێ دەسەڵاتی بەخێو کرد. هەروەها لەو ئایەتە موبارەکەوە دەردەکەوێ وەك چۆن بە کوفر و ئینکاری نیعمەتی خوا ئینسان گیرۆدەی سزای نەبڕاوە دەبێ بە کوفری نیعمەتی باوك و دایك و بە خزمەت نەکردنیان تووشی گوناهباری و تاوانکاری و بەدبەختیی قیامەت دەبێ. هەر لەسەر ئەم ئەساسەوە کە خوای گەورە بە شێوەی وەعدەدان بە عاقیبەت خێری بۆ ئادەمیزادی ڕاساڵ و خاوەن پیاوەتی و چاکە، ئەوەی لەگەڵ خوای گەورەدا ڕاست و لەگەڵ باوك و دایکدا چاك بێ، هەروەها بە شێوەی

هەڕەشەکردن لەو کەسانە کە لاسار و نالەبارن و بەگوێی خوا ناکەن و لە خزمەتکردنی باوك و دایکیاندا کەمتەرخەمن، لە دوادوایی ئایەتەکەدا فەرموویەتی «الی المصیر» واتە: سەرەنجامی هەموویان لای منە و، من چاك و خراپم لێ ون نابێ و ئاگام لە کرداری هەموو لایەکە و دەستم دەڕوا پاداشی چاکە بدەمەوە و تۆڵەش بسێنم. هەر لەبەر ئەمەیشە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەر کەسێ عیبادەت بکا و سوپاسی خوای گەورە بکا، بەڵام لەگەڵ باوك و دایکیدا باش نەبێ و سوپاسیان نەکا، ئەوە خودای گەورە چاکەی لێ قبووڵ ناکا و پایەی ناداتێ.

ئیمامی غەزەلی ڕەحمەتی خوای لێ بێ ڕیوایەتی کردووە. کە خوای گەورە وەحیی کرد بۆ حەزرەتی مووسا (د.خ) کە هەر کەس فەرمانبەرداری باوك و دایکی خۆی بێ، ئەوە هەر چەند لە عیبادەتی مندا کەموکوڕیی هەبێ، من لێی دەبوورم و لە ڕیزی فەرمانبەردارەکانی خۆمدا دەینووسم. بەڵام هەر کەسێ فەرمانبەرداری باوك و دایکی نەبێ و ڕەفتاری لەگەڵیاندا ناشیرین بێ، با فەرمانبەرداری منیش بێ لە ڕیزی فەرمانبەرداری خۆمدا نایینووسم.

ڕیوایەت کراوە: خزمەتی باوك و دایك و دڵخۆش کردنیان خێر و پاداشی لە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و عەمرەی سوننەت زۆرترە. شایانی باسە مەبەست لەم قسەیە ئەوە نییە ئەوانەی لەگەڵ باوك و دایکیاندا باشن نوێژ و ڕۆژوو و حەج و عەمرەی سوننەت نەکەن، بەڵکو مەبەس ئەوەیە ئەوانەی واجیبات بەجێ دێنن و لەگەڵ باوك و دایکیاندا باشن، ئەوانە ئەهلی نەجاتن، ئەگەر چی سوننەتیشیان تەواو نەبێ.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ یەکێ لەم سێ سیفەتانەی هەبێ، ئەوە ڕەفتاری باش سوودی نییە بۆی، یەکەم: شەریك دانان بۆ خوا واتە: کوفر بە هەر شێوەیێ بێ. دووەم: ئازاردان و بێ گوێیی کردنی باوك و دایك. سێیەم: فیرار و هەڵاتن لە جەنگی دژی کافراندا بەبێ بەهانەیەکی شەرعی. واللّه أعلم. جا هەندێ لە زاناکان لە بەیانی ئەم فەرموودە موبارەکەدا فەرموویانە: مەبەس ئەوەیە ئەوانەی ئازاری باوك و دایکیان دەدەن و ئەوانەی بێ بەهانە لە جەنگی ناوبراوا هەڵدێن بەرانبەر بە کردەوەی چاکیان جەزا و پاداش نانووسرێ وەك موسڵمانی تر کە ئەو سیفەتە خراپانەیان نەبێ؛ چونکە ئەم سیفەتانە ئینسانێکە سووك دەکەن تا لە مەیدانی ئیسلامەتیدا قەدروقیمەتی نامێنێ ئەگینا تاعەتەکانی بەتەواوی بەتاڵ نابنەوە.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزا فەرموویەتی: «وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً». واتە: ئەگەر باوك و دایكت هەوڵیان دا بۆ ئەوەی تۆ كافر ببی و شەریك بۆ خوا قەرار بدەی ئەوە لەم حاڵەتەدا بەگوێیان مەكە؛ چونكە كوفر و بێ ئیتاعەتیی خوا بە هیچ شێوەیێ ڕەوا نییە. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا لە ژیان و گوزەرانیاندا پشتیان لێ هەڵ مەكە و بە پیاوەتی و جوامێرانە لەگەڵیاندا هەڵسوكەوت بكە و، هەمیشە با ڕووت گەش و كراوە بی لەگەڵیاندا.

سەبارەت بە تەمێ و تەربیەتی بنیادەم لەسەر خزمەتی باوك و دایك ئەم ئایەتە پیرۆزە بۆ ئینسانی ژیر و بەفام بەسە؛ ئەوەتە دەفەرمووێ: تەنانەت ئەگەر باوك و دایك ئەوەندە خراپ بن هەوڵی كافر بوونی كوڕەكەیان بدەن و هێشتا هەر دروست نییە كوڕەكەیان لە كاروباری ژیان و هەڵسوكەوتی ڕۆژانەدا پشتیان تێ بكا و خزمەتیان نەكا. هەروەها ئەوەیش لە ئایەتەكە دەردەكەوێ كە هەرگیز دروست نییە ئینسان لە سەرپێچی و تاوان و پێچەوانەیی ئەمری خوادا بەگوێی هیچ كەس بكا، وەكو مەشهوورە (لا طاعة في معصية اللّه).

ڕەفاقەتی باوك و دایك بە شێوەیەكی باش ئەوەیە بیانژێنێ و خواردەمەنی و بەرگ و پۆشاك و پێویستییەكانی تری ژیانیان بەپێی دەسەڵات و بەگوێرەی ئەوەی لەو ڕۆژەدا و لەو شوێنە ژیانەدا باو و عادەتە بۆ دابین بكەی. هەروەها هەر پێویستییەكیان بوو بەپێی توانا بۆیان جێ بەجێ بكەی و كە نەخۆش كەوتن خزمەتیان بكەی و بیانبەیتە سەر دوختۆر و، لە هەڵسان و دانیشتندا شەرمیان لێ بكەی و قسەی خۆشیان لەگەڵ بكەی و ماوەی ئەوە نەدەی ژنەكەت بەسووكی تەماشایان بكا و تەمێی منداڵی وردت بكەی شەرمیان لێ بكەن و خۆت بە دەنگی نەرمونیان و بە ئەدەب بانگیان لێ بكەی. ئەگەر خوا نەخواستە زویر بوون دڵیان بدەیتەوە و ئاشتیان بكەیتەوە. بەكورتی بێجگە موخالەفەی ئاین بەپێی توانا خزمەتیان بكەی هەتا دەمرن.

جا براكان! تەماشا بكەن خوای گەورە چەند قەدری باوك و دایكی گرتووە و بە گەورە پیشانی داون و داوای لە بەندەكانی كردووە ڕێزیان لێ بگرن؟ تەنانەت وەك باسمان كرد، ئەگەر ئەمر بە منداڵەكەیان بكەن كوفری خوا بكا، ئەگەر چی نابێ لەوەدا بەگوێیان بكا، هێشتا هەر دروست نییە دەست لە خزمەتكردنیان هەڵبگرێ و دەبێ هەر بە پیاوەتی و جوامێری لەگەڵیان هەڵسوكەوت و گوفتار و ڕەفتار بكا ئیتر لەپاش وردبوونەوە لەم

ئایەتە پیرۆزە مەجالی ئەوە نامێنێ بۆ هیچ موسڵمانێ کە بڵێ: باوك و دایکی من خوویان خراپە بۆیە من خزمەتیان ناکەم؛ چونکە هەرگیز هیچ خوویەکی خراپ ناگاتە پایەی کافر بوون و ئەمر کردن بە کافر بوونی ئەولاد، ئەوەتە لە ئایەتەکەدا خوا دەفەرمووێ تەنانەت ئەگەر باوك و دایك تێ کۆشان بۆ کوفری ئێوە، تەنیا لەوەدا بەگوێیان مەکەن، ئیتر دەبێ، لە ژیاندا بە پیاوەتی و بەگوێرەی داوونەریتی ڕۆژ بەباشی لەگەڵیاندا بژین.

لە حەزرەتی ئەسمای کچی حەزرەتی ئەبوو بەکری سیدیقەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە فەرموویەتی: دایکم لەکاتی کافرییدا لە مەککەوە بەسەردان هات بۆ لام بۆ مەدینە. منیش ڕۆیشتمە خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزم کرد: دایکم هاتووە بۆ دیدەنیم، ئایا خزمەتی بکەم وڕێزی لێ بگرم یا نا؟ حەزرەت (د.خ) لە وەڵامدا فەرمووی: سیلەی ڕەحم بەجێ بێنە و خزمەتی بکە و ڕێزی لێ بگرە.

ڕیوایەت کراوە: ئینسانێ کە (عاق الوالدین) بێ، واتە: ئازاری باوك و دایك بدا، هەر خێرێ بکا هەر ناڕواتە بەهەشت. بەڵام ئینسانێ (بار بالوالدین)بێ، واتە: لەگەڵ باوك و دایکیدا چاك بێ و خزمەتیان بکا هەر کردەوەیەکی شەڕ بکا، بێجگە کوفر، هەر دەڕواتە بەهەشت. واتە: کردەوەکانی تاعەت و خێراتی ئینسانی بێ شەرم و ئازاردەری باوك و دایك ئەوەندە نرخیان نییە کە خاوەنەکانیان زوو بەزوو بەرنە بەهەشت و، چوونی بەهەشتیان دەکەوێتە پاش چوونی موسڵمانەکانی تر.

حەزرەت (د.خ) ئازاردانی باوك و دایکی لەپاش کوفر لە (أكبر الكبائر) و لە سەبعەی مووبیقە حسێب کردووە، واتە: ئەو حەوت گوناهانە کە خاوەنەکانیان بەهیلاکدا دەبەن و موستەحەقی دۆزەخیان دەکەن.

براکان! حوکمی ئازاردانی باوك و دایك ئەوەندە بەد و نالەبار و ناهەموارە لەناو گوناهە گەورەکانداکە لە حەوت سەد گوناهـ زیاترن جیا کراوەتەوە و، لەو نۆ گوناهانە یا لەو حەوت گوناهانە لەسەر ئیختلافی ڕیوایەت کە مووبیقە دانراون حسێب کراوە، بەڵێ ئا لەو نۆ گوناهانە یا لەو حەوت گوناهانە کە لە نەگبەتیی ئەوانەوە ئینسان بەبێ ئیمان دەمرێ و سەلبی سەرەمەرگ دەبێ -پەنا بە خوا-.

ڕیوایەت کراوە هەموو گوناهێ، هەرچۆن بێ، لەوانەیە خوای گەورە تۆڵەکەی بخاتە

ڕۆژی قیامەت ئازاردانی باوك و دایك نەبێ كە هەر لە حاڵی ژیاندا و لەپێش مردندا خوای گەورە تۆڵەكەی نیشان دەدا بە خاوەنەكەی. هەروەها مەترسی لەوە دەكرێ ئەو تۆڵەیە سەلبی ئیمان بێ، واتە: خاوەنی ئەو گوناهە بەبێ ئیمانی بمرێ (أعاذنا اللّه من ذلك) یاخۆ ئەگەر بەئیمانەوە بمرێ لە قیامەتدا سزای زۆر سەخت و نابار دەبێ.

ڕیوایەت كراوە: كەسێ ڕۆیشتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خوا من زۆر ئارەزووم لە جیهاد هەیە، بەڵام ناتوانم بڕۆم بیكەم. حەزرەت فەرمووی باوك و دایكت كەسیان ماوە؟ عەرزی كرد: بەڵێ دایكم ماوە. فەرمووی: دەی جیهادی تۆ لەپێناوی ڕەزامەندیی خوادا ئەوەیە چاكە لەگەڵ دایكتدا بكەی و پێویستی سەرشانت بەرامبەری بەجێ بێنی، مادام ئەوەت كرد ئەوە تۆ بە حاجی و بە غەزاكەر دەنووسرێیت.

ڕیوایەت كراوە: كەسێ بە شێوەی میهرەبانی و نەرمی و نیانی و قسە خۆشی خزمەتی دایكی بكا و لای خۆی ڕای بگرێ، ئەوە لای خوای گەورە لەو كەسە گەورەترە كە شمشێر بوەشێنێ لە ڕووی كافراندا و جیهاد بكا.

براكان! ئەو ئایەتانە كە بۆ چاكەكردن لەگەڵ باوك و دایكدا هاتوون بەسن بۆ عیبرەت گرتن و ئامۆژگاریی ئینسانی موسڵمان. خودای گەورە لە مەدح و سەنای حەزرەتی یەحیادا فەرموویەتی: «وَبَرّاً بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّاراً عَصِيّا». واتە: یەحیا لەگەڵ باوك و دایكیدا چاك بوو و ئینسانێكی دڵڕەق و سەركێش نەبوو كە ئازاری باوك و دایكی بدا. هەر لەم بابەتەوە لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) كە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: چوار جۆرە ماڵ سەرفكردن هەن كە لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشیان لەبەر زۆری حسێب ناكرێ، واتە: سەوابیان بێ ئەندازەیە؛ یەكەم ماڵ سەرف كردن بۆ دایك و باوك. دووەم ماڵ سەرفكردن بۆ هەژاران و داماوان لە مانگی ڕەمەزاندا. سێیەم: ماڵ سەرفكردن بۆ خێزان، واتە ئینسان بەپێی داونەریتی ئەو شوێنە و ئەو كاتە بە شێوەیەكی شەرعی مەسرەف بكا بۆ ژن و منداڵی خۆی. چوارەم مەسرەف كردن لە ڕێگەی خوادا و (في سبيل اللّه) ئینسان خزمەتی موسڵمانان بكا. بەڵێ ئەم چوار جۆرە ماڵ سەرفكردنانە لە جوملەی گەورەترین عیبادەت و خواپەرستی حسێب دەكرێن.

ڕیوایەت كراوە: ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) سەركەوتە سەر مینبەرەكەی و لە هەر پلەیەك كە سەردەكەوێ دەیفەرموو: ئامین.

هاوڕییەكانی عەرزیان كرد: هۆی ئەم سێ جار ئامین كردنەت چی بوو؟ فەرمووی: لە

پلەی یەکەمدا جیبرەئیل فەرمووی: یا محەمەد هەر کەسێ فریای یەکێ لە باوك و دایکی خۆی بکەوێ، واتە ماوەیەکی موناسب لە ژیانی ئەواندا بژی و لەپاشاندا بمرێ و بڕواتە دۆزەخ خوا بیباتە ناو دۆزەخەوە؛ چونکە ئەگەر ئەو کەسە خزمەتی باوك و دایکی بکردایە بەهەشتی دەبوو، مادام خزمەتی نەکردوون با لە دۆزەخدا سزا بدرێ، دەی ئامین بکە. منیش وتم: ئامین. لە پلەی دووەمدا وتی: یەکێ ناوی تۆ ببیسێ و لەبەر بێ موبالاتی سەڵەواتت لێ نەدا با دوور بێ لە ڕەحمەت، دەی ئامین بکە. منیش وتم: ئامین. لە پلەی سێیەمدا وتی: کەسێ مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی بەسەردا بێ و لەو مانگەدا ئەوەندە تاعەت و خواپەرستی و نوێژ نەکا و ئەوەندە ڕۆژوو نەگرێ و ئەوەندە خێر و چاکە نەکا کە پاداش و جەزای چاك مسۆگەر بکا، ئەو مانگە بێ و بڕوا و ئەو هەر ناهومێد و بێ بەش بێ لە پاداشی چاکی یاخوا هەر ناهومێد بێ، دەی ئامین بکە. منیش وتم: ئامین. بێگومان هەر دوعایێ حەزرەت (د.خ) ئامینی بۆ بکا، خوای گەورە قبووڵی دەکا.

براکان! مانای ئەم ڕیوایەتە پیرۆزە ئەوەیە کە دین و دنیا بە هەل دەست دەکەون و خزمەتی باوك و دایك هەلێکی جوانە و، سەڵەواتدان لە حەزرەتی (د.خ) هەلێکی جوانە و، هاتنی مانگی موبارەکی ڕەمەزان بۆ پەیداکردن و کۆکردنەوەی سەواب و پاداش هەلێکی یەکجار نایاب و جوانە. دیارە کەسێ ئازا و لێهاتوو و مەرد بێ، هەل لەکیس نادا و ناهێڵێ لە دەستی دەربچێ. جا مادام کابرا نامەرد بوو و ئەو هەلە باشانەی لەکیس دا با هەر ئاوارە بێ وەك ئاوارە بوو!.

ڕیوایەت کراوە جارێ حەزرەت (د.خ) فەرمووی «رغم أنفة، ثم رغم أنفة» واتە خوا داماو و مەهتووکی بکا، خوا داماو و مەهتووکی بکا. هاوڕێیەکانی عەرزیان کرد: باسی کێ دەکەی و دوعا لە کێ دەکەی؟ فەرمووی لە کەسێ کە بەهۆی خزمەت نەکردن و ڕێز نەگرتنی باوك و دایك هەردووکیان یا یەکێکیانەوە نەڕواتە بەهەشت. واتە: ئینسانێ ئەوەندە پیاوەتی لەگەڵ باوك و دایکیدا نەبێ و خزمەتیان نەکا و خەمیان نەخوا و بەهۆی خزمەت نەکردنی ئەوانەوە بە بەهەشت شاد نەبێ یاخوا هەر مەهتووك و داماو بێ.

کوڕە خۆشەویستەکانم ! ئەم فەرموودە پیرۆزە و لەگەڵ فەرموودە پێشووەکەش دەلیلن لەسەر ئەوە کە ڕێزگرتن لە باوك و دایك و خزمەت کردنیان دەبنە هۆی ئەوەی کە خوای گەورە ئەو ئینسانە ڕێزگرە خزمەت گوزارە عەفوو بکا و بیخاتە بەهەشت. هەروەها ئازاردانی باوك و دایك و ڕێز لێ نەگرتنیان و خزمەت نەکردنیان، دەبنە هۆی ئەوە کە

خوای گەورە ئەو ئینسانە ڕێزنەگرە بێ خزمەتە سپڵەیە حەواڵەی دۆزەخ بکا.

ڕیوایەت کراوە چوار جۆرە ئینسان زۆر لەبارن بۆ ئەوەی بڕۆنە دۆزەخ و سزا بدرێن، یەکەم ئەوانەی لەسەر خواردنەوەی شەراب بەردەوامن. دووەم ئەوانەی بە ناحەق ماڵی هەتیو دەخۆن. سێیەم ئەوانەی سوود دەخۆن. چوارەم ئەوانەی بەرامبەر باوك و دایکیان بێ ئەدەب و بێ مرووەتن. «قال علي، رضي الله عنه، مکتوب علی باب جهنم: من خالف هواه کانت الجنة مأواه. ومن أطاع هواه کانت النار مثواه. ومکتوب علی باب الجنة: أنت محرمة علی کل بخیل ومراء وعاق ونمام ودیوث». واتە: حەزرەتی عەلی (ر.خ) فەرموویەتی: لەسەر دەرگای دۆزەخ نووسراوە: هەر کەس سەرپێچی لە ئارەزووی نەفسی بکا و دوای نەکەوێ بەهەشت دوا ئارامگایەتی. ئەوەیش دوای ئارەزووی نەفسی بکەوێ و جڵەوی بۆ شل بکا، ناخی دۆزەخ جێگایەتی. هەروەها لەسەر دەرگای بەهەشت نووسراوە: تۆ ئەی بەهەشت حەرام کراوی لە ئینسانی ڕژد و ڕیاباز و لەگەڵ باوك و دایکدا سپڵە و لەوەی قسە لەناو خەڵکدا بێنێ و بباو لەوەی گەوادی بکا.

ڕیوایەت کراوە: ڕەزامەندیی خوا لە ڕەزامەندیی باوك و دایکدایە و، خوای گەورە نەفرینی لە حەوت جۆرە ئینسان کردووە و، لەسەر یەکێکیان سێ جار نەفرینەکەی دووبارە کردووتەوە ئەگەر چی جارێ بەس بوو. فەرمووی: مەلعوونە کەسێ ئازاری باوك و دایك بدا. مەلعوونە کەسێ ڕەفتاری وەك ڕەفتاری قەومی لووت بێ، مەلعوونە کەسێ ڕەفتاری وەك ڕەفتاری قەومی لووت بێ. مەلعوونە کەسێ ڕەفتاری وەك ڕەفتاری قەومی لووت بێ. هەروەها ڕیوایەتەکە لەسەر حەوت جۆرەکە، دەڕوا تا تەواو دەبن. ڕیوایەت کراوە: حاریسەی کوڕی نوعمان، خوای لێ ڕازی بێ، ڕۆژێ لەگەڵ دایکیدا ڕووی ترش کرد و قسەی تاڵی لە ڕوویدا کرد. لەپاشدا لە کەفارەتی ئەوەدا دوو بەندەی ئازاد کرد. هەروەها لە حەزرەتی عائیشەوە ڕیوایەت کراوە، ڕەزای خوای لێ بێ، فەرموویەتی: لە حەزرەتم بیست (د.خ) فەرمووی: ڕۆیشتمە ناو بەهەشتەوە و دەنگی یەکێکم بیست قورئانی دەخوێند؛ پرسیم: ئەم دەنگە دەنگی کێیە وەها قورئان دەخوێنێ؟ وتیان: ئەوە دەنگی حاریسەی کوڕی نوعمانە (ر.خ) کە لە هەموو کەس زۆرتر خزمەتی باوك و دایکی کردووە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەس پێی خۆشە تەمەنی درێژ و ڕزق و ڕۆزی زۆرتر بێ، چاکە لەگەڵ باوك و دایکیا بکا و سیلەی ڕەحم بەجێ بێنێ. لە ڕیوایەتێکی ترا دەڵێ با نوێژەکانی باش بەجێ بێنێ.

براكان! دەلیل لەسەر پایەی بەرزیی ئەو کەسانەی کە چاکە لەگەڵ باوك و دایکیاندا دەکەن، ئەوەیە کە ئینسان بەهۆی چاکەکردنەوە لەگەڵ باوك و دایکا بە فەرمانبەرداری خوا حسێب دەکرێ و بە خاوەن تەقوا دەناسرێ و خوای گەورەیش لە قورئاندا فەرموویەتی: «ومن یتق اللّه یجعل له مخرجاً ویرزقه من حیث لا یحتسب، ومن یتوکل علی اللّه فهو حسبه». واتە: کەسێ لە خوا بترسێ و خۆی لە نافەرمانیی خو، بپارێزێ و بە ئەمری خوا و پێغەمبەر بجووڵێتەوە، ئەو کەسە خوای گەورە ڕێگا و دەرەتانی ژیانی باشی بۆ دەکاتەوە و ڕزق و ڕۆزیی لە ڕێگەیەکەوە بۆ دەنێرێ کە هەرگیز بە خەیاڵیدا نەیێت. هەر کەس پاڵ بە ڕەحمەتی خواوە بدا و، پشت بەو ببەستێ و پشتەسووری میهرەبانیی ئەو بێ، خوا کیفایەتی کاری ئەو دەکا و هەرگیز داماوی ناکا. دیارە ئەم جۆرە ئینسانە بە سەربەرزی دەمرێ و بە سەربەرزی زیندوو دەبێتەوە لە بەهەشتدا هەتا هەتایە ئیستراحەت دەکا. ئەو کەسەیش ئازاری باوك و دایکی بدا بە ناموتتەقی و لە خوا نەترس دەناسرێ؛ کەوابوو دەبێ لە ئاگری دۆزەخدا سزا بدرێ، چونکە بێ گوێیی و نافەرمانیی خوای کردووە و خوای گەورەیش فەرموویەتی: «وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ» واتە: هەر کەس بەرامبەر بە خوا نافەرمان بێ ئەوە بەڕاستی ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو دانراوە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کاتێ کوڕێ بەچاوی خۆشەویستی و ئیحترام تەماشای باوکی خۆی بکا، ئەوە وەك ئەوەیە بەندەیەکی ئازاد کردبێ. هەندێ لە هاوڕێیەکانی عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ئەگەر سێسەد و شەست جار تەماشای بکا؟ حەزرەت (د.خ) فەرمووی (اللّه أکبر) واتە: ئێوە تەعەجوب دەکەن لەوە کە خوای گەورە بەرامبەر کارێکی بچووك کەرەمی زۆر لەگەڵ بەندەی خۆیدا بکا. ئەمە لە کەرەمی نەبڕاوەی خواوە دوور نییە. خوای گەورە بەرامبەر بە کردەوە بەڵێنی چوونە بەهەشتی داوە بە بەندەکانی خۆی و فەرموویەتی: «أولئك أصحاب الجنة خالدین فیها جزاء بما کانوا یعملون». کەوابێ ئەگەر خوای گەورە بەهۆی یەك جار تەماشای باوك و دایك بەڕێزەوە بەقەدەر ئازاد کردنی سەد هەزار بەندە پاداش بداتەوە، هێشتا کەمە و قەترە بە دەریایە. (واللّه أکبر قدرة، فأفهم).

ڕیوایەت کراوە: یەکێ هاتە خزمەت حەزرەت (د.خ) و عەرزی کرد: دەمەوێ بڕۆم بۆ غەزا. ئەویش فەرمووی: لە باوك و دایکت کەسیان ماوە؟ عەرزی کرد: بەڵێ دایکم ماوە.

ئەویش فەرمووی: جیهادی تۆ لە ڕێگای خوادا ئەوەیە خزمەتی دایکت بکەی وەکو کردووتە. مادام تۆ لەگەڵ دایکتدا باش بی بە خاوەن حەج و خاوەن عومرە و بە موجاهید دەنووسرێیت. ڕیوایەت کراوە خوای گەورە وەحیی کرد بۆ حەزرەتی مووسا (د.خ) و پێی فەرموو: ئەی مووسا! قەدری باوك و دایکتان بگرن، بەڕاستی هەر کەس قەدری ئەوان بگرێ تەمەنی درێژ دەکەم و ئەولادی وەهای پێ دەدەم خزمەتی بکەن وەك ئەو خزمەتی ئەوانی کردووە و، ئەگەر کەسێ ئازاری ئەوان بدا و قەدریان نەگرێ تەمەنی کورت دەکەم و ئەولادی وەهای دەدەمێ کە ئازاری دڵی بدەن و خراپ بن لەگەڵیدا. براکان! بەشی زۆری ئەوانەی کە خزمەتی باوك و دایکیان ناکەن ئەولادیان لەگەڵیاندا خراپ و نامەرد دەبن، بەڵام ئەمە مەعنای ئەوە نییە لە هەموو حاڵێکدا وابێ؛ جاری وا دەبێ ئینسانێ لەگەڵ باوك و دایکیدا خراپە، کەچی ئەولادی ئەو لەگەڵ ئەودا باش دەبن.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لەو شەوەدا کە ڕۆیشتم بۆ میعراج چەند کۆمەڵێکم دی بەسەر کوورەی ئاگرەوە هەڵواسرابوون. منیش پرسیم ئەی جیبرەئیل ئەمانە کێن؟ وتی: ئەمانە ئەو کەسانەن کە لە دنیادا جنێویان بە باوك و دایکیان داوە و لەگەڵیاندا خراپ و بەد و بێ شەرم بوون. هەروەها ڕیوایەت کراوە: ئەوانەی لە دنیادا (عاق)ن و جنێو بە باوك و دایکیان دەدەن لە قەبردا وەکوو باران پشکۆ بەسەریاندا دەبارێ. کوڕەکەم! ئەمە جەزای ئەو کەسەیە کە جنێو بە باوك و دایکی دەدا. جا تەماشای بکەن و قیاس بکەن ئەگەر کوڕەکان بێجگە جنێودان لێیان بدەن و ماڵیشیان لێ داگیر بکەن و دەریان بکەن دەبێ چەندێ سزا و ئازاری گۆڕ و ڕۆژی قیامەتیان سەخت و نالەبار بێ؟!

من ئاگادارم ئەم جۆرە بێ ئەمەکی و ئازاردانی باوك و دایکە زۆر ڕووی داوە، جا ئەگەر تەنیا عقووقی باوك و دایك ببێتە هۆی لێ سەندنەوەی ئیمان، وەکو لە هەندێ ڕیوایەتدا هەیە، دەبێ پاداشی عقووق لەگەڵ ئەم جۆرە بێ شەرمی و ناپیاوییە لەگەڵ باوك و دایکدا چی بێ؟! هەروەها ڕیوایەت کراوە: هەر کەس لە دنیادا باوك و دایکی خۆی عاجز بکا خوا غەزەبی لێ دەگرێ.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە عەلقەمە ناوێ هەبوو زۆر ئەهلی تاعەت بوو نەخۆش کەوت و گەیشتە حاڵی گیان کەنشت. ژنەکەی خەبەری بۆ حەزرەت نارد (د.خ) کە مێردەکەم لە حاڵی گیانەڵادایە و هەرچی هەوڵ دەدەم شایەتومانی بە

زمانا نایێ.حەزرەت (د.خ) بیلالی حەبەشی و عەمماری کوڕی یاسری نارد و پێی فەرموون: کەلیمەی شەهادەتی بخەنە سەر زمان و هەوڵی لەگەڵ بدەن شایەتومان بێنێ. ئەوانیش ڕۆیشتن و هەوڵیان دەدا کەلیمەی شەهادەتی بخەنە سەر زمان بەڵام بێ هوودە بوو زمانی یارمەتیی نەدەدا. دوو هاوڕێ بەڕێزەکانی حەزرەت گەڕانەوە خزمەتی و حاڵەکەیان بۆ گێڕایەوە. حەزرەت فەرمووی: ئایا باوك و دایکی یا یەکێکیان ماوە؟ یەکێ لەوێدا جوابی دایەوە: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا دایکی ماوە. حەزرەت (د.خ) یەکێکی نارد بۆ لای دایکی کە پێی بڵێن ئەگەر دەتوانی بێت بۆ لام ئەگەر ناتوانێ لە ماڵ دەرنەچێ هەتا من دێم بۆ لای ئەو. پیرێژنەکە وتی: ڕۆحم بەقوربانی، من دێم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (د.خ). عاسایەکی بەدەستەوە گرت و هات بۆ خزمەتی و سەلامی کرد و حەزرەت (د.خ) جوابی دایەوە. ئینجا فەرمووی: دایکی عەلقەمە! ڕاستم پێ بڵێ، ئەم کوڕەی تۆ حاڵی چۆن بوو لە ژیانی خۆیدا؟ ئەویش عەرزی کرد: ئەم کوڕەم نوێژی دەکرد و ڕۆژووی دەگرت، بەڵام من زۆر دڵم لێی عاجز بوو. حەزرەت فەرمووی: بۆچی؟ پیرێژنەکە عەرزی کرد: چونکە قەدری ژنەکەی دەگرت و قەدری منی نەدەگرت و حورمەتی ئەوی دەدا بەسەر مندا. ئینجا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەی بیلال! بڕۆ داری سووتەمەنی بێنە با عەلقەمە بسووتێنم، ئینجا پیرە داکەکەی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن کوڕی من و میوەی دڵم لەبەر چاومدا دەسووتێنی؟ دڵم ئەمە هەڵناگرێ. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەی دایکی عەلقەمە! سزای خوای گەورە لەم سووتاندنەی ئێمە سەختترە، ئەگەر دەتەوێ خوای گەورە عەلقەمە عەفوو بکا گەردەنی ئازاد بکە با لە سزای دۆزەخ ڕزگاری ببێ. قەسەم بەو کەسە کە گیانی من لە قودرەتی ئەوایە، بەو نوێژانەی کردووتی و بەو ڕۆژووانەی گرتوونی ڕزگار نابێ هەتا تۆ گەردنی ئازاد نەکەی. ئینجا پیرێژنەکە عەرزی کرد : (یارسول اللّه) ڕۆحم بەقوربانی تۆ بێ ئەوا خوا و حازرانی ئەم مەجلیسەم کرد بە شاهێد کە من لە عەلقەمە ڕازی بووم و گەردەنیم ئازاد کرد. پاش ئەم کەینوبەینە حەزرەت (د.خ) فەرمووی: بیلال! بڕۆ بۆ لای عەلقەمە بزانە ئاخۆ ئێستا دەتوانێ کەلیمەی شەهادەت بە زمان بڵێ؟؛ چونکە لەوانەیە دایکەکەی لە من شەرم بکا و بە دڵ ئازادی نەکردبێ. بیلالیش بەپەلە ڕۆیی، کە گەیشتە بەر دەرگای ژوورەکەی عەلقەمە بیستی کەلیمەی شەهادەت دەڵێ. ئیتر هەر لەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد و نێژرا حەزرەت (د.خ) هاتە سەر قەبرەکەی فەرمووی: ئەی کۆمەڵی موهاجیر و ئەنسار! هەر کەس ژنەکەی لە دایکی زیاتر ئیحترام بگرێ و دڵی دایکی ئازار بدا و خوا لە خۆی عاجز بکا و خزمەتی نەکا، ئەوە

خوا و مەلائیکەکان هەموو لەعنەتی لێ دەکەن و خوای گەورە نە فەرز و نە سوننەتی لێ قبووڵ ناکا، مەگەر بە ئیخلاس تەوبەیەکی ڕاستی بکا؛ چونکە ڕەزای خوا لەگەڵ ڕەزای باوك و دایکدایە و غەزەبی خوا لەگەڵ غەزەبی باوك و دایکدایە. جا هەتا دەتوانن ئەم ئامۆژگارییە وەربگرن.

عەبدوڵلای عومەر (ر.خ) دەفەرموێ: ژنێکم بوو، زۆرم خۆش دەویست بەڵام باوکم حەزی لە چارەی نەبوو، فەرمووی : تەڵاقی بدە. بەڵام من تەڵاقم نەدا و ڕۆیشتم ئەم باسەم عەرزی حەزرەت کرد (د.خ)، فەرمووی: تەڵاقی بدە. جا براکان! تەماشا بفەرموون خودای گەورە حەز لە تەڵاقدانی ژن ناکا و، حەزرەتیش (د.خ) فەرموویەتی: «ابغض الحلال الی اللّه الطلاق». واتە: نارەزاترین حەڵاڵ لای خوا ژن تەڵاقدانە، کەچی ئەگەر باوکی کوڕ ویستی کوڕەکەی ژنەکەی تەڵاق بدا سوننەتە تەڵاقی بدا، بەڵکو لەو مەسەلەدا کە باسمان کرد بەهۆی ئەمرەکەی حەزرەتەوە (د.خ) واجیب بووە.

ریوایەت کراوە: ڕۆژێ یەکێ هاتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! باوکم موحتاجی ماڵی منە، ئەمرت بەچییە؟، فەرمووی: تۆ خۆت و ماڵت هی باوکتن، ئینجا ڕووی کردە هاوڕییەکانی و فەرمووی: ئەولادەکانی ئێوە وەکو کەسابەتی حەڵاڵی ئێوەن، کەواتە لە ماڵی ئەوان بخۆن. هەندێ لە زانایان دەگێڕنەوە کە لە تەوراتدا نووسراوە: هەر کەسێ لە باوك و دایکی خۆی بدا، جەزای کوشتنە. مەبەس لەم نەقڵە ئەوەیە کە ئازاردانی باوك و دایك لە ئاینی پێشووانیشدا هەر بە گوناهی گەورە دانراوە و جەزای ئەوە بوو کە ئازاردەر بکوژرێ. هەروەها ڕیوایەت کراوە: ئەگەر یەکێ لەگەڵ باوك و دایکیدا خراپ بێ، خوای گەورە دوو جار دەرگای دۆزەخی بۆ دەکاتەوە، واتە: دوو قاتی گوناهباری تر موستەحەقی سزایە، یەکێ لەبەر ئەسڵی ناپیاوییەکەی. دووەم لەبەرئەوە کە ئەو ناپیاوییەی لەگەڵ ئەسڵ و بنەڕەتی خۆیدا کردووە.

ڕیوایەت کراوە کەس شەوێکی بە سەردا تێ پەڕێ و ڕۆژی لێ بێتەوە و لە سبەینێدا باوك و دایکی لێی زویر بن، ئەوە دوو دەرگای لە دۆزەخ بۆ دەکرێنەوە، یەکێ لەبەر ئازاردانی باوکی و یەکێ لەبەر ئازاردانی دایکی. هەندێ لە ئەسحابەکان عەرزی حەزرەتیان کرد: هەر چەند باوك و دایك و دایکەکەیش لەگەڵ کوڕەکەیاندا خراپ و ستەمکار بن؟

فەرمووی: هەر چەند باوك و دایکی لەگەڵیدا ستەمکار بن.

براكان! جا تەماشای ئەمە بكەن مادام لە كاتێكدا كە باوك و دايكیش ستەمكار بن، هێشتا بێ ئەدەبیی كوڕەكەیان ببێتە هۆی سزای خوای گەورە، دەبێ لە كاتێكدا كە باوك و دايكەكە ئینسانی باش بن، پاداش و سزای كوڕە خراپەكەیان چەند ناهەموار و نالەبار بێ!

لە بابەتی ئازاردانی باوك و دايكەوە ئايەت و حەديس و قسە و باس زۆرن، بەڵام لەبەرئەوە كە درێژەدان بە باسەكە نەبێتە هۆی دڵپەرێشان، بەم ئەندازە ئیكتیفام كرد، چونكە ئەم ئەندازەیە بەسە بۆ كەسێ كە باوەڕی بە ئايەت و حەديس هەبێ و دڵی ئەوەندە ڕووناكیی باوەڕی تێدا بێ كە شتی ڕاستی لێ ون نەبێ. بەڵام پێویستە لەم شوێنەدا، هەندێ باشیی چاكە كردن لەگەڵ باوك و دايكدا باس بكەم؛ هەتا ئەوانەی كە سوپاس بۆ خوا حاڵیان لەگەڵ باوك و دايكیاندا باشە، زۆر سوپاسی خوای گەورە بكەن كە بەو پايەی ئیحسانە شادبوون و لە نەگبەتیی ئازاردانی باوك و دايك ڕزگار بوون:

ڕیوايەت كراوە هەر موسڵمانێ ڕۆژی لێ بێتەوە و لەوكاتەدا باوك و دايكی لێی ڕازی بن، ئەوە خوای گەورە ئەمر دەفەرموێ كە دوو دەرگای بەهەشتی بۆ بكرێتەوە، دەرگايەك لەبەر ڕەزای باوكی و دەرگايەك لەبەر ڕەزای دايكی. هەروەها ڕیوايەت كراوە: هەر كەسێ حەزی لە تەمەن درێژی و ڕزق و ڕۆزی و ژیواری گوشاد و فراوان هەيە با لەگەڵ باوك و دايكیدا باش بێ و ڕەفتاری پیاوانە بێ.

ڕیوايەت كراوە: خۆتان بخەنە ژێر پێی دايكتان؛ چونكە بەهەشت لەژێر پێی دايكدايە. بەڵێ ئەم حەديسە شەریفە دەلیلە لەسەرئەوە كە خزمەتی باوك و دايك دەبێتە هۆی ڕۆیشتنە بەهەشت.

براكان! ئەگەر يەكێ لەپاش وەفاتی باوك و دايكی ئەم نامەی منەی بۆ خوێنرايەوە ئەوە پێویستە هەموو ڕۆژێ بەقەدەر توانا دوعای خێريان بۆ بكا و بڵێ: خوايا لە گوناهی باوك و دايكم ببوورە و میهرەبانییان لەگەڵ بفەرموو وەك ئەوان لەكاتی منداڵیمدا میهرەبان بوون لەگەڵ مندا و بەخێويان كردم. هەروەها بەپێی توانا قەدری برا و خوشكیان بگرن و بەچاوی حورمەتەوە سەيری دۆست و برادەريان بكەن. هەر عەهد و پەيمانێكیان كردووە، بەجێی بهێنن تا ئەگەر ناوتان لە دەفتەری باوك و دايك ئازاردەرانا نووسرابێ، بكوژێنرێتەوە و لە دەفتەری لەگەڵ باوك و دايك چاكاندا بنووسرێ (يمحوا الله ما يشاء ويثبت).

جەلالەددینی سیوتی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەگێڕێتەوە: کە مالیکی کوڕی دینار شەوێکی جومعە دەڕوا بۆ زیارەتی گۆڕستانی خۆیان، تەماشا دەکا نوور هەموو قەبرەکانی داپۆشیوە. ئەویش ڕوو دەکاتە قەبرێك و لە خاوەنەکەی دەپرسێ: ئەم هەمووە نوورە چییە؟ ئەویش دەڵێ: لەم شەوی جومعەدا یەکێ دوو ڕکات نوێژی شەوی کردووە و سوورەتی (کافرون) و سوورەتی (أخلاص)ی تیا خوێندووە و خێر و پاداشتی ئەو دوو ڕکاتە نوێژەی بەدیاری ناردووە بۆ ئەرواحی ئەهلی ئەم گۆڕستانە. مالیك دەڵێ: من کە ئەمەم بیست، کردم بەعادەت بۆ خۆم هەموو شەوێکی جومعە دوو ڕکات نوێژم بەو شێوە دەکرد و خێر و پاداشەکەیم بەدیاری دەنارد بۆ گیانی هەموو ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ). پاش ماوەیێ لە خەودا بە خزمەت حەزرەت گەیشتم (د.خ). حەزرەت ڕەزامەندیی خۆی دەربارەم دەربڕی و فەرمووی: بەقەدەر هەموو ئوممەتەکەیش پاداشی چاك بۆ تۆ نووسراوە و تۆ خزمەتی منت کردووە و من لە تۆ ڕازیم. جا ئەی برای ئازاردەری باوك و دایك! تۆیش ئەگەر دەتەوێ لە بەدبەختی و گوناهی ئازاردانی باوك و دایکت دەرباز بی، هەموو شەوێکی جومعە دوو ڕکات نوێژ بکە و لە یەکەم ڕکاتدا سوورەتی (کافرون) و لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی (أخلاص) بخوێنەوە خێرەکەی بەدیاری بنێرە بۆ باوك و دایکت، تا خوا لە زومرەی ئەوانەدا بتنووسێ کە لەگەڵ باوك و دایکیاندا چاکن و، لەو حاڵە خراپەوە بتگەیێنێتە ئەم پایە بەرزە.

ڕیوایەت کراوە پیاوێ لە هۆزی بەنی سەلەمە هات بۆ خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا لە بابەتی چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکمدا شتێ ماوە بەجێی بێنم؟ فەرمووی: بەڵێ، نوێژ کردن لەسەریان لەپاش مردنیان و پاڕانەوە و داوای عەفوو کردنیان لە خوای گەورە و بەجێهێنانی پەیمان و وەسیەتیان و قەدرگرتنی دۆست و برادەریان. ئەگەر ئەمانە بەجێ بێنن لەو نەگبەتییە ڕزگار دەبن کە لە لای خوای گەورە پێتان بوترێ (عاق الوالدین) و لە ڕیزی (بار بالوالدین)دا دەنووسرێن.

ڕیوایەت کراوە: خوا دەفەرموێ: ئەی ئینسانی ئازاردەری باوك و دایك! چی حەز دەکەی لە ڕەفتاری باش بیکە، بەڕاستی هەرگیز لە تاوانی ئازاردانی باوك و دایك عەفووت ناکەم. هەروەها دەفەرموێ: ئەی ئینسانی لەگەڵ دایك و باوکا چاك و پیاو، هەر چەند کردەوەی بەدت هەیە مادام لەگەڵ باوك و دایکتدا باشی و ئازاریان نادەی و قەدریان دەگری، عەفووت دەکەم، واتە: چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکدا دەبێتە کەفارەتی گوناهی عقووق و گوناهەکانی تر.

ڕیوایەت کراوە: یەکێ هات عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! گوناهێکی گەورەم کردووە ئاخۆ تەوبەم هەیە یا نا، مەبەستی ئەوەبوو کە عەفوو دەکرێ یا نا. ئەویش (د.خ) لە وەڵامیدا فەرمووی: دایکت ماوە؟ عەرزی کرد: نا. فەرمووی: پوورت هەیە (خوشکی باوك)؟ عەرزی کرد: بەڵێ. فەرمووی: چاکە بکە لەگەڵ پوورەکەتدا دەبێتە کەفارەتی ئەو گوناهەی کردووتە. جا براکانم! مادام چاکە لەگەڵ پووردا ببێتە کەفارەتی گوناه دەبێ چاکە لەگەڵ دایکدا چۆن بێ؟ بێگومانە و ئاشکرایە چاکە لەگەڵ دایکدا پاداشی زۆرترە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ هەموو ڕۆژێکی جومعە زیارەتی قەبری باوك و دایکی بکا و، سووروسەتی (یس) لەسەر قەبرەکەیان بخوێنێ، خوای گەورە عەفووی دەکا و ئەو زیارەتەی بە حەج و عومرەیەکی سوننەت بۆ دەنووسێ و، بەرامبەر بەهەر حەرفێ لەو سوورەتە یەك بە دە پاداش و خێری بۆ دەنووسرێ.

دەگێڕنەوە: پیاوێکی زۆر پیاوانە هەبوو ڕۆژێ لە ماڵی خۆی دەرچوو چاوی بە ئینسانێکی ڕێبوار کەوت هێنایەوە بۆ ماڵ و میوانداری کرد. کە ماڵاوایشی لێ کرد هەزار درەمی پێ دا. کابرای میوان وتی: ئەرێ برا! من و تۆ ئاشنای یەك نین و تا ئێستا یەکترمان نەناسیوە، ئەم هەمووە پیاوەتییەت چۆن و لەبەر چی لەگەڵم کرد؟!

خانەخۆییەکە وتی: قەسەم بە خوا کە چاوم پێ تکەوت شێوەت لەسەر شێوەی باوکم هاتە پێش چاوم؛ تەنیا لەبەرئەوە ئەم خزمەتەم کردی.

تەماشای ئەم پیاوەتییە بکەن مادام ئینسان لەگەڵ هاوونەی باوکی خۆیدا پیاوەتی بکا لەگەڵ باوکیدا دەبێ چۆن بێ؟ بێ گومان دەبێ زیاتر جوامێر و پیاوچاك بێ.

براکان! حیکایەتێ هەیە بۆتانی دەگێڕمەوە بەڵکو پەندی لێ وەربگرن. دەڵێن کوڕێ هەبوو هەر لە منداڵییەوە خووی گرتبوو بە خواپەرستی و عیبادەتەوە. جارێکیان ئارەزووی کرد بڕوا بۆ حەج پرسی بە دایکی کرد ڕێگای نەدا و وتی: تۆ لە بەرچاومدا نەمێنی من کوێر دەبم. لەگەڵ ئەمەیشدا کوڕەکە بەشەو بەبێ ئیجازەی دایکی هەستا و بەرەو حیجاز کەوتە ڕێ. کە دایکە خەبەری بووەوە و بیستی کوڕەکەی ڕۆیشتووە دوعای لێ کرد و وتی: خوایا ئازاری ئەم کوڕی منە بدە. کاتێ کوڕەکەی گەیشتە (بیت المقدس) شەو بۆ دەستنوێژ گرتن ڕۆیشتە دەرەوە و لەوێ پیاوی میری گرتیان و گومانی ئەوەیان

لێ کرد کە دز بێ، بۆیە بردیانە بەردەم فەرماندار و وتیان دزێکمان گرتووە. ئەویش ئەمری کرد دەست و پێیان بڕی و چاویان دەرهێنا و حەپسیان کردو تا سێ ڕۆژ مەنعی خواردەمەنییان لێ کرد. لەو کاتەدا زۆر حاڵی پەرێشان بوو، گریا و لە خوا پاڕایەوە وتی: یا ڕەبی من بە نیاز و ئارەزووی زیارەتی کەعبەی پیرۆزی تۆ هاتم کەچی بەم جۆرە گیرۆدە بووم و دەست و پێم بڕایەوە و چاوەکانم دەرهێنران. خۆزگە دەمزانی من تاوانم چی بوو وام بەسەر هات؟. کوڕەکە لەم پاڕانەوەدا بوو لەناکاودا یەکێ هات بانگی کرد: ئەی جوان! نان و ئاوم بۆ هێناوی لێم وەربگرە من لە خەوا بەخزمەتی حەزرەت گەیشتم (د.خ) ئەمری فەرموو بێم بۆ لات. ئەم باسە گەیشتە لای فەرماندار، ئەویش گورج ئەمری کرد کوڕەکەیان برد بۆ لای و ئەم لاولای ماچ کرد و تکای لێبووردنی لێ کرد و پێی وت: چیت دەوێ بۆت بکەم؟ ئەویش وتی: من ئەم دەردەم بەهۆی بەگوێ نەکردنی دایکمەوە بەسەرداهاتووە؛ ئەمر بکە بمبەنەوە بۆ لای دایکم. ئەویش ئەمری کرد هەڵیان گرت و بردیانەوە بۆ وڵاتی خۆی و لە دەرگای ماڵی خۆیاندا دایان نا. ئەویش دای لە دەرگا و بانگی کرد: ئینسانێکی غەریب و برسی و تینووم بێن فریام کەون. پیرێژنەکەی دایکی لە ماڵەوە بوو، بانگی لە کچەکەی کرد: بڕۆ پیاڵەیێ ئاو بدە بەو غەریبە بەڵکو خوا ڕەحمان پێ بکا و برا غەریبەکەت بەسەلامەتی بگەڕێتەوە. لەو کاتەدا ئەو پیرە دایکە لە یادی کوڕە غەریبەکەیدا ئەم شیعرانەی دەخوێندەوە:

قرة عيني، حبيبي، ولدي
ضاع مني للتنائي كبدي
أن يكن جسمي غريقا فلقد
أشكو حالي بأحتراق كبدي
ياالهي! قد ترى ما حل بي
فارزق الصبر عليه صمدي!
وأجمع الشمل وكن لي راحماً
فرجائي منك أقوى عددي

واتە: (ڕووناکیی چاوم، خۆشەویستەکەم، ڕۆڵەکەم، دوورکەوتەوە لە کیسم چوو جەرگەکەم. گەرچی لەشم نیشتووەتە سەر عارەق و غەرقم تێدا، وەی بەحاڵم ئەوا سووتا

جەرگەکەم. خوایا خۆ تۆ دەزانی چیم بەسەر هات، دەرووی سەبرم لێ بکەوە، سەبرم دەوێ. جارێکی تر کۆمان بکەرەوە و بەزەییت بێ بەحاڵماندا، ئومێد بە تۆ و بە ڕەحمی تۆ بەهێزترین چەکی منە).

بەڵێ لەم حاڵەدا دەگریا و هاواری دەکرد: خوایا! کوڕە داماوە غەریبەکەم بۆ ڕەوانە بکەیتەوە. لەم گریانەدا بوو دەنگی کوڕەکەی خۆی بیست قسەی لەگەڵ خوشکەکەیدا دەکرد. کاتێ تەماشای کرد کۆتەرە دارێکی کوێری بێ دەست و پێی هاتە بەرچاو، بە دیتنی ئەم وەزعە بێهۆش کەوت. پاش ماوەیەك هاتەوە سەر خۆی و لە خوای گەورە پاڕایەوە و وتی: خوایا! من کە دوعام لێ کرد نەمویست وەهای لێ بێ. خوایا! بۆ خاتری میهرەبانیی خۆت ئەم کوڕەم بۆ ساغ بکەرەوە، تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. بەم جۆرە دایکە پیرە بەدەم گریانەوە گەلێ هاوار و ناڵەی کرد و دەیوت: (یا حلیماً لا یعجل بالعقوبة!) ئەم دوعا و پاڕانەوە و سکاڵایەم لێ قبووڵ بکە. ئینجا میهرەبانی و کەرەمی خوا هاتە جۆش و ئەو کوڕە کوێرە دەست و پێ بڕاوەی وەك زەمانی پێشووی ساغ کردەوە بە دایکە پیرەکەی شاد کردەوە و دایکە پیرەیش بەو شاد بووەوە. (والحمد للّٰه علی ذلك).

براکان! ئەگەرچی ئەم سەرگوزەشتەیە هەندێ شتی تێدایە لە عادەت و یاسای دنیایی دوورە، بەڵام توانای خوای گەورە لە ژوور یاسای بیروهۆشی ئێمەوەیە. بەڕاستی بزانن ئەو کارەساتە نابارە ناهەموارە کە بەسەر ئەو کوڕە موسڵمانە باشەدا هات، هەمووی لە نەگبەتیی ئەوەوە بوو کە بێ گوێیی دایکی کرد و بێ ڕەزای ئەو ڕۆیشت بۆ حیجاز. ڕزگار بوونەکەیشی لە پیرۆزیی ئەوەوە بوو کە لە کردەوەکانی تریدا بێ گوێیی نەکردبوو.

براکان! ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە دڵی موسڵمانان بە درێژەپێدانی قسە ماندوو دەبێ، لەم ئەندازە زیاتر حەدیسم بۆ دەهێنانەوە، هەرچەند ئێوە (أن شاء اللّٰه) ئیمانتان تەواوە و بە پەند و ئامۆژگاری دڵشاد دەبن.

لە شازدەی ڕەجەبی ١٣٩٦ ی ك، ڕێکەوتی ١٤-٧-١٩٧٦ی ز لە تەرجەمەکردنی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی سی و پێنجەم

# باسی خەیانەت کردن لە کێشانە و پێوانەدا دەکا

بسم اللّە الرحمن الرحيم

بسم اللّە والصلاة والسلام على رسول اللّە وعلى آلە وأصحابە وأتباعە بأحسان إلى يوم الدين.

پاش ئەمانە، براکان! لە خوای خاوەن کەرەم تکاکارم کە لە گوناهـ بتانپارێزێ و هەر گوناهێکتان هەیە، عەفووی بفەرموێ و دڵتان وەها ڕووناك بکاتەوە کە هەمیشە خەریکی پەیداکردنی زەخیرە و توێشووی ڕۆژی قیامەت بن.

براکان! بە نەسسی قورئانی پیرۆز لەو کاتەوە کە سەر لە قەبر دەردێنین تا ئەو کاتە کە لە ڕاوەستانی ڕۆژی قیامەت و حسێبی کردەوە ڕزگار دەبین و دەچینە بەهەشت (أن شاء اللّە) یا ئەوانەی دۆزەخین دەڕۆنە دۆزەخ (أعاذنا اللّە) ماوەی پەنجا هەزار ساڵە، مەگەر کەسێ خوا بە میهرەبانیی خۆی عەفووی بکا و ئەو ماوە زۆرەی لەسەر کەم بکا؛ قال اللّە تعالى: «فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ» بۆیە پێویستە ئیهتیمام و موبالاتی ئینسان بە پەیداکردنی توێشووی ڕۆژی قیامەتی زیاتر بێ لە ئیهتیمامی بە پەیداکردنی توێشووی ژیواری دنیای، چونکە دنیا دەبڕێتەوە و قیامەت نابڕێتەوە. ئومێدەوارین هەردوولایان بۆ ئەهلی دین بەئاسانی جێبەجێ ببن.

زووتر کاتێ نامەی نوێژم بۆ نووسین، بەڵێنم دانێ نامەیەکتان لە بابەتی گوناهە گەورەکانەوە بۆ بنووسم، بەڵام لەبەرئەوە کە دەرحەق بە نامە پێشووەکان بەبێ موبالات هاتنە پێش چاوم، شەرمم کرد ئەوەندە دامێن گیرتان ببم، ئەگەر چی حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «علموا سنتي وأن كرهوا» واتە: ڕەوشتی من بە موسڵمانان فێر بکەن ئەگەرچی پێشیان ناخۆش بێ و لە دڵدا لە بیستنی ئامۆژگاریش قەڵس بن. هەروەها لە فەرموودەی حەزرەتدا هەیە (د.خ) کە گوێدان بە ئامۆژگاریی ئاینی نیشانەی ئیمانە، چونکە ڕیوایەت کراوە: لە گەورەترین ئەخلاقی بەرزی موسڵمان ئەوەیە کە هەرگیز لە

بیستنی خێری ئاینی تێر نەبێ. خوای گەورەیش فەرموویەتی: «وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ». تا ئەمساڵ تەماشام کرد، خوا بارانی لەم وڵاتە بڕی و کشتوکاڵێکی زۆر فەوتا و وشك بوو و بەپێی فەرموودەی پێغەمبەریش (د.خ) باران نەبارین لەبەرئەوەیە کە موسڵمانان زەکات نادەن، یا لەبەر ئەوەیە کە لە کێشانە و پێوانەدا دەستپیسی دەکەن.

بەڵێ لەبەر ئەمانە بە ناچاری دەستم کرد بە نووسینی نامەی مەنعی (تەتفیف) واتە مەنعی دەستپیسی لە کێشانە و پێوانەدا، تا موسڵمانان بیر بکەنەوە و بێنەوە سەر ڕێگای ڕاست.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «جزاء المعصية الوهن في الطاعة والضيق في المعيشة والتعس في اللذة. قيل: وما التعس في اللذة؟ قال: لا ينال شهوة حلالا ألا جاءه ما ينغصه أياها». واتە: پاداشی تاوانباری چەند شتێکە. یەکەم سستی لە خواپەرستیدا. دووەم تەنگیی ژیان. سێیەم تەعسە لە لەزەتدا. عەرزیان کرد: (تەعس لە لەزەتدا) یانێ چی؟ فەرمووی: مانای ئەوەیە ئینسانە گوناهبارەکە هەر لەزەت و خۆشییەکی حەڵاڵی دەست بکەوێ، شتێکی وای بۆ پەیدا دەبێ شیرینیی ئەو لەزەت و خۆشییەی لێ تاڵ دەکا. بەڵێ گەلێ دەوڵەمەند هەن لەگەڵ ئەوەیشدا کە لە هیچ کەمیان نییە ئەغڵەب گلەیی لە بێ ئاسایشیی خۆیان دەکەن و هاواریانە لە دەست تەنگیی گوزەرانیان!

خوای گەورە دەفەرموێ: «وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ[١] الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ[٢] وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ» واتە: وەیل (کە شوێنێکی زۆر ناخۆش و نارەحەتە لە دۆزەخدا) بۆ ئەو کەسانەیە کە شت بۆ خۆیان دەکڕن چاکی دەپێون و چاکی دەکێشن، بەڵام کە بە خەڵکی دەفرۆشن لە کێشانە و پێوانەیدا کورتی دەهێنن «أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ[٤] لِيَوْمٍ عَظِيمٍ[٥] يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ» واتە: ئایا ئەوانە باوەڕیان نییە بەوە کە لەپاش مردن زیندوو دەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوەی کار و کردەوە لە ڕۆژێکی گەورەی سامناکدا؟ ڕۆژێکی وەها کە هەموو ئادەمیزاد ڕادەوەستن و لە لایەن خوای هەموو عالەمەوە پرسیاریان لێ دەکرێ؟. دیارە ئەو ڕۆژە بۆیە بە گەورە دانراوە؛ چونکە هەرچی لەو ڕۆژەدا ڕوو دەدا هەموو کارەساتی گەورە گەورەن؛ زیندووکردنەوەی مردووان زۆر گەورەیە. ڕاپێچ کردنیان بۆ مەیدانی لێپرسینەوە زۆر گەورە و ترسناکە. سزای خەڵك لەو ڕۆژەدا زۆر بەتین و زەحمەتە. ڕاوەستان و چاوەڕوانیی لە مەیداندا زۆر

سەختە. تەسلیم کردنی دەفتەری حیساب و نامەی کردەوە زۆر جێگەی ترس و سامە و خەڵك هەموو چاوەڕوانی چارەنووسی خۆیانن.

ڕیوایەت کراوە: لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد هەموو زیندوو دەکرێنەوە و لە گۆڕ دێنە دەرەوە و دەکەونە ڕێ. هەندێ پێیان پەتییە و هەندێ سۆلیان لەپێدایە. هەندێ پیادەن و هەندێ سوارەن و سوارەکانیش هەندێکیان بەعادەتی بەڕێدا دەڕۆن و هەندێکیان وەك برووسکە تێ دەپەڕن.

هەروەها پیادەکانیش هەندێکیان بە شێوەیەکی عادەتی ڕێ دەکەن و هەندێکیان بەپێچەوانەی عادەت لەپەوڕوو یا بەسەر شاندا ڕادەکێشرێن؛ واتە: هەر کەس بەپێی ڕەفتاری دنیای خۆی خراپ و خراپتر، چاك و چاکتر تا کاتێ لە بەردەمی خوای گەورەدا ڕادەگیرێت بۆ لێپرسینەوە. بێگومان ڕاوەستانی ئادەمیزاد و جنۆکە لە مەیدانی حیسابدا پەرێشانیان دەکا و هەموویان دەکەونە ئازار و زەحمەتەوە. هاوار بۆ هەر کەس دەبەن لە پێغەمبەران لە حەزرەتی ئادەمەوە تا خوارتر. کەس توانای تکاکردنی لای خوای گەورەی نابێ و هەریەك لەوان بەجۆرێ بەهانە دێنێتەوە، تا هاوار دەبەنە لای حەزرەتی فەخری عالەم محەممەد (د.خ) و ئەو دەڕوا سوجدەی گەورەییی بۆ خوای گەورە دەبا و لێی دەپاڕێتەوە تا تکای لێ قبووڵ دەکرێ و دەس دەکرێ بە کێشانەی کردەوەی هەموو حازران. دیارە ئەو توندوتیژیی سزا و ڕاوەستانی مەیدانی حەشرە بۆ کەسێ فام و هۆشی ببێ زۆر گرانە و، بە موافیقی ئایەتی پیرۆز وەیل کە ناوی جێگەیەکی پڕ ئازارە لە دۆزەخدا دەبێتە شوێنی ئەو کەسانەیش کە لە کێشانە و پێوانەدا دەستپیسی دەکەن. دەگێڕنەوە گەرمای ئەو شوێنە بەڕادەیەکە ئەگەر هەموو کێوەکانی سەر زەوی بخرێتە ناوی لە گەرماندا دەتوێتەوە و دادەڕزێن!

براکان! خوای گەورە فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ».

دیارە ئەو هەڕەشانەی خوای گەورە کردوونی هەموویان بەستراون بە ئیرادە و خواستی خۆیەوە. جا ئەگەر خواستی لەمەڕ عەفوکردن و لێبووردنی تاوانبار بێ، ئاوا عەفووی دەکا. خۆ ئەگەر بیەوێ عەفووی نەکا، ئەوا ئەوەندەی تاوانی خۆی سزای دەدا، پەنا بە خوا. لەبەر ئەمە ئادەمیزادی بەختیار دەبێ هەمیشە ئاگای لە خۆی بێ و بەپێی توانا بۆ خواپەرستی و بەگوێکردنی تێ بکۆشێ و بێ ئەمری و نافەرمانیی خوا نەکا؛ خوای گەورە فەرموویەتی: «فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ» واتە: با

«ئەوانەی کە سەرپێچی لە ئەمری خوا دەکەن لەوە بترسن کە لە دنیادا تووشی ئاشووب و وەیشوومەیێ یا لە قیامەتدا گرفتاری سزایەکی سەخت ببن. واتە: ئەوانە کە بێگومان یا لە دنیادا یا لە قیامەتدا یا لە هەردوو دنیادا تۆڵەی ئەو سەرپێچییەیان لێ دەکاتەوە.

پێویستە ئەوەش بزانن هەر کاتێ لەناو قەومێکدا نافەرمانیی زۆر پەیدا بوو، خوای گەورە بەڵای ناهەموار بۆ سەر ئەو قەومە ڕەوانە دەکا. یاسای قەزای خوای گەورەش وەهایە کە هات تەنیا گوناهبارەکان پێوە نابن؛ بەڵکو بێ گوناهەکانیش تووش دەبن، بەڵام بۆ ئەمان دەبێتە هۆی پاداشی ڕۆژی قیامەت و بەخێر بۆیان دەنووسرێ؛ خوای گەورە فەرموویەتی: «وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً». واتە: خۆتان لەو بەڵاو ئاشووبە بپارێزن کە تەنسا تاوانبارەکانتان ناگرێتەوە، بەڵکو هەردوو لایان تاوانبار و بێ تاوان دەگرێتەوە، پەنا بە خوا. هەر لەم بابەتەوە لە حەدیسی پێغەمبەردا هەیە کە قەومێ بەهۆی گوناهی یەکێکیانەوە گیرۆدەی سزا دەبن، واتە: لە کاتێکدا ئەو تاقە کەسە گوناهەکەی کردووە و ئەوانی تر مەنعیان نەکردووە و دەستیان نەهێناوەتە ڕێی.

براکان! لە ئیمامی عومەرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرمووویەتی: پێنج خووی خراپ هەن پەنا بەخوا لەوەی کە بکەونە ناوتانەوە، یەکەم، زینا و فەرمانی فاحیشە. ئەم گوناهە لە هەر کۆمەڵێکدا پەیدا ببێ و بەبێ شەرمی بەئاشکرا بیکەن، خوای گەورە لە تۆڵەی ئەوەدا تاعوون و ناساغی و ناهەمواریی وایان لەناودا بڵاو دەکاتەوە کە لە پێشدا نەبووە و خەڵکی نەیاندیوە. دووەم، کەموکوڕییە لە کێشانە و پێوانەدا کە لەناو هەموو قەومێکدا پەیدا ببێ، بەقاتوقڕی و تەنگ گوزەرانی گیرۆدە دەبن و دەکەونە ژێرباری ستەمی پاشایانی ڕۆژ و ئازار دەدرێن. سێیەم، نەدانی زەکات و سەرفیترەیە کە لە هەر کۆمەڵێکدا پەیدا ببێ، خوا بارانیان لێ دەگرێتەوە، واتە یا هەر بارانیان بۆ نابارێ یا لە کاتێکدا دەبارێ زیانی هەبێ. ئەگەر لەبەرئەوەش نەبووایە کە خوای گەورە بەزەیی بەبێ زمانانددا دێتەوە، هەر بەجارێ مەنعی ئاوی بارانی لێ دەکردن. چوارەم سوود کردن و سوود خواردن لە قەرز و مامەڵەدا کە بڵاوبوونەوەی لەناو کۆمەڵێکدا دەبێتە هۆی ئەوە خوای گەورە پیت و بەرەکەت لە ڕزق و ڕۆزیی ئەو کۆمەڵەدا هەڵبگرێ. پێنجەم، کار بە حوکمی خوا نەکردن و گۆڕینی بە ئارەزووی نەفس. بێ گومان ئەمە لە هەر کۆمەڵ و کۆڕێکدا بڵاوبێتەوە کوشتاری بێ شوماری ناهەموار لەناویاندا پەیدا دەبێ،

وەکو ئەوە کە ساڵی پار (هەزار و دوو سەد و شەست و حەوت) ئەم دوو بەڵایە گرانی و کوشتاری ناحەق هەردووکیانمان بەچاوی خۆمان دی.

براکان! لەمەوپێش ئەو حەدیسەم بیستبوو کە باسی حوکمی ناحەق دەکا، بەڵام باش لە ماناکەی حاڵی نەبوو بووم و وام دەزانی مەبەستی ئەوەیە کە داوەرەکان لە دادگادا فەرمانی ڕاست نادەن و ستەم دەکەن. تا پاش ماوەیەك تێگەیشتم کە مەبەستی ئەوەیە یاسای هەوا و ئارەزووی نەفس دادەنێن لەباتی یاسای خوایی کە بناغەکەی قورئانی کەریم و فەرموودەی شیرینی حەزرەتە (د.خ). هەروەها لەپاشاندا لە کتێبی (جامع الصغير)دا چاوم پێ کەوت کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «تعمل هذه الأمة برهة بكتاب اللّه ثم برهة بسنة رسول اللّه ثم تعمل بالرأي. فأذا عملوا بالرأي فقد ضلوا وأضلوا». واتە: ئەم ئوممەتە ماوەیەك بە قورئان کار دەکەن، ئەمانە هاوڕێیەکانی پێغەمبەر و تابیعینین لەپێش ئەوەدا کە حەدیس تەدوین بکرێ و بنووسرێتەوە. ماوەیەکیش بە سوننەتی پێغەمبەر (د.خ) ڕەفتار دەکەن. ئەم ماوەیە زەمانی ئیمامە موجتەهیدەکان و شوێنکەوتووەکانیانە، کە وەکو بە کەلامی خوا ڕەفتاریان کردووە بە فەرموودە و سوننەتی پێغەمبەریش ڕەفتاریان کردووە. دیارە ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەم پەیڕەو و ڕێبازە دەوام دەکەن تا دنیا دوور دەکەوێتەوە و یاسای ئاین کز دەبێ و زانا بەرزەکانی دین نامێنن و، ئەگەر تاکە تاکەیەکیش بمێنن هیچ دەستیان ناڕوا، ئیتر ئوممەت دەکەوێتە چەرخی شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزووی شەخسی بە گوێرەی قازانجی خۆیان. جا کاتێ چەرخ ئاوەها گۆڕا ئەو کەسانە کە بە ڕا و ئارەزووی خۆیان ڕەفتار دەکەن خۆیان گومڕاه دەبن و خەڵکی تریش گومڕاه دەکەن. ئام ئارەزووی شەخسییە ئەوەیە کە لە قانوونی بێگانە دێنن و ڕەفتاری پێ دەکەن. حەدیسێکی پیرۆز هەیە یارمەتیی ئەم قسەیە دەدا کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «لتتبعن سنن الذين قبلكم شبراً بشر و ذراعاً بذراع حتى لو دخلوا في جحر ضب لاتبعتموهم. قلنا اليهود والنصارى؟ قال: فمن؟!» واتە: بە خوا قەسەم لەمەوپاش ئێوە بست بە بست و گەز بە گەز دەکەونە شوێنی ڕەفتاری ئەو کەسانە کە پێش زەمانی ئێوە ژیاون، تەنانەت ئەگەر بەکونی بزن مژەیشدا بچن، ئێوەش دوایان دەکەون. ئێمەش عەرزمان کرد: مەبەستت لەوانەی پێشوو جوولەکە و گاورە؟ فەرمووی: ئەی کێم مەبەستە!؟، واتە: دیارە ئەوانم مەبەستە. ئەم قسەیە وا ئێستە هاتووەتە دی.

جارێ ڕۆیشتم بۆ شاری بەغدا لەوێ کتێبێکم دی ئەوەڵ و ئاخیرەکەی نەمابوو تا بزانم

باوەڕ پێکراوە یا نا؟ لەو کتێبەدا حەدیسێکم چاوپێ کەوت بە سەراحەت دەیفەرموو: لەمەولا قانون لە موقابیلی شەرعەوە پەیدا دەبێ و خەڵکی ڕەفتاری پێ دەکەن؛ بۆ نموونە: لە ویلایەتی شارەزوورا، کە هەموو شافیعی مەزهەبن، مودەعی و مودەعا عەلەیهی شافیعی مەزهەب دێن بۆ لای نائیب لە مەحکەمەدا و، قازییەکە بە مەزهەبی ئیمامی شافیعی حوکم ناکا، بەڵکو بە مەزهەبی ئیمامی ئەعزەم حوکم دەکا کە ئەبووحەنیفەیە (ر.خ) لەگەڵ ئەوەشدا دوو طەرەفی نیزاعەکە تەقلیدی ناکەن. ئەمە شتێکی باش نییە و، واجیبە لەسەر خەڵکی هەرەمە تەقلیدی ئەو ئیمامە بکەن کە حوکمەکە لەسەر مەزهەبی ئەو دراوە. هەروەها پێویستە ئەو قازییەش کە حوکم بە غەیری مەزهەبی شافیعی دەکا لەم باسە ئاگادار بکرێ.

ڕیوایەت کراوە لە زەمانی حەزرەتی مووسادا، پێنج ساڵ باران نەباری و، خەڵك زۆر پەرێشان بوون. حەزرەتی مووساش (د.خ) زۆر لە خوای گەورە پاڕایەوە بۆ لابردنی ئەو پەرێشانییە و عەرزی بارەگای ئەقدەسی خوای کرد: حیکمەتی چییە ئەم خەڵکە هەموویان دوعا دەکەن و دوعایان قبووڵ نابێ؟ خوای گەورە لە وەڵامی مووسادا فەرمووی: من چۆن کۆمەڵێ قبووڵ دەکەم کە لەشیان بەتاوانباری و زوبانیان بە درۆو خوسپ و پاشملە و دەستیان بە کاری ناشایستە و نالایق پیس بووە و سکیان بووەتە عەماری خواردنی حەرام؟. من بەندێکم هەیە برۆن پەنای پێ ببەن تا دوعا بکا و ئەم خەڵکە لەم مەینەتە ڕزگار بکا. حەزرەتی مووسا عەرزی بارەگای خوایی کرد: ئەو بەندە ناوی چییە و لە کام وڵاتە؟ خوای گەورە فەرمووی: ناوی مووسایە و لە فلانە دەشتدا دەگەڕێ. ئەویش ڕۆیی و ئەو زەلامەی دۆزییەوە و عەرزی کرد: ئەی بەندەی خوا نزا بۆ ئەم عالەمە بکە با لەم مەینەتە ڕزگار ببن و ڕوویکەنە خوا. ئەویش وتی: ئەی مووسا لێم دوور بکەوەرەوە تا دوعایان بۆ بکەم. کاتێ کە مووسا دوورکەوتەوە کابرا ڕووی کردە ئاسمان و وتی: خوایا! مەگەر خەزینەی ڕەحمەتت خاڵی بووە لە خێرات، یا باران لە ژێر فەرمانی تۆ دەرچووە، یا هەور لە ژێر حوکمی تۆدا نییە، یا لەوە دەترسی کە فرسەتی تۆڵەسەندنەوەت لەدەست دەرچێ ، ئێستا پێشدەستی دەکەی و تۆڵە لەم خەڵکە دەستێنی؟! مادام تۆ لەمانە هەموو دووری و هەموو شتێ وا لە ژێر فەرمانی خۆتدا تکا لێ دەکەم بارانیان بۆ ببارێنی. ئیتر لەو کاتەدا کە ئەو شەخسە دەستی کرد بە دوعا و پاڕانەوە گورج هەوا گۆڕا و هەور ڕووی ئاسمانی گرت و بارانێکی باش باری و دەرگای خۆشی لە ئادەمیزاد و گیانلەبەران کرایەوە.

براكان! بەندەی دەرگای خوا ئاوا دەبێ نەك وەكو ئێمە كە لەبەر گوناه لە گیانلەبەران كەمترین و ڕووڕەشی قاپی خواین و زۆر پێویستە هەموو بۆ بەدئەحواڵیی خۆمان بگرین و پەشیمان بینەوە و تەوبە بكەین. سا خوا دڵی ئەم برادەرانە نەرم بكا تا لەترسی خوادا بگرین و تەوبە بكەن.

دەگێڕنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەندەیێ دێنن بۆ حوزووری خوا و پێی دەڵێن: ئەو ئەمانەتەی لاتە بیدەرەوە. ئەویش دەڵێ: خوایا! مومكین نییە ئێستا من ئەو ئەمانەتە بدەمەوە؛ دنیا نەماوە و ئەمانەت نەماوە. جا خوا ئەمر بە مەئمووری دۆزەخ دەكا بیبەن بۆ دۆزەخ. ئەوەی ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە دەفەرموێ: حەزرەت (د.خ) لەپاش ئەم حەدیسە فەرمووی: نوێژ ئەمانەتە لە گەردەنی ئینساندا و، كێشانە ئەمانەتە و، پێوانە ئەمانەتە. مەبەستی ئەوەیە، خوایش زاناترە، كە ڕۆژوو ئەمانەتە، زەكات ئەمانەتە و هەرچی خوای گەورە فەرزی كردووە لەسەر عەبدی خۆی ئەمانەتە بەجێهێنانی ئەمانەتە و تەرككردنی خیانەتە و دەبێتە هۆی سزای ڕۆژی قیامەت.

حەزرەت (د.خ) فەرمووی بە كۆمەڵێ كە كێشانە و پێوانەی ڕزق و ڕۆزییان بەدەست بوو: بەڕاستی ئێوە كارێكتان پێ سپێرراوە كە گەلێ ئوممەتی لەمەوبەر تیایدا فەوتاون و تیاچوون. هەروەها ڕیوایەت كراوە كە قەومی شوعەیب (د.خ) بەهۆی خیانەت لە كێشانە و پێوانەدا خوای گەورە غەزەبی لێ گرتوون.

براكان! لەبەر گەورەیی و خۆشەویستیی حەزرەتی فەخری عالەم (د.خ) ئەم جۆرە سزایانە كە بۆ قەومە پێشووەكان بوون لەم ئوممەتە هەڵگیراون و سزایان خراوەتە ڕۆژی قیامەت و (وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَى) سزای ئوممەتە پێشووەكان ڕۆچوونی زەوی و هەورە تریشقە و گۆڕانی شێوەی بنیادەم بە شێوەی حەیوانات بوو.. جوان بیر بكەنەوە ئەو بەدڕەفتارییە كە بووەتە هۆی فەوتانی ئوممەتە پێشووەكان بۆ ئەوە ناشێ ئینسانی خاوەن ویژدان تەحەممولی بكا و ببێتە هۆی فەوتانی عالەمێ وەكو پشیلەی نەوتاوی كە ئاوەدانییەك بسووتێنێ ، ببێتە هۆی قاتوقڕی و بێ بارانی و پەشێویی وڵات و پەرێشانیی خەڵك و تەنگیی حاڵیان و ستەمی ستەمكاران.

لە مالیكی كوڕی دینارەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) وتوویە: دراوسێیەكم بوو كەوتە حاڵی گیانەڵڵا. منیش ڕۆیشتمە لای خەریك بووم كەلیمەی شەهادەتی پێ بڵێم ئەو دەستی كرد بە وتنی ئەم دوو كەلیمەیە (جبلین من نار). واتە: دوو كێوی ئاگر. دوو كێوی ئاگر. هەر

ئەم کەلیمەیەی دووبارە دەکردەوە. منیش پێم وت: (یا أبا الخیر) ئەوە چی دەڵێی؟ وتی: دوو عەیارم بوو بۆ پێوانی دەغڵودان، بەگەورەکەیان ڕزقم دەکڕی و بە بچووکەکەیان دەمفرۆشت. کە هەڵسام چاوم بەو دوو عەیارە کەوت ڕۆیشتم بیانشکێنم، کابرا هاواری کرد و وتی: ئەی مالیك دانیشە؛ هەرچی تۆ ئەو دوو کاسە دەدەی بەیەکا بۆ ئەوەی بیانشکێنی من ئازارم زۆرتر دەبێ ئیتر کابرا هەر ئەو دوو کەلیمەیەی دەوتەوە تا گیانی دەرچوو... هەر لەم بابەتەوە لە هەندێ پێشینانی دیندار دەگێڕنەوە وتوویە: ڕۆیشتم بۆ سەر نەخۆشێ کەلیمەی شەهادەتی بخەمە سەر زوبان، هەرچیم کرد و کۆشام نەهات بە زوبانیدا. لێم پرسی بۆچی ئەو کەلیمە بە زوبانتدا نایێ؟ وتی: میلی ترازووەکەم وا لەناو دەممدا زوبانمی لکاندووە بە مەڵاشوومەوە، ناتوانم ئەو کەلیمەیە بڵێم. پێم وت: تو خوا لە کێشانەدا کەمت نە دەکرد؟ سەنگی سووکت لە ترازووەکەتدا دانەدەنا؟ وتی: نەوەڵڵا، بەڵام لە کاتی کێشانەدا گوێم بە کەموکورتی نەدەدا. جا براکانم! تەماشا بکەن ئەمە حاڵی کەسێ بوو کە تەنیا گوێی بە کێشانەکە نەداوە ئەوەتە لەکاتی سەرەمەرگدا نەیتوانیوە شایەتومان بێنێ! وای بە حاڵی ئەو کەسە کە سەنگی سووك بۆ فرۆشتن دابنێ یا پێوانەی کەموکورت بەکاربێنێ و شتی سووك و کەم دەسەنقەست بە خەڵك بفرۆشێ، دەبێ ئەوە حاڵی چۆن بێ؟!

دەگێڕنەوە: یەکێ بوو کاتێ میوەی دەفرۆشت پاکی نەدەکردەوە لە خۆڵ و تۆز. کە مرد لە قەبرەکەیەوە هاوار و ناڵەی دەبیسترا تا هەندێ لە پیاوچاکان دوعایان بۆ کرد و لە خوا پاڕانەوە ئینجا ئەو ناڵە و هاوارە بڕایەوە. هەروەها دەگێڕنەوە کە حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، خوایان لێ ڕازی بێ، بەلای بازاڕی ئەهلی کێشانە و پێوانەدا ڕادەبوورد دەیفەرموو: براکان! خۆتان لە خیانەت بپارێزن؛ لە ڕۆژی قیامەتدا خائینەکانی کێشانە و پێوانە عارەقی شەرمەزارییان لێوە دەڕژێ بۆ داوێنەیان.

براکان! لە هەڕەشە ترساندنانەوە کە لە ئایەت و حەدیسەکانەوە دەردەکەون بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە کەمکردنی کێشانە و پێوانە لە کاتی فرۆشتندا گوناهی گەورەیە و بەتاوانێکی زل حیساب دەکرێ و خاوەنی ئەم خیانەتە ئەهلی عەزابە و لە لایەن خوای گەورەوە سزا دەدرێ، چونکە ئەم جۆرە کارانە بە غەش دادەنرێن و، حەزرەتیش (د.خ) فەرموویەتی: «من غش فلیس منا» واتە: هەر کەس ماڵی بفرۆشێ و عەیبی ماڵەکەی باس نەکا، یا دیوی دەری ماڵەکەی جوان بکا و عەیبەکەی بشارێتەوە، یا ئەو شتەی کە

دروستی دەکا مەحکەم و ساغ دروستی نەکا، یا ئەو شتەی کە دەیدووریّ باشی نەدووریّ، یا ئەو شتەی دێنێتە بازاڕەوە شتێکی بێگانەی تێکەڵ بکا، هەرماڵیّ و هەر رزقیّ بیّ، ئەوە بە خاوەن غەش دەناسریّ و حەزرەت (د.خ) تەبەڕای لیّ کردووە و بە ئینسانێکی وەهای نەژماردووە کە لەناو کۆڕی موسوڵمانانندا بیّ.

براکان! بەپێی ڕێوشوێنی ئاینی ئیسلام حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) بە پەنای تاوانبار و بە تکاکاری ڕۆژی قیامەت دەناسریّ؛ بۆیە زۆر جێگەی داخە بۆ موسڵمان کارێکی وا بکا لە موعامەلە و کڕین و فرۆشتندا وەزعێکی وەها جێبەجیّ بکا کە ئەو زاتە خاوەن پایەیە یەخەی لیّ هەڵتەکێنیّ و لێی تەبەڕا بیّ!

لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) ڕۆژیّ گەیشتووە بە یەکیّ هەندیّ شیری هەڵگرتووە، کاتیّ تەماشای شیرەکەی کرد تیّ گەیشت ئاوی تیّ کراوە؛ ئەویش پێی فەرموو حاڵی تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا چۆن دەبیّ؟ لەو کاتەدا زۆرت لیّ دەکەن ئەو ئاوە لە شیرەکەت جیابکەیتەوە. ئەم زۆرەیشی تەنیا لەبەرئەوە لیّ دەکەن کە لەناو ئەهلی مەحشەردا شەرمەزار بیّ، ئەگینا بەپێی فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) لە کارە چاکەکانی بەقەدەر تاوانەکەی دەدریّ بەو کەسانە کە شیرەکەیان لیّ کڕیوە.

هەر لەم بابەتەوە ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئاو مەکەنە ناو شیرەوە چونکە بەڕاستی یەکیّ لە ئەفرادی ئوممەتە پێشووەکان کە شەربەتی دەفرۆشت، هەر وەختیّ شەربەتی دەبرد بۆ ناوشار ئاوی تێکەڵ دەکرد. قەزاوقەدەر جاریّ سواری کەشتی بوو، لە دەریادا مەیموونێکی کڕیبوو، لەناکاو ئەو مەیموونە کیسەی پارەی خاوەنەکەی هەڵگرت و بەداری عەلەمی کەشتییەکەدا هەڵزنی تا گەیشتە سەری سەرەوە، لەوێوە دەستی کرد بە کیسە پارەکەدا درەمێکی فڕیّ دەدا بۆ ناو دەریا و درەمێکی فڕیّ دەدا بۆ ناو کەشتییەکە بۆ لای خاوەنەکەی و هەروەها... تا کیسە پارەکە تەواو بوو، نیوەی فڕیّ دایە دەریا و نیوەی بۆ لای خاوەنەکەی. دیارە کابرا ئەو پارەی لە فرۆشتنی شەربەتەکەوە پەیدا کردبوو. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: خوای گەورە جەزای ئەو خاوەن شەربەتەی وا دایەوە کە خستیە دڵی ئەو حەیوانەوە لەپێش چاوی عالەمدا ئەو پارەیە بەو جۆرە بکا بە دوو بەشەوە و بەشی خیانەتەکەی بهاوێتە دەریاوە تا خاوەن پارەکە و خەڵکەکەش بەم کارەساتە پەند و عیبرەت وەربگرن.

ڕیوایەت کراوە هەر کەسیّ ماڵێکی عەیبدار بفرۆشیّ و باسی عەیبەکەی نەکا ئەوە لە

غەزەبی خوای گەورەدا دەمێنێتەوە و مەلائیکەکان لەعنەتی لێ دەکەن. براکان! ئەگەر یەکێکی تریش غەیری ماڵفرۆشەکە بەو عەیبە بزانێ و بە کڕیارەکە نەڵێ، ئەوە ئەویش هاوبەشی گوناهی فرۆشیارەکەیە؛ چونکە ڕیوایەت کراوە: پێویستە موسڵمانان دۆستی یەکتر بن هەر چەند ماڵ و مەنزڵیشیان لە یەك دوور بێ. ڕیوایەت کراوە: «المؤمن غر کریم. والمنافق خب لئیم» واتە: موسڵمانی ساغ دڵساف و نیاز پاك و بەگوزەشت و لێبووردووە، بەڵام ئینسانی نابارى دووڕوو لەئیم و پەست و فێڵبازە. واتە: فڕوفێڵ و غەش و خیانەت نیشانەی مونافیقی و دانەمەزرانی ئیمانە، خوای گەورە پەنامان بدا.

براکان! ئەگەر کاربەدەستانی ئیمڕۆ تەفتیشی ئەهلی مامەڵەیان بکردایە ئەو وەختە غەش و خیانەتی خەڵك تەواو دەردەکەوت بەجۆرێ کە خاوەن ویژدانەکان نەفرەتیان لێ دەکردن و لێیان دوور دەکەوتنەوە.

بێگومان ئەم غەشکردنە لە مامەڵەدا بێجگە لەوە کە کردەوەیەکی ناشیرینە داگیرکردنی ماڵی خەڵکیشە. خوا خۆی فەرموویەتی: «يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ». واتە: ئەی موسولْمانینە! لەناو خۆتاندا ماڵی یەکتر بە ناحەق و ناشەرعی مەخۆن، بەڵێ ڕەوایە بە یاسای مامەڵە و بازرگانی و ڕەزامەندیی هەموو لایێ لەناو خۆتاندا ئاڵوگۆڕ بکەن و قازانج لە ماڵی یەکتر وەربگرن. شتێکی دیارە لە هەر شوێنێکدا یەکێ لە مامەڵەچییەکان فڕوفێڵ و غەش و خیانەتی لەوی تر کرد، کاتێ ئەم پێی زانی، بەو مامەڵە ڕازی نابێ و ماڵی خۆی لە هاومامەڵەکەی وەردەگرێتەوە. ئەو جۆرە فڕوفێڵ و غەش و دەسبڕینە کە لە هەندێ بازرگان و وردەفرۆش و خومچی و جۆلا و کەوشدروو و چەرچی و جانباز و هەندێ پیشەسازی ترەوە پەیدا دەبێ، عەقڵ و فام سەرگەردان دەکا، ئەو جۆرە فڕوفێڵ و غەشکردنە خیانەت و نامەردی و بێ ناموسی و ناپیاوییە، کابرای خاوەن ئیحتیاج کە دێ بۆ لای ئەمانە ناشارەزایە و مامەڵە نازانێ و پەنا دەهێنێ و ئەم شەخسە بە ئەمین دەدانێ؛ زۆر ناشیرینە و مایەی ئەسەفە ئەم بەو جۆرە نائەمینیی لەگەڵ بکا و بە نادڵسۆزی لەگەڵیدا بجوولێتەوە. ئایا نازانێ کە خوای گەورە بە ڕاسەریانەوەیە و بەدیار و نادیاریان دەزانێ و لە ئەنجامدا تۆڵە لە تاوانبار دەسێنێتەوە؟.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: دین بریتییە لە دڵسۆزی. عەرزیان کرد: دڵسوزی لەگەڵ کێدا؟ فەرمووی: یەکەم، لەگەڵ خوادا، واتە موسڵمان هەر کارێکی کرد

هەر بۆ خوای بکا و بزانێ کە خوا چاوی لێیە. دووەم، لەگەڵ کەلامی خوادا کە قورئانی پیرۆزە، واتە موسڵمان باوەڕی وابێ ئەو قورئانە فەرموودەی خوایە و هەرچی تیایە هەمووی ڕاستە و ڕەفتارکردن بەدەستووری ئەو هۆی پیرۆزی و بەختیارییە. سێیەم، لەگەڵ پێغەمبەراندا، واتە موسڵمان باوەڕی وابێ کە پێغەمبەرانی خوای گەورە ڕابەری ڕاستن و پیاوی ساغ و سالم شارەزای ڕێگەی حەقن و، خەڵکی بە شارێگەی بەختیاریی نەبڕاوەدا دەبەن. چوارەم، لەگەڵ کاربەدەستانی دادپەروەر و فەرمانداارانی پاك نیاز و چاك ڕەفتارا، واتە ئینسانی موسڵمان پێویستە کۆمەکیان بکا و یارمەتییان بدا بۆ بڵاو کردنەوەی داد لە جیهاندا و مەنعی فیتنەیان لێ بکا و دوعای خێریان بۆ بکا و، ئەگەر لە ڕێگای ڕاست لایان دا بیانخاتەوە سەری. پێنجەم، لەگەڵ هەموو موسڵمانانندا چونکە هەموو برای یەکترن.

براکان! ئەو کەسانەی کە خاوەنی نیفاق و دووڕوویی و غەش و حیلەن لە بیروباوەڕیانا یا لە کردار و ڕەفتاریانا ئەوانە لەوە دەچن کە فێڵ لە خوا بکەن و شتێکی زۆر دیارییە کە هیچ کەس ناتوانێ لەم بابەتەدا بە ئەنجامێکی باش بگا چونکە خوای گەورە دوورە لەوەی کە بە کەس فریب بدرێ! خوا دەفەرموێ: «وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ اللّهُ وَاللّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ» واتە: ئەوان فڕوفێڵیان لەگەڵ خوادا کرد. خودایش تۆڵەی فڕوفێڵەکەی پیشان دان، خوا چاکترین تۆڵەسێنە.

هەروەها دەفەرموێ: «إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ» واتە: دەیانەوێ بەفێڵ خوا فریو بدەن، خوای گەورە زانایە بە هەموو شت و توانایە بەسەر هەموو شتێکدا و بە کەس فریو نادرێ. خوای گەورە لەسەر ئەو کردارە ناهەموارە جەزایان دەداتەوە. ئەو کەسانەی بەو جۆرە فێڵبازی دەکەن، خۆیان دەخەڵەتێنن و شەیتان تەفرەی داون و لە ئەنجامدا گیرۆدەی سزا و قەهری خوای گەورە دەبن. لە لایەکی تریشەوە ئەم کردەوە نابارە ناپەسەندانە، نیشانەی تێکچوون و خراپ بوونی زەمانەیە و نیشانەی ئەوەیە کە ڕۆژی قیامەت نزیکە و خەڵکەکە تووشی سزا دەبن. بێجگە لەمە ئەو کردەوە خراپانە دەبنە هۆی ئەوە کە پیت و بەرەکەت لەسەر زەوی و لە ڕزق و ڕۆزی هەڵگیرێ و کشتوکاڵ و باغ و بێستان کەم بەر بن. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: قاتوقڕی هەر لە بێ بارانییەوە نابێ، بەڵکو پیت و بەرەکەت لەسەر زەوی هەڵدەگیرێ، واتە هەر چەند باران ببارێ بەپیت و بەرەکەتەوە نابارێ. دیارە ئەسبابی ئەمانە هەموو گوناهباری و تاوانکاریی خەڵکی سەر زەوییە، بەددڵی و بەدگومانی و کەم ئیمانی و کەم میهرەبانیی ئادەمیزادە لەگەڵ خوادا

و لەگەڵ دراوسێ و خزم و خۆیش و ڕەعیەت و مسکێن و فەرمانڕەوادا. هەر گوناهە دەبێتە هۆی ئەوە کە ستەمکار زاڵ ببێ بەسەر مسکێن و کاسبکاری شار و بازاڕ و لادێدا. مایەی نەگبەتییە خەڵك بە پارووی حەرام بژین. ڕیوایەت کراوە: هەر کەس پارووییەکی حەرام بهاوێتە سکیەوە، ئەوە تاعەت و عیبادەتی چل ڕۆژی لێ وەرناگیرێ، واتە: ئەو پیرۆزییە کە لە تاعەتەوە دەست دەکەوێ بەهۆی یەك پارووی حەرامەوە لەکیس دەچێ!. هەروەها هەر بەندەیێ لە خۆراکی حەرامەوە گۆشت بگرێ و بەحەرام بژی ئەوە ئاگری دۆزەخی بۆ باشترە لەو گۆشتەی گرتوویەتی.

زووتری سەنعەتکاران گیرۆدەی وتوویرەی شەیتان بوون و دەڵێن: ئەگەر کاری ساغ و باش بکەین لە چی نان بخۆین و چۆن بژین؟ نازانن هۆی ژیانی پڕ لە بەختیاری تەنیا ساغی و بێ غەلوغەشییە! نازانن چەندێ لەو ناساغی و غەلوغەشەوە قازانج دەکەن چەند قاتی ئەوە لە پیتوبەرەکەتی ماڵ و داراییان با دەیبا و لەکیسیان دەچێ و لای خوای گەورە نرخیان نامێنێ و لای خەڵکیش سووك دەبن. بەڵکو ئیتر خەڵك کەم هاتوچۆیان دەکەن، بێجگە لەوە کە غەش لە پیشەدا هۆی سزای قیامەت و شەرمەزارییە لەناو ئەهلی قیامەتدا. سەرەڕای ئەمانە بەراورد کراوە هەر کەس بە ساختەکاری، دارایی و سامان بەیەکەوە بنێ، خوای گەورە ڕۆژێ لە ڕۆژان بە سەرفکردن لە کارەساتی ناهەموارا یا بە ستەمی ستەمکارانی زۆردار ئەو ماڵەی دەفەوتێنێ.

براکان! فەرموودەی حەزرەتە: خوای گەورە سامانی دنیا بە پیاوی باش و خراپ بە خۆشەویست و ناخۆشەویست دەدا، بەڵام دین تەنیا بەو کەسانە دەدا کە خۆشیانی دەوێ.

براکان! ئامان سەد ئامان هەرگیز نەڵێن: ئەی ئەوە بۆچی فلان کەس هەر حەرام دەخوا و تەرکی نوێژ دەکا کەچی هەمیشە سامان و دارایی هەر زۆر دەبێ؛ چونکە ئەم دارایی و سامانە ئیستیدراجە و هۆی گومراهییە. ڕیوایەت کراوە: «أذا رأیتم اللّه– عز وجل– یعطي العبد من الدنیا وما یحبه فأنما هو أستدراج. ثم تلا رسول اللّه (ص) فلما نسوا ما ذکروا به فتحنا علیهم أبواب کل شيء حتی أذا فرحوا بما أوتوا أخذناهم بغتة فأذا هم مبلسون». واتە: کاتێ کە کاربەدەستان نەسیحەت و ئامۆژگاریی زانایانی ئاینیان لەبیر چووەوە، لە ماوەیەکدا دەرگای هەموو خێراتمان لێ کردنەوە. جا کە بەو دارایی و سامانە شادمان بوون، لەناکاودا بەهۆی ئەو نافەرمانی و سەرکەشییەوە گرتنمان و، بۆیان دەرکەوت کە بێ بەش و ناهومێد و خەفەتبارن.

براکان! ئەگەر بەڕاستی بڕوانین حاڵی دەبین کەوا ئێمە هەمیشە بۆ فەوتان و زیانی خۆمان هەوڵ دەدەین و ئەوەی مایەی ڕزگاری بێ نایکەین.

ڕیوایەت کراوە لە ڕۆژی قیامەتدا هەندێ کەس دێنن بۆ مەیدانی حیساب و لێپرسینەوە کە هەریەکێ بەقەدەر کێوێ لە کێوەکانی مەککە خێرات و چاکەیان هەیە. کە دەست دەکرێ بە کێشانەی کرداریان خوای گەورە هەموو چاکەکانیان چز دەکا و هیچ پاداشیان نامێنێ و ڕەوانە دەکرێن. لەوێدا هاوڕێیکانی حەزرەت (د.خ) عەرزیان کرد: ئەو کەسانە ئەم هەموو زەحمەتەیان لەبەر چی بەسەردا دێ؟ فەرمووی: لەسەر ئەوە کە لە دنیادا خۆیان لە بێ شەرعی نەپاراستووە و حەرامیان خواردووە و لەگەڵ خەڵکدا لە مامەڵەدا غەش و خیانەتیان کردووە؛ ئیتر کردەوە باشەکانی خۆیان بەهۆی ئەو ڕەفتارە خراپانەوە زایە کردووە. جا زۆر پێویستە ئینسان ژیر بێ و مادام خوا بۆ کردەوەی باش تەوفیقی داوە، سوپاسی بکا و، بەهۆی غەش و خیانەتەوە ئەو کردەوە چاکانەی خۆی پایەماڵ نەکا.

ئەم گوناهانە کە لەم نامانەدا بۆ ئێوەم نووسیون شوومی و نەگبەتییان ئەوەندە زۆرە دەگاتە ڕۆڵە و ڕۆڵەزا تا حەوت بەرە، وەکو هەندێ لە زانایان لە تەفسیری ئایەتی «وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُواْ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافاً خَافُواْ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللّهَ وَلْيَقُولُواْ قَوْلاً سَدِيداً» دا فەرموویانە و ڕۆشنیان کردووەتەوە.

جا هەر وەکو ئامۆژگاریی موسڵمانانمان کرد بۆ خۆپاراستن لە غەلوغەش و ساختەکاری پێویستە باسی نرخ و قیمەتی ڕاستی و ساغیی ئەوانەش بکەین کە بە شێوەی موسڵمانانە لەگەڵ خەڵکدا مامەڵە دەکەن هەتا ئینسانە بەدڕەفتارەکان تۆبە بکەن و چاك ڕەفتارەکانیش سوپاسی خوا بەجێ بێنن لەسەر ئەو نیعمەتە کە بە گوناهی خیانەت کردن لە کێشانە و پێوانەدا گیرۆدە نەبوون.

ڕیوایەت کراوە کۆمەڵی مامەڵەرکارەکان لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوەیان کە غەشیان کردووە، لە ڕیزی (فجار)ا ڕادەوەستن. ئەوانەش کە لە مامەڵەدا بێ غەش بوون بەخۆشی لە ڕیزی ڕاستگۆیاندا حەشریان دەکرێ. هەروەها ڕیوایەت کراوە کە درۆکردن بەرەکەتی مامەڵە هەڵدەگرێ و ئینسانە درۆکەرەکە دەباتە ڕیزی هەرە درۆزنەکانەوە.

براکان! ئەهلی مامەڵە دوو بەشن، یەکەم ئەوانەن کە لە هەرچی گوناهـ بێ لە مامەڵەدا پارێز دەکەن، وەك سوود خواردن و فڕوفێڵ و درۆکردن و سوێندی ناحەق خواردن، تێ

دەكۆشن مامەڵەكەيان بە شەرعی بێ و حەقی خەڵكیان نەكەوێتە سەر، لە ڕۆژ و وادەی خۆشیدا (حق اللّه) لە ماڵەكەیان دەردەكەن. ئەم بەشە لەگەڵ پێغەمبەران و شەهیدان و پیاوچاكاندا حەشر دەكرێن. بەشی دووەم كە پێچەوانەی بەشی یەكەم ڕەفتار دەكەن لە ڕیزی فاجیرەكاندا حەشر دەكرێن و هەرچی هەڕەشە لە ئایەت و حەدیسا دەرحەق بە فاجیر وارید بووە، دەیانگرێتەوە پەنا بە خوا.

ڕیوایەت كراوە: «أحب اللّه عبداً سمحاً أذا باع، سمحاً أذا أشترى، سمحاً أذا أقتضى» واتە: خوای گەورە بەندەیەكی خۆش دەوێ كە سالم و نەرم و لێبووردوو بێ، واتە: دڵڕووناك و زمان پاك و ڕووخۆش و ڕاستگۆ بێ و زۆر لەسەر شتی پڕوپووچ نەڕوا و ئەم سیفەتانەی لە كاتی ماڵفرۆشتن و ماڵكڕین و داواكردنی قەرزا هەبێ. ئەو كەسانەی ئەم سیفەتانەیان هەیە خوای گەورە لێیان ڕازی دەبێ و لای بەندەی خوایش خۆشەویست دەبن كاسبییەكەشیان پیتوبەرەكەتی تێ دەكەوێ.

براكان! تكاتان لێ دەكەم ئەگەر دڵتان لەسەر ئەوە نییە كە بەم نامەیە ڕەفتار بكەن لای كەمی جارێ گوێ ڕابگرن تا خوێندەوارێ بۆتان بخوێنێتەوە؛ فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ): لە گەورەترین خووڕەوشتی موسڵمان ئەوەیە هەرگیز لە بیستنی خێری ئاینی تێر نابێ. (والسلام على من أتبع الهدى).

لە ٢٧ی ڕەجەبی ١٣٩٦ی ك، ڕێكەوتی ٢٤-٧-١٩٧٦ ی ز دا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی سی و شەشەم

# باسی سوێندی درۆ خواردنە

بسم اللّه الرحمن الرحيم

بسم اللّه، والحمد للّه والصلاة والسلام على رسول اللّه، وعلى آله وأصحابه واتباعه المحسنين إلى يوم الدين.

پاش ئەمە، براکان! هەر گوناهێ لە گوناهە گەورەکان کە لەم ڕۆژەدا خەڵك پێیانەوە گیرۆدە بوون لە نامەیەکی سەربەخۆدا عەرزم کردوون. ئەم نامەیش کە ئێستا پێشکەشتانی دەکەم لەو چاکترین دیارییانەیە کە دۆست بۆ دۆستی بنێرێ. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «ما أهدى مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده اللّه بها هدى أو يرده عن ردى». واتە: هەرگیز موسڵمان دیارییەکی وای نەناردووە بۆ برای موسڵمانی چاکتر بێ لە قسەیەکی پڕ حیکمەت کە بێتە هۆی ئەوەی خوا شارەزاییی ئاینی ئەو برایە زیاد بکا یا لە ماڵوێرانی ڕزگاری بکا. بەڕاستی نامەکانی دڵسۆزتان لە گەورەترین نامەکانی سەر زەوین لەوانە کە ئینسان دڵخۆش بێ پێیان، بەتایبەتی ئەم نامەیە کە باسی دوورکەوتنەوەتانە لە گوناهە گەورەکان. من کە ئەم نامە بۆ ئێوە دەنێرم و باسی گوناهە گەورەکان دەکەم تێدا، دەمەوێ لێیان دوور بکەونەوە. من لەبەر دڵسۆزی و خۆشەویستی ئامۆژگاریتان دەکەم نەك لەڕووی کینەوڕقەوە. من وەك برای دڵسۆزی ئێوەم و پێویستە ئێوە ئەم ئامۆژگارییانەی منتان پێ خۆش بێ، چونکە لە گوناهی گەورە ئاگادارتان دەکاتەوە. حەزرەتی عومەر (ر.خ) فەرموویەتی «رحم اللّه أمرء أهدى إلى عيوبي» واتە: خوا ڕەحم بەو کەسە بکا کە عەیبەکانم بە شێوەی دیاری بۆ دەنێرێ واتە: ئاگادارم دەکا لێیان. پاش ئەم قسەیش دەیفەرموو: بەڵام ئەم جۆرە دۆستانە زۆر نایابن و بەدەگمەن دەست دەکەون. براکانم! زۆر چاك بزانن من یەکێ لەو دۆستانەم بەزەحمەت دەگەڕێم و باسی ئەو گوناهانە لە کتێبی دین وەردەگرم و بۆتانی ڕەوانە دەکەم. زۆر تکاتان لێ دەکەم ئەم دیارییەی برای خۆتان وەرگرن.

یەکێ لەو گوناهە گەورانە سوێندی درۆ خواردنە بۆ ئەوە کە ماڵی خەڵك بە ناحەق بخۆن چ ماڵی موسڵمان و چ ماڵی زیممی، چ بەبێ هوودە و بێ سوود، ئەو سوێندە بخوا یا بەهەر مەبەستێ بێ سوێندی درۆ بخوا. جا بۆ ئامۆژگاریی ئێوە لەم بابەتە چەند ئایەت و حەدیسێکتان بۆ دەنووسم. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: «إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَناً قَلِيلاً أُوْلَـئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ».

واتە: ئەو کەسانەی بەهۆی سوێند خواردنەوە بەدرۆ قیمەتێکی کەم و بێ بایەخ وەردەگرن، لە خێر و پاداشتی چاکی ڕۆژی قیامەت بێ بەشن و لە خۆشی و بەرەکەتی ئەو ڕۆژە ناهومێد دەبن و، خوای گەورە نایاندوێنێ و بۆیان ناڕوانێ و پاکیان ناکاتەوە، بێجگە لەمانەش سزای سەخت و ناهەمواریان دەدرێ لە ڕۆژی قیامەتدا.

ڕیوایەت کراوە جارێ دوو کەس لەسەر شتێ بوو بە هەرایان. کابرای داوالێکراو ئینکاری حەقەکەی کرد و نیازی بوو سوێند بخوا، جا ئەم ئایەتە نازڵ بوو.

لەم ئایەتەدا پێنج هەڕەشە لەو جۆرە کەسانە کراوە. یەکەم، بێ بەش دەبن لە قیامەتا. دووەم، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا قسەیان لەگەڵ ناکا. سێیەم، بە میهرەبانی بۆیان ناڕوانێ. چوارەم، خوای گەورە تەزکیەیان ناکا و لەو گوناهانەی کە کردوویات نایانبوورێ و پاکیان ناکاتەوە. پێنجەم سەرەڕای ئەمانەش لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەسکی ناباریان هەیە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەس سوێندی درۆ بخوا بۆ ئەوە ماڵی موسڵمانان بخوا، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا غەزەبی لێ دەگرێ.

لە ڕیوایەتێکی تردا: ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا (أجذم)ە، واتە: بێ خێر و پاداش و چاکەیە. یا واتە: لەو کاتەدا حەشر دەکرێ خوا گولی دەکا و لەشی پارچە پارچە دادەڕزێ. یا واتە: زمانی دەبڕدرێ چونکە لە دنیا سوێندی درۆی خواردووە. ئەم سێ مانایە بۆ (أجذم) بەیان کراوە.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: بەو خوایە کە گیانی لەناو مشتی توانای ئەوایە هەر کەس سوێندی درۆ بخوا خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ کە تا ڕۆژی قیامەت لاناچێ. هەروەها ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ سوێندی درۆ بخوا و بیکاتە هۆی

وەرگرتنی ماڵی حەرام ئەوە بەهەشت لە خۆی حەرام دەکا و مادام خوا عەفووی نەکا، موستەحەقی ئاگری دۆزەخ دەبێ. عەرزیان کرد: با ئەم ماڵەش کەم بێ؟ فەرمووی: با ئەو ماڵەش بەقەدەر قەیتانی سۆلی ئینسان بێ، تا بەو گوناهە نەسووتێ و حەقی ئەو سوێندەی لێ نەسەنرێ ناچێتە بەهەشتەوە. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ «..فلیتبوأ مقعده من النار» واتە: با جێگای خۆی لە دۆزەخدا بگرێ. بێجگە لەمانە سوێند بەدرۆ خواردن پیتوبەرەکەتی دارایی ناهێڵێ، چونکە فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) «الیمین الفاجرة منفقة للسلعة ممحقة للکسب» واتە: سوێندی درۆ ماڵ دەخاتە ڕەواجەوە، بەڵام کاسبی خاوەنەکەی بێ پیت دەکا. شێخ عەبدولوەهابی شەعرانی دەگێڕێتەوە دەڵێ: دۆستێکم بوو بازرگان بوو، پاشان نابووت کەوت. لێم پرسی: تۆ داراییکی زۆرت هەبوو، بۆچی پیتی پێوە نەما؟ وتی: لەبەرئەوە کە بەزیاد دەمفرۆشت بەجۆرێ کە کڕیار سوودی لێ دەست نەکەوێت!. جا شێخی شەعرانی پاش ئەوە ئامۆژگاریی برادەرەکانی دەکرد و دەیفەرموو: لەگەڵ موسوڵمانانادا غەش مەکەن، ئەگەر نا خوا نیعمەتەکەی خۆتان لێ دەسێنێتەوە.

خوای گەورە فورموویەتی: «وَلاَ تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصْلِحُواْ بَيْنَ النَّاسِ». زانایان بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە دوو تەفسیریان بەیان کردووە، یەکەم: ئەوەیە کە سوێند بە خوا خواردن مەکەن بە مانیع و کۆسپ لە ڕێی چاکە لەگەڵ خەڵکدا کردن و لە خوا ترسان و چاك کردنی بەینی موسوڵمانانادا. واتە: هەر کاتێ کارێکی خێر هەڵکەوت بیکەن و سوێند مەخۆن لەسەر نەکردنی. دووەم: ئەوەیە ناوی پیرۆزی خوای گەورە مەکەنە بنێشتە خۆشەی دەمتان کە هەموو کات سوێند بەدەمتاندا بێت و نرخی ئەو ناوە گەورەتان لە دڵدا نەمێنێ. دیارە ئینسان کە حاڵی وای لێ هات ناتوانێ ئیشی چاك بکا چونکە لەناو خەڵکا سووك دەبێ و باوەڕی پێ ناکرێ و ئیشی پیاوانەی بۆ هەڵناسووڕێ. حیکمەتی نەهیکردنی خوای گەورە لە سوێند خواردن ئەوەیە، ئەگەر کەسێ زمانی فێربوو بە سوێند خواردنی زۆر، ئیتر حورمەتی سوێندی لا نامێنێ و سوێندی درۆ دەخوا و دەکەوێتە ناو نەگبەتییەوە. هەر لەبەر ئەمەیە پێشینان فەرموویانە: «سوێند نەبە درۆ و نە بە ڕاست».

ڕیوایەت کراوە: ئەو سوێندەی لەسەر بێ گوێیی ئەمری خوا بخورێ، بە سوێند حسێب ناکرێ، واتە: ئەگەر کەسێ سوێند بخوا و بڵێ: (واللە) سیلەی ڕەحمی فلان بەجێ ناهێنم یاخۆ فلان چاکەی واجیب ناکەم، واجیبە ئەو سوێندە بشکێنێ و کەفارەتی سوێندەکە بدا،

چونکە هیچ شتێ نییە بەقەدەر سیلەی ڕەحم خوا زوو جەزای چاکەی ئینسانی لەسەر بداتەوە. هەروەها ڕیوایەت کراوە سوێندی درۆ چەند خانووی تێك دا و چەند خانەدانی بەرباد کرد و چەند خێزانی بێ نەتەوە و وەچاغ کوێر و گیرۆدەی زیان کرد!

براکان! لە فەرموودەی پێغەمبەردا (د.خ) سوێندی درۆ بە یەمینی غەمووس ناوبراوە، واتە: ئەو سوێندەی کە خاوەنەکەی دەباتە خوارەوە بە ناخی گوناهـ و تاواندا. تەنانەت هەندێ لە زانایانی ئاین فەرموویانە: سوێند خواردنی زۆر، با بە ڕاستیش بێ، ئینسان فاسق دەکا، چونکە بناغەی سوێندی زۆر لەسەر بێ موبالاتییە بە ئاین.

ڕیوایەت کراوە: لە ڕووداوێکدا جوبەیر (ر.خ) هەزار درەمی دا و سوێندی نەخوارد. پاشان فەرمووی: ئەگەر سوێندیشم بخواردایە بەڕاستم دەخوارد، بەڵام با ئەم هەزار درەمە کەفارەتی ئەوە بێ، واتە: هەزار درەمەکەم لەباتی سوێندە ڕاستەکەم.

ڕیوایەت کراوە: ئەشعەسی کوڕی قەیس (ر.خ) حەفتا هەزار درەمی دا بە فیدیەی یەك سوێندا، واتە سوێندێکی خوارد و لە کەفارەتیدا ئەو ئەندازە پارەیەی دا بە فەقیر و هەژاران. جا وا دەرکەوت وانەکەی پێشینان «سوێند نە بەدرۆ و نە بە ڕاست» بناغەکەی نرخ دانانە بۆ خوای گەورە.

بزانن سوێند خواردن بە غەیری زاتی خوا و سیفەتەکانی خوا، وەکو پێغەمبەران و مەلائیکە و کەعبەی پیرۆز لای هەندێ لە زانایان مەکرووهە و لای هەندێ حەرامە. بەڵێ حەرامە قازیی شەرع سوێندی خەڵك بدا بە تەڵاق. هەروەها حەرامە زۆردار سوێندی خەڵك بدا بە تەڵاق؛ چونکە تەڵاق بۆ ئەوە ناشێ سوێندی پێ بخورێ. بێجگە لەوە زۆر جار وا دەبێ کابرای تەڵاقخۆر تەڵاقەکەی دەکەوێ و هەردووکیان واتە زۆردار و سوێندخۆر، تووشی گوناهـ دەبن. بەڵام زانای گەورە ماوەردی فەرموویەتی: هەر کەسێ سوێند بە غەیری خوا و سیفەتەکانی خوا بخوا و باوەڕی وابێ ئەوانە وەك ناوی خوای گەورە سوێندیان پێ دەخورێ ئەوە کافر دەبێ.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (د.خ) فەرموویەتی: شەریك بۆ خوا دانان سێ بەشە، یەکەم عیبادەت کردن بۆ غەیری خوای گەورە. دووەم سوێند خواردن بە غەیری خوا. سێیەم حەیوان سەربڕین بۆ غەیری خوا.

هەروەها سوێند خواردن بە باوك و باپیرە و بە گۆڕی کەسێ یا بە ژینی کەسێ یا بە

گەورەیی یا بە نیعمەتی پاشایی، ئەمە ئەگەر لەبەر زمان فێربوون و بەدەمدا هاتنی بێ مەبەس بێ یا هیچ نییە یا مەکرووهە. خۆ ئەگەر لەسەر ئیعتیباری بە گەورە گرتنی ئەوانە بێ، ئەوە ڕاجیح وایە کە حەرامە و مەرجووح وایە کە مەکرووهە.

ئەمەی لەم بابەدا عەرزم کردن بەسە بۆ ئەو کەسانە کە ڕەحم بە حاڵی خۆیان دەکەن.

لە ٢ی شەعبانی ١٣٩٦ی ك، ڕێکەوتی ٢٩-٧-١٩٧٦ی زدا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی سی و حەوتەم

# باسی ڕەشبەڵەکە

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمد للّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه، وعلى آله وصحبه وأتباعه بأحسان إلى يوم الدين.

لە پاش ئەمانە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «ما أهدى مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده اللّه بها هدى أو يرده عن ردى».

براکان! ئەم نامەیە کە من ڕەوانەی دەکەم بۆ خزمەتی ئێوە گەورەترین دیارییە کە دۆست بۆ دۆستی خۆی ڕەوانە بکا، چونکە دەبێتە هۆی زیادیی نیعمەت و بەرەکەتی خوای گەورە، هەروەها دەبێتە مایەی پاراستن لە سزا و تۆڵەی ڕۆژی قیامەت.

براکان! ئەگەر گوێ نەدەن بە خوێندنەوەی ئەم نامەی منە، ئەوە خوانەخواستە دەبێتە دەلیل لەسەر بەدئەحواڵیی خۆتان؛ چونکە یەکێ لە گەورەترین ئەخلاقی موسڵمانان ئەوەیە کە لە بیستنی ئەم ئامۆژگاریی خێر تێر نەبێ. جا ئەگەر وابوو ئەوە موسوڵمانی باشە و ئەگەر وانەبوو ئەوە دینەکەی کەموکووڕە.

براکان! من بۆ ئەوە ئامۆژگاریتان دەکەم کە تەرکی گوناه بکەن بە تایبەتی گوناهی گەورە و بە تایبەتی تریش ئەو گوناهەی کە لە هەموو گوناهەکانی تر ناشیرینتر و ناهەموارترە و بیدعەتێکی زۆر ناپەسەندە کە بریتییە لە ڕەشبەڵەك.

ئەم ڕەشبەڵەکە ئەوەیە کە هەندێ کەسی نامەردی بە شێوە مەرد لەگەڵ هەندێ ژن و کچی خووڕەوشت پەستدا پێکەوە دەست دەگرن و هەڵدەپەڕن و ڕەقس و سەما دەکەن. ئەم گوناهە گوناهێکی ئەوەندە سووکە، ئینسانێ کە سەربەرزی و کەرامەت و شەرەف لە وجوودیا ببێ نایکا. ئەم تەبیعەتە تەبیعەتی حەیواناتی بێ زانست و شعوورە و، بۆ شعووری ئینسانێ کە غیرەت و نامووس لە گیانیدا هەبێ دەست نادا، ژن و خوشکی خۆی

ببینێ لەگەڵ پیاوێکی نامەحرەمی خاوەن هەوا و هەوەسدا تەنیشت بە تەنیشت و شان بەشان هەڵپەڕێ و قەرەباڵغێکی گەورەش بەدەوریاندا تەماشایان بکەن. کەسێ حەمییەت و غیرەتی ئیسلامییەتی ببێ، ئەم هەتك و بێ نامووسییە قبووڵ ناکا.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا پێنج ئایەتی دەربارەی ئەمر بە حیجاب و خۆداپۆشین و حورمەت ڕاگرتن نازڵ کردووە و، مەنعی ژن و پیاوی کردووە لەوە کە خۆیان و زینەتی خۆیان و لەشی خۆیان دەربخەن یەکەم: ئەم ئایەتەیە «قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ» واتە: ئەی پێغەمبەری ڕەهبەر! فەرمان بدە بە پیاوە موسوڵمانەکان کە چاوی خۆیان بنووقێنن و مەنعی بکەن لە ڕوانین بۆ ژنی نامەحرەم و عەورەتی خۆیان بپارێزن لە بەکارهێنانی لەگەڵ نامەحرەمدا بەهەر جۆرێ ببێ. دووەم ئەم ئایەتەیە «وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ....» واتە: هەم ئەمر بکە ئەی پێغەمبەری خوا بە ژنە موسڵمانەکان، چاوی خۆیان بنووقێنن لە تەماشاکردنی پیاوانی نامەحرەم، هەر کەس بن و هەر شوێنێکیان ببێ و لە تەماشا کردنی ئەو شوێنانە کە ڕەوا نییە تەماشایان بکەن لە لەشی ژنان و، عەورەتی خۆیان بەرودوای بپارێزن لە کاری نارەوا و، زینەت و جوانیی خۆیان وەکو گەردەن بەند و لاسەرە و پاش قەیتان لە بۆ نامەحرەم دەرنەخەن، مەگەر ئەو شتانەیان کە بەناچاری وان بەدەرەوە وەکو ئەنگووسیلە و هەندێ بەرگ کە بەناچاری دەردەکەون. ئەمەش بەوە دەبێ کە ئافرەت سەرپۆش بدا بەسەریدا و ئەو خشڵانە داپۆشێ و، هەروەها فەرمانیان پێ بدە با چارشێو بدەن بە بەرۆکیاندا تا سنگ و مەمك و گەردەنیان دەرنەکەوێ و، هەرگیز زینەتی خۆیان دەرنەخەن و مەگەر بۆ مەحرەمیان وەك شوو و کوڕ و باوك و مەحرەمەکانی تریان.

دیارە هەروەکو دەرخستنی زینەتی جوانی ژنانە حەرامە، لەسەر ژنان لەسەر پیاوانیش حەرامە بۆی بڕوانن. لەمە عەجایەبتر ئەوەیە ئەو مووی سەری ژنە کە لەپێش مارەکردنیان بڕیویەتی و فڕێی داوە دروست نییە بۆ مێردەکەی لەپاش مارەبڕین تەماشای بکا؛ چونکە لەو کاتەدا کە ژنەکە بڕیویەتی مووی ژنێکی نامەحرەم بووە، بەم پیاوە. هەروەها لەپاش تەڵاقدانی ژن تەماشا کردنی ئەو مووی سەرەی کە لە پێش تەڵاقدا بڕیویەتی بۆ پیاوە تەڵاقدەرەکە حەرامە؛ چونکە هەرچەند لە وەختی خۆیدا تەماشاکردنی حەڵاڵ بووە، بەڵام پاش تەڵاقدانی حەرامە، تەماشای بکا. لەمە سەیرتریش ئەوەیە، هەندێ حەمامچی کردوویانە بە عادەت مووی بڕاوی قژی ژن دەهۆننەوە و دەیکەن بە

شریت، تەماشاکردنی ئەو شریتانەش حەرامە. لەمەش سەیرتر ئەوەیە کە تەماشاکردنی پیاو بۆ خوشك و دایك و کچی خۆی بە ئارەزووی نەفسەوە حەرامە.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە خاوەن دەستەلاتەکان ئەم کارە ناشیرینانە دەبینن و مەنعیان ناکەن. «وقال بعض الفقهاء: أن خفي المرأة من العورة» واتە: تەماشاکردنی کەمترین و بێ نرخترین پۆشاکی ئافرەت، کە خوففەکەیەتی، حەرامە، چ جایێ جوانترین و دڵکێشترین جلوبەرگ، وەك گەردانە و لاسەرە و هەوری سەریان.

باسی خراپی و ناشیرینی و ناهەمواریی زیناکردن، پەنا بە خوا، لە نامەی زینادا بەدرێژی باسم کردووە.

لە حەدیسا هەیە: «النظر سهم مسموم من سهام أبليس فمن تركه خوفاً من اللّه تعالى آتاه اللّه أيماناً يجد حلاوته في قلبه» واتە: تەماشاکردنی ژنی نامەحرەم و پیاوی نامەحرەم، تیرێکی ژەهراوییە لە تیرەکانی شەیتان لەعنەتی خوای لێ بێ. جا ئەگەر کەسێ لەبەر ڕەزامەندیی خوا و لەترسی سزای خوا تەرکی بکا، ئەوا خوای گەورە نووری ئیمان بەجۆرێ دەخاتە ناو دڵیەوە کە لەزەت و شیرینی لە دڵی خۆیدا هەست پێ دەکا. ئەم فەرموودەیە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی، کە تەماشاکردنی نامەحرەم تیرێکی ژەهراوییە لە تیرەکانی شەیتان، مانای ئەوەیە هەروەك ڕاوچی بەتیر ڕاوی نێچیر دەکا، هەروەها شەیتانیش بەتیر ڕاوی ئینسان دەکا و تیرەکەی ئەوەیە کە ئینسانەکە تەفرە دەدا تا تەماشای نامەحرەم بکا و ئەو تەماشاکردنەی وەکو تیرێکی ژەهراوی وایە کە دای لە دڵ بەتەواوی خراپی دەکا، وەك زەخمی تیراوێ کە زەحمەتە خۆش ببێتەوە تا بەتەواوی ئەو دڵە دادەرزێنێ، سا مەگەر زوو پەشیمان ببێتەوە و عەزمی بێتە سەر ئەوە کە هەرگیز نەگەڕێتەوە سەری. «وقال عيسى، عليه السلام، وأياكم والنظر فأنها تزرع في القلب الشهوة وكفى بها لصاحبها فتنة» واتە: خۆتان لە تەماشاکردنی نامەحرەم بپارێزن؛ چونکە ئەو تەماشایە تۆوی ئارەزووی ناپەسند لەناو دڵدا دەڕوێنێ و ئەو تۆوە بیسە بۆ دروستکردنی فیتنە و دڵوێران کردن بەسە.

(وسئل حكيم: ما بدء الزنا؟ قال النظر). واتە لە زانایەکی خاوەن دڵیان پرسی: ئەو گوناهە کە دەبێتە پێش قەرەوڵی زیناکردن چییە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: تەماشاکردنی نامەحرەمە. واتە: کە ئینسان تەماشای نامەحرەمی کرد، دڵی گیرۆدەی دەبێ و دەکەوێتە شوێنی یا شوێنی هاوچەشنی، ئیتر هەروا وردە وردە زۆرتر دڵی ئالوودەی گوناه دەبێ

تا ئەوەندە ڕەش دەبێتەوە فەرقی حەڵاڵ و حەرامی لە لا نامێنێ و، هەر کاتێ بۆی ڕێك کەوێ زینا دەکا، پەنا بە خوا و بمانپارێزێ لە هەموو گوناهێ.

لە حەدیسدایە: ئەگەر کەسێ دەست لە پێستی نامەحرەمێ بدا ئەوە وەکو ئەوەیە دەست بەناو گۆشتی بەرازێکی مردارەوەبوودا بکا و لێی دەربێنێ و بیخوا! هەروەها لە باقیی حەدیسەکەدا دەفەرموێ: ئەو کەسەی دەست لە نامەحرەم دەدا لە ڕۆژی قیامەتدا بە زنجیر کراوی دەبرێتە حوزووری خوای گەورە (جل جلالە).

براکان! بەقوربانتان بم. نابێ ئێمە بەوە بایی ببین کە خوای گەورە مۆڵەتی داوین و لەسەر ئەم گوناهانە کە دەیانکەین، ئێستا سزامان نادا؛ چونکە باشتر بۆ ئێمە ئەوەیە کە خوا لە دنیادا زوو تۆڵەمان لێ بسێنێت، تا لە گوناه کردن پەشیمان ببینەوە. کە لە دنیادا سزای نەداین ئەمە مانای وایە،ئەگەر ڕەحم نەکا، پێمان لە قیامەتدا سزامان زۆر گران دەبێ.

دەگێڕنەوە: (أبو یعقوب) ناوێ، کە لە پیاوچاکان بووە، لە کاتی تەوافی (کعبة الله)دا چاوی بە پیاوێ کەوت کە چاوێکی کوێر بوو بە گریان و هەناسە هەڵکێشانەوە دەیگوت: خوایا! گوناهم ببەخشە و تەوبەم لێ قبووڵ بکە. (أبو یعقوب) پێی فەرموو: تۆ بۆچی ئەوەندە عاجزی و پەرێشانی پیشان دەدەی؟ عەرزی کرد: لە عومری خۆما تاقە جارێ تەماشایەکی نامەحرەمم کرد، لەناکاودا دەستێ لە غەیبەوە هات و دای بە چاومدا و چاوێکم کوێر بوو، بانگیشی کردم و وتی: بە تاقە تەماشایێ چاوێکت لەکیس دا! ئەگەر جارێکی تر تەماشایێ بکەی ئەو چاوەکەی تریش لە کیس دەدەی؛ جا من لەوکاتەوە ترس چووەتە دڵمەوە.

ڕیوایەت کراوە: «ما من مسلم ینظر إلی أمرأة أول مقته، ثم یغض بصره ألا أحدث اللّه له عبادة یجد حلاوة في قلبه». واتە: هەر موسڵمانێ لە یەکەم نیگادا تەماشای ژنێکی نامەحەرەم بکا و ئیتر جاری دووەم چاوی بنووقێنێ و لەبەر خوای گەورە، خۆی لە تەماشاکردنی مەنع بکا، خوای گەورە لەبەر ئەم خۆپاراستنە پایەی عیبادەتێکی بۆ دەنووسێ کە لەزەت و خۆشییەکەی لە دڵدا هەست پێ دەکا.

براکان! بزانن لە هەر شوێنێکدا ژنان و پیاوان دەست بگرن و ڕەشبەڵەك بکەن تاریکیی ئەو گوناهە ئەو ناوە داگیر دەکا و ڕقی خوای گەورە ئەو دەوروبەرە دادەپۆشێ کە ئەگەر خەڵك بەچاو ئەو غەزەبی خوایانە بدیایە و ئەو ئاگرە ناهەموارەیان تەماشا بکردایە، هەر

کەس وڵاغی بووبووایە سواری دەبوو و غاری دەدا، هەر کەسیش وڵاغی نەبووایە بە پێ ڕای دەکرد و لەو شوێنە دەردەچوو تا لەو غەزەبە دووردەکەوتەوە. خۆ ئەگەر نە وڵاغی بوایە و نە قاچ و قولیشی ساغ بووایە لەسەر دەست هەروەك منداڵ خۆی بە گاگۆڵکە و سنگەخشە لەو شوێنە دوور دەخستەوە نەبادا گیرۆدە ببێ.

دەگێڕنەوە: مامی حەزرەتی ئیبراهیم (على نبينا وعليه الصلاة والسلام) کلیلەوانی بتخانە بوو. حەزرەتی ئیبراهیم هەر ڕۆژێ جۆرە عەیبێکی لە بت و بتخانە دەدۆزییەوە بەجۆرێ کە لەناو خەڵکا مەشهوور بوو بە دوژمنی ئەو بتانە، تا ڕۆژی جەژن هات و بە دابوونەریتی ئەو ڕۆژە، خەڵکەکە لە شار دەرچوون. حەزرەتی ئیبراهیم (د.خ) ڕۆیشت بۆ بتخانەکان و بە دەستی خۆی بە تەور هەموو بتەکانی شکاند، بتە گەورەکەیان نەبێ کە بەساغی هێشتیەوە و تەورەکەی لەسەر شانی ئەو دانا و بەجێی هێشتن. کاتێ کۆمەڵەکە لە دەشت گەڕانەوە ڕوویان کردە بتخانە بۆ ئەوەی سوجدە لە بتەکان بەرن، سەیریان کرد بتەکان شکاون. ڕۆیشتنە لای فەرماندار و شکاتیان لە حەزرەتی ئیبراهیم کرد.

فەرماندار حەزرەتی ئیبراهیمی بانگ کرد و پێی وت: بۆچی ئەو بتانەت شکاندووە؟ حەزرەتی ئیبراهیم وتی: بتە گەورەکە شکاندوونی، چونکە ڕازی نەبوو کەس سوجدە بۆ بتە بچووکەکان ببا و بکرێنە شەریکی ئەو لە سوجدە بۆ بردندا و، لە غیرەتدا شکاندنی، ئەگەر باوەڕیش ناکەن بڕۆن لێیان بپرسن بزانن قسەکەم ڕاستە یا نا؟ کە چوون پرسیاریان لێ کردن هیچ جوابیان دەسگیر نەبوو، ئینجا قەومەکە هەموو مات و سەرسام بوون، چونکە دەیانزانی ئەو بتانە گیانلەبەر نین و جوابیان نییە، ئیتر غیرەتیان هەستا و پیلانی سووتاندنی حەزرەتی ئیبراهیمیان ڕێك خست و، بەئەمری پاشای سەردەم بەقەدەر تەپۆڵکەیێ داریان کۆکردەوە و ئاگریان دا، لەبەر تیژی گڕەکەی و گەورەیی قەوارەکەی کەس نەیتوانی نزیکی بکەوێتەوە، ناچار هاتن حەزرەتی ئیبراهیمیان خستە ناو مەنجەنیقێك و لە دوورەوە فڕێیان دایە ناو ئاگرەکە. لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: یەکەم جار مەلائیکە لە غەیبەوە هاتن و مەنعی مەنجەنیقەکەیان کرد لە جووڵانەوە و نەیانتوانی حەزرەتی ئیبراهیم فڕێ دەنە ناو ئاگرەکە، تا شەیتانی لەعنەتی لە شێوەی پیاوێکی پیردا هات و وتی: چار ئەوەیە هەندێ ژن و پیاو بێن لە دەوری ئەو مەنجەنیقەدا دەست بگرن پێکەوە بەشێوەی ڕەشبەڵەك هەڵپەڕن، ئەوسا مەنجەنیقەکە دەسووڕێتەوە و ئیبراهیم فڕێ دەدا بۆ ناو ئاگرەکە. پیاو و ژنەکان کە هاتن دەستیان کرد بە ڕەشبەڵەك، مەلائیکەکان لە شوومی و نەگبەتیی ئەو ڕەشبەڵەکەوە لەودەورەدا نەمان و سەرکەوتن بۆ ئاسمان، جا

مەنجەنیقەکە سووڕایەوە و حەزرەتی ئیبراهیمی فڕێ دایە ناو ئاگرەکەوە. براکان! بزانن لەم ڕیوایەتەوە دەردەکەوێ لە هەر شوێنێکدا ڕەشبەڵەك بکرێ، مەلائیکە لەبەر شوومیی ئەو ڕەشبەڵەکە لەو شوێنەدا نامێنن. جا دەبێ ئەو غەزەبە لەو کاتەدا دەبارێ چۆن غەزەبێك و ئەو موسیبەتە چۆن موسیبەتێ بێ!.

براکان! ناموس لای خوای گەورە ئەوەندە حورمەتی زۆرە ئەگەر کەسێ بڕوا لە سەربانەوە یا لە تاقی خانووەوە تەماشای حەوشەی ماڵێکی تر بکا و بنواڕێ بۆ عائیلەی کابرای خاوەن ماڵ و پاش ئەوەی خاوەن عائیلەکە ئینذاری کرد و مەنعی کرد جاری دووەم بێتەوە و تەماشای عائیلەکەی بکاتەوە، بۆ خاوەن عائیلەکە دروستە بە تیری دوو سەر، تیر بهاوێتە ئەو کابرا خائینە و، ئەگەر هەردوو چاوی کوێر کرد بەشەرع قیساسی نییە؛ چونکە بەهۆی ئەو خیانەتەوە خۆی بێ نرخ کردووە. (عن أبي هريرة رضي الله عنه، من أطلع في دار قوم ففقيء فقد هدرت عينه) واتە: ئەگەر کەسێ بڕوانێ بۆ ناو خانووی قەومێ و تەماشای عائیلەی ئەو ماڵە بکا، ئەوە لەپاش ئەو خیانەتە بۆ خاوەن ماڵەکە دروستە چاوی ئەو کابرایە هەڵکۆڵێ و ئەگەر هەڵی کۆڵی قیساسی نییە و بێ تۆڵەیە و چاوەکەی بێ نرخ ڕۆیشتووە. جا تەماشاکەن چاوێ کە نیوەی (دیە) و خوێنی خاوەنەکەی تۆڵەیەتی، بەهۆی ئەو تەماشاکردنەوە خوێنی لەسەر هەڵگیرێ، دەبێ تاوان و گوناهی ئەو بێ ناموسە چەند زۆر بێ کە دەستی ژن و کچ و خوشکی خەڵکی بێگانە بگرێ و لەبەرچاوی خەڵکدا لەگەڵیاندا هەڵپەڕێ و ئەگەر شەو بێ ماچیشیان بکا و مەمکیان بگرێ و لەشی بلکێنێ بە سمتیانەوە؟! دەبێ ئەو خاوەن ژن و کچ و خوشکانە چ ناموسێکیان بۆ بمێنێتەوە کە بەم کارە ناشیرینە نامەردانەیە ڕازی بن.

براکان! بێگومان ئەم کارە ناشیرینە دەبنە هۆی ئەوەی گەلێ لە ژنان شەرمیان نەمێنێ و، کاری فاحیشەیان لا ئاسان ببێ و خاوەنەکانیان ببنە دەویت! پەنا بە خوا لەم کارە ناشیرینانە. براکان! زۆربەی ئەم کارە ناڕەوایانە دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی فیتنە و ئاشووبە لەناو خەڵکدا و چەن موسیبەتیان لێوە پەیدا دەبێ و زۆر کەس عاشق دەکەن و تووشی بەدڕەفتاری دەبن. تەنانەت لە پیاوێکی باوەڕ پێکراوم بیست وتی: جارێکیان هەندێ کەس پاش ڕەشبەڵەك هاتن بۆ سەر حەوزی مزگەوت و غوسڵی لەش پیسییان دەرکرد، وتی: منیش پێم وتن: ئێوە نەنووستوون تا ئیحتیلامتان ببێ، ئەم خۆشۆردنەتان لە چییە؟ لە وەڵامدا وتیان: فڵانە ژن ئەوەندە جوان بوو هەر بە تەماشاکردنی لە ڕەشبەڵەکەکەدا لەشمان پیس بوو!. جا تو خوا بۆ مێردی ئەو جۆرە ژنانە، مردن چاکتر

نییە لەوە کە هەتیو و مەتیو دەستی ژنەکانیان بگرن و لە لکانی لەشیان بە لەشیانەوە لەشیان پیس ببێ و شەیتانی ببن!

براکان! فەتح عەلی شای ئێران، میرزا محەمەد ناوی مەلاباشیی، لە تارانەوە نارد بۆ لای عەبدورەحمانی پاشای بابان، لەو کاتەدا باوکی خوا لێخۆشبووم بۆ تکایێ ڕۆیشت بۆ لای عەبدورەحمان پاشای خوا لێخۆشبوو، منیش کە لەو وەختەدا لە تەمەنی دوازدە ساڵاندا بووم لە خزمەتی باوکمدا بووم. میرزا محەمەد گێڕایەوە بۆ باوکم و عەرزی کرد! جارێ شا ناردمی بۆ لای قراڵی ڕووس. کە گەیشتمە ئەوێ قەشەکانیان لێم کۆبوونەوە و دەستیان کرد بە پرسیاری ئاینی. یەکەم پرسیار ئەوە بوو: ئەسڵ ئەوەیە خواردنی گۆشتی هەر حەیوانێ کە زیانی نەبێ بۆ ئینسان ڕەوا بێ؛ کەواتە هەق وایە خواردنی گۆشتی بەراز ڕەوا بێ. منیش خوای گەورە خستیە دڵمەوە وتم: زیان لە زیانی بێ ناموسی ناهەموارتر نییە و لە لەشی ئینساندا پارچەیێ نییە لە دڵ بەنرختر بێ. ئێمە تەماشا دەکەین ئەوانە کە گۆشتی بەراز دەخۆن دڵیان تووشی نەخۆشیی بێ ناموسی دەبێ و خووی بەراز دەگرن. تەماشا دەکەین بەرازە نێرەکان بە کۆمەڵ لەسەر بەرازێکی مێنگە کۆدەبنەوە و لێی دەپەڕن، بەڵام غەیری بەراز نێرێکی وەها نییە کە غیرەتی لەسەر مێنگەکەی نەبێ. کە ئەم جوابەم دانەوە، سەریان داخست و بێدەنگ بوون. موسڵمانەکان! خۆ ئێوە گۆشتی بەرازتان نەخواردووە بۆچی وەها لەسەر ژن و خوشك و کچی خۆتان بێ غیرەت بوون؟! بۆچی ڕازی دەبن دەستیان بدەن بە دەستی بێگانەوە و پێکەوە هەڵپەڕکێ بکەن؟! خۆزگە من کوێر و کەڕ دەبووم نە ئەحواڵی ئێوەم بەچاو ببینیایە و نە باسی بێ ناموسیی ئێوەم بەگوێ ببیستایە!

لە سەلمانی فارسییەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) خوای گەورە کە ویستی قەومێ بفەوتێنێ لەپێش هەموو شتێکدا حەیا و شەرمیان لەناو هەڵدەگرێ، جا کە شەرمیان لەناوا نەما عەسەبییەت و ڕقیان ئەستوور دەبێ، کە ڕقیان ئەستوور بوو، دڵیان پڕ دەبێ لە کینە و، ئەمانەت و ڕەحم و شەفەقەت و میهرەبانییان لە لا نامێنێ و دڵیان قەساوەتدار دەبێ، ئەمجار نووری ئیسلامەتی لە دڵیاندا هەڵدەگیرێ و شەیتان بە ئارەزووی خۆی سواری سەریان دەبێ، و دەیانکاتە خزمەتکاری خۆی، جا گیرۆدەی دەردی گوناهە گەورەکان دەبن و لەعنەتی خوا بەسەریانا دەبارێ. فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) «الحياء من الأيمان» واتە: شەرمکردن بەشێکە لە ئیمان، کە شەرم و حەیا نەما، ئیمان لەڕو لاواز دەبێ، هەروەها وردە وردە تا ئیمانەکە بەتەواو دەڕوا- پەنا بە خوا-

دەگێڕنەوە: شەیتان هات بۆ لای حەزرەتی مووسا (د.خ) و لێی پاڕایەوە کە بڕوا لە خزمەتی خوای گەورەدا تکای بۆ بکا، عەفووی بفەرمووێ. ئەویش ڕۆیشتە حوزووری خوا و تکای بۆ کرد. خوای گەورە پێی فەرموو: پێی بڵێ: بەو مەرجە عەفووی دەکەم سوجدە بەرێ بۆ گۆڕی ئادەم، شەیتان قبووڵی نەکرد و وتی: من کە ئادەم بەسەر زیندوو بوو، سوجدەم بۆ نەبرد، ئێستا کە مردووە، چۆن سوجدەی بۆ دەبەم!؟ بەڵام مادام ئەم زەحمەتەت بۆ کێشام ئەم ئامۆژگارییانەت بۆ بەیان دەکەم، ئاگاداربە و بە ئۆممەتەکەی خۆت بڵێ: لە سێ کاتدا ئاگادار بن، یەکەم: لەکاتی ڕق هەستاندا، چونکە من لەکاتی ڕق هەستاندا گاڵتەیان پێ دەکەم، وەك چۆن خەڵکی گاڵتە بە گۆ دەکەن لە مەیداندا و دەیهێنن و دەیبەن، هەروەها گیرۆدەی ئەنواعی ئێشی ناباریان دەکەم. دووەم: لەو کاتەدا کە لەگەڵ ژنی نامەحرەمدا دادەنیشن، چونکە من وەکو دەڵاڵ دڵی ژن دێنم بۆ لای پیاو و دڵی پیاو دێنم بۆ لای ژن و گیرۆدەی گوناهیان دەکەم. سێیەم: لەکاتی ڕیزبەستندا بۆ جەنگ لەگەڵ کافران؛ من وەسوەسە و وتوویرە دەخەمە دڵیانەوە: کە بۆچی خۆتان بەکوشت دەدەن؟ وایان لێ دەکەم کە پشت هەڵکەن و لە مەیدانی جەنگدا ڕابکەن و ڕیزی غەزا بەجێ بێڵن.

برادەران! تەعەجوب دەکەم ئەگەر یەکێ بەبوختان نیسبەتی بێ ناموسی لە کەسێ بدا ئینسان نزیکە بیکوژێ و خۆی تووشی گێرە و کێشە بکا، کەچی ئینسان خۆی بەدەستی خۆی ناموسی خۆی بەرەڵڵا دەکا بۆ ناو نامەحرەم و بێگانە دەستی دەگرن و خۆ لە یەکتر دەچەسپێنن و دەکەونە خەیاڵاتی بەدەوە. تەنانەت ئەوەندە بێ شوعوور دەبن، شانازی بەوەوە دەکەن کە ژن و کچیان بەرەڵڵا دەکەن بۆ ناو لۆتی و هەرچی و پەرچی و هەموولایێ بەردەبنە یەکتر، وەکو حەیواناتی بێ هەست و شوعوور!. ئەمە چ حەیا و شەرمێکە و چ غیرەتێکە کە پیاو قبووڵی ئەوە بکا دەستی ژنی بەدەستی هەتیوانەوە بێ هەڵیفلیقێنن؟! هەزار جار تف لەو غیرەتە و لەو پیاوەتییە!

لە حەزرەتی عەلییەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) فەرموویەتی: «مكتوب على باب جهنم: من خالف هواه كانت الجنة مأواه. ومن أطاع هواه كانت النار مثواه. ومكتوب على باب الجنة: أنت محرمة على كل بخيل ومراء وعاق ونمام وديوث». واتە: لەسەر قاپیی دۆزەخ نووسراوە: ئەو کەسەی بڕوا بەگژ ئارەزووی نابارى نەفسی خۆیدا بەهەشت جێگایەتی و ئەو کەسەی لەژێر فەرمانی ئارەزووی نەفسدا بێ، ئاگر جێگایەتی. هەروەها لەسەر دەرگای بەهەشت نووسراوە: تۆ حەرام کراوی لەسەر ئەو ڕژدانە کە حەقی خوای گەورە

نادەن و، لەسەر ئەو کەسانە کە عیبادەت و خواپەرستی بەرپا و بەرچاوی دەکەن و، ئەو کەسانە کە ئازاری دڵی باوك و دایکیان دەدەن و، ئەو کەسانە کە دەویتن. زاناکانی ئاین فەرمووویانە: دەویت ئەو کەسەیە کە غیرەت و حەمیەتی نەبێ بۆ پاراستنی خێزان و ماڵی خۆی بەبێ ناموسیی ئەوان ڕازی بێ. جا براکان بڕوانن ئینسانێ کە ژنی خۆی یا کچی خۆی بدا بەدەستی فاسقانەوە کە دەست بخەنە ناو دەستیان و لەشیان بلکێنن بەلەشیانەوە و هەموو قسەیەکی هەواپەرستییان لەگەڵ بکەن، ئیتر دەبێ چی لەوە پیستر و ناپەسەندتر بێ؟ تەنیا ئەوە ماوە کە زینا یان لەگەڵ بکەن! ئەمە خیلافی غیرەتی هەموو گیانلەبەرێکی نێرە سەبارەت بە مێچکەی خۆی.

حیکایەتێکی خۆش:

ڕۆژێ ڕۆیشتم بۆ دێی (جێشانە)، هەندێ لە خەڵکی ئەو دێیە لەقلەقێکیان پیشان دام لەناو هێلانەکەیدا و بۆیان گێڕامەوە وتیان: ئەو لەقلەقە کە دەیبینی لە هێلانەکەیدا پارەکە لەقلەقێکی نێرەی زۆردار هات لە هێلانەکەی دەری کرد و لەگەڵ مێچکەکەیدا دەنیشت. تا چەند ڕۆژێ ئەم لەقلەقە داماوە لەسەر دارێکی تر دەنیشت و تەماشای ئەوانی دەکرد. لەپاشاندا گوم بوو تا چەند ڕۆژێ. ئەمجار کوتوپڕ تەماشامان کرد کۆمەڵێ لەقلەقی هێناوە دایان بەسەر ئەو لەقلەقە فاسقەدا، ئەویش هەرچۆن بوو ڕای کرد، ئەوانیش کەوتنە سەری و لە ئاسماندا لێیان دا و خستیانە خوارەوە و بۆی دابەزین و پارچە پارچەیان کرد. ئەنجا لەقلەقە دەرکراوەکە هاتەوە هێلانەکەی خۆی و لەگەڵ هاوجووتەکەیا پێکەوە ئولفەتیان گرتەوە. هەروەها لە شێخ (محی الدین) ناوێکی عەرەبم بیست وتی: پوورێکی خوشکی باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: ڕۆژێ چووم بۆ دەشت، تەماشام کرد مارێ لە کونەکەی هاتە دەرەوە و لە نزیکیا بە لەش و بە کلك خەتێکی کێشا و ڕۆیشت. وتم ئەمە بێ هۆ نییە لەو نزیکدانەدا خۆم شاردەوە و تەماشام کرد پاش ماوەیێ مارێ هات و تەماشای خەتەکەی کرد تۆزێ ماتڵ بوو ئەمجارە خۆی بەرز کردەوە لە خەتەکە و ڕۆیشتە ناو کونەکە تا ماوەیێ ئەنجا هاتە دەرەوە و ڕۆیشت. سەعاتێ لەو شوێنەدا مامەوە تەماشام کرد مارە پێشووەکە هاتەوە تەماشایەکی خەتەکەی کرد و ڕۆیشتە ژوورەوە. پێش ئەوەی بچێتە ژوورەوە بە مارەکەم وت: وەڵڵا ئێستا لەپێش تۆدا مارێ ڕۆیشتە ژوور و هاتە دەرەوە و ڕەنگە ژنەکەیشتی خراپ کردبێ. مارەکە کە ڕۆیشتە کونەکەی ئەوەندەی پێ نەچوو مارە مێچکەکەی کوشت و هێنایە دەرەوە و لەژێر هەندێ بەرد و خۆڵا شاردیەوە و لەو نزیکانەدا خۆیشی حەشاردا. پاش سەعاتێ تەماشام کرد،

ماره فاسقەکە هاتەوە و نزیکی کونەکە بووەوە و مارە خاوەن شوێنەکە بۆی هات و کەوتە شەڕ لەگەڵیدا و کوشتی. ئەمە هەمووی لەبەر غیرەت لەسەر مێچکەکەی. ئەی تف لە غیرەتی ئەو کەسەی لە حەیوان بێ غیرەت ترە و تەماشای نامووسی خۆی ناکا و نایپارێزێ!.

بە فەرموودەی حەزرەت (د.خ) ڕیوایەت کراوە: ئەو ژنانەی لە خانووی خۆیان دەردەچن و پۆشاکی جوان دەپۆشن و بۆنی خۆش لە خۆیان دەدەن و، بەناو بێگانەدا دەسووڕێنەوە، ئەوانە خوا و پێغەمبەری خوا لەعنەتیان لێ دەکەن ئەگەر چی ڕووی خۆشیان داپۆشن. مەبەس لەم فەرموودەیە ئەوەیە ئەو ژنە کە پۆشاکی جوانی لەبەر کردووە و خۆی بۆنخۆش کردووە دروست نییە بەبێ بەهانەیەکی شەرعی بڕواتە دەرەوە؛ چونکە چوونە دەرەکەی دەبێتە هۆی تێکدانی دڵی خەڵك و ئامادەیان دەکا بۆ ئارەزووی نەفس.

براکان! جا بەراورد بفەرموون ئەگەر ژنێ خۆی جوان بکا و بەرگ و پۆشاکی جوان لەبەرکا و خۆی بۆنخۆش بکا و ڕووی خۆی دەربخا و، لەگەڵ پیاوێکی بێگانەدا دەست بگرێ و هەڵپەڕکێ بکا، دەبێ گوناهـ و تاوانی ئەوە چەند نابار و ناهەموار بێ؟ تەنانەت حەدیس ئەو ژنە بە زیناکار دادەنێ، واتە: گوناهی بەقەدەر گوناهی زیناکەر گەورەیە.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لەعنەت بکەن لەو ژنانە کە ڕەفتاریان وەهایە؛ چونکە ئەوانە لە لایەنی خواوە لەعنەتیان لێ کراوە. براکان! دروستە بۆ موسڵمانێ کە لە فیتنە نەترسێ، بڕوات بەدەنگی بەرز لەعنەت لەو ژنانە بکا کە لەناو ڕەشبەڵەکدا دەستیان گرتووە و، بەوان و بە پیاوەکانیش بڵێ: کە خوا و پێغەمبەری خوا لەعنەتیان لە ئێوە کردووە، بۆیە ئێمەش لەعنەتتان لێ دەکەین و، تا ئەم بێ شەرمییە تەرك نەکەن دروستە لەعنەتتان لێ بکرێ.

براکان! دروست نییە بۆ ژنان بەبێ ڕاڵێبوونی مێردەکانیان، بڕۆنە دەرەوە، ئەگەرچی عەتریشیان لە خۆیان نەدابێ، مادام ناچارێکی شەرعی نەبن، وەکو گیانەڵا یا مردنی یەکێ لە خزمانیان، هەروەها مەلائیکەی خوا لەعنەتیان لێ دەکەن تا دەگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان و، نوێژی فەرز و سوننەتیان قبووڵ نابێ، واتە خێر و پاداشیان بۆ لەسەر نانووسرێ.

ڕیوایەت کراوە ئەو ژن و پیاوانەی دەستی یەك دەگرن بۆ ڕەشبەڵەك شەیتانەکان بەدەوریاندا دەسووڕێنەوە و گاڵتەیان پێ دەکەن ، بووزیان پێوە دەکەن.

براکان! ژنی ناو ڕەشبەڵەك لە ژنی سەماکەر بێ شەرمترە، چونکە ئەم بەتەنیا خۆی هەڵدەپەڕێ و خەڵکی تەماشای دەکەن، بەڵام ژنی ناو ڕەشبەڵەك دەستی دەدا بەدەستی بێگانەوە و لەشی خۆی لە لەشی بێگانە توند دەکا و خەڵکی تەماشای دەکەن.

براکان! لەم بابەتەوە قسە زۆرە، بەڵام بۆ ئەوانەی کە حەیا و شەرمیان ببێ و غیرەت لە بەدەنیاندا ببێ و کەمێ لە خوا بترسن، ئەم ئەندازە بەسە کە عەرزمان کرد. هیوام وایە هەر کەس جارێ ئەم نامەیەی بۆ بخوێنرێتەوە قەناعەت بکا و لە ڕەشبەڵەك دەسبەردار ببێ و، مەنعی نامووسی خۆی بکا لەوەی کە جارێ لە جاران ئەو سووکییە بەسەر خۆیدا بێنێ.

تکام وایە ئەم نامەی منە بخوێننەوە بۆ موسڵمانان بەڵکو لەناو سەد کەسدا دە کەسیان یاخۆ هیچ نەبێ، تاقە یەکێکیان لەو تاوانە دەسبەردار ببن. دیارە ئەگەر بەهۆی ئەو خوێندنەوەی ئێوەوە یەك کەس دەس لە گوناهـ هەڵگرێ ئەوە خێری بۆ ئێوە لە هەموو ئاڵتوون و زێڕ و زیوی دنیا زۆرترە، بەڵکو لە هەموو موڵکی جیهان چاکترە، چونکە فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) ئەگەر تاقە کەسێ بەهۆی ئامۆژگاریی تۆوە ڕێگای ڕاست بگرێتەبەر، ئەوە بۆ تۆ چاکترە لە هەموو موڵکی ڕووی جیهان؛ چونکە ئەو کەسەی خەڵك بۆ ڕێگای ڕەزامەندیی خوا شارەزا دەکا بەشێکی لە پایە و مایەی پێغەمبەران دەستکەوتووە و خەڵکی بۆ لای خوای گەورە بانگ کردووە و، لە ڕۆژی قیامەتدا لەپاش پێغەمبەران لە هەموو کەس لە خواوە نزیکترە. هەروەها ئەگەر یەکێ لە هەموو ژیانیدا ئامۆژگاریێ خەڵك بکا بۆ ڕێگەی خوای گەورە و کەس گوێی پێ نەدا و موبالاتی پێ نەکا، بەڵام لە ئەنجامدا تاقە کەسێ کەوتە شوێنی و بەو ئامۆژگارییانەی ئەو ڕەفتاری کرد، ئەوە دروست نییە بڵێین ئەو کەسە عومری بەزایە چووە، مادام تاقە کەسێ بەهۆی ئەوەوە ڕووی لە خوای گەورە کردووە، ئەوە وەك ئەوەیە کە هەموو موڵکی دنیای دەست کەوتبێ و لە ڕێگای خوادا خەرجی کردبێ کە بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا دەستی دەکەوێتەوە.

(وصلى اللّه على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه وأتباعه بأحسان إلى يوم الدين. وآخر دعوانا أن الحمد للّه رب العالمين).

لە ١٥ی شەعبانی ١٣٩٦ی ك ڕێکەوتی ١١-٨-١٩٧٦ی ز دا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا

وەرگێڕ

## نامەی سی و هەشتەم

# باسی غەیبەت دەکا

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمد للّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه، وعلى آله وصحبه المجاهدين في اللّه أجمعين.

لەپاش ئەمانە، براکان! هەموو ماڵ و دارایی من بەقوربانی ئەوە بێ کە ئێوە تووشی ئەو گوناهانە نەبن کە دەبنە هۆی کەموکوڕیی ئیمان. خۆشەویست و دڵسۆزی ئێوە وەسیەتتان بۆ دەکا کە خۆتان لە هەموو گوناهێ بپارێزن بە تایبەتی لەو گوناهە کە زۆربەی خەڵك پێیەوە گیرۆدە بوون، ئەویش ئەوەیە کە ئینسان ناوی کەسێ ببا بە شتێ، ئەگەر ئەو کەسە بیێ پێی دڵگران ببێ کە مەشهوورە بەغەیبەت.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) جارێکیان لە هاوڕێیەکانی پرسیی: غەیبەت چییە؟. هاوڕێیەکانی عەرزیان کرد: خوا و پێغەمبەری خوا دەزانن. فەرمووی: غەیبەت ئەوەتە ئینسان لە پاشملە ناوی برای خۆی ببا بە شتێ ئەو برایە پێی خۆش نەبێ. ئینجا عەرزیان کرد: ئەگەر ئەو شتەش لەو کەسەدا هەبێ هەر غەیبەتە؟. فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئەو شتەی تێدا نەبێ ئەوە بوختانە و گوناهی بوختان زۆر گرانە.

ڕیوایەت کراوە هەر کەسێ بە سیفەتێ باسی یەکێ بکا ئەو یەکە ئەو سیفەتەی تێدا نەبێ و، مەبەستی ئەوە بێ ڕیسوای بکا و لەناو خەڵکدا عەیبداری بکا، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە دۆزەخ حەپس دەکرێ تا ئیسباتی ئەو سیفەتە دەکا لەو کەسەدا و دیارە بۆشی ئیسبات ناکرێ.

وا من لەپێشدا ئەو ئایەتانە کە دەربارەی غەیبەت هاتوون بۆتان باس دەکەم و لەپاش ئەوانە هەندێ فەرموودەی پێغەمبەرتان بۆ بەیان دەکەم کە سەبارەت بە غەیبەت فەرموویەتی.

بزانن خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئینسانێ کە غەیبەت بکا و، لە پاشملە بە ناوبردنی ناشیرین لە کەسێ بدوێ، بەو ئینسانەی داناوە کە گۆشتی برای مردووی خۆی بخوا و، نەهیی لەو غەیبەتە کردووە و فەرموویەتی: «وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ» واتە: با هەندێ لە ئێوە لە پاشملە هەندێکتان نەدوێن و غەیبەتی نەکەن، ئایا یەکێ لە ئێوە پێی خۆشە گۆشتی برای مردووی خۆی بخوا؟! نەخێر! ئێوە کە خاوەن زەوقی ئینسانین، شتی وەها و خواردەمەنی وەهاتان لا ناشیرین و ناپەسەندە.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێ زەیدی کوڕی سابت (ر.خ) لەگەڵ هەندێ هاوڕێیانی پێغەمبەرا دانیشتبوو حەدیسی بۆ باس دەکردن. ئەوانیش پێیان وت: بڕۆ لە ماڵی حەزرەت (د.خ) داوای هەندێ گۆشتمان بۆ بکە؛ ماوەیەکە گۆشتمان نەخواردووە. ئەویش ڕۆیشت ئەم باسەی لە خزمەتی حەزرەتا کرد. لەو کاتەدا کە زەید دەچێ بۆ خزمەتی حەزرەت هاوڕێیەکانی وتبوویان: ئەم حەدیثانەی کە زەید بۆمانی باس کرد، ئێمە نەمان بیستوون لە حەزرەتەوە (د.خ) وەك بڵێی گومانی ئەوەیان کردبێ کە زەید خۆی ئەم حەدیسانەی هەڵبەستبێ! جا کاتێ کە زەید لە خزمەتی حەزرەتدا قسەکەی ئەوانی گەیاند حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەوان خۆیان خەریکی گۆشت خواردنن. کە زەید گەڕایەوە بۆ لایان، فەرموودەکەی حەزرەتی بۆ گێڕانەوە. وتیان: سەرمان سووڕماوە؛ ئێمە لەم ماوەدا گۆشتمان نەخواردووە، هەروەها هەندێکیان ڕۆیشتن و لە خزمەتی حەزرەتدا ئینکاری گۆشت خواردنەکەیان کرد. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: پاش ئەوە کە زەید هات بۆ لای، من ئێوە غەیبەتتان کرد و وتتان: ئەم حەدیسانە چین کە زەید باسیان دەکا؟ ئێمە لەگەڵ ئەوەش کە زۆرتر لە خزمەتی حەزرەتدا بووین ئەم حەدیسانەمان نەبیستوون. جا کە حاڵی بوون مەبەستی حەزرەت (د.خ) ئەوە بووە کە غەیبەتی زەیدیان کردووە، هەموو لەو غەیبەتە پەشیمان بوونەوە.

لەم حەدیسە شەریفەوە دەردەکەوێ گۆشت خواردنی ئینسانێ غەیبەت بکا، شتێکی مەعنەوییە، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووی دەردەکەوێ، چونکە ئەبوو سەعیدی خیدری (ر.خ) دەگێڕێتەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لەو شەوەدا کە چووم بۆ میعراج گەلێك بنیادەمم دی، هەندێ مەئموور بەسەریانەوە بوون، گۆشتیان لە تەنیشتیان دەبڕی و دەرخواردیان دەدانەوە. منیش لە جیبرەئیلم پرسی: ئەمانە چ کەسانێکن؟ وتی: ئەمانە ئەو

کەسانەن کە لە دنیادا غەیبەتی خەڵك دەکەن... ئەمانە تا ڕۆژی قیامەت لە قەبردا بەم جۆرە سزا دەدرێن. ئەڵبەتە لەسەر جۆرە گوناهێکی تر بەجۆرێکی تر سزا دەدرێن، پەنا بە خوا.

ڕیوایەت کراوە: ئەوانەی لە دنیادا غەیبەتی خەڵکی دەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا غەیبەت کراوەکان بەمردوویی دێننە بەردەمیان و زۆریان لێ دەکەن گۆشتی ئەو مردووانە بخۆن و، پێتان دەڵێن: وەك چۆن لە دنیادا گۆشتی ئەمانەتان خواردووە، فەرموون ئێستاش دەبێ گۆشتیان بخۆن.

خوای گەورە فەرموویەتی: «يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا...» واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە خۆتان لە گەلێ گومان بپارێزن، بەڕاستی هەندێ گومان گوناهە و تاوانە و تۆڵەی گرانی هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، وەك کە گومان خراپ و ناڕەوا بەو کەسانە ببەن کە زۆرتری کردەوەیان باشە و لەسەر ئوسووڵی ئاینە، یا گومانی فیسق و فجوور بەو کەسانە ببەن کە خەریکی تاعەتن، یا کەسێ کە کارێکی چاك دەکا، ئێوە بیبڕن بەسەر نییەتێکی ناڕەوادا. هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: جاسووسی مەکەن، واتە بەدوای کاری پەنامەکیی موسوڵماناندا مەگەڕێن بۆ ئەوە بەڵگەیێ بدۆزنەوە و بیکەنە دەلیل لەسەر ئەوە کە کابرا پیاوێکی خراپە. خوای گەورە سەتتار و سرپۆشە و ئێوەش لەسەر سرپۆشی بژین.

دەگێڕنەوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەموو شتێکی موسڵمان لە موسڵمان حەرامە. خوێنی، ماڵی، نامووسی. دیارە غەیبەت کردنی کەسێ وادەبێ ڕقی دوژمنان و نەفامان لەو کەسە هەڵدەستێنێ و دەستدرێژی دەکەنە سەری و دەیکوژن، یا دەس دەبەن بۆ ماڵی و دەیخۆن، یا دەستدرێژی دەکەنە سەر حورمەتی و دەچن بەگژیدا و هەتکی دەکەن، ئەمانەش هەموو گوناهی گەورەن و پێویستە موسڵمان خۆی لەم گوناهان دووربخاتەوە کە دەبێ بەهۆی ئەم گوناهە گەورانە. بەڵێ خاوەنی شەریعەت غەیبەتی ئەوەندە لا خراپە کە لەگەڵ خەڵك کوشتن و ماڵی خەڵك خواردنا کۆی کردوونەتەوە و فەرموویەتی: با هەندێکتان غەیبەتی هەندێکتان نەکەن؛ ئێوە هەموو بەندەی خوان و حەق وایە وەکو برای ڕاساڵ لەگەڵ یەکتر بژین. هەروەها فەرموویەتی: غەیبەتی یەکتر مەکەن؛ چونکە هەندێ غەیبەت لە زینا خراپترە و، لە زینا زۆرتر فەسادی لێ پەیدا دەبێ. وادەبێ کابرای زیناکەر تەوبە دەکا و لە گوناهەکە ڕزگار دەبێ، بەڵام غەیبەتکەر تا غەیبەتکراوەکە ئازادی نەکا، تەوبەی لێ قبووڵ ناکرێ.

دەگێڕنەوە سلێمانی کوڕی جابیر (ر.خ) فەرموویەتی: هاتم بۆ حوزووری پێغەمبەر (د.خ) و عەرزم کرد: ئامۆژگاریێکم بکە بێتە هۆی قازانج بۆ لای خوای گەورە. فەرمووی: هەرگیز ئیشی خێر و چاکە کردن بەکەم مەزانە، ئەگەر چی خێرەکەت بریتی بێ لەوە کە کەمێ ئاو لە دۆڵچەکەی خۆت بکەیتە ناو کاسەی ئینسانێکی تێنووەوە و، کاتێ گەیشتی بە برای خۆت ڕووت خۆش بێ لەگەڵیدا و، کە دیار نەبوو، غەیبەتی مەکە؛ غەیبەت لە هەر مەجلیسێکدا بێ، دەبێتە هۆی ئەوە کە لای خواوە بارانی ڕق و غەزەب بەسەر ئەو مەجلیسەدا ببارێ، چونکە هەر مەجلیسێ ناوی خوای تێدا ببرێ و قورئانی تێدا بخوێنرێ و ڕێوشوێنی ئاینیی تێدا فێر بکرێ، فریشتەی ڕەحمەت دەوری لێ دەدەن و ڕەحمەتی خوا بەسەر دانیشتووانی ئەو شوێنەدا دەبارێ و دڵیان بە نووری خوا دادەمەزرێ. کەواتە هەر مەجلیسێ موخالیفی ئەم مەجلیسە بێ، غەزەبی خوای بۆ نازڵ دەبێ، پەنا بە خوا لە غەزەبی خوا.

ڕیوایەت کراوە: ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) لە حاڵی زویریدا فەرمووی: ئەی کەسانێ کە بەزمان ئیمانتان هێناوە و بەدڵ ئیمانتان نییە غەیبەتی موسڵمانان مەکەن و مەکەونە دوای عەیبی موسڵمانان، چونکە هەر کەسێ بکەوێتە شوێن عەیبی موسڵمانان و عەیبیان دەربخا، خواش دەکەوێتە شوێن عەیبی ئەو و، دیارە هەر کەس خوای گەورە بکەوێتە شوێن عەیبی، عەیبەکانی هەموو دەردەکەون و نە لە دنیا و نە لە قیامەتدا، داناپۆشرێن و، با لە ماڵی خۆشیدا دانیشێ خوا هەر ڕیسوای دەکا.

ئەنەسی کوڕی مالیك، خوای لێ ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: حەزرەت (د.خ) خوتبەیەکی خوێندەوە، باسی سوودخواردنی تیا کرد و بە گوناهێکی زۆر گەورەی نیشان دا و فەرمووی: درەمێ لە ڕێگای سوودەوە بگاتە دەستی ئینسان گوناهی لە (٣٦) زینا زۆرترە و، ناشیرینترین سوود ئەوەیە ئینسان نامووسی ئینسانی موسڵمان بشکێنێ، واتە: بەغەیبەت کردن و ناوبردنی ئابڕووی ببا.

هەندێ بە زاناکان وتوویانە: گوناهی سوودخواردن بۆیە لە گوناهی زینا خراپترە؛ چونکە کەس ناتوانێ بەئاشکرا زینا بکا و لە ئاشکرا بچێت بەگژی یاسای ئیسلامدا و، بەشی زۆری خەڵك نامووسی خۆیان دەپارێزن. بەڵام سوودخواردن لە قەرز و مامەڵەدا دەبێ و قەرز و مامەڵەیش زۆرتری ئاشکرایە و کابرای سوودخۆر بەئاشکرا حورمەتی ئاین و یاسای ئیسلام دەبا، بەڵام سیری ئەو ژمارە تایبەتییە وا لە عیلمی خوادا.

ڕیوایەت کراوە (ربا) و سوودخۆری لە مامەڵەدا (٧٢) جۆرە. لای کەمیان وەك ئەوە وایە ئینسان زینا لەگەڵ دایکی خۆیدا بکا. لەم هەموو جۆرە سوودەش خراپتر ئەوەیە، ئینسان دەربارەی نامووسی برای موسڵمانی زمان درێژی بکا، واتە: غەیبەتی بکا و لە پاشملە بە جۆرێکی نارەوا ناوی بهێنێ لەناو خەڵکدا نامووسی بباو بیزڕێنێ.

لە جابیرەوە ڕیوایەت کراوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) بەلای دوو قەبرا ڕابوورد و فەرمووی: خاوەنی ئەم قەبرانە سزا دەدرێن، سزاکەشیان لەسەر شتێکە کە لای خەڵك گەورە نییە، بەڵام لای خوا گەورەیە؛ یەکێکیان دوو زمانیی دەکرد و، ئەوی تریان لە کاتی میزکردندا خۆی لەپاش میز پاك نە دەکردەوە و پەلەی دەکرد. پێغەمبەر (د.خ) لەو شوێنەدا لقە دارێکی تەڕی هەڵگرت و کردی بە دوو پارچەوە و هەر پارچەیەکی لەسەر قەبرێکیاندا چەقاند و فەرمووی هیوام وایە بەهۆی زیکری ئەو دوو لقەدارە تەڕەوە، کە مادام وشك نەبن، زیکری خوا دەکەن، خوا سزای ئەم دووانە سووك بفەرمووێ.

براکان: لە فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە دەردەکەوێ داری تەڕ زیاتر لە داری وشك زیکری خوا دەکا و بەهۆی زیکری خواوە سزای ئەهلی سزا لە قەبردا سووك دەبێ، ئەگەرچی ئەسڵی عەزابەکەیان لەسەر دەمێنێ و، بەقیاس لەسەر مادەیە دەردەکەوێ کە قورئان خوێندن لەسەر قەبری مردوو دەبێتە هۆی سووك کردنی سزای؛ چونکە زمانی ئینسان لە لقی داری تەڕ گەورەترە و قورئانی پیرۆزیش لە هەموو زیکرێکی تر گەورەترە. باسی سوود و چاکیی زیکرم لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسیوە.

دەگێڕنەوە: جارێ لە جاران حەزرەت (د.خ) فەرمانی دا بە سەنگەسارکردنی کەسێ کە زینای کردبوو و، لەپاش ئەوە کە وەفاتی کرد یەکێ وتی: ئەم شەخسە کەوا لەو شوێندا مردووە، وەکو سەگ مردووە. حەزرەت (د.خ) قسەکەی بیست و، پاش چەند هەنگاوێ گەیشتە شوێنێ مردارێکی تیابوو بۆگەنی کردبوو، لەوێدا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: کێ دەتوانێ لەم مردارە بخوا؟! عەرزیان کرد: کەس تەبیعەتی ناچێتە سەری. فەرمووی: ئەو قسەیە کە فلان کەس کردی لەو مردارە بۆگەنتر و ناپەسەندتر بوو. لەم فەرموودەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەو کەسەی گوێ ڕابگرێ بۆ غەیبەت مادام بتوانێ مەنعی بکا و نەیکا، لە تاوانی ئەو غەیبەتەدا هاوبەشە.

هەروەها ئەوەش دەردەکەوێ کە غەیبەتی مردوو وەك هی زیندوو حەرامە، بگرە غەیبەتی مردوو خراپترە، چونکە ئاسانە و لەوانەیە زیندووەکە لە ئینسانە غەیبەتکەرەکە

خۆش ببێ و چاوپۆشیی لێ بکا، بەڵام مردووەکە لەدەست دەرچووە و قابیل نییە ئینسان ئازاد بکا.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەس ئاگای لێ بێ، موسڵمانێ زەلیل بکرێ و ئازار بدرێ و پشتوانێ مەنعی ئەو ئازارە لەو موسڵمانە بکا و نەیکا، ئەوە خۆشی لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەرچاوی خەڵکدا بەئاشکرا زەلیل و سووك دەکرێ. لەم فەرموودەوە دەردەکەوێ ئەگەر کەسێ ئاگای لێ بوو یەکێ غەیبەتی یەکێ دەکا و سووکی دەکا و بتوانێ مەنعی ئەو غەیبەتکەرە بکا و نەیکا، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا سووك دەکرێ.

ڕیوایەت کراوە: هاوڕێیانی پێغەمبەر (د.خ) غەیبەتی یەکتریان نەدەکرد و، ئەم غەیبەت نەکردنەیان بە عیبادەت دەژمارد و، غەیبەت کردنیان بە کاری (منافق) دووڕووەکان دادەنا.

هەندێ لە زانایانی ئاینی ئیسلام فەرموویانە: سەلەفی ساڵح و پیاوە گەورەکانی ئیسلام لە بەجێهێنانی نوێژ و ڕۆژوودا ئەوەندە چاکە و کەماڵاتیان نەدیوە بەقەدەر ئەوەندەی کە لە مەنعکردنی نەفس لە باسی عەرز و ناموسی موسڵماناندا هەیە. واتە: پیاوی موسڵمانی ساغ و تەواو ئەوەیە زەممی موسڵمانان نەکا و دەس لە غەیبەتیان هەڵبگرێ و دەستدرێژی نەکاتە سەر ناموسی خەڵك و حورمەتیان نەشکێنێ.

ئیمامی موجاهید لە لێکدانەوەی «وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ»دا فەرموویەتی: (هومەزە) ئەو کەسانەن کە تانە و تەشەر لە خەڵك دەدەن و (لومەزە) ئەوانەن کە گۆشتی خەڵکی دەخۆن. هەروەها هەندێ لە مەعنا لێدەرەوانی قورئان فەرموویانە: وەیل شیوێکە لە دۆزەخدا ئەگەر هەرچی کێوی سەر زەوی هەیە بیخەیتە ناوی هەمووی دەتوێنێتەوە و جۆشیان دەدا و دەیانکوڵێنێ.

ئیمامی قەتادە فەرموویەتی: زۆرترین سزای توندی قەبر سێ بەشە؛ بەشێکیان لە غەیبەتەوەیە و بەشێکیان لە خۆ پاك نەکردنەوەوەیە لە میز. بەشی سێیەمیشیان لە قسەهێنان و قسەبردنیانەوەیە لەناو خەڵکدا.

شێخ حەسەنی بەسری (علیه الرحمة) فەرموویەتی: بنیادەم حاڵی وابێ موسڵمانان عەیبدار بکا، ناگاتە حەقیقەتی ئیمان، واتە: ئینسان ئیمانی کامیل و تەواو نابێ تا نەگاتە پایەیێ کە دڵ و زمانی خۆی بگرێ لە باسی عەیبی موسڵمانان.

مالیکی کوڕی دینار دەفەرموێ: ڕیوایەت کراوە جارێ حەزرەتی عیسا (د.خ) لەگەڵ

کۆمەڵێ لە (حواریین) واتە هاوڕێ دڵسۆزە تایبەتییەکانی لە ڕێگایەکدا سەگێکی تۆپیویان دی. هاورییەکانی وتیان: ئای لەو سەگە چەند بۆگەنی کردووە!. حەزرەتی عیسا فەرمووی وامەڵێن، بڵێن ئای لە دانەکانی چەند سپی و جوانن؟! واتە: تەنانەت لە حاڵی وەهایشدا مادام ئینسان ماوەی هەیە و شتێکی باش هەیە باسی بکا، با ئەو شتە باشە باس بکا و واز لە باسکردنی شتە عەیبەکان بێنێ. لێرەدا مەبەس لەمە ڕاهێنانی نەفسە لەسەر چاوپۆشی کردن لە عەیب و، تا لە توانادا هەبێ بە چاکە نەبێ باسی مەخلووقی خوا نەکرێ.

ڕیوایەت کراوە: هەندێ لە ئەسحابە لە خزمەتی حەزرەتدا (د.خ) بە شوێنێکدا ڕادەبووردن، لەو شوێنەدا بۆنێکی ناخۆش هات بەسەریاندا هەندێکیان فەرموویان: ئای لەم بۆنە پیسە کە هات بەسەرماندا! حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەوە بۆنی غەیبەتە خوای گەورە بە ئێوەی گەیاند. هەروەها ڕیوایەت کراوە چوار تایەفە هەن دەبنە ئازار بۆ ئەهلی دۆزەخ و دەبنە سەرباری ئازار بۆیان؛ یەکەم لەو سێ تایەفە کەسانێکن لە دۆزەخدا قەپ لە خۆیان دەگرن و گۆشتی لەشی خۆیان بە دان دەپچڕن و دەیجوون. کاتێ لێیان دەپرسن: بۆچی وا دەکەن؟ دەڵێن: ئەمە جەزا و پاداشی ئەوەیە کە لە دنیادا غەیبەتی خەڵکمان کردووە.

ڕیوایەت کراوە: زەمان درێژیی ئینسان لە هەتکی نامووسی خەڵکدا یەکێکە لە گوناهە گەورەکان.

براکان! ئەگەر چی غەیبەت گوناهێکی گەورەیە و غەیبەت کراوەکە ئازاری پێ ناگا، بەڵام با مژدەبێ لەو کەسانەی غەیبەت دەکرێن کە قازانجیان کردووە، چونکە ئینسانی غەیبەت کرا و لە ڕۆژی قیامەتدا دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی هەر چاکەیەکی باشی کابرای غەیبەت کردوو هەبێ بەقەدەر غەیبەتەکەی لێ ببا بۆ خۆی.

جا باش وردبنەوە لەم وەزعە: کەسێ کردەوەی چاکی زۆری ببێ لە کاتێکدا کە خۆی زۆر پێویستی بە پاداشتی ئەو کردەوە چاکەی هەبێ، لەناکاودا لە دەستی وەرگرن و لێی ناهومێد ببێ!

دەگێڕنەوە: هەندێ کەس کە لە ڕۆژی قیامەتدا نامەی کردەوەکانی دەدەنە دەست تەماشادەکا گەلێ لە کردەوە باشەکانی نەنووسراون. ئەویش هاوار دەکا و دەڵێ: من فلانە کردەوە و فلانە کردەوەم بووە کەچی نەنووسراون! لەوێدا مەلائیکەکان پێی دەڵێن: ڕاستە ئەو کردەوانەت بووە بەڵام بەهۆی غەیبەت کردنی خەڵکەوە لە دەستی تۆ دەرچوون

و دراون بەوانەی غەیبەتت کردوون و، ئەگەر ئەو کردەوە باشانەت نەبووایەن، دەبووا بە ئەندازەی ئەو غەیبەتانە سزات بدرایە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ غەیبەتی خەڵك بکا و هەتکی ناموسیان بکا حەقە لەسەر خوا بە ئاگری دۆزەخ سزای بدا و، هەر کەس مەنعی غەیبەت بکا لە برای خۆی حەقە لەسەر خوا لە ئاگری دۆزەخ دووری بخاتەوە. هەروەها ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ موسڵمانێ لە دەست و دەمی منافقێ بپارێزێ خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا مەلائیکەیێ دەنێرێ لە ئاگری دۆزەخی بپارێزێ.

حەزرەتی عەبدوڵلای کوڕی عەباس (ر.خ) لە مانای لێدانەوەی «وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً»دا فەرموویەتی: ئەم ئایەتە هەر وەکو ئەوە دەگەیێنێ کە هەر کەس بێتە هۆی پاراستنی یەکێ لە کوشتن وەکو ئەوە وایە هەموو ئادەمیزادی پاراستبێ، ئەوەیش دەگەیێنێ کە هەر کەس مەنعی خەڵك بکا لە هەتکی ناموسی موسڵمانێك و ماوە نەدا غەیبەتی بکەن ئەوش هەر بەو خێرە دەگا.

براکان! لە باسی ناباریی غەیبەتەوە ئەم ئەندازە بەسە. هیوام وایە سوودی لێ وەربگرن، چونکە ئینسانی ژیر هەمیشە بۆ شتێ دەکۆشێ سوودی ببێ و خۆی لە کردەوەی بێ سوود دەپارێزێ.

(والسلام عليكم ورحمة اللّه وبركاته).

لە ١٩ی شەعبانی ١٣٩٦ی ك، ڕێکەوتی ١١-٨-١٩٧٦ی زدا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا

وەرگێڕ

نامەی سی و نۆیەم

# باسی ئەو گوناهە گەورانەیە
# کە پێوەندییان بە عیبادەتەوە هەیە

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمد للّه رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين.

لەپاش ئەمانە، برا خۆشەویستەکانم! ئەم نامانە کە لەمەوپاش بۆتانیان دەنووسم لە باشترین نامەکانن و دیارییەکن لەو باشترین دیارییانە کە دۆست بۆ دۆستی گیانی بەگیانییان بنێرێ، چونکە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (د.خ) ڕیوایەتی کردووە: «ما أهدى مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده اللّه بها هدى أو يرده عن ردى» لە نامەیەکی تایبەتیدا باسی گوناهی گەورەی نادیاریم نووسیوە، وا لەم چەند نامەیشیا گوناهی گەورەی دیاریتان عەرز دەکەم بە تەرتیبی بەشەکانی شەریعەت و، لەم نامەیاندا دەست دەکەم بە باسکردنی گوناهی گەورە، ئەوەی پێوەندیی بە عیبادەتەوە هەیە.

گوناهی گەورە ئەوەیە کە بەبێ تەوبە و پەشیمان بوونەوە، خاوەنەکەی شایانی عەفو نابێ، بەڵکو ئەو گوناهە دەبێتە هۆی سزا و ئازاری گرانی ڕۆژی قیامەت. هەروەها گوناهی گەورە ڕێگای ئەوە دەگرێ کە کردەوەی چاکەی خاوەنەکەی ببێتە کەفارەتی گوناهە بچووکەکانی و، گەلێ زیاتریشی هەیە. لەلایەکی ترەوە پاداشی نەکردنی گوناهی گەورە لە پاداشی عیبادەت کردن گەورەترە، کەسێ گوناهی گەورە بکا، ئەم زیانەشی لێ دەکەوێ کە لە سەوابی نەکردنەکە بێ بەشە و شایانی سزایشە.

زانا گەورەکانی ئاین لە تەعریفی گوناهی گەورەدا چەند بیروڕایان نیشان داوە، بەڵام ڕووناکتریان ئەوەیە هەر گوناهێ لە قورئانی پیرۆزدا یا لە حەدیسی شەریفدا هەڕەشەی لەسەر کرابێ، ئەوە گوناهی گەورەیە. شایانی باسە گوناهی گەورە سێ زیانی لێ پەیدا

دەبێ کە پێغەمبەر (د.خ) لەم حەدیسە شەریفەدا ناوی هێناون: «جزاء المعصية الوهن في الطاعة والضيق في المعيشة والتعس في اللذة. قيل: وما التعس في اللذة؟ قال: لا ينال شهوة حلالا إلا جاءه ما ينغصها أياه». واتە: تۆڵەی تاوان لە دنیادا سێ شتە، یەکەم: سستی لەشە لە عیبادەت کردندا. دووەم: تەنگیی ژیانە. سێیەم: تەعس و مەینەتە لە لەزەتی دنیادا، واتە: ئەگەر خۆشحاڵی و ئاسایش کاریەکی بۆ هەڵکەوێ، شتێکی نابەاری لێ قوت دەبێتەوە، ئەو خۆشی و ئاسایشەی لێ تاڵ و نارەحەت دەکا. شتێکی زۆر ئاشکرایە ئەگەر شوومی و نەگبەتی تاوانباری نەبووایە ئێمە بەم شێوەی ئێستا لە عیبادەت کردن و نوێژ و ڕۆژوو بەجێهێناندا سست و تەمەڵ نە دەبووین و هەوڵی پەیداکردن و هەڵگرتنی توێشووی قیامەتمان دەدا.

جا بۆ هەر گوناهێ بەئیتیفاق گەورە نەبێ دەنووسم: (مین جوملە فلانە گوناه) و، بۆ هەر گوناهێ بەئیتیفاق گەورە بێ، دەنووسم: (مین جوملە فلانە گوناهی گەورە).

گەورەترین گوناهی گەورەی دیار، تەرکی نوێژی فەرزە. باسی خراپیی تەرکی نوێژ لە نامەی خۆیا نووسراوە. شایانی باسە مەترسیی گوناهی تەرکی نوێژی فەرز بەڕادەیەکە ئیمامی عومەر و ئیمامی عەلی (ر.خ) فەرموویانە: هەر کەسێ تەرکی نوێژی فەرز بکا، کافرە، هەرچەند باوەڕیشی ببێ کە نوێژەکە فەرزە. تەنانەت عادەتگرتن بە دواخستنی نوێژی فەرزەوە لە کاتی خۆی بەبێ عوزر گوناهی گەورەیە.

مین جوملە. بەکارهێنانی قاپوقاچاغی ئاڵتوون و زیو بۆ خواردن و خواردنەوە و بۆ کلدان و وێنەی ئەوانە، هەروەها ڕاگرتنیشیان بەبێ بەکارهێنانیان حەرامە و، ئەنگوستیلەی ئاڵتوونیش حەرامە، بەڵام ئەنگوستیلەی زیو مەکرووهە و، لەسەر فەرموودەی (أصح) حەرامە و، هەرچەند بووەتە بەڵای گشتی پێویستە من بەیانی بکەم.

مین جوملە: چوونە سەر ئاو لەسەرە ڕێگەدا یا لە ژێر داری بەرادا یا لە ژێر داری سێبەردارا کە خەڵکی لە سێبەرەکەیدا دابنیشن ئەمەش حەرامە و هۆی لەعنەتکردنی ئادەمیزاد و مەلائیکەیە.

مین جوملە خۆلێ نەپاراستن و گوێ نەدان بە پرژی میز گوناهێکی گەورەیە بەتایبەتی کە میزەکە بەهۆی باوە بێتەوە بەرووی ئینساندا و پیسی بکا. چاری ئەمەیش زۆرە، یەکەم: ئەوەیە کابرا هەندێ خاك و خۆڵی ورد لەبەردەمی خۆیدا کۆبکاتەوە و عەورەتی

لەسەر ئەم خاك و خۆڵە دابنێ تا پرژی میزەکە هەڵنەپرژێتەوە بەرِوویدا. دووەم: بەردێکی ساف دابنێ و لەنزیکەوە میزەکەی بکا بەسەر ئەو بەردەدا.

سێیەم: چەند جارێ بەنەرمی دەست بێنێ بەژێر قامیشیا، ئاوی تیا نەمێنێ، یا چەند جارێ بەنەرمی بکۆکێ تا ئەگەر تەڕاییەك مابێ بێتە دەرەوە.

مین جوملە لە گوناهی گەورەیە: پاك نەکردنەوەی پاش بەجۆرێ کە مرۆ گومانی بێتە سەر ئەوە پیسیی پێوە نەماوە. خەڵکی دەشت لەبەر نەزانین یا لەبەر بێ موبالاتی خۆیان پاك ناکەنەوە و دەرپێ و ئەندامی لەشیان پیس دەبێ و نوێژەکانیان هەموو بەتاڵ دەبێ، بۆیە فەرموودەی حەزرەت وارید بووە لەسەر ئەوە کە زۆربەی سزای قەبر لە غەیبەت کردنەوەیە یا لە خۆ پاك نەکردنەوەوە لە میز.

مین جوملە لە گوناهی گەورەیە: بێ موبالاتی بە دەستنوێژ و بە خۆشۆردن و، مانەوەی هەندێ لەشی ئینسان بەوشکی؛ چونکە ئەو کەسە دەستنوێژەکەی یا خۆشۆردنەکەی بەتاڵ دەبێ و، ئەگەر نوێژ بکا بەبێ دەستنوێژی و یا بە لەش پیسییەوە نوێژ دەکا.

مین جوملە دەرخستنی عەورەت لەبەرچاوی خەڵکدا حەرامە و دەبێتە هۆی بێ مروەتی و بێ حەیایی و لاچوونی کەرامەت و شەرەفی ئینسان.

مین جوملە: جیماع لەگەڵ ژندا لە حاڵەتی حەیزا، کە بەپێی نەسی حەدیسی شەریف دەبێتە هۆی لەعنەتکردن لەو کەسە؛ واتە: ئەو کەسەی لە کات و ساتی حەیزی ژندا جیماعی لەگەڵ بکا ئەوە مەلعوونە.

دەخیل سەد دەخیل! نەڵێن جیماع لە ڕێگەی عادەتییەوە لە حاڵەتی حەیزدا حەرامە، بەڵام لە ڕێگەی غەیرە عادەتییەوە دروستە!!

چونکە جیماع لە ڕێگەی غیرە عادەتییەوە لە هەموو کات و ساتێکدا کاری فاحیشەیە و ئیشی قەومی لووتە و بە یەکێ لە گوناهە زۆر گەورەکان دەژمێررێ، تەنانەت لە حەدیسا باس کراوە کە لەپاش مردن و ناوگۆڕخستنی خاوەنی ئەم کارە ناشایستەی قەومی لووتە مەلائیکەی تایبەتی لەشەکەی دەگوێزنەوە بۆ ناو ئەو کەسانە کە ئەو کارە نابارەیان کردووە.

مین جوملە: (وشم) واتە: خاڵ کوتان لە لەش و، (وشر) واتە: دان تیژکردن و، (نمص) واتە: مووی ڕوخسار هەڵگرتن بەلای قەولی (أصح)ەوە حەرامە، بەڵکو لە گوناهە

گەورەکان حسێب دەکرێن. وەکو لە حەدیسی شەریفدا هاتووە: «لعن اللّه الواشمات والمستوشمات والمتنمصات المغيرات خلق اللّه» واتە: لەعنەتی خوا لەو ژنانە کە خاڵ دەکوتن لەسەر لەشی خەڵك و، لەسەر ئەو ژنە باڵغانە داوا دەکەن خاڵ لە لەشیان بکوترێ. هەروەها لەو ژنانە موو لە ڕوخساری خۆیان هەڵدەکێشن و شێوەی خواکرد دەگۆڕن.

مین جوملە: تێپەڕبوون لە ناوبەینی پێ و سوجدەگای نوێژکەردا بەبێ بەهانەیەکی شەرعی گوناهە، مەگەر لەپێشەوە بەئەندازەی جێگەی نوێژکەرێ خاڵی بێ و ئەم شەخسە بەناچاری بۆ ئەو شوێنە بڕوا، واتە: شوێنی تری نەبێ بۆ نوێژ.

مین جوملە: عادەت گرتنی مەئموم بەپێشکەوتنەوە لە ئیمام بە ڕوکنێ یا دوو ڕوکن حەرامە.

مین جوملە: هەر دێیەك یا هەر گەڕەکێك تەرکی جەماعەت بکەن لە هەر مانگێکا سەد و پەنجا گوناهی گەورە دەکەوێتە سەریان، بە تایبەتی ئەوانەیان کە دەستیان دەڕوا و دەتوانن ئەسبابی جەماعەت پەیدا بکەن.

مین جوملە: بە شێوەی تەعظیم و بەگەورەترین بەردی کێڵی قەبر یا شوورای قەبری پیاوی گەورە ماچ کردن حەرامە و، هەندێ لە زانایان فەرموویانە: مەکرووهە. بەڵام ڕای ئەمانە بێ هێزە.

هەروەها سەفەر کردنی ژن بەبێ هاوڕێی مەحرەم حەرامە. بەڵام ئەگەر سێ ژنی بەحیشمەت بن، دروستە پێکەوە بڕۆن، مەبەست لە ژنی بەحیشمەت، ژنێکە خاوەن ئەدەب و خاوەن شەخسییەت بێ. هەروا بەتەنیا لەگەڵ ژنێکی نامەحرەما دانیشتن یا ڕاوەستان یا نووستن یا سەفەر کردن حەرامە. بەڵام ئەگەر پیاوێ لەگەڵ دوو ژنی نامەحرەمدا سەفەر بکا ئەوە دروستە.

مین جوملە: تەشائوم و تەتەییور حەرامە، بۆ نموونە: کەسێ بڕوا بۆ سەفەرێ و لە سەرەتاوە قەلەڕەشی بێتە پێش چاوی، ئەویش بڵێ ئەمە نیشانەی ئەوەیە ئەم سەفەرەم بەدئەنجام و بەدیوومە. ئیتر بگەڕێتەوە و سەفەرەکەی دوابخا. یا لەو کاتەدا کە بۆ مەبەستێکی خۆی دەڕوا بگا بە یەکێ و لێی بپرسێ: ناوت چییە؟ ئەویش مەسەلا بڵێ: ناوم (ڕەشە)یە، ئەویش بڵێ: ئەم سەفەرەم ڕەشە و، گورج بگەڕێتەوە. ئەم جۆرە کار و هەڵسوکەوتانە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا ناشیرینن و ئینسان لەسەر ئەم جۆرە

بیروباوەڕانە گوناهبار دەبێ، بەتایبەتی ئەگەر باوەڕی وابێ ئەمانە تەئسیریان هەیە، ئەوە بۆنی کافربوونی لێ دێ.

مین جوملە: لە شوێنێکدا کە نوێژی جومعەی تیا واجیب بێ، هەر کەس بڵێ: من نوێژی نیوەڕۆ دەکەم و نوێژی جومعە ناکەم پێویستە سوڵتانی شەرع بیکوژێ، جا نەخوازەڵا کە نە نوێژی نیوەڕۆ و نە نوێژی جومعە هیچیان نەکا؛ چونکە بەئیجماعی زانایانی ئاین نوێژی جومعە لەسەر پیاوانی بێ عوزر فەرزی عەینە و، وەکو جەماعەتی نوێژەکانی تر نییە کە فەرزی کیفایەیە.

مین جوملە: هەنگاونان بەسەر ڕیزی جەماعەتدا بەجۆرێ ئازار بە یەکێ لە ئەهلی جەماعەت بگەیێنێ.

مین جوملە: دانیشتن لەناویەینی هەڵقەی خەڵکدا بەجۆرێ کە پشت بکا لە خەڵك و ئازار بەدڵیان بگەینێ، ئەوە حەرامە و ئەگەر ئازاری پێ نەگەیاندن مەکرووهە.

مین جوملە: لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشم بۆ پیاو حەڕامە. ڕیوایەت کراوە: کەسێ لە دنیا ئاوریشم بپۆشێ، ئەوە لە قیامەتدا لێی حەرام دەکرێ.

مین جوملە: هەر ژنێ پۆشاکی پیاوانە بکاتە بەر، یا هەر پیاوێ پۆشاکی ژنانە بکاتەبەر، ئەوە ئەو کارەیان حەڕامە و ئەو کەسە لەعنەتی لێ کراوە. هەروەها هەر پیاوێ دەست و پێی لە خەنە بگرێ وەك ژنان ئەوە خوای گەورە لەعنەتی لێ دەکا و مەلائیکەکان لەسەر ئەو لەعنەتە ئامین دەکەن.

مین جوملە: هەر ژنێ پۆشاکێکی ناسکی وەها بکاتە بەر کە ڕەنگی پێستی لەشی لێوە دەربکەوێ ئەوە مەلعوونە.

مین جوملە: هەر ژنێ یا هەر پیاوێ لە مردنی خزمێکیدا ڕووی خۆی بڕنێ یا شەقازلە لە ڕووی خۆی بدا یا چەپۆك بەسەری خۆیدا بدا یا یەخەی خۆی دادڕێ ئەوە گیرۆدەی گوناهی گەورەیە. هەروەها ئەگەر بانگەواز هەڵدا و چاکە و کردەوە و شێوەی مردووەکە هەڵبدا، ئەمانە هەموو بە گوناهی گەورە دادەنرێن و، ئەو کەسەی ئەم کارانە دەکا مەلعوونە. خۆ ئەگەر مردووەکە کاتی خۆی وەسیەتی کردبێ کە ئەوانەی بۆ بکەن ئەوا ئەویش سزا دەدرێ و، ئەوانەی کە ئەو ڕەفتارانە دەکەن حەزرەت (د.خ) خۆی دوور خستووتەوە لێیان و فەرموویەتی: ئەوانە لە ئێمە نین. هەر لەم ڕووەوە لە ئیمامی

عومەرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە جارێ گریانی یەکێکی بیست و ڕۆیشت بەدەمیەوە لە نزیکی ئەو دەنگەوە کۆمەڵێکی پێش چاو کەوت بۆ مردوویەك دەگریان و، ژنێ لەناویاندا بە باڵای مردووەکەیای هەڵدەدا، ئەوانیش لەسەر ئەو دەنگ و ئاوازە دەگریان. حەزرەتی عومەر (ر.خ) یەکەیەکە دەستی کرد بە لێدانیان تا گەیشتە سەر ژنەکە. بەهێز لەویشی دا بەجۆرێ کە سەرپۆشەکەی لەسەر داکەوت. ئەمری فەرموو یەکێکی تر لەو ژنە سەرقەتارە بدا و، فەرمووی: ئەم ژنە لەبەر پارەکەی خۆی دەگری و هەر لەبەر پارەکەی خۆیشی فرمێسکی بێ سوود بە ئێوەش دەڕێژێ. خوای گەورە فەرموویەتی: ئێوە لەسەر ئەم جۆرە بەلایە خۆگر بن و سەبر بکەن، ئەو ژنەش فەرمان بە گریان دەدا دژی ئەمری خوای گەورە دەجووڵێتەوە!

مین جوملە: شکاندنی ئێسقانی مردوو حەرامە وەك شکاندنی ئێسقانی زیندوو. هەروەها پێکەنین و قسە و باسی دنیایی لەسەر قەبران بەبێ پێویستی حەرامە و، هەندێ لەو زانایانە فەرموویانە: گوناهی گەورەیە.

مین جوملە لە کاتی زیارەتی قەبری ئەولیادا سەردانەواندن تاڕادەی ڕکووع بەنیازی تەعزیم و ماچکردنی بەردی قەبرەکان حەرامە.

مین جوملە: حەز بە مردن نەکردن و لە ترسی سزای گوناهـ و کەموکووڕیی ئینسان، گوناهە. بەڵام بە فەرموودەی زۆر ڕاست گوناهی کەبیرەیە. خۆ ئەگەر ئەو حەز بە مردن نەکردنە لەبەر بەدگومانی بێ و کابرا وابزانێ کە خوای گەورە عەفووی ناکا، ئەوە بە ئیتیفاق گوناهی کەبیرەیە.

مین جوملە: مەنعی زەکات و سەرفیترە گوناهی کەبیرە وەکو لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسیومە. هەروەها لەسەر زمانی حەزرەت (د.خ) لەعنەت لەو کەسانە کراوە کە مەنعی زەکات و سەرفیترە دەکەنێ و نایدەن بەوانە کە موستەحەقن و، لەبەر پایەی گەورەی حەزرەت نەبوایە (د.خ) دەبوا ئەوانە کە مەنعی زەکات و سەرفیترە دەکەن مەسخ بوویبوونایەتەوە وەکو بەنی ئیسرائیلییەکان کە ڕەنگ و شێوەیان ڕۆیشتە سەر شێوە و ڕەنگی مەیموون و بەراز.

مین جوملە: باجگرتن گوناهی کەبیرەیە و، هەر کەس ئەم ڕەفتارەی هەبێ، بێجگە لە سزای قیامەت لە قبووڵ بوونی دوعاش ناهومێدە، واتە: لەو کاتانەدا کە کاتی قبووڵ

بوونی دوعای خێرن ئەو باجگرانە دوعایان لێ قبووڵ ناکرێ، بۆ نموونە لە بەرەکەت و پیرۆزیی دوعای نیوەی مانگی شەعبان بێ بەش دەبن. مین جوملە: داواکردنی ئینسانی دەوڵەمەند بۆ سەدەقەی تەتەوع لەبەر ئەوە کە ماڵ زۆر بکا و دارایی بنێ بەیەکەوە ئەوە گوناهی گەورەیە. دیارە دەوڵەمەند کەسێکە کە گوزەرانی ماوەیەکی درێژی ببێ. بەڵام وەرگرتنی زەکات دروستە بۆی، مەگەر کیفایەتی ژیانی عومری غاڵبی ببێ.

مین جوملە ئینسانی فەقیر لە داواکردنی ماڵا ئەوەندە ئیلحاح بکا کە ئازاری دڵی خاوەن ماڵەکە بدا، چونکە خوا خۆشی لە داواکەرێ نایێ کە ئیلحاح بکا. بەڵام داواکەرێ کە ناچار بێ، قەی ناکا ئیلحاح بکا بۆ ئەوەی شتێکی دەست بکەوێ پێی بژی.

مین جوملە ئیحسان کردن و خێرکردن بە بێگانە، لە کاتێکدا دایك و باوك و خزم و خوێشی خاوەن خێرەکە، خۆی فەقیر و داماو بن، گوناهە. لە حەدیسا هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا خوا بەڕەحمەت تەماشای ئەو کەسانە ناکا کە باوك و دایك و خۆشیان موحتاجن و خزمەتیان ناکەن و خزمەتی غەیری ئەوان دەکەن. بەڵێ ئەگەر خزمەکانی بەدکردار بن و بێگانەکە ئینسانێ چاك بێ ئەوە قەی ناکا خزمەتی ئەوان بکا و خزمەتی ئەمان دەکا.

مین جوملە: منەت کردن بەسەر ئەو کەسانەدا کە چاکەیان لەگەڵ نەکا گوناهی گەورەیە و پاداشی چاکەکەش بەوە پایەماڵ دەبێ. هەروەها داواکردنی شتێ لە یەکێ بە ناوی خوای گەورە، بۆ نموونە بڵێ: بۆ خاتری خوا ئەم شتەم پێ بدە، شتەکەش لای خاوەنەکەی خۆشەویست بێ، ئەوە حەرامە. بەڵام ئەگەر شتەکە لای خاوەنەکەی خۆشەویست نەبێ و نەشیداتێ، ئەوە هەردووکیان گوناهبار دەبن؛ داواکەر لەبەر داواکردنەکەی و ناوی خوا بەکارهێنانەکەی و، داوالێکراویش لەبەر نەدانەکەی. هەندێ لەو زانایانەش فەرموویانە: نەدانەکەی حەرام نییە بەڵکو تەنیا مەکرووهە.

مین جوملە ڕۆژوو نەگرتن لە مانگی ڕەمەزاندا بەبێ عوزرێکی شەرعی، وەکو نەخۆشی و سەفەرکردن، گوناهی کەبیرەیە. بەڵێ ئینسانی ئیشکەر کە ناتوانێ بەڕۆژوو بێ لە شەوا نییەتی ڕۆژوو بێنێ و کە ڕۆیشت بۆ ئیشەکەی دەوام بکا لەسەر ڕۆژووەکەی و ئەگەر بێ تاقەت نەبوو ڕۆژووەکەی بباتەسەر. خۆ ئەگەر لە توانایدا نەما، تەوای بکا، بیشکێنێ، ئەوە دروستە. شایاتی باسە شکاندنی ڕۆژووی یەك ڕۆژ لە ڕەمەزان گوناهێکی گەورەیە و، لەم ڕووەوە زاناکان فەرموویانە: ئەگەر پاش ئەوە هەموو عومری بەڕۆژوو بێ ناگاتە

ئەو پایەی دەستی دەکەوت ئەگەر لەکاتی خۆیدا بیگرتایە. واتە: هەر چەند بەڕۆژووی ڕۆژی قەزای ڕۆژێ دەکرێتەوە، بەڵام قیمەت و نرخی ڕۆژوویکی نییە لەکاتی خۆیدا بگیرێ. هەروەها هەر ڕۆژوویێ کە بەبێ بەهانەی شەرعی بشکێنرێ، پێویستە (فوراً) لەپاش مانگی ڕەمەزان و جەژن قەزا بکرێتەوە. ئیتر بە دواخستنی بێ بەهانەی شەرعی کابرا تووشی گوناهی گەورە دەبێ.

مین جوملە: ڕۆژووگرتن لە ڕۆژی جەژنەکاندا و لە سێ ڕۆژی پاش جەژنی قورباندا حەڕامە؛ چونکە دەبێتە هۆی گوێ نەدان بە میوانداریی خوا بۆ موسڵمانان.

مین جوملە: تەرکی هەر تاعەتێ کە نەزری کردبێ لەسەر خۆی گوناهی گەورەیە.

ئەوانەی موحەڕەماتی حەجن لە نامەی تایبەتدا بەیان کراون. دیارە هەر کەسێ توانای حەجی هەبێ و بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا و شەرعی حەج نەکا لە حەدیسایە ئارەزووی هەیە بە جوولەکەیی ئەمری یا بە گاوری دەمرێ یا بمرێ.

مین جوملە: بڕینی گوێ و لێوی حەیوانات حەڕامە. هەروەها داخکردنی ڕوویان حەڕامە و لای هەندێ لە زانایان گوناهێکی گەوریە.

بەڵام داخکردنی گوێی حەیوان دروستە.

مین جوملە هەر حەیوانێ گۆشتی بخورێ و کابرا سەری ببڕێ و گۆشتەکەی نەخوا و بەجێی بێڵێ، ئەوە حەڕامە. هەروەها پاش ئەوەی سەربڕا و پێش گیان دەرچوونی بڕینی دەست و دڕینی سکی حەڕامە.

مین جوملە: سووتاندنی حەیوانی زیانبەخش بە ئاگر حەڕامە و فتوای سووتاندنی نادرێ.

مین جوملە: کەسێ دینی خۆی بدا بە دنیای غەیری خۆی، ئەوە گوناهی گەورەیە. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «ألا أنبئك بشرار الناس؟ من أكل وحده ومنع رفده وضرب عبده. ألا أنبئنك بشر من هذا؟ من باع آخرته بدنيا غيره». مەنعی (رفد) واتە: مەنعی بەخشش لە داماوان.

لەم فەرموودە پیرۆزەدا، باسی سێ پایەی تاوان کراوە کە دووەم لە یەکەم خراپترە و سێیەم لە دووەم خراپترە، ئەوەیە ئینسان دینی خۆی بۆ دنیای غەیری خۆی لە کیس بدا؛

وەك خزمەتكار و یارمەتیدەری ستەمكاران، ئەم جۆرە كەسانە وەك مەشهووره (خسر الدنیا والآخره)ن؛ قیامەت و دنیایان هەردوو لەكیس چووە.

براكان پێویستە ئینسانی موسڵمان ئاگای لە گوناهە گەورەكان بێ؛ چونكە زانینی ئەوە قازانجی زۆرە. ئینسان ئەگەر خوا تەوفیقی بدا خۆی لێیان دووردەخاتەوە و، ئەگەر گیرۆدە بوو پێیانەوە ئومێد هەیە تەوبە بكا و لێیان پەشیمان بێتەوە و داوای عەفوو لێبووردن لە خوای گەورە بكا.

(والسلام علیكم ورحمة اللّه وبركاته).

لە ٢٨ی شەعبانی ١٣٩٦ی ك، ڕێكەوتی ٢٤-٨-١٩٧٦ی ز دا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا

وەرگێڕ

## نامەی چلەم

# باسی ئەو گوناهە گەورانە دەکا

# کە پێوەندییان بە موعامەلاتەوە هەیە

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمد للّه، والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين والتابعين بأحسان إلى يوم الدين.

براکانم! گوناهە گەورە پەنامەکییەکانم لە نامەی تایبەتیدا نووسیوە، چونکە ئەوانە نەخۆشیی دەروونن. لەم نامەدا گوناهی گەورەی ئاشکراتان بۆ دەنووسم. هیوام وایە لە درێژیی باسەکەم ماندوو نەبن، تا بەکورتی لە گوناهە گەورەکان ئاگادار ببن و پارێزیان لێ بکەن و، ئەگەر خوانەخواستە تووشیان بوون، لێیان پەشیمان ببنەوە؛ چونکە گوناهی گەورە وەکو گوناهی بچووك نییە کردەوەی چاك بێتە کەفارەتی و ڕای ماڵێ. سزا و ئازاری گوناهی گەورە زۆر توندوتیژە، بگرە هەندێ لەو گوناهە گەورانە دەبنە هۆی پایەماڵ بوونی کردەوەی چاکە و هەندێکیان دەبنە هۆی ئاخرشەڕی و بێ ئیمانی و، دەبنە هۆی سێ زیانی تر لە خاوەنەکانیان؛ وەك حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «جزاء المعصية الوهن في الطاعة والضيق في المعيشة والتعس في اللذة. قيل: وما التعس في اللذة؟ قال: لا ينال شهوة حلالا إلا جاءه ما ينغصه أياها».

مین جوملە: وەرگرتنی قیمەتی ژنی ئازاد، واتە: فرۆشتنی بە پارە لە کاتێکدا دەیدا بە شوو، یانێ ئەو پارە وەربگرێ کە مەشهوورە بە (شیربایی) بە گوناهی کەبیرە دەناسرێ. لە حەدیسدا هەیە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: من لە ڕۆژی قیامەتدا دژ و دوژمنی ئەو کەسەم کە کچی خۆی بفرۆشێ و پارەکەی بخوا، ئاشکراشە هەر کەسێ من دوژمنایەتیی لەگەڵدا بکەم بەسەریدا زاڵ دەبم.

مین جوملە: ڕیبا واتە سوودخواردن گوناهی گەورەیە. تەنانەت گوناهە گەورەکان، کە لە حەوسەد زیاترن، نۆیان لێ جیا کراونەتەوە و، لەو نۆیشە حەوتیان جیا کراونەتەوە و،

لەناو ئەو حەوتە جیاکراوانەدا ڕیبا، واتە سوودخواردن، لە هەموویان نابارتر و نارەواترە. ئەم گوناهە ئەوەندە گرانە شاهێد و نووسەر و یارمەتیدەریش دەگرێتەوە واتە: ئەم سێیانەیش وەك سوودخۆرەکە تیا گوناهبار دەبن و بەر نەفرینی خوا دەکەون.

دەگێڕنەوە: لە ڕۆژی قیامەتدا کە مردوو زیندوو دەکرێتەوە، سوودخۆرەکان لەسەر شێوەی سەگ و بەراز زیندوو دەکرێنەوە؛ چونکە ئەمانە بەشێوەی فڕوفێڵ ماڵی داماوانیان وەرگرتووە و بە ناحەق خواردوویانە.

ڕێکخستنی ئەم ڕیوایەتە لەگەڵ ئایەتی ڕیبادا بەم جۆرە دەبێ بڵێین سوودخۆرەکان دوو جۆرن: یەکەم کە لە گۆڕ دەرچوون شێوەیان دێتە سەر شێوەی سەگ و بەراز و، لەپاش ماوەیەکی کەم وەك لەوەوپێش دەچنە سەر شێوەی ئادەمیزاد. لەم بابەتەوە حەدیسی زۆر ڕیوایەت کراوە. دووەم ئەوەیە کە لە گۆڕ دەرچوون بە شێوەی سەگ و بەراز زیندوو دەبنەوە و هەروا دەمێنێتەوە تا ئاخری ڕۆژی حەشر، ئەنجا دەگەڕێنەوە سەر شێوەی ئینسان. لەم بابەتەشەوە حەدیس ڕیوایەت کراوە. بەڵام بۆ دەرخستنی پەستیی پایەی سوودخۆرەکان ئەم ئایەتە پیرۆزە بەسە کە دەفەرمووێ: «الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ» واتە: ئەو کەسانەی لە دنیادا سوود دەخۆن لە ڕۆژی قیامەتدا خۆیان بەپێوە ڕاناگرن و کە هەڵدەستن دەڵێی فێ لێی داون و شەیتان دەستی لێ وەشاندوون و، کە بە ڕێگەدا دەڕۆن بەم لاو لادا لەتر دەدەن!

لێرەدا بەکورتی باسی سوود دەکەم، چونکە لە نامەی تایبەتیدا بەدرێژی باسی کراوە. دیارە سوود تاوانێکی زۆر گرانە و، هەر فێڵ و فڕێ بۆ خواردنی سوود ڕێك بخرێ لای ئیمام مالیك و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بە گوناهی کەبیرە حسێب دەکرێ. تەنانەت دیاری بۆ بردن و خزمەتکردنی خاوەن ماڵ نارەوایە و وەرگرتنیان لەلایەن ئەو کەسانەوە کە بۆیان دەبرێ، حەرامە، ئەگەر لەوەوپێش دۆستی و دیاری و خزمەتی دۆستانە لەبەینیاندا نەبووبێ.

مین جوملە: مەنع کردنی نێر وەك ئەسپ و بەران لە ڕەوگ و ڕانی خەڵك، لەکاتی پێویستدا، گوناهی کەبیرە. هەروەها خواردنی ماڵی خەڵك بە ناحەق و نارەوا چ بەشێوەی غەسب و داگیرکردن یا بەشێوەی قومار یا بە حیلە و فێڵ وەك موعامەلەی نادروست و ناڕاست، یا بەشێوەی (بيع المعاطاة) لە شتی خاوەن قیمەت و ئیعتیباردا، ئەمانە هەموو گوناهی کەبیرەن و، بەپێی دەلالەتی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) خواردنی حەرام دەبێتە کۆسپ لە ڕێگای قبووڵی نزا و پاڕانەوەدا و، دەبێتە هۆی کەموکوڕیی تاعەت یا قبووڵ

نەبوونی. هەروەها ئەو گۆشتەی بەهۆی خواردنی ماڵی حەرامەوە لە لەشی ئینساندا نەشونوما دەکا لە ڕۆژی.قیامەتدا بە ئاگری دۆزەخ دەسووتێ.

ڕیوایەت کراوە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ڕۆژی قیامەت هەندێك كەس دێنن بەئەندازەی کێوێ لە کێوەکانی مەککە خێرات و کردەوەی چاکیان هەیە، بەڵام هیچ کام لەو چاکانەیان لێ قبووڵ ناکرێ و دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە. هاورییەکانی پێغەمبەر عەرزیان کرد: بۆچی وایە؟. فەرمووی: ئەمانە نوێژ و ڕۆژوو و حەجی ماڵی خوایان بەجێ هێناوە، بەڵام هەر کاتێ حەرامێکیان بۆ هەڵکەوتبێ، بێ یەك و دوو وەریان گرتووە و خواردوویانە! بەم هۆوە چاکەکانیان بێ سوود دەرچوون.

مین جوملە: (أحتكار) لە گوناهە گەورەکانە، واتە: ڕاگرتن و شاردنەوەی ڕزق و ڕۆزی و ئەو شتانەی بۆ ژینی ئادەمیزاد پێویستن لە ڕۆژی گرانی و شیدەتی پێویستی موسڵماناندا، واتە: خەڵکی بیانەوێ ئەو شتانە بە پارە بکڕن خاوەنەکانیان نەیانخەنە بەر و نەیانفرۆشن، دیارە ئەم کارە بەمەرجێ گوناهە کە ئەو شتانە زیاد بن لە پێویستیی ژیواری خاوەنەکانیان. لە فەرموودەی حەزرەتەوە (د.خ): ئەو کەسانە کە مەنعی تەعام دەکەن لە خەڵك خوای گەورە لێیان بەرییە و دوورن لە ڕەحمەتەوە.

مین جوملە لە گوناهە گەورەکانە یارمەتیدانی خەڵك لەسەر تاوانکردن، وەك ئەوە مێوژ و ترێ بفرۆشێ بەو کەسانەی دەیانکەن بە شەراب، یا دارێ بدەی بە کەسێ بیکا بە ئەسبابی ساز و سەمتوور، یا چەك بفرۆشێ بەو کافرانە کە دژی ئیسلام جەنگی پێ دەکەن، یا بەو کەسانە کە ڕێ لە کاروانی موسڵمانان دەگرن، یا ماڵی خەڵکی دەبڕن و دزی دەکەن.

هەروەها لە گوناهە گەورەکانە کەسێ منداڵێکی موو لێ نەهاتوو بداتە دەستی کەسێ کە بزانێ بەدڕەوشتە و فیسق و فجووری لەگەڵدا دەکا. یا پەلەوەرێ وەك کەو و مریشك و کەڵەشێر بفرۆشێ بەو کەسانە کە شەڕیان پێ دەکەن و بەشەڕیان دەدەن لەگەڵ یەکتردا. مین جوملە: فرۆشتن لەسەر فرۆشتن گوناهی گەورەیە، واتە: ماڵێکت بە یەکێ فرۆشتبێ کەچی لەپاش ئەو بیفرۆشی بە یەکێکی تر. هەروەها کرین لەسەر کڕین، واتە شتێ کە یەکێکی تر کڕیویە تۆ بڕۆی بیکڕی لەو کەسە کە فرۆشتوویە. یا خوازبێنی لەسەر خوازبێنی، واتە کەسێ خوازبێنیی کچێکی کردووە و پێیان داوە کەچی یەکێکی تر بڕوا خوازبێنی ئەو کچە بکا لە خاوەنەکەی و داوای بکا بۆ خۆی و بەهۆی ئەمەوە نەیدەن بە خوازبێنیکەری یەکەم.

مین جوملە لە گوناهی گەورەیە گومکردن یا باس نەکردنی عەیبێ لە ماڵێکدا کە بفرۆشرێ، یا لە خوازبێنیکەر یا لە خوازبێنیکراودا لەپاش پرسیار.

مین جوملە: غەش و حیلە و فێڵ کردن لەگەڵ موسڵمانان و لەگەڵ ئەهلی زیممەی وا کە زیانیان بۆ موسڵمانان نەبێ، گوناهی گەورەیە. فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) کەسێ شتێکی عەیبدار بفرۆشێ و باسی ئەو عەیبە نەکا و بە کڕیارەکەی نەڵێ، دەکەوێتە ناو غەزەبی خوای گەورە و تێکەوتنێکی خراپ و ناڕەحەت. قال اللّه تعالی: «وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ» واتە: مەکری خراپ دەوری کەس ناگرێ و زیانی بۆ کەس نابێ بۆ خاوەن مەکرەکە نەبێ.

مین جوملە: فرۆشتنی ماڵ بەهێزی سوێندی درۆ لە گوناهی گەورەیە، وەك ئەهلی مامەڵەی ئەم چەرخە دەیکەن، بە تایبەتی جانبازە حەیوان کڕەکان کە بە درۆ و فێڵ بە هەزاران حەیواناتی خەڵکی لادێ بە هەرزان دەکڕن. لە حەدیثدا هەیە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بە میهرەبانی تەماشای ئەم چەشنە تاوانبارانە ناکا.

زیانی ئەم تاوانەم لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسیوە.

مین جوملە: لە گوناهی کەبیرەیە قەرزکردن بەنیازی ئەوە کە نەیداتەوە بە خاوەن قەرزەکە وەك کاری زۆربەی قوماربازەکانی ئەم زەمانە. هەروەها قەرزکردنی ئینسانی لات و بێ دەسەڵات کە ئومێدی توانای دانەوەی ئەو قەرزەی نەبێ و شتێکی وا قەرز بکا کە لە ژیندا ناچار نەبێ پێی.

مین جوملە: دواخستنی دانەوەی قەرزی وەها کە قەرزدارەکە دەستەڵاتدار بێ؛ لە حەدیسایە: «مطل الغني ظلم» واتە: پیاوی دەوڵەمەند کە قەرز دوابخا و لە وەخت و وادەی خۆیدا نەیداتەوە کارەکەی بە زوڵم حسێب دەکرێ و هەموو ڕۆژێ لەسەری دەنووسرێ: ئەم کابرایە زاڵمە و پاداشی نوێژ و ڕۆژووی بۆ نانووسرێ.

هەروەها لە جوملەی گوناهە گەورەکانە ئەمە کە ئینسان قەرزاری خۆی بدا بە حەپسکردن و ئازاردان و لەکاتێکدا بزانێ قەرزارەکەی بێ دەستەڵاتە و ناتوانێ ئەو قەرزە بداتەوە. لە جوملەی گوناهە گەورەکانە خواردنی ماڵی هەتیو یا فەوتاندنی. هەندێ لە زاناکان فەرموویانە: خواردنی ماڵی هەتیو هۆی بەدبەختی و ئەنجام شەڕی، بێ ئیمانی و بێ دینییە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ

الْيَتَامَى ظُلْماً إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَاراً وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيراً». واتە: بەڕاستی ئەو کەسانە کە بەشێوەی ناشەرعی ماڵی هەتیو دەخۆن و دەیفەوتێنن، ئەوانە پڕ بە سکی خۆیان ئاگر دەخۆن و لە پاشەڕۆژدا دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەر هەیە (د.خ) کە حەقە لای خوا ئەو کەسە نەباتە بەهەشتەوە و عەفووی نەکا، تا بەهۆی ئەو گوناهەوە ماوەیەك نەیسووتێنێ و سزای نەدا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە سەرفی ماڵ لەپێناوی گوناها، چ گوناهی گەورە و چ بچووك، چ ماڵی زۆر و چ کەم.

هەروەها لە جوملەی گوناهی گەورەیە ئازاردانی دڵی دراوسێ چ ئازاری زۆر و چ کەم، هەر چەندە دراوسێیەکەش گاور و جوولەکە بێ. ئەم باسەم بە تایبەتی نووسیوە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە دروستکردن و بەرزکردنەوەی خانوو زیاتر لە ئەندازەی پێویست بۆ خۆبەرزکردنەوە بەسەر خەڵکدا.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە ئەمە کە ئینسان لە بەینی موڵکی خۆی و موڵکی خەڵکا نیشانەی موڵك بگۆڕێ بەجۆرێ ببێتە هۆی ئیشتیباه و لێ تێکچوونی ئەو کەسانە کە مەبەستیانە لە یەك جیابکرێنەوە.

هەروەها هاتوچۆکردن بە موڵکی خەڵکدا، بۆ ئەوەی خەڵکی بە خاوەن حەقی بزانن لە هاتوچۆدا، لەم بابەتەوە فەرموودەی حەزرەت (د.خ) هەیە.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە، تەنگ کردنەوەی شەقامی گشتی بەهۆی کەپر دروستکردن یا سەکۆ یا شتی ترەوە بەجۆرێ کە ڕێبوارەکان نەتوانن بەو ڕێگەدا بڕۆن، یاخۆ ببێتە هۆی زەحمەت بۆ هاتوچۆی حەیوان و کاروان بەو ڕێگەدا.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە، خیانەت کردن لەگەڵ شەریکە موڵکدا. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: من لە ڕۆژی قیامەتدا لەو خائینانە بەریم.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە: ئیقرار کردنی نەخۆش بە قەرز و حوقووق بۆ خەڵکی تا میراتگری شەرعی لە ماڵەکەی بێ بەش بن.

هەروا ئەمەش گوناهی گەورەیە کە نەخۆش لە حوقووقی خەڵکی بێدەنگ بێ تا ئەو حوقووقە بفەوتێ و بە خاوەنەکەی نەگات. هەروەها گوناهی گەورەیە یەکێ ئیقراری

نەسەب بۆ كەسێ بكا كە لەو نەبێ و بە ناحەق بیكا بە میراتبەری خۆی. هەروا بەكارهێنانی ماڵی (عاریە) واتە خواستەمەنی، زیاد لەو ئەندازەی خاوەنەكەی ڕێگەی داوە، حەرامە و گوناهی گەورەیە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ئەمە كە خاوەن كار لە وەختی خۆیدا كرێ بە كرێكارەكانی نەدا. لەو بابەتەوە حەدیس هەیە كە خوا فەرموویەتی: من دوژمنی ئەو كەسانەم كە حوقووقی خاوەن حەق زایە دەكەن.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە مەنعكردنی حقووقی گشتی لە موسڵمانان وەك پووش و گیا و ئاو و ئاگر و دار بەجۆرێ كە زیانیان پێ بگا و بكەونە بێ ئاسایشی و تەنگانییەوە. هەروەها مەنعكردنی ڕێگە و هاتوچۆ لە موسڵمانان بەم جۆرە ڕێگای هاتوچۆی خەڵكی بكا بە موڵكی خۆی و قەراغی چەم داگیر بكا و كۆڵانی هاتوچۆ بكا بە بینا وموڵك بۆ خۆی.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە داگیركردنی ماڵی وەقف یا سەرفكردنی بە خیلافی شەرتی واقیف با خۆشی نەیخوا و بیدا بە خەڵك بیخۆن. دیارە ئەگەر خۆی بیخوا ئەوە گوناهی زۆرترە و بەشی زۆری خوای گەورە هەر لە دنیادا تۆڵەی لێ دەسێنێ؛ چونكە گوناهێ لە فەوتاندنی حەقی خەڵكەوە پەیدا ببێ، خوای گەورە تۆڵەكەی دوادەخا، تا لە قیامەت ببێتە هۆی سووك بوونی سزای حەق خوراوەكان. دیارە ئەوقاف حەقی خوایەو خوای گەورەش پێویستی بە هیچ نییە و هەر لە دنیادا حەقی خۆی وەردەگرێ. بەراورد كراوە هەر كەس ماڵی وەقفكراو بخوا خوای گەورە لە دنیادا حەقی لێ دەسێنێ.

لە گوناهە گەورەكانە: تەسەروف كردن لە ماڵی دۆزراوەدا پێش ئەوە كە مەرجی تەسەڕوف كردنەكە بێتەجێ، وەك بانگەواز و باسكردنی لەناو خەڵكدا و پێش ڕابووردنی ساڵێ بەسەریدا.

لە گوناهە گەورەكانە: لادان لە ئەندازەی شەرعی لە وەسیەتكردندا، واتە: بە زیاتر لە سێیەكی ماڵی وەسیەت بكا و مەبەستی زیان گەیاندن بێ بە میراتبەری خۆی، یا ئیقراركردنی بە قەرزاریی كەسێ تا ماڵەكەی بدرێ بەو كەسە و نەدرێ بە میراتبەری، یا موڵكی خۆی زۆر بە هەرزان بفرۆشێ بە هەندێ كەس تا میراتبەرەكانی لە میرات بێ بەش ببن، یا وەسیەت نەكردن بە حەقێ كە لەسەری بێ یا بە ئەمانەتێ كە لای دانرابێ.

له ڕاستیدا خێری قبووڵکراو ئەوەیە کە ئینسان (للّه) و (في اللّه) له حاڵی ساغ و سەلامەتیی خۆیدا ماڵ له ڕێگای خوادا سەرف بکا، تەنانەت هەرچەندێ ماڵی هەیە سەرفی بکا بۆ هەر کەس دروستە مادەم زیان نەگەیەنێ بە حاڵی خۆی و سەبر و قەناعەتی ببێ.

هەروەها لە جوملەی گوناهە گەورەکانە ئەمە کە میراتبەر یا وەسی وەسیەتی مردووەکە جێبەجێ نەکات و بڵێ: مردوو مرد و وەسیەت با بردی، ئەمە زۆر تاوانبارییە؛ چونکە کابرا ئەو ماڵەی بە خوێنی جەرگ پەیدا کردووە و، مادام بڕیاری داوە بەخێر بۆی سەرف بکرێ، پێویستە بۆی سەرف بکرێ و، هەر کەس ئەو وەسیەتە بگۆڕێ، تاوانبارە. جا پێویستە موسڵمان ئاگای لە حوقووق بێ و حەقی کەس نەفەوتێنێ. (والسلام على من أتبع الهدى).

لە ١٥ی شەووالی ١٣٩٦ی ك، ڕێکەوتی ٨-١٠-١٩٧٦ی زدا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی چل و یەکەم

# باسی ئەو گوناهە گەورانە دەکا کە پێوەندییان بەنیکاحەوە هەیە لەگەڵ هەندێ گوناهی گەورەی ترا

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمد للّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه وعلى آله وصحبه المجاهدين في سبيل اللّه.

لەپاش ئەمانە ئەی برادەران! باسی گوناهە گەورەکانتان عەرز دەکەم، بەهیوای ئەوەی هەر کەس گیرۆدە نەبووە پێیانەوە خۆی بپارێزێ لێیان و ئەوەش گیرۆدە بووە پێیانەوە پەشیمان ببێتەوە و تەوبەیان لێ بکا.

تکاتان لێ دەکەم ئەم نامانەم بخوێننەوە و رەفتاریان پێ بکەن تا لە رۆژی قیامەتدا بە سەربەرزی حەشرتان بکرێ.

بزانن: لە جوملەی گوناهە گەورەکانە تەرکی ژنهێنان. بەشەرتێ کابرا توانای هەبێ مارەیی بدا و نەفەقەی ژنەکە بەرێوەبەرێ و ترسی ئەوەشی هەبێ گیرۆدەی زینا ببێ. لە فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ): خوای گەورە لەعنەتی کردووە لە پیاو و ژنێ کە قەتعی نیکاح بکەن، واتە: ژنەکە شوو نەکا و پیاوەکە ژن نەخوازێ بەو مەرجەی کە وتمان. ئەگەر مەرجەکەش نەهاتەدی ژن نەهێنان و شوو نەکردن ئیحسانی زۆرە.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە تەماشاکردنی ژنی بێگانە و دەسدان لە لەشی بەرووتی بەشەرتێ ترسی هەڵسانی ئارەزووی نەفسی لەو تەماشاکردنە یا لەو دەس لێدانە هەبێ. ئەگەر ئەم ترسە نەبوو ئەوە هەر حەرامە بەڵام گوناهی گەورە نییە. بەڵێ تەماشاکردنی ئەمرەد،واتە: نێرینەیێ کە هێشتا مووی لێ نەهاتبێ، ئەوە خراپەی لە خراپەی تەماشاکردنی ژنی بێگانە زۆرترە. ریوایەت کراوە: لەگەڵ ژنێکدا یەك شەیتان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمرەددا بیست شەیتان هەیە.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە غەیبەت، واتە لە پاشملە باسی ئینسان کردن. بەکورتی:

لە پاشملە ئینسان، ناوی کەسێ ببا بە شێوەیێ ئەگەر ئەو باسکردنە لە بەرەوڕوویا بێ، پێی ناخۆش بێ. ڕیوایەت کراوە سوودخواردن حەفتا و سێ پایەی فەسادی هەیە، سووکترین پایەیان وەك زینا کردنی ئینسانە لەگەڵ دایکی خۆیدا، بەڵام لەمانە هەموو ناشیرینتر دەوامکردنە لەسەر غەیبەتکردنی موسڵمانان و هەتکی عەرز و ناموسیان.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە گاڵتە کردن بە موسڵمانان و تەحقیریان، وەکو ئەوە کە لە بەرەوڕوویانا عەیبیان لێ بگرێ و بەبێ ئینسافانە پێیان پێ بکەنێ، یاخۆ لەناو خەڵکدا لاسای وتار و ڕەفتاریان بکاتەوە.

لەم ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرموێ: «لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْراً مِّنْهُمْ» هەتا ئەوێ کە دەفەرموێ: «وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ» مەنعی ئەو سێ تاوانەی کردووە کە هەرسێکیان گوناهی گەورەن. هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر، (د.خ): ئەو کەسانەی لە دنیادا گاڵتە بە خەڵك دەکەن مەلائیکەی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا گاڵتەیان پێ دەکەن، بانگیان دەکەن بۆ بەهەشت. کە نزیك دەبنەوە و لەوانەیە بڕۆنە ژوورەوە دەرگای بەهەشتیان لەڕوودا دادەخەن و دەیانگێڕنە دواوە بۆ لای دۆزەخ و دەیانخەنە ئەوێ (جزاء وفاقاً).

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە (نمامی) واتە: قسەگێڕان بەناو خەڵکدا، بۆ نموونە: یەکێ دەڕوا بۆ لای ئەحمەد و دەڵێ: مەحموود وای پێ وتی و، دەڕوا لای مەحموودیش دەڵێ: ئەحمەد وای پێ وتی! تا بەینی ئەو دوو کەسە خراپ دەکا و تێکی دەدا. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی خراپترینی ئادەمیزاد دووزمانەکانن کە دۆستان لەیەك جیا دەکەنەوە و حەزیان لە جیاکردنەوەی موسڵمانە لە یەکتری.

دووزمانی نیشانەی منافقییە. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەر کەسێ لە دنیادا دووزمان بێ لە قیامەتدا دوو زمانی ئاگرین دەخەنە ناو دەمیەوە کە ئەوەندە تیژ و بەتینن مەغزی سەری دێننە جۆش.

زاناکان فەرموویانە: کردەوەی دووزمان لە کردەوەی شەیتان زیانی زۆرترە؛ چونکە کردەوەی شەیتان بە وەسوەسەیە، بەڵام کردەوەی دووزمان بەچاو دەبینرێ و بەگوێ دەبیسترێ.

لە گوناهە گەورەکانە: بوختان کردن، واتە: عەیب هەڵبەستن و کردەوەی ناشیرین ڕێکخستن بۆ کەسێ کە لەوانەوە دووربێ.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا خاوەن بوختتان لە دۆزەخدا حەپس دەکەن و پێی دەڵێن: پێویستە ئەو بوختانە ئیسپات بکەی، دیارە کە بوختان ئیسپات ناکرێ و هەروەها سزاکەی بەردەوام دەبێ تا خوا مەیلی لێ بێ ئەوسا ڕزگار دەبێ.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە مەنعی کچی باڵغ لە شووکردن. حەزرەت (د.خ) لەعنەتی لەو کەسە کردووە کە کچی باڵغی هەیە و بەبێ بەهانەی ڕەوای شەرعی مەنعی دەکا لە شووکردن. لەڕاستییدا ژن و پیاو هەردوولایان ئارەزووی نەفسیان هەیە، بەڵکو ئارەزووی ژن گەلێ زیاترە و لەم ڕووەوە ژن زۆر لە فیتنەوە نزیکە و، هەم بەهۆی شوونەکردنیەوە ئازار بە دڵی دەگا کە تەحەممول نەکرێ، دیارە کەسێ ببێتە هۆی ئەو زیانانە گیرۆدەی گوناهـ دەبێ.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە: بڵاو کردنەوەی پەنامەکیی نێوان ئینسان خۆی و ژنەکەی لەناو خەڵکدا و لای ئەو جۆرە کەسانە کە دوور لە ئەدەبن، چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی هەتکی حورمەتی خۆیشی وژنەکەشی. بێگومان ئینسان هەرگیز لە عەیب خاڵی نابێ و، بڵاو کردنەوەی ئەو عەیبانە بە تایبەتی زۆر گوناهە و، بۆ ئەوانەش کە دەیانبیستن دەبێتە هۆی فەسادی حاڵ و خراپ بوونی خوو و ڕەوشتیان.

هەروەها لە جوملەی گوناهی گەورەیە جیماع کردنی ئینسان لەگەڵ ژنی خۆیدا بە جۆرێ کە خەڵك چاویان لێوە بێ. ئەمە ئەوپەڕی بێ شەرمییە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە مارەکردنی ژن بە قەستی ئەوە کە بەهەر جۆرێ بێ کابرا مارەییی ئەو ژنە نەدا و داگیری بکا، بە تایبەتی مەنعی مارەیی لە کاتێکدا کە ژنەکە داوای بکا. فەرموودەی پێغەمبەرە دەربارەی ئەمانە: «لقی اللّه وهو زان» واتە: ئەو .کەسانە هەر چەند ژنەکانیان مارەکردوون، بەڵام لەبەرئەوە کە قەستیان وابووە مارەیی بە ژنەکانیان نەدەن، وەکو پیاوی زیناکار گوناهبار دەبن و تۆڵەیان لێ دەکرێتەوە.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە وێنەکردنی گیانلەبەر بەتەواوی چ جۆرێ سێبەری هەبێ وەك هەیکەل لە دار و بەرد و شتی تر، یا سێبەری نەبێ وەك نەخشە لەسەر تەختە و قوماش دەکێشرێ. بەڵێ وێنەی شتی بێ گیان وەك دەشت و کێو و گیا و دار و جۆبار و ڕووبار ئەوە گوناهـ نییە.

تەنانەت هەندێ لە مەعنا لێدەرەوەکانی قورئانی پیرۆز فەرموویانە: ئایەتی «إِنَّ الَّذِينَ

يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَاباً مُّهِيناً» لەبارەی ئەو کەسانەوە هاتووەتە خوار کە وێنەی گیانلەبەر دەکێشن؛ چونکە وێنەکێشان ئینسان دەخاتەوە سەر بیری چەرخی بتپەرستی کە لەمەوپێش بووە. هەروەها لە فەرموودەی حەزرەتا هەیە (د.خ) کە فریشتەی ڕەحمەت ناچێتە ئەو ماڵەو ئەو خانووە کە وێنەی گیانلەبەری تیا هەبێ. چاری ئەو وێنانەش کە هەن ئەوەیە کە سەرەکەیان لە لەشیان جیا بکرێتەوە یا بە ڕەنگێکی موخالیف ئەو شێوە ون بکرێ. بەڵێ وێنە لەسەر فەرشێ کە پێی پیا دەنرێ، وەکو فەرشی ڕۆژی زەماوەند و نان خواردنی زەماوەند، ئەوە قەی ناکا ، مەنعی ڕۆیشتنی بانگ کراوەکان ناکا بۆ ئەو شوێنانە.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە، ئەمە کە ئینسان بکەوێتە تەك ئەو کەسانە کە بە تایبەتی بانگ کراون بۆ نان خواردن لە ماڵی یەکێکدا. ئەمانە کە لە عورفدا پێیان دەڵێن خۆ هەڵپەساردوو (توفەیلی) وەك دز تەماشا دەکرێن و لەوانە حسێب دەکرێن کە ماڵی خەڵك تالاَن دەکەن. لە گوناهە گەورەکانە ئەمە کە میوان پاش ئەوەی تێری خوارد و بەبێ ئیجازەی خاوەن خواردەمەنی شتی زیاد بخوا، چونکە لەلایەکەوە ئیسراف و زیادەکارییە و لە لایێکی ترەوە خاوەن ماڵەکە ئیجازەی نەداوە. بەڵام ئیسراف کردنی ئینسان لە ماڵی خۆیدا وەختێ گوناهە کە ئەو خواردنە زیانی ببێ بۆی؛ دیارە بەشێوەیەکی گشتی هەرشتێ زیانی بۆ لەش ساغی هەبێ حەرامە. هەروەها حەرامە ئینسان لەبەر فیز و خۆ بەزلزانین زۆر زیادەڕەوی بکا لە ئامادەکردنی چەشنەکانی خواردەمەنیدا. بەڵام ئەگەر لە ڕێگەی خوادا بێ، چ لە خزمەتی میوان یا هەژاران، ئەوە چاکە و قەی ناکا.

لە فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ): خراپترینی ئوممەتی من ئەوانەن کە ئەنواعی خواردەمەنی دەخۆن و جۆراوجۆریی پۆشاك دەپۆشن و هەمیشە بە واتەی بێ سوودەوە خۆیان خەریك دەکەن و، بە تایبەتی فەساحەت و زمانداریی خۆیان دەردەخەن.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە عەدالەت نەکردنی مێرد لە بەینی دوو ژن یا زیاتردا. ڕیوایەت کراوە: هەر کەس دوو ژنی هەبێ و عەدالەت نەکا لەبەینیاندا ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا یەك لای گیرۆدەی ئیفلیجی دەبێ و بە ئیفلیجییەوە حەشر دەکرێ. شتێکی ئاشکرایە هەرچۆن هەڵبکەوێ ئازاردانی دڵی موسڵمان بەجۆرێکی نابار بە گوناهی کەبیرە دادەنرێ، دیارە مەیل کردنی مێرد بۆ لای ژنێ لە ژنەکانی دەبێتە هۆی ئازاردانی دڵی ئەویتریان.

ڕیوایەت کراوە: لەناو ئوممەتی حەزرەتی مووسادا (د.خ) کەسێ لە یەکێ زۆر عاجز بووایە و دوژمنایەتی بووایە لەناویاندا، دوعای وای لێ دەکرد دەیوت: (یاخوا فلان کەس بەدکردار و ئازاردەری دڵی خەڵکی بێ) چونکە هەر کەس حاڵی وابێ زوو گیرۆدەی ئازاری دنیا دەبێ و دەکەوێتە ناو چاڵی هیلاکەتەوە.

بەڵێ ئەگەر پیاوێ لە دڵدا ژنێکی لە ژنێکی تری زیاتر خۆشتر بوێ، بەوە گوناهی ناگا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ئەمە کە ئینسان لە سێ ڕۆژ زیاتر تەرکی برایەتی و قسە بکا لەگەڵ برایەکی دینیی خۆیدا و برادەرەکەشی تەرکی ئەو بکا و لەو تەرك کردنەدا دەلیلێکی شەرعی نەبێ. جا هەر کام لەم دوو کەسە لەپێش برادەرەکەیدا بمرێ موستەحەقی دۆزەخە و، هەر کامیان زووتر بڕوا و پێشدەستی بکا و سڵاو لەویتر بکا ئەوە ئیستیحقاقی ڕەحمەتی خوا پەیدا دەکا. وە ئەگەر لەپاش مردنی یەکێکیان ئەویتریان تەوبەی کرد لەو گوناهە ئەوە خوا عەفووی دەکا. خۆ ئەگەر ئەویش هەر لەسەر ئەو ڕقوکینەیە دەوامی کرد و لەسەر ئەو حاڵە مرد ئەوە ئەویش وەك پێشووەکەیان دۆزەخی و تاوانبارە.

هەروەها لە گوناهە گەورەکانە ئەمە کە ژن لە ماڵی خۆی دەردەچێ بۆ دەرەوە و خۆی بۆنخۆش بکا و بە یەقین یا بە زەن بزانێ کە ئەو وەزعی دەرچوونەی بە بۆنی خۆشەوە دەبێتە هۆی تێکچوون و وروژاندنی دڵی ئەو پیاوانەی کە پێی دەگەن و هەست بەو بۆنە خۆشە دەکەن، ئەگەر چی مێردەکەشی ئیزنی دابێ بەوجۆرە بڕواتە دەرەوە و ڕووی خۆشی داپۆشیبێ. بەڵێ ئەگەر لەم چوونە دەرەوەدا تەسەوری فیتنە نەکرێ ئەوە دەرچوونەکە حەرامە، بەڵام گوناهی گەورە نییە. وە ئەگەر ژن بەبێ ئیجازەی مێردەکەی بچێتە دەرەوە، ئەوە ئەگەر چی خۆی دەرنەخا و جلوبەرگی بۆنخۆش نەکا هەر حەرامە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە نشووزی ژن، واتە: دەرچوونی لە فەرمانی مێردەکەی بەبێ عوزری شەرعی بەوشەرتە ئەو دەرچوون لە فەرمانە ئازاری دڵی مێردەکەی بدا. ئەگەر ئازاری نەدا ئەوە تەنیا حەرامە و گوناهی گەورە نییە. هەروەها لە گوناهی گەورەیە ئەمە کە ژن داوای تەڵاق لە مێردەکەی بکا بەبێ عوزری شەرعی.

لە گوناهی گەورەیە دەویتی، واتە: ڕازی بوونی ئینسان بەوە کە ژنی خۆی یا ژنی کوڕی فیسق و فجوور بکا، با ئەو فیسقەیش تەنیا بەوەبێ کە بڕوا لەگەڵ پیاواندا هەڵپەڕکێ بکا یا ماچیان بکا یا ماچیان بداتێ. بە فەرموودەی حەزرەت (د.خ) بەهەشت لەسەر دەویت حەڕامە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە (قذف) واتە: ئینسان نسبەتی زینا بدا لە پیاویٚ یا لە ژنیٚ، یا نیسبەتی (لواط) بدا لە نێرینەییٚ چ بلّیٚ فاعیلە یا بلّیٚ مەفعوولوبیهیە. لە قورئانی عەزیمدا ئەو کەسە بە فاسق ناوبراوە و بەوە کە لە دنیا و قیامەتدا مەلعوونە و سزایەکی گەورەی هەیە. لە حەدیسی شەریفدا ئەم گوناهە لە ئەکبەری کەبائیرە، واتە لە گوناهە هەرە گەورەکان، ژمێرراوە و پێویستە هەشتا دار لە گوناهبارەکە بدریٚ واتە گوناهەکە ئەوەندە ناشیرینە حەددەکەی تەنیا بیست داری لە دارەکانی حەددی زیناکردن کەمترە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە پیشەی جنێوفرۆشی، واتە: ئینسان جنێوی زۆر بدا بە خەڵك یا نسبەتی خووی پیسیان لیٚ بدا. لە حەدیسی شەریفدا ئینسانی جنێوفرۆش بە فاسق و بە شەیتان ناوبراوە.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە: لەعنەت کردن لە موسڵمانان بە ناحەق. فەرموودەی حەزرەتە (د.خ): کاتیٚ یەکیٚ لەعنەت لە یەکێکی تر بکا مادام ئەو کەسە موستەحەقی ئەو لەعنەتە نەبیٚ، ئەوا لەعنەتەکە بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان، کە گەیشتە ئاسمان دەرگای لیٚ دەبەستریٚ و دەگەڕێتەوە بۆ خوارەوە بۆ لای ڕاستی ئەو کابرا کە لەعنەتەکەی کردووە و لەولایشە مەنع دەکریٚ، جا ڕوو دەکاتە لای چەپی کابرا، هەروەها هەموو لایەکی لیٚ دەبەستریٚ و لە ئەنجامدا ئەو لەعنەتە دەچەسپیٚ بە کابرای لەعنەتکەرەوە. جا ئەی برادەران! وەرن تەماشای ڕەحمەتی خوا بکەن: مادام ئەو کەسە ئەو لەعنەتەی لیٚ کراوە، موستەحەقی لەعنەتەکە نەبیٚ خوا مەنعی هەموو شوێنێکی لیٚ دەکا تا دەیخاتە ئەستۆی کابرای بیٚ ئینساف کە بەناحەق لەعنەتی لیٚ کردووە.

لەم فەرموودە بەرزەوە وا دەردەکەویٚ کە پێویستە موسڵمان ئاگاداری زمان و دڵی خۆی بیٚ و بەناحەق نیسبەتی خراپە لە خەڵك نەدا و جنێو نەدا و لەعنەت لە کەس نەکا، ئەگەرنا وەیشوومەی ئەو لەعنەتە دەگەڕێتەوە بۆ سەر خۆی. هەروەها لەعنەت کراوە لەو کەسەی دەبێتە هۆی ئەوە کە خەڵکی لەعنەت لە باوك و دایکی بکەن. ئەمە بە تاوانێکی زۆر گەورە دانراوە و وەك ئەوەیە خۆی لەعنەتی لە باوك و دایکی خۆی کردبیٚ.

زاناکان فەرموویانە: تەنانەت لەعنەت کردن لە حەیوانات گوناهی گەورەیە، بەڵام حەق ئەوەیە کە تەنیا حەرامە و ئیتر گوناهی گەورە نییە.

زاناکان فەرموویانە لەعنەت لە کەسێکی دیار لە جوولەکە یا گاور نارەوایە، چونکە مەعلوم نییە لە ئەنجامدا حاڵی ئەو کەسە چۆن دەبیٚ؟ بەڵکو موسڵمان ببیٚ. هەروەها

دروست نییه لەعنەت لە موسڵمانێکی دیار و تایبەتی بکرێ، ئەگەر چی زۆر فاسق و تاوانباریش بێ، چونکە مەعلووم نییە لە پاشەڕۆژدا چۆن دەبێ؟ بەڵێ حەزرەت (د.خ) لەعنەتی کردووە لە گەلێ کۆمەڵەی وەها کە بە سیفەتێکی خراپ ناسراون، وەکو تاقمی سوودخۆر و شاهیدی مامەڵەی سوود و بنووسی دەفتەرەکەی. دیسان لەعنەتی کردووە لەو کەسانە کە وێنەی گیانلەبەران بەتەوای دەکێشن و، لەو کەسانە کە سنووری موڵك دەگۆڕن و، لەو کەسانە کە خەڵکی گومڕا دەکەن، بەتایبەتی ئەگەر سەر لێشێوێنراوەکە کوێر و نەزان بێ.

لەعنەت کراوە لەوانە کە زینا لەگەڵ حەیوانا دەکەن و لەو کەسانە کە لە غەیری ڕێگەی شەرعییەوە دەچنە لای ژنەکانیان و، لەوانەیش کە کردەوەی ناباری قەومی لووت دەکەن.

لەعنەت لەوانە کراوە کە لەکاتی هاتنی خوێنی عوزرا جیماع لەگەڵ ژنەکانیان دەکەن.

لەعنەت لەوانە کراوە کە سیفەت و کردەوەی مردوو دەگێڕنەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانە وان بەدەوریاندا بگرین بۆ مردووەکە. هەروەها لەعنەت لەو ژنانە کراوە دەگرین بۆ ئەوەی ژنان بەدەوریانا بگرین.

لەعنەت کراوە لەو ژنانە کە شەویان بەسەردا تێ دەپەڕێ و مێردەکانیان بەپێی یاسای شەرع عاجزن لێیان. وەکو لەعنەت کراوە لەو ژنانە کە بەبێ عوزری شەرعی لە مێردەکانیان دووریکەونەوە و لەگەڵیاندا نەخەون و ماوەی مێردەکانیان نەدەن بەپێی شەرع ڕابوێرن لەگەڵیاندا.

لەعنەت لەو کەسانە کراوە کە جنێو بە یارانی پێغەمبەر دەدەن (ر.خ).

لەعنەت کراوە لە دز و جەردە. هەروەها لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە (تخنث) دەکەن، واتە: لەو پیاوانە کە وەکو ژن و لەو ژنانە کە وەکو پیاو هەڵسوکەوت و موعامەلە دەکەن؛ واتە: پیاو بە بەرگ و پۆشاك یا بە دەنگ و ئاواز خۆی بباتە شێوەی ژنەوە یا بەپێچەوانەی ئەمە ژن بە جلوبەرگ و دەنگ و ڕەنگ خۆی بباتە شێوەی پیاوەوە.

لەعنەت لەو کەسانە کراوە کە لە ڕێگوزەرا قەزای حاجەت دەکەن و ڕێی ڕێبوار پیس دەکەن. هەروەها لەو کەسانە کە لە ژێر داری بەرداردا قەزای حاجەت دەکەن.

لەعنەت لەوانە کە مابەینی ژن و مێرد یا گەورە و خزمەتکار تێك دەدەن.

لەعنەت لەو کەسانە کراوە کە بەتیر و شیر و هەر چەك و سیلاحێکی باو موسڵمانان دەترسێنن، هەرچەند (فعلا) زیانیان پێ نەگەیێنن، جا وەیل بۆ ئەوانە کە (فعلا) زیانیان پێ دەگەیێنن.

لەعنەت لەوانە کراوە کە زەکات و سەرفیترە نادەن.

لەعنەت لەوانە کراوە کە بە درۆ نیسبەتی خۆیان بدەن لە کەسێ واتە: بڵێ: من کوڕی فلاّن کەسم. بە تایبەتی لەعنەتی زۆر توند لەوانە کراوە کە بەدرۆ نیسبەتی خۆیان لە فەخری عالەم بدەن (د.خ). (واتە بەدرۆ بڵێن: ئێمە لە ئەولادی پێغەمبەرین).

لەعنەت لەوانە کراوە کە تەرکی ئەمر بە مەعرووف و نەهی لە مونکەر دەکەن لە کاتێکدا کە دەستیان بڕوا. ئەم باسە لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسراوە.

لەعنەت لەو کەسانە کراوە کە دەموچاوی حەیوان داخ دەکەن. بەلاّم ئەگەر گوێچکەی حەیوانی لە زەکاتدا وەرگیراوی (بيت المال) داخ بکەن ئەوە سوننەتە (واللّٰه أعلم).

لەعنەت کراوە لەو کەسانەی تکا دەکەن بۆ ئەوەی حەددی شەرعی بەجێ نەهێنرێ، بۆ نموونە: قازی فەرمانی داوە بەوەی جەلدە لە بوختانکەر (قاذف)ی بدرێ و یەکێك بێ تکا بکا بۆ ئەوەی لێی نەدەن. خۆ ئەگەر حاکم شەرع خۆی قسوور بکا لە جێبەجێکردنی حەددی شەرعی، ئەوە عقووبەتەکەی گرانترە.

لەعنەت کراوە لە (فاعل) و (مفعول بە)ی کە باڵغ و عاقڵ بن. هەروەها لەعنەت کراوە لەوانەی شەڕاب دەخۆن و هەروەها لەوەی دەیگێڕێ و لەوەی دەیفرۆشێ و لەوەی دەیکڕێ و لەوەی ترێکەی گوشیووە بۆ شەراب با شەراب خۆریش نەبێ.

بە تایبەتی لەعنەت کراوە لەو کەسە زینا لەگەڵ ژنی دراوسێدا دەکا. لەعنەت کراوە لەو کەسە کە بەدەستی خۆی ئاوی خۆی دەهێنێتەوە، مەگەر مەترسیی زینای هەبێ ئەوە لەو کاتەدا دروستە، لەبەر دەفعی ئەفسەد بە فاسید.

لەعنەت کراوە لەو کەسە کە پرسیارێکی ئاینییە لێ دەکرێ جوابی نەداتەوە، لە کاتێکدا کە مەسەلەکەش بزانێ و مانیعێکی شەرعییش نەبێ لە جوابدانەوەی. لەعنەت کراوە لەو کەسەش کە ئاگادار بێ لە کردەوەیێ بە خیلافی حوکمی شەرع و ئەویش ڕاستەکەی دەرنەبڕێ.

لەعنەت کراوە لەو کەسەی بەرتیل دەدا و لەوەش وەری دەگرێ. واتە بۆ نموونە کەسێ

بیەوێ ماڵێکی حەرام وەرگرێ و پارە بە گەورەیەك بدا تا ئەو ماڵە حەرامەی پێ بدا. لەو کەسەش کە لە بەینی ئەو دووانەدا هاتوچۆ دەکا.

لەعنەت کراوە لە (محتكر) واتە ئەو کەسە کە ڕزقی لایە و لە کاتی گرانیدا دەیشارێتەوە و هەڵی دەگرێ بۆ کاتێ کە بە گرانتر بیفرۆشێ.

لەعنەت کراوە لەو کەسە، موسڵمانێ پەنای پێ ببا و پەنای نەدا لەگەڵ ئەوەشدا بتوانێ کۆمەکیی ئەو کەسە بکا و دەستی بڕوا پەنای بدا. هەروەها لەعنەت کراوە لەو کەسانە دەستیان دەڕوا و ڕەحم بە خەڵك ناکەن و حەق نادەنەوە بە خاوەن حەق. یاخۆ ئاگایان لە حاڵ و وەزعی هەژاران بێ و گوێیان نەدەنێ و ڕەحمیان پێ نەکەن.

لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە کاری بیدعەت و خیلاف شەرع دادەمەزرێنن، بۆ نموونە: وەك دانیشتن بۆ تەعزیە لە نۆ جەژندا.

لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە گیانلەبەر دەکەنە نیشانە بۆ ئەوەی تیر یا تفەنگیان پێوە بنێن. یاخۆ گیانلەبەرێ لە بەردەمی دڕندەیەکی ڕاهێنراوا دابنێن تا سکی بدڕێ یا گازی لێ بگرێ و گۆشتی لێ بپچڕێنێ. یا مریشکێ ببەستنەوە بۆ بازێ یا هەڵۆیێ تا بە دەنووك ئەو پەلەوەرە ئازار بدات و بیخوا.

لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە چرا لەسەر قەبر دادەگیرسێنن. لەو کەسانەش کە لەپاش مردنی کوڕیان یا کچیان یا برایان یا باوکیان یا غەیری ئەمانە بە دەنگی بەرز بانگ هەڵدەدەن، بە تایبەتی ئەگەر سیفەتەکانی مردووەکەش باس بکەن و بیانژمێرن. هەروەها لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە لەکاتی موسیبەتا سەر و ڕیشی خۆیان هەڵدەکەنن یا بەرۆکی خۆیان دادەدڕن، بەڵام گریان بەدەنگی نزم زیانی نییە و دروستە.

لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە لە مەجلیسدا بە واتەی بێ سوود و بە زمان درێژی و شتی بێ مەبەست و مانا فەصاحەت و بەلاغەتی خۆیان دەردەخەن.

لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە خراپەکاری دەکەن لە دنیادا بە بڵاو کردنەوەی بیروباوەڕی نامەشرووع و کردار و خوو و ڕەوشتی ناپەسەند، یا بە هاندانی خەڵك لەسەر زیان گەیاندن بە موسڵمانان، یا بە فیتنە و ئاژاوە نانەوە لەناو هۆز و خزم و خوێشدا، یا بەتێکدانی ناوبەینی دوو کەس بە تایبەتی ئەگەر لە ڕێکیی ئەواندا سوودی ئاینی هەبێ.

لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە بە مەکر و حیلە و فڕوفێڵ زیان دەگەیێنن بە موسڵمانان بە نەفسیان یا بە ناموسیان یا بە ماڵ و موڵکیان.

لەعنەت کراوە لەو کەسە کە خۆی ژنی ببێ و لەگەڵ ژنێکدا کە شووی ببێ زینا بکا، لەگەڵ ئەوەدا کە زینا بە هەر جۆر بێ گوناهی گەورەیە.

لەعنەت کراوە لەو کەسە کە لە مەجلیسدا دابنیشێ و پشت بکاتە دانیشتووانی مەجلیسەکە بەجۆرێ ئازار بە دڵیان بگا.

لەعنەت کراوە لە کەسێ کە دەنگی بانگ ببیسێ و بەبێ عوزری شەرعی نەڕوا بۆ نوێژی جەماعەت.

لەعنەت کراوە لە کەسێ کە یاریی شەترەنج لەسەر ماڵ بکا.

هەروەها لەعنەت کراوە لە ژنێ کە بەرگی ناسك و شاشی وەها بکاتەبەر کە عەورەتی لێوە دەرکەوێ، واتە: ئەو بەرگە ئەوەندە ناسك و شاش بێ مەنعی دەرکەوتنی ڕەنگی لەشی ژنەکە نەکا، یاخۆ ئەو پارچەیە ئەوەندە نەرم و ناسك بێ، بلکێ بە لەشی ژنەکەوە بە شێوەیێك کە بەرزی و نزمیی لەشی ژنەکەی پێ دەرکەوێ.

لەعنەت کراوە لەو کەسانەی کە خاوەن دەست و خاوەن حورمەتن و یاسایان وایە کە حورمەتی پیاوی فاسق و عادی دەگرن. بەڵام پیاوی ساڵح و ئەهلی زانست تەحقیر دەکەن و ڕێزیان لێ ناگرن و لەبەرچاوی خەڵکدا سووکیان دەکەن.

لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە تەحقیری ئالوبەیت و عەشیرەتی حەزرەت دەکەن و جنێویان پێ دەدەن. ئەم باسەم لە نامەیەکدا نووسیوە.

لەعنەت کراوە لەو کەسانەی کە باوەڕیان وایە قەزا و قەدەر لای خواوە نییە و ئادەمیزاد خۆی کردەوەی خۆی دروست دەکا. هەروەها لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە بەرامبەر بە باوك و دایکیان بێ حورمەتن و حوقووقیان ڕاناگرن و خزمەتیان ناکەن و بێ شەرمانە ئازاری دڵیان دەدەن.

لەعنەت کراوە لەوانە کە خاوەن دەسەڵاتن و بەهێز و فەرمانڕەوان و ئینسانی نەزان و ستەمکار و بەدخوو دەکەن بە کاربەدەست بەسەر ڕەعیەتدا، واتە ئەو سەرۆکانە کە پیاوی ناپیاو دەکەن بە فەرمانڕەوا لە شارەکاندا. لە فەرموودەی حەزرەتدا هەیە (د.خ) ئەم جۆرە پیاوانە نوێژ و ڕۆژوویان بۆ حسێب ناکرێ و لای خوا و پێغەمبەر و موسڵمانان بە خیانەتکار دەناسرێن.

لەعنەت کراوە لەو کەسانە کە عەبدی دینار و درەمن، یانێ ئەو کەسانە کە بە هەر

ئەوعیَ دینار و درهەمیان دەست بکەویَ، حەرام بیَ یا حەلاَل، وەری دەگرن و، ئەگەر بە شێوەی حەلاَل دەستیان بکەویَ واجیباتی شەرعیی لیَ جێبەجیَ ناکەن.

لەعنەت کراوه لەو کەسانە کە بەو جۆره شەرع دایناوه نەفەقەی ماڵ و منداڵی خۆیان نادەن، بۆ نموونە: لە خواردن و خواردنەوه و بەرگ و پۆشاك و نوێن و ڕایەخ و هۆده و شوێنی مانەوەدا قسوور دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستیان دەڕوا.

لەعنەت کراوه لەو کەسانە کە پێوەندیی خزمایەتی دەپچڕێنن و بەپێی توانا یارمەتیی خزم و خۆیش نادەن و بەسەریان ناکەنەوه. لە حەدیسی شەریفدا هەیە: ڕەحمەتی خوا نابارێ بەسەر کۆمەڵێکدا کە پچڕاندنی پێوەندیی خزمایەتی لەناویاندا باو بیَ و نەهی لیَ نەکەن. گوناهی پچڕاندنی پێوەندیی خزمایەتی ئەوەندە زۆره حسێب ناکریَ و شوومیی و نەگبەتیی ئەم گوناهە تەشەنە دەکا بۆ دراوسێش، پەنا بە خوا لە دراوسێی خراپ.

براکان! دەخیلتان بم باش ئەم نامەیە بخوێننەوه کە باسی گوناهـ گەورەکان دەکات، چونکە نامەیەکی زۆر بەسووده.

یەکەم: کە لە گوناهە گەورەکان ئاگادار بوون بە یارمەتیی خوا دەستبەرداریان دەبن و نایانکەن.

دووەم: ئەگەر ماوەییَ ئەو گوناهانەتان کردبیَ کە پێتان زانین تەوبەیان لیَ دەکەن و ناگەڕێنەوه بۆیان.

سێیەم: کە پایەی گوناهی گەورەتان زانی، ئیتر بە سووکی تەماشایان ناکەن. ئەمەش نیعمەتێکی گەورەیە؛ چونکە بە سووکی تەماشاکردنی گوناهی بچووك کوفره، چ جایێ بەسووکی تەماشاکردنی گوناهی گەوره.

(أعاذنا اللّه منها بمنه. آمین. والسلام علیکم ورحمة اللّه وبرکاته).

لە ٦ی (ذي القعدة)ی ١٣٩٦ ی ك، ڕێکەوتی ٢٨-١٠-١٩٧٦ی ز دا لەتەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوه. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی چل و دووەم

# باسی شیرخواردن دەکات

بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمد للّه رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

لەپاش ئەمانە ئەی برایانی دینی و ئەی خۆشەویستانی گیانی، بەخوا من بەڕاستی دۆستی ئێوەم و، ئەگەر بەهۆی پەیڕەوی نەکردنی یاساکانی ئاینەوە زیانێکتان لێ بکەوێ، خەفەتتان بۆ دەخۆم و دڵم بۆتان ناڕەحەت دەبێ، بۆیە هەمیشە لە بابەتی بەڵا و زیانێکەوە نامەتان بۆ دەنووسم کە پێوەندی بە ئاینەوە هەیە و هەموو لایەکی گرتووەتەوە.

لەو شتە گرنگانەیە کە بۆتان دەنووسم: لە دوادوایی مانگی (ربيع الآخر)ی ساڵی ١٢٩٠ کوچیدا یەکێ هاتە، لام و تێی گەیاندم کە هەموو وڵاتی شارەزوور بەڵکو گەڕەکەکانی شاریش حاڵیان وایە کە ژنی منداڵدار لە ماڵی خۆی دەردەچێ و منداڵە شیرەخۆرەکەی بەجێ دەهێڵێ و ئەو منداڵەش پاش چەند دەقیقەیەك دەست دەکا بە گریان و ژنی دراوسێ دەنگی گریانەکەی دەبیستێ و بەزەیی پیا دێتەوە و دێتە لای و شیری پێ دەدا. وادەبێ ئەو منداڵە لە ماوەی چەند ڕۆژدا لە پێنج جار زیاتر شیری ئەو ژنە دەخوا. هەروەها ئەم شێوە کارەساتە لەناوا دەوام دەکا و، گەلێ منداڵ گەلێ جار شیری غەیری دایکی دەخوا و، ژنەکانیش لەبەرئەوە کە خوێندەوار نین، ئەم حسێبە ڕاناگرن و نایینووسن و شتەکە لەناوا ون دەبێ و، لەئەنجامدا گەلێ کوڕی گەنج خوشکی شیریی خۆی مارە دەکا و نەوەیەکی زۆر لەم خوشك و براژن و مێردانە پەیدا دەبێ بەبێ ئەوە کەس بزانێ بە مەسەلەی شیرخواردن و خوشك براییبان. وە ئەگەر یەکێ لە موسڵمانان کەمێ تێفکرینی ببێ، ئەویش کارەکە فەرامۆش دەکا و باسی ناکا بۆ خەڵك، وەك لە ئایەتەکەدا دەفەرموێ: (وَمَا أَنسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ).

ئەی براکان! پێویستە ئینسان ئاگادار بێ لە دینی خۆی و لە دینی خەڵك و هەر شتێ

زیانی ببێ بۆ دین دەری بخا تا خەڵك گیرۆدە نەبن. جا ئەگەر ئەو کەسانە کە خەبەر دەدەن بۆ شاهێدی شەرعی بەکەڵك بێن، ئەوا حەرامیی ئەو کوڕ و کچە لە یەکتر سابت دەبێ. خۆ ئەگەر بۆ شاهێدی بەکەڵك نەیێن هیچ نەبێ شوبهە و گومان دروست دەکەن، ئینسانی موسڵمانیش حەقی وایە خۆی لە شوبهە بپارێزێ.

لە سەردەمی حەزرەتا (د.خ) مەسەلەیەکی وەها ڕووی دا و، لەبەرئەوە بە ئیسباتی شەرعی سابت نەبوو، حەزرەت (د.خ) نەیفەرموو نیکاح مەکەن، بەڵام فەرمووی (کیف وقد قیل؟) واتە: چۆن ئەو نیکاحە دەکەن لەگەڵ ئەوەدا کە قسە کراوە لە مەحرەمییان بەهۆی شیرەوە؟! دیارە لەو فەرمووده پیرۆزەی حەزرەتەوە دەردەکەوێ کە لە هەر شوێنێکدا باسی مەحرەمیی بەینی کوڕ و کچێك کرا، بەهۆی شیرخواردنەوە ئەوە پارێز کردن لەو نیکاحە زۆر باشە، ئەگەر چی بە شەرع ئەو مەحرەمییە ئیسپات نەبووبێ.

من بە واجیبی سەرشانی خۆمی دەزانم کە هەموو دۆستان و برادەران ئاگادار بکەم و لەم بێ ئاگاییە گەورەیە خەبەرداریان بکەم.

دەگێڕنەوە: جارێ لە جاران شەیتان گەیشت بە خدری زیندە و پێی وت: ئەی خدر من هەمیشە دەمەوێ موسڵمانان گیرۆدەی گوناه بکەم. جا ئەو کەسانە کە ژنیان نییە و نایانەوێ ژن بێنن ئەوە بە تێکۆشینێکی کەم تەفرەیان دەدەم و گیرۆدەی زیانیان دەکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوانەدا کە دەیانەوێ ژن بێنن تێ دەکۆشم بۆ ئەوەی دڵیان بڕواتە سەر ژنێ کە بەهۆی شیر خواردنەوە مەحرەم بێ. خۆ ئەگەر ئەمەش نەبوو ئەوا تێ دەکۆشم کەموکورتی بخەمە ناو عەقدی نیکاحەکەیانەوە تا نیکاحەکە بەتاڵ بێ و نەتەوەی پاکیان لێ نەبێتەوە و، ئەگەر چی بەدیمەن عەیبی دیار نییە بەڵام لە ڕاستیدا ئەو نەوانە نەوەی ڕاستی ئەو ژن و پیاوە نین و، نوتفەکە بەشێوەیەکی شەرعی ئارام نەگرێ، ئەولادی بەدخووی لێ پەیدا دەبێ، وەك چۆن کە باوك و دایك نەخۆش و ناساغ بن، زۆربەی نەوەکانیان نەخۆش و ناتەواو دەبن. جا تکاتان لێ دەکەم لە مەسەلەی ژنهێنان و مارەبڕیندا ئاگادار و وریا بن؛ چونکە نیکاحی بەتاڵ دەبێتە هۆی برانی نەسەب، واتە: نەوەی نیکاحی بەتاڵ ئەگەر سەیید بێ لە سەییدایەتییەکەی دەپچڕێ و ئەگەر لە نەوەی حەزرەتی عوسمان یا حەزرەتی ئەبووبەکری سیدیق یا حەزرەتی عومەری فاروق (ر.خ) یا لە هۆزی قورەیش بێ، ئەو پێوەندییەی نامێنێ و هەر میراتێ لەو باوکەوە دەستی بکەوێ، میراتی شەرعی نابێ.

لەڕاستیدا ئێستا لەناو هەرزەکاندا باوە کە گاڵتە بە تەڵاق دەکەن و بەبێ پێویستی لەسەر هەموو شتێ، بەکەڵك و بێ کەڵك، تەڵاق دەخۆن کە بێگومان ئەم شێوە زۆر زۆر لە ئیسلامەتییەوە دوورە. جا ئەگەر ئەم گاڵتەکردنەیان بە تەڵاق لەبەرئەوە بێ کە باوەڕیان بە تەڵاق نەبێ ئەوە کافر دەبن. خۆ ئەگەر هەر مەبەستی ڕابواردن و گاڵتەوگەپ بێ ئەوە تەڵاقیان دەکەوێ، واتە: پاش ئەو جۆرە تەڵاق خواردنە ئەو کەسە هەرچەند لەگەڵ ژنەکەیدا بنوێ، وەك ئەوەیە کە لەگەڵ ژنێکی نامەحرەمدا بنوێ و هەموو نووستنێکی لەگەڵیدا بە زینا حسێب دەکرێ. ئەو کەسانەش لەو مەجلیسدا دادەنیشن کە کابرا تەڵاقی تیدا دەخوا و پێی پێ دەکەنن یا کافر دەبن یا تووشی گوناهی گەورە دەبن، واتە: ئەگەر باوەڕتان بە تەڵاق نەبێ کافر دەبن و، ئەگەر باوەڕیان پێی هەبێ و، تەنیا گاڵتە بە بەکارهێنانی ئەو تەڵاقە بکەن ئەوا ئەو پێکەنین و گاڵتەکردنە گوناهی گەورەیە.

براکان! ئەم هەموو گوناهـ و تاوانانە کە ئێوە گیرۆدەیان دەبن لەبەرئەوەیە کە گوێ نادەنە ئامۆژگاریی زانایانی ئاین. ئەگەر بە گوێتان بکردنایە دڵتان نوورانی دەبوو بە نووری زانینی ئاین و، لەو ڕێگایەشەوە کردەوەکانتان بەگوێرەی شەرع دەبوون.

جا بۆ ئاگادار کردنەوەی ئێوە من لەم نامەدا هەندێ لە تاریکی و ناباری و سزا و پاداشی زیناتان بۆ باس دەکەم تا باش حاڵی ببن.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «مامثل الدنیا مع الآخرة إلا کما غمس أحدکم أصبعه في اليم فأنظر بم يرجع؟» واتە: ئەگەر ئازار و سزا و هەروەها سامان و ناز و نیعمەتی دنیا لەگەڵ هی قیامەت و نەبڕاوەی قیامەتدا بەراورد بکەی. وەکو ئەوەیە کە یەکێکتان پەنجەی بکا بەدەریادا و دەری بهێنێ ئاخۆ چەند ئاوی لەگەڵ دێ؟ (دەریاکە قیامەتە و ئەو ئاوە کەمەش لەگەڵ پەنجەکەدا دێ دنیایە).

بەڵێ خۆشی و لەزەتی دنیا لەچاو قیامەتدا و سزا و ئازار و ماندووبوونی دنیا لەچاو هی قیامەتدا لە قەترە بەدەریاش بێ نرختر و نابوودترە. واتە: ئازاری گەزینی دووپشکێ لە دنیادا لەچاو گەزینی دووپشکێ لە قیامەتدا و، لەزەتی خواردەمەنیی دنیا لەچاو لەزەتی خواردەمەنیی قیامەتدا و، لەزەتی ڕابواردنی ژن و مێردێ لە دنیادا لەچاو ڕابواردنیان لە قیامەتدا هەر خوایان یەکە.

جا هەر کەس باوەڕی بە فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەر بێ (د.خ) دەبێ دڵنیابێ کە

دنیا و خۆشی و ناخۆشیی دنیا بەنیسبەت ڕۆژی قیامەتەوە بێ نرخە و، دەبێ بەقەدەر توانا و دەسەلآت تێ کۆشێ بۆ پیرۆزی و بەختیاریی ڕۆژی قیامەتی. ئەم فرسەت و هەلی لەش ساغی و ژیانی دنیایەی زایە نەکا و سوودی لێ وەربگرێ بۆ دوارۆژی. دیارە هەر کەس باوەڕی بە حەزرەت بێ (د.خ) و هەوڵ نەدا بۆ خۆشییس قیامەتی و کردەوەی باش نەکا ئەوە شێت و بێ مەعریفەتە.. ئەگەر باوەڕیشی نەبێ ئەوە بە (مرتد) و لە دین وەرگەڕاو دەناسرێ. خوا پەنامان بدا.

پێویستە بزانن کە تێکڕا زیناکردن ئەگەرچی یەکێکە لە گوناهە هەرە گەورەکان، بەلآم ئەم گوناهە گەورەیە چەند پلە و پایەیەکی هەیە و بەپێی ئەو پلە و پایانە سزاکەی دەگۆڕێ. بۆ نموونە: زیناکردنی پیاوێ ژنی هێنابێ و ژنێ شووی کردبێ، گوناهی زۆرترە و سزای زیاترە لە زیناکردنی پیاوێ ژنی نەهێنابێ و ژنێ شووی نەکردبێ. ژنێ شووی کردبێ و پیاوێ ژنی هێنابێ کە زینایان لەسەر سابیت بوو، سزایان سەنگەسار کردنە تا مردن، بەلآم سزای زینای پیاوی ژن نەهێناو و ژنی شوو نەکردوو سەد جەڵدەیە. هەروەها بەگوێرەی فەرموودەی حەزرەت (د.خ) زیناکردن لەگەڵ ژنی دراوسێدا گوناهی گەلێ گەلێ زۆرترە لە زیناکردن لەگەڵ ژنی دووردا.

زانا گەورەکان فەرموویانە: گوناهە گەورەکان لە حەوسەد گوناه زیاترن و، لەناو ئەوانەدا نۆ گوناهی زۆر گەورە هەن کە زینا یەکێکیانە. بەلآم لە لایەنی پیسی و بێ نامووسییەوە زینا لە هەموویان پیسترە، بۆ نموونە: ئینسان کوشتن گوناهێکی گەورە و سەختە، کەچی زینا لەو پیسترە؛ خوای گەورە فەرموویەتی: «وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً» واتە: نزیکی زینا مەکەونەوە بێگومان زینا کردەوەیەکی زیاد لە ئەندازە خراپ و بێ ئابڕووییە و هۆی مەحرومبوون و نەمانی شێوەی ئیسلامییەتە و ڕێگایەکی زۆر بەدە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە زۆر بەتوندی باسی زینای کردووە؛ یەکەم: دەفەرموێ: هەر نزیك مەبنەوە لەم کردەوە نە لە خۆی و نە لەو شتانەی کە پێش قەرەوڵینی، وەك تەماشا کردنی ژنی نامەحرەم، یا بەتەنیا دانیشتن لەگەڵیدا، یا بەڕێدا ڕۆیشتن لەگەڵیدا، یا تەماشاکردنی وێنەی، یا دەسبازی کردن لەگەڵیدا یا پێکەوە هەڵپەڕین. بەڵێ ئەمانە هەموویان هۆی وێران کردنی دینی ئینسانن و دەبنە هۆی گیرۆدە بوون بە زیناوە.

دووەم زینای بە (فاحیشە) ناوبردووە. سێهەم بە جوملەی (وساء سبیلا) زەممی زینای

دووپاد کردەوە کە جوملەیەکە زۆر مویالەغەی تێدایە لە زەممی زینادا. زینا یەکێکە لەو گوناهە کە لە سەرەتای دروستکردنی ئادەمیزادەوە تائێستا لە هیچ کۆمەڵێکدا پەسەند نەکراوە و بە گوناهێکی دژی نامووس و شەرافەت ناسراوە. هەروەها خوای گەورە نەهی کردووە لەوەی لەکاتی سزادانی پیاو و ژنی زینا کردوودا میهرەبانییان لەگەڵا بەکاربهێنرێ و، بڕیاری داوە بۆ زیادە ڕیسواکردنیان کۆمەڵێ لە ئادەمیزاد حازر بن و ئاگاداری سزادانەکان بن. بەڵام دەربارەی قیساس سەندنەوە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (وأذا قتلتم فأحسنوا القتلة) واتە: کاتێ یەکێکتان کوشت لە قیساسا بە باشی و بەئاسانی بیکوژن. ئەو تیغەی پێی دەکوژن با تیژ بێ، ئەو کەسە تیغەکە بەکار دەهێنێ با زانا و توانا بێ. بەڵام بۆ سزای زیناکردوو فەرموویەتی: میهرەبانی مەکەن لەگەڵیانا.

ڕیوایەت کراوە کە شوێنی گوناهباران وا لە قووڵاییی دۆزەخدا. بەڵام شوێنی ئەوانە کە زینایان کردووە وا لە خواری شوێنی ئەوانەوە، شوێنێکە کە چڵك و زووخاوی لەشی ئەهلی دۆزەخ لەوێدا کۆدەبنەوە وەکو حەوزی ئاوی پیس (أعاذنا اللّه تعالى منها) خوا پەنامان بدا لەو گوناهە و لە تاوانەکەی.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: خەڵکینە! خۆتان لە زینا بپارێزن، بەڕاستی زینا شەش بەڵای سەختی لێ پەیدا دەبێ؛ یەکەم ڕووناکیی ئیسلامییەت لەڕووی ئینسان هەڵدەگرێ. دووەم دەبێتە هۆی فەقیری و گەدایی خاوەنەکەی. سێیەم دەبێتە هۆی تەمەن کورتی. چوارەم دەبێتە هۆی نارەزایی خوای گەورە. پێنجەم دەبێتە هۆی سەختیی حیسابی قیامەت. شەشەم دەبێتە هۆی سزای دۆزەخ.

ڕیوایەت کراوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا زیناکەر بە عەورەت هەڵدەواسن. کە لەبەر توندی ئێش و ئازاری هاوار دەکا و دەناڵێنێ فریشتەی عەزاب پێی دەڵێ: لەو کاتەدا کە بەو کردەوە ناشیرینەی خۆت لە دنیادا پێ دەکەنیت بۆچی بیری ئەم هاوارەت لا نەبوو و شەرمت لە خوا نەدەکرد؟!

ڕیوایەت کراوە: کاتێ کە خاوەن زینا پاش مردن دەخرێتە قەبر خوا ئەو قەبرەی بۆ دەکاتە شوێنی سزای سەخت و چەند کون دەبێتە قەبرەکەی و مار و دووپشك بە ئەمری خوا لەو کونانەوە دەڕۆن بۆ ئەو کەسە و بەکۆمەڵ پێیەوە دەدەن.

ڕیوایەت کراوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە زیناکەرەکانەوە بۆنێکی پیسی وەها پەیدا دەبێ هەموو ئەهلی عەرەسات لەو بۆنە پیسە هەراسان و وەڕس دەبن و بەتەواوی پەرێشان دەبن.

براکان: باسی سزای ئەهلی زینا زۆر درێژە و من بەکورتی کەمێکم عەرزکردن. ئەگەر باوەڕ دەکەن من خۆم لەکاتی نووسینی ئەم نامەدا دەستم کرد بەگریان، لە خوای گەورەم دەوێ ئێوەش بێنە گریان و بیر لە حاڵی خۆتان بکەنەوە بەڵکو گیرۆدەی سزای سەختی پاشەڕۆژ نەبن.

من دەستی زاناکان ماچ دەکەم و داوێنیان دەگرم کە ئەم نامەی دۆست و دڵسۆزی خۆیان بخوێننەوە بۆ موسڵمانانی شوێنی خۆیان و لەم بابەتەوە هەوڵ و کۆششێکی باش بدەن تا ئەو موسڵمانانە لە جیماعی حەرام ڕزگار بن، چ حەرامیی زینا و چ حەرامێ بەهۆی شیری یەکتر خواردنەوە بێ، یا بەهۆی نیکاح و مارەبڕینی بەتاڵەوە بێ و، هەتا لەپێش ژنهێناندا ئیحتیات بکەن و لە مارەبڕینی مەحرەمیی شیری خۆیان بپارێزن. (والسلام علیٰ من أتبع الهدیٰ).

لە ١٠ی (ذی القعدە)ی ١٣٩٦ی ك، ڕێکەوتی ٢-١١-١٩٧٦ز دا لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە. سوپاس بۆ خوا.

وەرگێڕ

## نامەی چل و سێیەم

# باسی ئەو گوناهە گەورانە دەکا
# کە پێوەندییان بە بریندارکردنی ئینسانەوە هەیە
# لەگەڵ هەندێ گوناهی گەورەی ترا

بسم اللّه الرحمن الرحيم

بسم اللّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه وعلى آله وصحبه وأتباعه المحسنين إلى يوم الدين.

لەپاش ئەمە، ئەو گوناهە گەورانەتان بۆ باس دەکەم کە پێوەندییان بە بریندارکردنی ئینسانەوە هەیە، بەڵکو ئیشەڵڵاَ پارێزیان لێ بکەن، چونکە کردنی گوناهی گەورە زیانی زۆرە و، کەسێ گوناهی گەورە بکا طاعەتەکانی نابنە کەفارەتی گوناهە بچووکەکانی. واتە: مادام ئینسانێ خۆی لە گوناهی گەورە بپارێزێ ئەگەر گوناهی بچووکی لەدەست دەرچوو ئەو گوناهە بچووکانە بەهۆی تاعەتەوە، وەك دەستنوێژ و خوێندنی قورئان و تەسبیح و تەهلیل، عەفوو دەکرێن، بەڵام ئەگەر گوناهی گەورەی کرد لەم رەحمەتە دوور دەبێ و گوناهە بچووکەکانی لەسەر دەمێنێتەوە. هەروەها سزای گوناهی گەورە زۆر گران و درێژە. پاداشتی تەرکی گوناهی گەورە زۆر گران و درێژە. پاداشتی تەرکی گوناهی گەورە لە پاداشتی تاعەتکردن زۆرترە. جا کەسێ گوناهی گەورە بکا، تووشی ئەوانە دەبێ کە باسمان کردن، زیاد لەوەیش بۆ دنیایشی سێ زیانی هەیە وەکو حەدیس دەفەرموێ: (جزاء المعصية الوهن في الطاعة والضيق في المعيشة والتعس في اللذة. قيل: وما التعس في اللذة يا رسول اللّه!. قال: لا ينال شهوة حلالا إلا جاءه ما ينغصه أياها).

تەماشا دەکەین ئەم بنیادەمە ئەگەر شەو و رۆژ هەوڵ بدا بۆ ژیانی دنیای، تەمەڵی لێ نابینێ و سست نابێ، بەڵام ئەگەر بانگی بکەی بۆ تاعەتکردن چەند بەهانەت بۆ دەهێنێتەوە.

براکان! ئەم نامانەی بۆتانیان دەنووسم بە خزمەتێکی گەورەیان حسێب دەکەم. تکاتان لێ دەکەم بیانخوێننەوە و تێ کۆشن بۆ حاڵیکردنی موسڵمانان. ئەوەیش خۆی بە موسڵمان دەزانێ بەتەبیعەت ئامادە دەبێ بۆ وەرگرتنیان؛ چونکە گەورەترین خوو و ڕەوشتی موسوڵمان ئەوەیە کە لە ئامۆژگاری و بیستنی فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) تێر نابێ.

لە جوملەی ئەو گوناهە گەورانە کوشتنی ئینسان بە ناحەق. سزای ئەم گوناهە گەورەیەم لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسیوە.

ڕیوایەت کراوە: شەیتانی لەعین هەموو ڕۆژێ سەرلەبەیانی سوپای شەیتانەکان بڵاو دەکاتەوە بەدنیادا بۆ گومراهـ کردنی خەڵکی و گوناهـ پێکردنیان. لەپاشان یەکێ لەو شەیتانانە دێتەوە و دەڵێ: من کارێکی وەهام کرد کە فلان کەس ژنەکەی تەلاق بدا. شەیتان دەڵێ: ئەم گوناهە بێ قیمەتە چونکە کابرای تەلاقدەر دەتوانێ ژنەکەی مارە بکاتەوە. یەکێکی تریان دێتەوە و دەڵێ: من کەوتمە ناوبەینی ئەو کۆمەڵەوە و دەستم کرد بە ئاژاوەنانەوە تا فلان کەس فیسار کەسی کوشت– شەیتانی لەعین چاوی ئەمیان ماچ دەکا و زۆر دڵی خۆش دەبێ و ڕەزامەندیی خۆی دەردەبڕێ و، دەڵێ: تۆ بەڕاستی لە نەوەی منی و تاجی حورمەت شایانی سەری تۆیە، چونکە موسڵمانان لە مەیدانی فراوانی ڕەحمی نەبڕاوەی خوادا دەمێننەوە تا یەکێکیان یەکێ دەکوژێ، کە ئەمەیان کرد ئیتر مەیدانی ڕەحمەتی خوا بەتەواوی تەنگ دەبێ لەسەریان.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە ئەمە کە یەکێ ببێ بەهۆی کوشتنی کەسێ. هەر کەسێ ببێتە هۆی کوشتنی یەکێ لە ڕۆژی قیامەتدا لەناو چاوی دەنووسرێ: ئەمە دوورە لە ڕەحمەتی خوا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە بێ دەنگ بوون لە کاتی کوشتنی ناحەق و نارەوادا. واتە: ئەگەر کەسێ لە شوێنێکدا بێ و لەو شوێنەدا یەکێ بێ یەکێ بکوژێ لەسەر ئەو کەسە واجیبە کە حازرە لەو شوێنەدا تا لە توانایدا بێ مەنعی ئەو زاڵمە بکا و نەهێڵێ ئینسانە زوڵم لێکراوەکە بکوژێ. خۆ ئەگەر دەستی ڕۆیی و بەئەندازەی دەست ڕۆیشتنەکەی مەنعی نەکرد ئەوە لەو گوناهەدا هاوبەشە و بە خاوەنی گوناهی گەورە دەناسرێ و، ئەو لەعنەتە کە بۆ ئینسان کوژەکە دێ بۆ ئەمەش دێتەوە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ترساندنی کەسێ بە شمشێر و خەنجەر و تفەنگ و هاوچەشنیان بەو شەرتە لە دڵیدا هەبێ بریندار ی بکا و ترسێنراوەکەش وەها تێ بگا کە ترسێنەر نیازی فەوتاندنی ئەوی هەیە، واتە: ئەگەر لە دڵیدا نەبێ، بریندار ی بکا و هەر بۆ ترساندن بێ ئەوە تەنیا کارێکی حەرامە و بە گوناهی گەورە حسێب ناکرێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە خوێندنی زانستی جادووگەری (سحر) یا فێر کردنی بە یەکێ، بەڕادەیێ لەنێوان زاناکاندا ئیختیلاف هەیە کە جادووگەر کافرە یا نا؟

لە جوملەی گوناهی گەورەیە (تطیر) و (تشاؤم) واتە پەیڕەوکردنی ڕێگای کافرانی پێش چەرخی ئیبسلام کە ئەگەر کەسێ کەوتبێتە ڕێ بۆ سەفەرێك و ڕێکەوتی پەلەوەرێکی ناشیرینی کردبێ، وەکو بووەکەڕە ،گەڕاوەتەوە و سەفەرەکەی نەکردووە و، باوەڕی وابووە کە بینینی ئەو پەلەوەرە دەبێتە نیشانەی ناموبارەکیی ئەو سەفەرەی و تەئسیرێکی ڕاستی هەیە بۆ خراپیی حاڵی ئەگەر ئەو سەفەرە بکا!

لە جوملەی گوناهی گەورەیە (تنجیم) واتە: ئەستێرە گرتنەوە و حیسابی ئەستێرە و باوەڕکردن بە حسێبی هەڵاتن و ئاوابوونی ئەستێرە یا کەوتنەیەکیان بۆ دەلالەت کردن لەسەر پیرۆزی و ناپیرۆزیی کار و بڕیاردانی تەئسیر بۆ ئەو ئەستێرانە، چونکە بڕیاردان و باوەڕکردن و نیسبەتدانی تەئسیر بۆ غەیری خوای گەورە کوفرە. بەڵام ئەگەر بەو شێوە تەماشایان بکەن کە نیشانە و عەلامەتی هەندێ ڕووداون ئەوە زیانی نییە. شایانی باسە هەرەمە خەڵکەکە ئەوەندە هۆشیار نین فەرق بکەن لە بەینی شتێ خاوەن تەئسیر بێ و شتێ نیشانە و عەلامەت بێ؛ لەبەرئەوە لەم شوێنەدا پارێز گەلێ بەنرخە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە دەرچوون لە فەرمانی حاکم و فەرمانداری گشتیی موسوڵمانان ئەگەر عادڵ و دادپەروەر بێ. هەروەها دەرچوون لە فەرمانی فەرمانداری ستەمکار، کە ئەمر بکا بە شتێکی مەشرووع و ڕەوا، گوناهی گەورەیە. واتە: ئەگەر فەرمانداری ستەمکار ئەمری کرد بە جیهاد یا زەکات سەندن لە دەوڵەمەندان یا دروستکردنی مزگەوت یا خەستەخانە یا موسافیرخانە واجیبە بەگوێی، بەگوێ نەکردنی لەم کارانەدا گوناهی گەورەیە. بەڵام ئەگەر فەرمان بدا بە کوشتنی ئینسانێکی بێ تاوان، ئەوە دروست نییە بەگوێی بکرێ. هەر لەم بابەتەوە ڕیوایەت کراوە: کە سێ کۆمەڵ هەن لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بەمیهرەبانی تەماشایان ناکا و قسەیان لەگەڵ ناکا یەکێ لەوانە ئەو کەسانەن کە لە فەرمانی سوڵتانی دادپەروەر دەردەچن.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە بەیعەت پێکردن و دانانی سوڵتانی ناعادل لە ڕۆژێکدا کە سوڵتانی عادل و دادپەروەر دەست بکەوێ، واتە: دانانی حاکمی بێ داد لە کاتی بوونی کەسێکی عادل و ڕەشیددا.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە: فەرمانداریێ کە شایانی فەرمانداری نەبێ بەخیانەتکار لەگەڵ خوا و پێغەمبەری خوا و موسڵمان دادەنرێ. هەروەها فەرمانداری عادل و دادپەروەر حوکمداری کردنی سەعاتێکی بەعەدالەت و دادپەروەری ئەجر و پاداشتی لای خوا لە عیبادەتی شەست ساڵی خەڵکی تر زۆرترە و، حوکمکردن حاکمی غەیرە عادل لە تاقە سەعاتێکدا ئەوەندەی گوناهکردنی شەست ساڵە. ئەم بەیانە کە بۆ فەرماندار کرا بۆ قازی دادگای ئاینیش هەروەهایە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە تێکەڵی لەگەڵ زاڵمان و ئولفەت و دۆستایەتی لەگەڵ ئەهلی زوڵم و ئەهلی فیسقدا، مەگەر ئەو تێکەڵی و ئولفەتە لەبەر فەرمانی شەرع بێ، وەك ئامۆژگاری کردنیان، یا بۆ ڕزگارکردنی داماو و بێچارە لەژێردەستیان، یا لە ترسی فیتنە و ئاشووبیان، بەڵێ ئولفەت لەگەڵ ستەمکاراندا بۆ ئەو مەبەستانە نەبێ دروست نییە؛ چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: «وَلاَ تَرْكَنُواْ إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ» واتە: مەیل مەکەن بۆ لای ئەو کەسانە کە ستەمیان لە خەڵك کردووە و لە ڕێگەی ڕاستی ئاین لایان داوە؛ ئەگینا ئاگری دۆزەخ دەتانگاتێ و داختان دەکا.

لەم ئایەتە پیرۆزە دەردەکەوێ ئەو کەسەی کەمترین مەیل و مەحەببەتی ببێ لەگەڵ ئەوانەدا کە کەمترین زوڵم و ستەمیان لێ بوەشێتەوە، ئەوە کەمترین پایەی پێگەیشتنی تینی ئاگری تووش دەبێ و ئەو لێکەوتن و پێگەیشتنە کەمەی ئاگر ئێشێکی سەخت و گەورە و گرانی هەیە و، لەو ڕۆژەدا کە ئەو ئاگرە لەو جۆرە ئینسانانە دەدا غەیری خوا کەس بە هاواریانەوە ناچێ و کەس کۆمەکییان پێ ناکا، جا هاوار بۆ حاڵی ئەو کەسە کە زۆر مەیل و مەحەببەتی لەگەڵ ئەو کەسانەدا ببێ لە زۆر زاڵم و ستەمکارن دەبێ ئەوانە حاڵیان چۆن بێ؟!

لە جوملەی گوناهی گەورە ستەمکردن لە موسڵمان یا لە ئەهلی زیممە، کە گاور و جوولەکەن، بە داگیرکردنی ماڵ و سامانیان یا بە لێدان و جنێو پێدانیان.

لە فەرموودەی حەزرەتدا هەیە کە زوڵم لە دنیادا دەبێ بە (ظلمات) واتە بە تاریکی بۆ خاوەنەکەی. مەبەست لەم (ظلمات)ە کە بەشێوەی جەمع وتراوە ئەوەیە کە ستەم دەبێتە

هۆی تاریکیی دڵ لە دنیادا و تاریکیی قەبر لەپاش مردن و تاریکیی عەرەسات لە ڕۆژی قیامەتدا، هەروەها لە ڕۆژی قیامەتا حەسەنات و چاکەی ئەو ستەمکارە دەدەن بەوانەی ستەمی لێ کردوون. جا ئەگەر چاکەکانی بەشی حەقی ستەم لێکراوەکانی نەکرد ئەوە لە گوناهـ و تاوانی ستەم لێکراوەکانی دەدرێ بەکۆڵا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە نەمیمە، واتە قسەهێنان و قسەبردن بەناو خەڵکدا بە نیازی تێکدانی ناوبەینیان، بەتایبەتی دووزمانی کردن لای کۆمەڵە ستەمکارەکان لە هەموو جۆرە دووزمانییەك گەورەترە و سزای زیاترە. لە فەرموودەی حەزرەتدا هەیە (د.خ) ئیسنان تا لەناو ستەمکاراندا بەحورمەتتر و لەپێشتر بێ لای خوای گەورە بێ حورمەتتر و دوورتر دەبێ و، هەروەها پێغەمبەریش لێی دوورە بەرییە لێی و فەرموویەتی: ئەو جۆرە دووزمانە نایێتە سەر حەوزی کەوسەر.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە کردەوەیەك کە کوفر بێ وەکو ئەوە پەڕەی قورئانی پیرۆز بدڕێ و فڕەی بدا، یا وتارێکی کوفری بەدەما بێ وەك وتارەکە دەلالەت لەسەر بێ باوەڕی بە شتێ دەکا لەو شتانە کە حەزرەت (د.خ) لەلای خواوە هێناونی. دیارە ئەم گوناهە گەورەترینی گوناهەکانی ئینسانە، مەگەر زووبەزوو پەشیمان ببێتەوە و ناڕەزاییی خۆی دەرببڕێ لەو کردەوە ناپەسەندەی و لەو وتارە ناپەسەندە کە بەدەمییا هاتووە. پەنا بە خوای گەورە.

هەر پیاوێ ژنی هەبێ و هەر ژنێ مێردی هەبێ، هەرکاتێ کردەوەی کوفر یا وتاری کوفریان لە دەم دەرچوو، لەسەر پەیڕەوی ئیمامی شافیعی (ر.خ)، ئەگەر لەپێش تەواوبوونی عیددەی ژنەکەدا موسڵمان بوونەوە و شایەتومانیان هێنا و بێزاریی خۆیان لە کوفر دەربڕی ئەوا نیکاحەکەیان لە بەینا دەمێنێ، خۆ ئەگەر لەو ماوەدا نەگەڕایەوە بۆ ئیسلام، ئەوە نیکاحیان لەبەیندا نامێنێ، واتە: هەرجارێ بڕۆنە لای یەکتر، یەعنی جیماع بکەن، ئەو جیماعەیان حەرامە تا سەرلەنوێ عەقدی نیکاحەکە تازە نەکەنەوە لە بەینیاندا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە بڵاو کردنەوەی عەیبی موسڵمان بەمەرجێ کە مەبەستی ئابڕووبردنی ئەو موسڵمانە بێ لەناو خەڵکدا.

بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ کابرا عەیبەکەی خۆی ببیسێتەوە و دەسبەردار ببێ ئەوە گوناهی گەورە نییە.

بۆ نموونە: یەکێ دز بێ و ماڵی خەڵکی بدزێ ئەوە هەر کەس ئاگای لەو کردەوەیە بێ، دروستە بە خەڵك بڵێ: فلاّن کەس دزی دەکا تا خەڵکی خۆیان بپارێزن یاخۆ کابرای دزە خۆی دەسبەرداری دزی ببێ.

هەر جنێوێ یەکێ بە یەکێکی تری بدا تەنیا حەرامە تا دەگاتە قەزف یانێ نیسبەتدانی زی نا لێی، کە وای لێهات دەبێتە گوناهی گەورە و، ئەگەر بەو جۆرە شەرع دای ناوە ئیسپاتی نەکا حەددی شەرعیی لەسەر واجیب دەبێ کە بریتییە لە لێدان (٨٠) دار و بەپێی ئەمری قازیی شەرع جێبەجێ دەکرێ.

لەکاتێکدا یەکێ جنێوی غەیری قەزف بدا بە یەکێك و ئەویش جنێوی پێ بداتەوە ئەوە هەردووکیان گوناهبار دەبن، بەلاّم جنێودەری یەکەم زیاتر؛ چونکە ئەو لەپێشدا جنێوی داوە و بووەتە هۆی دوژمنایەتی.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ڕاگرتنی ئینسانی موفسید و خراپەکەر و پەنادانی مەگەر ئەو پەنادەرە بترسێ لەوەی کە کابرای پەناهاوەر بکوژن و موستەحەقی کوشتنیش نەبێ. هەر کەسێ پەنای موفسید بدا هاوبەشی دەبێ لە گوناهەکەیدا و خوای گەورە لێی نارازییە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە کۆمەڵك و یارمەتیدانی کەسێ کە بە ناحەق ئازاری خەڵکی بدا یا قسەیان پێ بڵێ یا دەستدرێژی بکاتە سەر نامووسیان چونکە یارمەتیدانی کەسێ لەسەر گوناه دەبێتە هۆی گوناهباری و هاوبەشی لە گوناها.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە شوێن کەوتنی عەیبی موسڵمان، واتە: وەك جاسووس بەم لاولادا بگەڕێ و پرسیار بکا و هەوڵ بدا بۆ دۆزینەوەی عەیبی موسڵمانان بە قەستی ئەوە، لەناو خەڵکدا بلاّوی بکاتەوە و، ئەو کەسە یا ئەو خانەدانە یا ئەو دەزگا و بارەگایە عەیبدار بکا. ئەم گوناهە زۆرە نابارە و مایەی تێکدانی ڕشتەی دۆستایەتی و خزمایەتی و مەحەببەتە لەناو خەڵکدا. ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەو کەسەی دەکەوێتە شوێن عەیبی موسڵمانان خوای گەورە دەکەوێتە شوێن عەیبی. دیارە هەرکەس خوای گەورە بکەوێتە شوێن عەیبی ئابڕووی دەبا و شەرمەزاری دەکا و لەناو خەڵکدا سووك و ڕیسوا دەبێ.

براکان! خوای گەورە سەتتار و سرپۆشە و حەزی لەوەیە عەیبی بەندەی خۆی

بشارێتەوە. تەماشاکەن دەرکەوتنی زینای وەها گران کردووە کە بە دەگمەن سابت دەبیّ، چونکە بڕیاری داوە کە چوار ئینسانی ڕاستی ڕاساڵ چاویان بە عەورەتی پیاو و ژنەکە کەوتبیّ لەکاتی زیناکەدا، ئەمەش زۆر کەمە و نایاب ڕێك دەکەویّ، ئەگەر یەکیّ لەو چوارە نەیبینیبن و شایەتی نەدا ئەوە شایەتی سیّ کەسەکەی تر قبووڵ ناکریّ، بەڵکو یەکیّ هەشتا داریان لیّ دەدریّ؛ چونکە بە (قاذف) و بوختانکەر دەناسرێن.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە، یەکیّ خۆی بباتە شێوەی ئینسانی باش و لە خواترس و ڕیش و پەشمیّ بۆ خۆی ڕێك بخا، تا خەڵکی بە ئینسانی چاکی بزانن، کەچی بە پەنامەکی کردەوەی ناڕەوا و ناشیرین بکا.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەر کەس خۆی جوان بکا بە شێوەی ئەهلی تاعەت و لەڕاستیدا وەها نەبیّ، لەعنەت و نەفرینی لە ئەهلی ئاسمان و زەوییەوە بۆ دیّ.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمویّ: ئەگەر لە ڕۆژی قیامەتدا بەقەدەر کێوەکانی مەککە خێرات و کردەوەی باش لەگەڵ خۆیدا بێنیّ، خوای گەورە (علی رؤوس الأشهاد) هەموو دەکا بە تۆز و غوبار و مەحوی دەکاتەوە و ئەو کەسە ڕیسوا دەبیّ و حورمەتی دەڕوا.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە موداهەنە و ڕیابازی لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە گوناه دەکەن بۆ پاراستنی قازانجی دنیایی. پوختەی قسە: لەبەر پاراستنی دنیا وماڵی دنیا و قازانجی دنیایی ئینسان ڕووپامایی و موجامەلە بکا لەگەڵ پیاوی گەورەی تاوانبار و ستەمکارا. بەڵام ئەم وەزعە ئەگەر لەبەر پاراستنی ئەوانە نەبیّ کە باس کران، بەڵکو لەبەرئەوە بیّ کە کابرای موجامەلە لەگەڵ کراو زۆر زاڵم و بەدەسەڵات و بیّ شەرمە و لێی دەترسیّ ئەوە قەی ناکا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە زینا واتە: چوونە لای ژنیّ نیکاحی شەرعیی نەکردبیّ بۆ خۆی، یا ئامادەکردنی ژنیّ بۆ پیاویّ کە نیکاحی بەسەر ژنەکەوە نەبیّ. عقووبەتی ئەم کردەوەیە لە نامەیەکی تایبەتیم نووسیوە بۆتان.

زینا کردن بێجگە لەوە کە دەبێتە هۆی فیتنە و ئاژاوە و کوشتار لەناو کۆمەڵدا دەشبێتە هۆی خراپکردن و تێکدانی تەبیعەتی ژنی مێردار و هەڵگەڕانەوەی لە مێردەکەی. هەروەها دەبێتە هۆی خراپکردن و تێکدانی پیاوی خاوەن ژن و ئاڵۆزکردنی لە ژن و ماڵی خۆی و، دەبێتە هۆی تێکەڵ بوونی نەتەوە و نەناسینی ئەولاد و باوك بەڕاستی.

بێجگە لەوانەش دەبێتە هۆی تووشبوونی نەخۆشیی سووزەنەك و گەلێ ناساغیی تر. هەروەها دەبێتە هۆی گەدایی و ڕووت و ڕەجاڵی و نابووتی لە دینادا و، دەبێتە هۆی جاری کردنی حەددی شەرعییش بەسەریاندا کە سەد جەڵدە و دوور خستنەوەی ساڵێکە لە کەسوکار، یا سەنگەسار کردنیان تا دەمرن. دەشبێتە هۆی سزای سەخت و نابار لە ڕۆژی قیامەتا.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە (لواط) واتە: جیماع کردنی پیاو لەگەڵ پیاودا یا لەگەڵ ژنی خۆی یا ژنی بێگانە لە غەیری شوێنی عادەتییەوە. ئەم کردەوە فاحیشەیە، کردەوەی قەومەکەی حەزرەتی لووت (د.خ) کە بە هۆی ئەو گوناهە ناشیرینەوە خوای گەورە غەزەبی لێ گرتن و وڵاتەکەی ژێراوژوور کردن و بەردی بەسەریاندا باراند.

لە پەیڕەوی ئیمامی شافیعیدا (ر.خ) ئەوەی ئەم کردارە ناپەسەندە دەکا ئەگەر ژنی هێنابێ ئەوە سەنگەسار دەکرێ و، ئەگەر ژنی نەهێنابێ سەد جەڵدەی لێ دەدرێ و ساڵێ دوور دەخرێتەوە چ (فاعل) چ (مفعول بە) ئەگەر باڵغ بن و بەئارەزوو ئەو ئیشە کرابێ نەك بە زۆر.

ڕیوایەت کراوە: ئەو کەسەی ئەم کردەوە ناشیرینەی هەیە لەپاش مردن لەشەکەی لە گۆڕەکەیەوە دەگوازرێتەوە بۆ زەویی قەومی لووت و سزای زۆر سەختی دەدرێ.

هەروەها لە گوناهی گەورەیە جیماع کردن لەگەڵ حەیواندا وەك کەر و حەیواناتی تر و ئەم کەسانە تەعزیر دەکرێن.

ئەوەی ئەم ئیشە دەکا بەپێی حەدیسی شەریف لەعنەتی لێ کراوە.

لە گوناهی گەورەیە جیماع کردن لەگەڵ ژنێ کە بەشێوەی (موقت) مارە بڕابێ، بۆ حەفتە یا مانگ یا زیاتر یا کەمتر. ئەم جۆرە نیکاحە کە مەشهوورە بە نیکاحی موتعە، گوناهی گەورەیە و لە دینی ئیسلامەوە دوورە و جاڕدراوە بەوە کە حەرامە، بۆیە لەسەر موسڵمان حەرامە بەو شێوە ژن مارە بکا و جیماعی لەگەڵ بکا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە (استمناء) واتە ئاو هێنانەوەی کەسێك بەدەستی غەیری ژنی خۆی، مەگەر لە کاتێکدا کە ترسی تووشبوونی زینای هەبێ، ئەوە دروستە لە بەر دەفعی ئەفسەد بە فاسید.

لە جوملەی گوناهە گەورەکانە دزیکردن لە ماڵی خەڵکی. لە نامەی تایبەتیدا باسی سزا

و تاوانی دزیم نووسیوە. نووسیومە ئەو کەسەی دەڕوا بۆ دزیکردن نووری ئیمان لە دڵی دوور دەکەوێتەوە تا لەو کردەوە ناشیرینە دەسبەردار دەبێ، ئەوجا نوورەکە بە کەمی و ناتەواوی دێتەوە بۆ ناو دڵی.

هەندێ لە زانایان فەرموویانە: سەگ لە ئینسانی دز باشترە، سەگ بەرامبەر بەو دوو سێ نانە کە خاوەنەکەی دەیداتێ شەو تا بەیانی پاسی دەکا و نانوێ و دڵی خاوەنەکەی ئازار نادا، بەڵام دز لەگەڵ ئەوەدا کە خوا دروستی کردووە و، چەند ناز و نیعمەتی پێ بەخشیوە، هەر کاتێ گومانی ئەوە ببا کە لە شوێنێکدا ماڵێکی دەست دەکەوێ دەڕوا بۆی و دەیدزێ و خاوەنی خۆی کە خوایە لە خۆی دەڕەنجێنێ!.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە جەردەیی و ڕێگری و ترساندنی ڕێبوار لە نەفس و ماڵی، هەرچەند کەس نەکوژێ و ماڵ لە کەس نەسێنێ. دیارە ئەگەر لەگەڵ ترساندنەکەدا کەسی کوشت و ماڵی لە خەڵك سەند ئەوا تاوانەکەی زۆرترە. حەددی ڕێگرانیش دیارە کە هەڵاوەستن و کوشتنە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە شەراب خواردنەوە و بەنگ و تریاك کێشان. ئەم کردەوە پیسە یەکێکە لە ئەسبابی سەلبی ئیمان، واتە: مردنی خاوەنی ئەو کردەوە بە کافری. لە حەدیسی پیرۆزدا لەعنەت کراوە لە شەڕابخۆر و لەوەی دروستی دەکا و لە (ساقی) واتە مەی گێڕ. هەروەها تا دە کەس باس کراون کە بەهۆی شەڕابەوە لەعنەتیان لێ کراوە. بەپێی قسەی زانایان لەبەر ڕووناکی فەرموودەی حەزرەتدا (د.خ) ئەو کەسانەی لە دنیادا عارەق دەخۆنەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا عارەقی لەشی ئەهلی دۆزەخیان دەرخوارد دەدا. باسی زیانی ئەم شەرابە لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسراوە.

لە گوناهی گەورەیە یەکێ لە کونی پەنجەرە یا لە کونی دیوار یا لە سەربانەوە تەماشای ژن و کچ و کارەکەری دراوسێی خۆی بکا. جا لەپاش ئینذار ئەگەر بە بەردێ چاوی ئەو کەسە کوێر بکەن، دروستە و قیساسی نییە.

لە گوناهی گەورەیە کوڵەگرتن لە خەڵك، واتە: وەستان بە پەنامەکی لەپاڵ دەرگا یا دیوار یا پەنجەرە و گوێ لە خەڵك گرتن تا بزانێ چی دەڵێن؟! یا بە پەنامەکی تەماشاکردنیان تا بزانێ چی دەکەن؟! ڕیوایەت کراوە فریشتەی سزا لە ڕۆژی قیامەتدا مس دەتوێنێتەوە و دەیکاتە گوێی ئەو کەسەی بەپەنامەکی گوێی لە قسەی خەڵك گرتووە.

لە گوناهی گەورەیە وازهێنان لە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە. واتە: ئەگەر ئینسان

لە شوێنێکا کردەوەیەکی نارەوا و ناشەرعیی چاو پێ کەوت مادام دەستی بڕوا واجیبە بە زۆر مەنعی ئەو کردەوە خراپە بکات، خۆ ئەگەر دەستی نەڕۆیشت واجیبە بە زمان مەنعی بکا واتە: یا خۆی قسە بکا یا بڕوا بۆ لای پیاوێکی گەورەی خاوەن دەسەڵات قسەی بۆ بکا تا ئەو پیاوە مەنعی ئەو کردەوە خراپە بکا. خۆ ئەگەر ماوەی ئەمەش نەبوو واجیبە هەر هیچ نەبێ بە دڵ ئەو کارە نارەوایە ببوغزێنێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ئەمە کە ئینسان لەبەر بەخۆنازین و خۆ بە گەورە زانین حەزبکا خەڵك لە بەرامبەریەوە ڕاوەستن.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ڕاکردن لە دەستی تاعوون بەبێ عوزری شەرعی.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ستەمکردن و زوڵمکردن لەو زیممییانە کە جیزیە دەدەن و ئیتاعەتی دەوڵەتی ئیسلام دەکەن.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە سوێند بەدرۆ خواردن. درۆ ئینسان بە ناخی گوناهـ و تاواندا و دەباتە خوارەوە، لە قیامەتیشا دەیخاتە ناخی دۆزەخ و ئاگرە بەتینەکەی. هەروەها لە گوناهە گەورەکانە سوێند بە غەیری زات و سیفەتی خوا خواردن، بەڵام لای قەولی سەحیح تەنیا مەکرووهە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە بۆ قازی کە بەخیلافی شەرع حوکم بکا؛ چونکە ئەو حوکمەی یا لەبەر نەزانین و بێ قابیلییەتییە یا لەبەر خۆ بە زل زانینە و فیزی ناهێنێ بچێ موراجەعەی کتێبەکەی بکا یا لە خۆی زاناترێ بپرسێ و باش لەو حوکمە شەرعییە حاڵی ببێ و بەئاگادارییەوە حوکمەکە بدا. ئەم قازیی شەرعە کە لەبەر فیز و دەمار یا لەبەر نەزانین لە حەق لابدا دەکەوێتە بەر ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: «وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ» و لە قیرائەتێکی ترا: «وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ». واتە دادوەرێك بەوجۆرە حوکم نەکا کە خوا ناردوویە بەڕاستی ستەمکارە، لە حەق لادەرە. وە هەر حاکمێ بە غەیری حوکمی خوا حوکم بکا وەك ئەو گیانلەبەرەیە کە بە چەقویەکی کول سەربڕابێ، واتە: ئەو حاکمە خۆی بەدەستی خۆی ئامادە کردووە بۆ سزای ڕۆژی قیامەت. بەڵێ تا یاسای دەستکرد نەهاتبووە ناو موسڵمانان بەدەگمەن هەڵدەکەوت یەکێ بە غەیری حوکمی خوایی حوکم بکا، بەڵام لەپاش ئیعلانی ئەم جۆرە یاسایانە ئیتر حوکم بە غەیری حوکمی خوا زۆر بوو، بەڵکو لە گەلێ شوێندا حوکم بە شەرع فەوتاوە و کەم ڕەفتاری پێ دەکرێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ئەمە کە یەکێ بەهۆی قسەی خیلافی شەرعەوە دڵی پیاوی خاوەن حورمەت و پایە خۆش بکا، واتە: ئینسان حاڵی وەهابێ بەرامبەر بەوانەی هەرچی بڵێن و هەرچی بکەن بە باشی بزانێ و تەحسینی بکا و لە بەرەورووویدا و لەناو مەجلیسدا بڵێ: باشە. ئەمە دەبێتە هۆی نارەزایی خوا لەو کەسە، چونکە لەسەر هەموو کەس واجیبە ئینکاری شتی خیلافی شەرع بکا و نارەزایی خۆی دەربڕێ لە هەر حوکمێ کە پێچەوانەی حوکمی خوای گەورە بێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە بە یارمەتیدانی ئینسانی زۆردار و ناحەقکار، لە حەدیثدا هەیە ئەو جۆرە کەسانە لە زیممەی خوا دوور دەخرێنەوە و خوا لێیان ڕازی نابێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە بەرتیل وەرگرتن و بەرتیلدان و دەلالی ناوبەینی بەرتیلخۆر و بەرتیلدەر. ئەمە حوکمی بەرتیلێکە کە ببێتە هۆی لەناوچوونی حەقێ، بەلام دانی بەرتیل بۆ ئەوەی حەقێ جێبەجێ بکرێ، واتە: بەهۆی ئەو بەرتیلەوە لە ڕێگای کەسێکەوە ئینسان بگاتە حەقی شەرعیی خۆی ئەوە دانی، بەرتیلەکە گوناه نییە، بەلام وەرگرتنی گوناهی گەورەیە.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە وەرگرتنی دیاری لەلایەن قازی و حاکم و پیاوی خاوەن پایە و شان و پیاوی ساڵحەوە لە زانایانی دین و ئەوانەی مەشهوورن بە مەشیخەت، یا کەسێ گومانی سیفەتێکی باشی پێ ببرێ و خەڵك لەبەر ئەو سیفەتە خزمەتی بکەن و ماڵی دنیای پێ بدەن و، لە ڕاستیدا ئەو سیفەتەی تیا نەبێ.

بۆ نموونە: خاوەن ماڵەکە گومانی وابێ ئەوەی کە ماڵەکەی بۆ دەبا وەلییە و پیاوچاك و لە خواترسە، کەچی ،وانەبێ یا هیوای جێبەجێکردنی نیازێکی پێ هەبێ و ئەو هیچ بەجێی نەهێنێ، لەم حاڵەدا مادام کابرا بە کرێ و ئوجرە ئیشی پێ نەکا، هەرچی لێ وەربگرێ حەرامە و خواردنی ماڵی خەڵك بەناحەق حەرامە و گوناهی گەورەیە. بەلام ئەگەر لەڕووی خۆشەویستییەوە بۆی بێنێ یا لەبەر سیفەتێ بێ کە تیایدا بێ وەك سەییدی و ساڵحی و زانست و خۆ لە گوناه پاراستن ئەوا وەرگرتنی ئەو ماڵ و دیارییە حەلاڵە و ڕەدکردنەوەی چەند عەیبێکی تیایە، یەکەم ئەو ماڵە خوا بۆی ناردووە و ئەو ڕەدی دەکاتەوە بەسەر خوادا. دووەم دەبێتە هۆی دڵشکانی موسڵمانە خاوەن دیارییەکە. سێیەم: دەبێتە هۆی مەنعی خێر و پاداشی خاوەن ماڵەکە و ئەو سەدەقەی لێ تێك دەدا.

چوارەم: ئەم ڕەدکردنەوەیە بۆنی نەفسانییەت دەدا، واتە: هەتا خەڵکی بڵێن ئەم کابرایە پیاوچاکە وماڵی دنیای ناوێ و شت لە کەس وەرناگرێ.

ئیبنو حەجەر (ر.خ) فەرموویەتی: بۆ نموونە: کەسێ حەپس کرابێ و ماڵێ بدا بە کەسێ کە تکای بۆ بکا بەڵکو ڕزگاری بکا، ئەوە دەبێتە (جعالة) و جەعالە حەڵاڵە. بەڵام ئەگەر ماڵێ بڕیار بدا بۆ کەسێ کە ئیشێکی حەرامی بۆ بکا وەك دزیکردن لە ماڵێ یا لێدانی موسڵمانێ ئەوە جەعالە نییە و بەرتیلە و دان و وەرگرتنی ئەو ماڵە حەرامە. یا ئەگەر ماڵێ بڕیار بدرێ بۆ یەکێ بەرامبەر بە کردنی کارێ کە خۆی لە خۆیا واجبە لەسەری وەکو ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە کە (ذاتاً) واجبە لەسەری ئەوە وەرگرتنی ئەو ماڵەش حەرامە وەکو ئەوەیە پارە بە یەکێ بدەی بەرامبەر بەوە کە نوێژە فەرزەکانی خۆی بەجێ بێنێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە یەکێ کە بەشکردنی ماڵێکی پێ سپێردرابێ یا تەخمینکردنی باغی ترێ و خورمای بدرێتە دەست، غەدریان تیدا بکا و ئیشەکە بەڕاستی و شەرعی نەکا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە، شایەتیدان بەدرۆ. لە حەدیسی پێغەمبەرایە (د.خ) کە شەهادەتی زوور و درۆ لە گوناهە گەورە هەرە گەورەکان حسێب کراوە. جا من لەبەر توندی و سەختیی سزای ئەم گوناهە لە نامەیەکی تایبەتیدا باسم کردووە. هەروەها شاردنەوەی شایەتیش لە گوناهە گەورەکانە، واتە: کەسێ ئاگای لە ڕووداوێ بێ وەکو کڕین و فرۆشتنی ماڵێ، یا مارەبڕینێ، یا ڕووتکردنەوەی ڕێبوارێ... تاد و، لە کاتێ پێویستیدا ئەو شایەتییە نەدا و حەقی خاوەن حەق بفەوتێ گوناهێکی گەورەی دێتە سەر.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە درۆ کردن. لە حەدیثی شەریفدا هەیە درۆ کردن بە نیشانەی منافقی دانراوە. حەدیسێکی تر دەفەرموێ: چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکدا عومری ئینسان زیاد دەکا و، درۆ کردن ڕۆزی کەم دەکا.

براکان! زۆربەی گوناهەکان زیانی قیامەتیان هەیە و زیانی دنیایان نییە یا کەمە، بەڵام درۆکردن زیانی بۆ دین و دنیا هەیە. تەنانەت ئەگەر بە گاڵتە درۆ بکا و لە درۆکەدا (توریە) نەکا، ئەوە بە گوناهی گەورە دەنووسرێ لەسەری. هەروەها لە قورئانی پیرۆزوا لەعنەت کراوە لە درۆزن.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «الصدق يهدي إلى البر، والبر يهدي إلى الجنة. والكذب يهدی إلى الفجور، والفجور يهدي إلى النار» واتە: ڕاستی ڕێنومایيی ئينسان دەكا بۆ كردەوەی باش و كردەوەی باش ڕێنومايیی ئينسان دەكا بۆ بەهەشت. درۆش ڕێنومايیی ئينسان دەكا بۆ لادان لە حەق و لادان لە حەقيش ڕێنومايی ئينسان دەكا بۆ ئاگری دۆزەخ. هەروەها كاتێ ئينسان درۆيێ دەكا فريشتەی لای ڕاست لەبەر بۆنی ناخۆشی ئەو درۆيە بە ماوەی ميلێ لەو درۆزنە دوور دەكەوێتەوە.

ڕيوايەت كراوە: گاورێ هات بۆ خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خوا! من بە چوار شتی خراپەوە گيرۆدە بووم؛ شەراب خواردنەوە و دزيكردن و درۆزنی و زيناكردن. ئەمانەش هەموو لە دينی ئيسلامدا بەد و ناپەسەند و زەم كراون. ناشتوانم بەجارێ هەموويان تەرك بكەم. ئەگەر تەنيا لە هەندێكيان مەنعم بكەن، قبووڵی دەكەم و موسڵمان دەبم، بەڵام ئەگەر لە هەموويان مەنعم بكەن ئەوا پێم ناكرێ. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: تەنيا لە درۆكردن مەنعت دەكەم. كابرای گاور بەم فەرموودەی حەزرەتەوە زۆر دڵشاد بوو، موسڵمان بوو، پاش ئەوە ئەو گاورە تازە موسڵمانە هات بەدڵيدا كە مەنعی من لە درۆ كردن مەنعە لە هەموو شتێ، چونكە كاتێ كە ئيشێكی خراپم كرد و پرسياريان لێ كردم ئەگەر ڕاست نەڵێم ئەوا بە درۆزن دەردەچم و تەوبەی ئيسلامييەتەكەم ناتەواو دەبێ و، ئەگەر ڕاستيش بڵێم، بۆ نموونە: بڵێم دزيم كردووە، دەستم دەبڕن. هەروەها شتەكانی تريش. ئەنجا عەرزی حەزرەتی كرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ كە مەنعت كردم لە درۆ بە حيكمەت ڕەفتارت لەگەڵ كردم؛ چونكە مەنعكردن لە درۆ، مەنعە لە هەموو سيفەتێكی خراپ، بۆيە وا بەڕاستی ئامۆژگارييەكەتم قبووڵ كرد و دينی ئيسلامم بەدڵ وەرگرت.

لە جوملەی گوناهی گەورەيە ڕابواردن و دانيشتن لەگەڵ عەرەقخۆر و ئەوانەی بە لەهوو لهب ڕادەبوێرن يا لەگەڵ هاوچەشنيان، چونكە ئينسان ئەگەر بتوانێ مەنعيان بكا لەو كارە خراپانە و نەيكا ئەوا تووشی گوناهی گەورە دەبێ كە تەركی نەهی لە مونكەرە، ئەگەر نەشتوانێ مەنعيان بكا ئەوا ڕابواردن لەگەڵ ئەو جۆرە كەسانە، با گوناهی سەغيرەش بێ، بەهۆی دەوامكردن لەسەری دەبێتە گوناهی گەورە؛ كەواتە پێويستە ئينسان دوور بكەوێتەوە لە ئينسانی عەرەقخۆر و قومارکەر و ساز و سەمتوور لێدەر و وێنەی ئەمانە لە گرۆی فاسقان.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە یاری نەرد و شەترەنج لەسەر ماڵ. هەروەها لە جوملەی گوناهی گەورەیە دروست کردنی ئەسباب و ئالەتی ساز و سەمتوور و دمبەڵەك و جووزەلە و گۆی لێ ڕاگرتنیان مەگەر تەپڵی باز بەتەنیا یا دەف بەتەنیا کە گوێ ڕاگرتن بۆ ئەمانە لە شایی و خەتەنە سووران و لەبەڕێکردنی حاجییان لە جەژنەکاندا حەڵاڵە. بەڵام (یراع) کە بە کوردی پێی دەڵێن (بلوێر) ئیختیلافی تێدایە و ئەسەح ئەوەیە کە حەرامە و، هەندێ لە ئیمامەکان فەرموویانە بۆ ساڵحان حەرام نییە. بەڵام گوێگرتن لە شمشاڵ و دەف پێکەوە حەرامە.

ئیمامی غەزالی (ر.خ) فەرموویەتی: گوێڕاگرتن لە ئاوازی خۆش بەپێی ئەشخاس دەگۆڕێ، واتە: بۆ ئەو کەسانەی کە ئارەزووی نەفسانییان زۆرە حەرامە، چونکە بیستنی ئەو ئاوازە خۆشە شەهوەت و ئارەزووی نەفسی دەجوولێنێ. بۆ کەسانێ کە ئەهلی لەهوو لەعب نەبن مەکروهە. بۆ کەسێ کە طەبعی سلیم و زەوقی لەسەر دەنگی خۆش و پۆشاکی جوانە و حەز لە پاکی و تەمیزی دەکا حەڵاڵە. بۆ کەسێ کە مەحەببەتی خوا و پێغەمبەری خوای ببێ، مەندووب و مەرغوبە؛ بیستنی ئاوازی خۆش سیفەتە چاکەکانی دەبزوێنێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە غەیبەتکردنی پیاوێ یا ژنێکی دیاری.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە دەوامکردن لەسەر گوناهی بچووك. هەروەها دانانی شیعری عیشقبازی گوناهی بچووکە، بەڵام بەردەوام لەسەر کردنی دەبێتە گوناهی گەورە، ئەگەر تاعەت و چاکەی زاڵ نەبێ بەسەر گوناهە بچووکەکانیدا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە ئینسان لەبەر خەسیسی و دەنائەت و پارەپیسی لە ڕزق و ڕۆزی و ژیاندنی خێزانی خۆیدا قسوور بکا و بەقەدەر دەسەڵات و توانا گوزەرانیان دابین نەکا. بەڵام ئەگەر لەبەر نەبوونی بێ، یاخۆ هەیبێ و خێزانەکەی تێکڕا حەز بە زاهیدی و تەرکی دنیاکردن بکەن ئەوە قەی ناکا.

لە جوملەی گوناهی گەورەیە تەرکی تەوبە کردن. خوای گەورە فەرموویەتی: «وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ» واتە: ئەی موسڵمانەکان! هەمووتان بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە بەڵکو لە سزای ڕۆژی قیامەت ڕزگار ببن.

جا تەماشا بکەن لەم شوێنە بەنرخەدا کە شوێنی ئەمر بە تەوبەیە خوای گەورە

ڕزگاریی بەبێ قەید و شەر باس نەفەرمووە، بەڵكو بەستوویەتی بە ڕجاوە، واتە: ئەگەر تەوبەتان كرد لەوانەیە و ڕجا هەیە عەفوو بكرێن. دیارە لە تێكڕای سیاقی ئایەتەكەوە دەردەكەوێ: ئەگەر پەشیمان نەبنەوە لەو گوناهانە كە كردوویانن، عەفوویان بڕیار نەدراوە.

پێویستە ئەوەش بزانین كە هەروەك تەوبە لە گوناهی گەورە واجیبە تەوبەكردن و پەشیمان بوونەوە لە گوناهی بچووكیش واجیبە. هەروەها تەوبە كردن لە دواخستنی تەوبەش واجیبە.

چاكەی تەوبەكردن و خراپەی نەكردنیم، بەتایبەتی لە نامەیەكا نووسیوە. (والسلام علیكم ورحمة اللّٰه وبركاته).

سوپاس بۆ خوای گەورە لە ٢٧ی (ذي القعدة)ي ١٣٩٦ی كۆچی، ڕێكەوتی ٢٠-١١-١٩٧٦ی زاینی لە حوجرەی مەدرەسەی تەكیەی حەزرەتی (عبدالقادر)ی گەیلانی (ر.خ) لە بەغدا لە وەرگێڕانی ئەم نامەیە بوومەوە. بەمەش بەرگی سێیەمی مەكتووباتی كاكەحمەدی شێخ (ر.خ) تەواو بوو. تكاكارم خوای میهرەبان بە لوطفی بێ پایانی خۆی یارمەتیم بدا كە نامەكانی تریش ئامادە بكەم و لە چاپیان بدەم. پشت و پەنای هەموو لایەك هەر خوایە.

وەرگێڕ: عەبدولكەریمی مودەریس

## نامەی چل و چوارەم

# باسی ئەو گوناهە گەورانە دەکا
# کە پێوەندییان بەدڵ و دەروونەوە هەیە و بەدەرەوە نین

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين وأتباعه بأحسان إلى يوم الدين.

پاش ئەمانە، برا خۆشەویستەکانم! ئەم پێنج نامەیە کە لە باسی گوناهە گەورەکاندا نووسیومن، بەنرخترین دیارییەکن کە دۆستان بۆ یەکتریان بنێرن، چونکە خەلیفەی دووەم حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (د.خ) لە حەزرەتەوە (د.خ) دەگێڕێتەوە: «ما أهدى مسلم لأخيه المسلم هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى أو يرده عن ردى»، واتە: هیچ موسڵمانێ دیارییەکی بۆ برای موسڵمانی نەناردووە چاکترو بەسوودتر بێ لە قسەییەکی ڕاست و مەعناداری وەها کە خوای گەورە بەهۆی ئەو قسەوە شارەزاییی ئەو موسڵمانە زیاد بکا یا سەرگەردانی وماڵوێرانی لێ دەفع بکا.

براکان! هەموو دیارییەکانی برای خۆتان بۆ ئێوە ئا لەم جۆرە دیارییانەن، بەڵکو هەر نامەییەکم هەزار دیاری و هەزار کەلیمەی دینییە. بەتایبەتی ئەو نامانە کە باسی گوناهـ دەکەن، چونکە دەبنە هۆی دەرخستنی عەیب و خەوشی ئینسان، چاکترین دیارین بۆ ئێوە، بەتایبەتی کە ئەو عەیب دەرخستنە بەشێوەی ئابرووبردن و ناوزڕاندنی کەس نەبێ وەك من بەشێوەییەکی بەئەدەب و دڵسۆزانە باسیان بکا. بەڵێ ئەم جۆرە عەیب دەربڕینە شتێکی زۆر بەجێیە؛ وەختی خۆی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب زۆرجار لە حوزەیفە و لە سەلمانی فارسی و هاوڕێیەکانی تری دەپرسی و داوای ئەوەی لێ دەکردن کە عەیب و کەموکوڕییەکانی خۆیی پێشان بدەن و دەیفەرموو: «رحم الله أمرء أهدى إلى عيوبي» واتە: ڕەحمەتی خوای گەورە لەو کەسە کە عەیبەکانی خۆمم بەدیاری بۆ بنێرێ. دواییش دەیفەرموو: ئەم جۆرە دۆستانە بەدەگمەن دەست دەکەون.

براکان! بەخوای گەورە قەسەم من لەو دۆستانەم کە ئیمامی عومەر (ر.خ) فەرموویەتی بەدەگمەن دەست دەکەون.

براکان! بەچەند زەحمەت و شەونخوونی و بەناو کتێباندا گەڕان، ئەم نامەم ئامادەکردووە کە بەدیاری بۆم ناردوون. بەخوا قەسەم هیچ پیاوەتی نییە ئەوانەتان کە فارسیزانن نەیخوێننەوە بۆ موسڵمانەکانی تر، هەروەها پیاوەتیش نییە کە ئێوە بۆتان خوێندنەوە ئەوان گوێی بۆ ڕانەگرن و باش لێی حاڵی نەبن و ڕەفتاری پێ نەکەن. بێ گومان گوێدان بەم نامانەی من نیشانەی ئیمانە، چونکە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: «أيما مسلم جاءته موعظة من الله في دينه فأنها نعمة من الله سيقت إليه فأن قبلها بشكر زاده الله نعماً أخرى والا كانت حجة من الله... إلى أن قال... ويزداد بها سخطاً». ئەم فەرموودە شەریفە وەعدە بەخێرو موژدەیە بۆ ئەو کەسانە ئەم نامانە دەخوێننەوەو ڕەفتاریان پێ دەکەن و، هەڕەشە و ترساندنە بۆ ئەو کەسانە کە نایانخوێننەوە یا کاتێ بۆیان دەخوێننەوە ڕەفتاریان پێ ناکەن. بەڵێ گوێ ڕاگرتن بۆ ناوەڕۆکی ئەم نامانە نیشانەی موسڵمانییەتی و بەهێزیی ئیمانە، حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: یەکێ لە خووڕەوشتە جوانەکانی موسڵمان ئەوەیە کە هەرگیز لە بیستنی وتەی خێر تێر نەبێ.

براکان! گیرۆدەبوون بەگوناهە گەورەکانەوە لە گیرۆدە بوون بەگوناهە بچووکەکانەوە پڕ مەترسیترە، چونکە بە نەسی ئایەت ئەو کەسانە کە گوناهی گەورە ناکەن کردەوە چاکەکانیان گوناهە بچووکەکانیان لا دەبەن و کارە چاکەکانیان دەبنە کەفارەتی کارە خراپەکان، بەڵام ئەو کەسانە کە گوناهی گەورە دەکەن گوناهە بچووکەکانیشیان بەسەرەوە دەمێنێتەوە، سا مەگەر بەمیهرەبانیی خوای گەورە ڕزگار ببن. ئەو کەسەی زاڵ ببێ بەسەر گوناهی گەورەدا و لێی نزیك نەبێتەوە بەختیارە، چونکە نەکردنی گوناهی گەورە زۆر پاداشی گەورەی هەیەو، پاداشی ئەم نەکردنە لە کردنی تاعەت زۆرترە. هەروەها بەهۆی نەکردنی گوناهی گەورەوە لە نەگبەتی و ناخۆشیی سزای قیامەت دەپارێزرێ. جا هەر کەس گوناهی گەورە بکا لەم دوو بەشە ناهومێد دەبێ. بێجگە لەمە لە دنیایشدا گیرۆدەی سێ جۆرە زیان و ناخۆشی دەبێ وەك حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «جزاء المعصية الوهن في الطاعة والضيق في المعيشة والتعس في اللذة. قيل: وما التعس في اللذة؟ قال: لا ينال شهوة حلالا إلا جاءه ما ينغصه إياها»، واتە: پاداشی تاوانباری لە دنیادا سێ شتە، یەکەم سستییە لە تاعەت کردندا، واتە: ئینسانی گوناهکار هەمیشە لەشی قورسە و دڵی ڕێگای نادا هەستێ بەسووك و سۆڵی عیبادەت بۆ خوا بکا. دووەم

تەنگیی ژیانە، واتە: ئینسانە تاوانکارەکە ئەگەر دەوڵەمەندیش بێ هەر بێ مەجال و ژیانی ناخۆش دەبێ. سێیەم ئەگەر دڵخوازێکی حەڵاڵی دەسکەوێ کۆسپێکی لێ ڕاست دەبێتەوە کە خۆشیی تامی ئەو دڵخوازەی لێ تاڵ دەکا.

گوناهە گەورەکان بە(متفق علیه)ی و (مختلف فیه)ییانەوە لە حەوسەد زیاترن، بەڵام دۆستی دڵسۆزتان بەشێوەییەکی کورت و لە چەند نامەییەکا ئەو گوناهە گەورانەتان عەرزدەکا، کەبوونەتە بەڵای گشتی و گەلێ کەس پێیانەوە گیرۆدە بوون. یەکێ لەوانە نامەی ئەو گوناهە گەورانەیە کە نەخۆشیی دڵن و بەدەرەوە نین، چواریشیان نامەکانی ئەو گوناهە گەورانەن کە پێوەندییان بەکردەوە دیارەکانەوە هەیە.

یەکێ لە مەترسییەکانی گوناهە گەورەکان ئەوەیە کە حەزرەت (د.خ) لە حەدیسدا فەرموویەتی: «أن الرجل لینطلق إلی المسجد فیصلي وصلاته لا تعدل جناح بعوضة. وأن الرجل لیأتي المسجد ویصلي وصلاته تعدل جبل أحد إذ کان أحسنها عقلاً. قیل: وکیف أحسنها عقلا؟ قال: أورعها عن محارم الله»، واتە: نوێژی ئینسانێ کە خۆی لە گوناه نەپارێزێ لای خوا بەقەد باڵی مێشوولەییەك قورس نییە، بەڵام نوێژی کەسێ خۆی لە حەرام بپارێزێ بەقەد کێوی ئوحود قورسە. جا لەبەر ئەمانە ئەم چەند نامەیەم نووسی دەربارەی گوناهە گەورەکان.

پێویستە بزانن لە پاش شەریك بۆ خوا بڕیاردان، کە کوفرە، گوناهە گەورە نادیارەکان کە بەنەخۆشیی دڵ دەژمێررێن لە هەموو شت پڕ مەترسیترن بۆ ئینسان. هەروەها لە ناو ئەمانەدا نەزانینی زات و سیفەتی خواو نەزانینی ئەو بیروباوەڕانە کە واجیبن و نەزانینی حوکمە ئاینییەکان لە هەموو گوناهەکانی تر ناهەموارترن، چونکە نەزانین و بێ ئاگایی لە ئەحکام دەبێتە سەرچاوەو بناخەی هەموو گوناهێ، کە وابوو لەسەر زاناکانی ئاین واجیبە موسڵمانان لەمە ئاگادار بکەن و ڕێنوێنییان بکەن بۆ فێربوون و زانینی ئەحکامی ئاینی ئیسلام لە بابەتی بیروباوەڕو واجیب و سوننەت و حەرام و مەکرووە و موباحی کارو کردارو هەڵسوکەوت.

مین جوملە لە پاش کوفر (پەنا بەخوا) ڕیاکردن بەگوناهێکی زۆر گەورە حسێب کراوە، حەزرەت (د.خ) ڕیاکردن بە(شرکی أصغر) داناوە واتە شەریك بۆ خوا قەراردانی دەرەجە دوو، ئەم ڕیاکردنە دەبێتە هۆی مەحوبوونەوەی کردارە چاکەکانی ئینسان.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: خۆتان لە ڕیا بپارێزن؛ چونکە ڕیا شەریك بۆ خوا دانانە.

لە رۆژی قیامەتدا بانگ لە ڕیاباز دەکەن: ئەی کافر! ئەی فاجر! ئەی غادیر! ئەی خاسیر! کردەوەکانی تۆ نەماوە، جەزای چاکەی تۆ مەحوبوویەوە و لای خوای گەورە بەشت نەما، برۆ پاداشی خۆت لەو کەسانە داوا بکە کە کردەوەکانت لە بەرچاوی ئەوانا دەکرد!. جا تەماشاکەن ئایا بەدبەختی لەمە زیاتر هەیە کە ئینسان (خسر الدنیا والآخرة) بمێنێتەوە؟! نە لە دنیادا کابرای ڕیابۆکراو، هیچ چاکەیەکی دایەوەو نە لە قیامەتدا خوای گەورە خێر و پاداشێکی چاکی بۆ حسێب کرد.! جا لەبەرئەوە کە کابرای ڕیاباز عیبادەتەکەی لە ئەسڵا بۆ خوا کردووە و لە پاشاندا ڕووپامایی خەڵکیشی تێکەڵ کردووە بەکافری ساغ ناناسرێ و پاداشەکەی هەر ئەوەندەیە کە تاعەت و عیبادەتەکەی بێ سەوابە. بەدرێژی ئەم باسەم لە نامەی ڕیادا نووسیوە.

لە جوملەی گوناهە گەورە نادیارەکانە توورەبوون و ڕق هەستان لەسەر شتی هیچ و پووچ، بۆ نموونە لەسەر بەجێ نەهاتنی ئارەزوویەکی نەفسی، بەڵام توورەبوون و ڕق هەستان لەسەر حەق و لەسەر هەتکی حورمەتی ئاین ئەوە بەعیبادەت حسێب دەکرێ.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: توورەبوون و ڕق هەستان ئیمان لادەباو تێکی دەدا وەك (تاڵی شاری) ئەگەر بیکەیتە ناو هەنگوینەوە تاڵی دەکاو لە کەڵکی دەخا.

ڕیوایەت کراوە: «من لم یكن فیه ثلاث خصال یجد طعم الأیمان، حلم یرد به جهل الجهال وعجز عن المحارم وخلق یداري به الناس»، واتە: سێ سیفەت هەن هەر کەس نەیبن تامی خۆشیی ئیمان ناکا، یەکەم: ئارامی و سینگ فراوانییەکی وەها کە چاری نەفامیی نەفامانی پێ بکا. دووەم: دوورکەوتنەوە لە کردەوەی حەرام. سێیەم: خوو و ڕەوشتێکی وەها بتوانێ مودارای پێ بکا لەگەڵ خەڵکداو دڵیان ڕابگرێ و بەسەلامەتی لەگەڵیاندا ڕابوێرێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەی نادیارە حیقد و حەسوودی بردن بەموسڵمانان، واتە: ئەگەر کەسێ خوا نیعمەتێکی پێ دا، یەکێکی تر پێی ناخۆش بێ و بەدڵ حەز بکا ئەو نیعمەتە لەو بستێنێ و بیدا بەم.

عوقبە (ر.خ) دەگێڕێتەوە کە حەسوودی ئیمان تێك دەدا. جا ئەگەر بێ ئیختیار ئەم حەسوودییەی بەسەردا هات و گورج لێی پەشیمان بووەوە و ئەو حاڵەی خۆی لا ناشیرین بوو ئەوە زیانی نییە.

ڕیوایەت کراوە: شەیتان بەدەستەو نەوەی خۆی دەڵێ: برۆن حەسوودی و ستەمکاری بخەنە

ناو دڵ و دەروونی موسڵمانانەوە، چونکە حەسوودی برای کوفر و شەریك بۆ خوا دانانە.

نەخۆشیی حەسەد و ڕق ناویراون بە(حالقة) واتە دین تاش، واتە ئەو کەسە کە حەسوودی بەخەڵك ببا دینی بەساغی نامێنێ و هەروەك گوێزان مووی لەشی ئینسان دادەتاشێ حەسوودیش دینی ئەو ئینسانە حەسوودە وەها دادەماڵێ و نایهێڵێ. دیارە بۆ ئیسپاتی ناپەسەندیی حەسوودی بەسە کە لە سوورەتی (فلق)دا ئەمر کراوە بەپەناگرتن بەخوا لە شەڕی ئینسانی حەسوود کە حەسەد بەئینسان بەرێ. سەبارەت بەڕق و کینەیش لە حەدیسی شەریفدا هەیە، ئەگەر دوو موسڵمان ڕقیان لە یەك هەستێ و تا ماوەی سێ ڕۆژ قسە لەگەڵ یەك نەکەن و، ئەم لە یەك تووڕە بوونەیشیان لەبەر کاروباری دنیایی بێ، پاش ئەو سێ ڕۆژە هەر کامیان بمرێ شایانی سزای دۆزەخ دەبێ، مەگەر خوای میهرەبان بیبەخشێ.

لە جوملەی گوناهی گەورەی نادیار (تکبر) خۆ بەگەورە گرتن بەسەر خەڵکدا. ئەم سیفەتە شتێکی زۆر ناباروو ناپەسەندەو دەبێتە هۆی گوێ نەدان بەحەق و تەماشاکردنی موسڵمانان بەچاوی بچووکی و کەم نرخی و جێبەجێ نەکردنی واجیباتی زیممە وەك وەڵامی سەلام و فێرکردنی نەزانان و شارەزایی کردنی داماوان. هەروەها دەبێتە هۆی بێ ڕەحمی و بێ ئینسافی دەربارەی حەقی خەڵك و قسوور لەگەڵ خێزان و لەگەڵ خەڵکی تریشدا، دەبێتە هۆی گوێ نەدان بەحوقووقی خودا لە حەددە شەرعییەکانا. پوختەی قسە ئەوەیە خۆ بەگەورە زانین لای خوا بێجگە لە کوفر لە هەموو خوویەکی بەد خراپترە، پەنا بەخوا لەمەو لە سیفەتە ناهەموارەکانی تر.

بەڵێ ئەگەر کەسێ دیار بوو کە گوێ بەدین ناداو بەناشکرا فیسق و فجوور دەکرد ئەوە بۆ ئینسانی موسڵمان دروستە موبالاتی پێ نەکاو ئەهەمییەتی پێ نەداو فیز بکا بەسەریدا. ڕیوایەت کراوە: «تقربوا إلى الله ببعض أهل المعاصي وألقوهم بوجوه مكفهرة والتمسوا رضا الله بسخطهم وتقربوا إلى الله بالتباعد منهم». بەڵام ئەمەیش بەمەرجێ کە ئینسان لە فیتنەی ئەو کەسانە نەترسێ یا هیوای بیستنی ئامۆژگاریی پێیان نەبێ ئەگەر نا هەر موجامەلە و ئیحترامیان باشە.

ڕیوایەت کراوە: ئەو کەسەی بەئەندازەی دانەی خەرتەلەیێ فیز و دەمار لە دڵیدا بێ، ناچێتە بەهەشت، واتە: یا پێویستە بەقەدەر خۆی لە دۆزەخدا سزا بدرێ یا مەگەر خوا بەتایبەتی عەفووی بکا.

دەگێڕنەوە لەو کاتەدا کە سەلمانی فارسی (ر.خ) فەرمانداری ناوچەی مەدائین و

بەغدای ئیمڕۆ بووە، ڕۆژێ لە ڕێگادا دەگا بەیەکێ کە هەندێ کای بۆ ئاژەڵەکەی کڕیبوو. زەلامەکە حەزرەتی سەلمانی نەناسی و داوای لێ کرد ئەو کایەی بۆ هەڵگرێ ئەویش بۆی هەڵگرت و ناوی خۆی نەبرد.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورەکان عوجبە. ڕیوایەت کراوە حەزرەتی مووسا (د.خ) لە شەیتانی پرسی: کام گوناه هەیە ئەگەر ئادەمیزاد بیکا ئیتر لەگەڵتدا ڕێك دەکەوێ و بەینتان باش دەبێ؟ "ئەویش لە وەڵامیدا وتی: عوجب واتە خۆ بەچاك زانین و لە خۆبایی بوون. هەرکاتێ ئادەمیزاد لە خۆی بایی بوو و بەباشی تەماشای خۆی کرد و لە تاوانباری نوقسانکاریی خۆی بێ ئاگا بوو، ئەو کاتە من بەتەواوی زاڵ دەبم بەسەریداو ئەوەی بمەوێ پێی دەکەم.

لە گوناهە گەورە نادیارەکانە تەماعکاری و دەنائەت پەرستی بۆ دنیا، واتە تەماع وا بکا بەئینسان هەموو جۆرە پەستی و حەقارەتێ قبووڵ بکا ئەوە یەکێکە لە ڕەزیلە نابارەکان و، کاتێ ئادەمیزاد تەبیعەتی هاتە خوار بۆ قبووڵ کردنی هەموو جۆرە پەستییەك لە پێناوی ماڵی دنیادا ئەوە ئەو ئادەمیزادە تاوانبارە و ئەو تەماعەی دەبێتە هۆی گەلێ گوناهکاری و ناتەواوی و بێ دینی.

پێویستە بزانن مەبەس لە تەماع ئەوە نییە کە ئینسان بەیاسای شەرع و بەڕێگای ڕەواو بەجێ، هەوڵی پەیداکردنی ماڵی دنیا بدا، بەکشتوکاڵ یا ئاڵوگۆڕ یا کرێکاری یا هەر جۆرە کەسابەتێکی شەرعیی تر. لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە «لیس من حب الدنیا طلب ما یصلحك»، واتە: گەڕان بەدوای ڕزق و ڕۆزیێ کە ژیانت چاك بکاو لە هەموو لایەکەوە پۆشتەو پەرداخت بکا، پێی ناوترێ دنیا خۆشویستن. بەڵکو مەبەس لە تەماعکاری ئەوەیە کە ئینسان بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامانی دنیا بەهەموو جۆرێ هەوڵ بدا و گوێ نەداتە حەرام و حەڵاڵ و واجیبی ئاینی لەسەر بفەوتێنێ و پیاوەتی و شەرەفی خۆی لەسەر دابنێ و لە سنووری پیاوەتی لابداو خۆی بۆ سووك بکا، وەکو ئەوە کە گەلێ لە ئەهلی ئەم ڕۆژە پێیەوە گیرۆدە بوون و بۆ پەیداکردنی مایە و پایەی دنیایی چەند کردەوەی حەرام دەکەن.

یەکێ لە گوناهە گەورە نادیارەکان حیرسە لەسەر دنیا کە دەبێتە هۆی کۆکردنەوەی ماڵی دنیاو مەنعی ئەوە کە لە شوێنی خۆیدا سەرف بکرێ. دیارە ئەم مەنعی سەرفی ماڵی دنیایە لە خاسیەت و پەستیی تەبیعەت و ڕژدییەوە پەیدا دەبێ.

زەممی بەخیلم لە نامەیێکی سەربەخۆدا نووسیوە و لەوێدا باسی ئەوەم کردووە کە

بەخیلی بریتییە لە ڕاگرتنی ماڵ لە کاتێکدا سەرفکردنەکەی واجیبی شەرعی بێ.

دیارە هەروەکو سەرف نەکردنی ماڵی دنیا مەزمووم و خراپە، هەروەها ئیسراف و تەبزیر و زیادەڕەوییش لە سەرفی ماڵدا مەذموومو و خراپە. زۆربەی ئیسرافیش لەوەوە پەیدا دەبێ کە کابرای موسریف حەز لەوە دەکا خەڵك مەدحی بکەن و تەعریفی بڵاوببێتەوە.

دەگێڕنەوە کە شەیتان، لەعنەتی خوای لێ بێ، هات بۆلای حەزرەتی سولەیمان (د.خ) ئەویش لێی پرسی: ئەی ئیبلیس بە چ شتێ زاڵ دەبی بەسەر ئوممەتی پێغەمبەری ئاخر زەماندا کە (محەمەد)ە (د.خ)، ئەویش لە وەڵامیدا وتی: خۆشویستن و حیرسی دنیا دەخەمە دڵیانەوەو لە پێش چاویاندا جوانتری دەکەم لە وتنی (لا إله إلا الله محمد رسول الله) واتە: لەبەر حیرسی دنیا نایانپەرژێ ناوی خوا بهێنن.

یەکێ تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان حوببی جاهە، واتە: حەز کردن لە پایەو شان بۆ ئەوە خەڵك بەشان و باڵیدا هەڵدەن و مەدحی بکەن. جا ئەم حەز لە مەدح و سەنا کردنە ئەگەر لەسەر کردەوەی خۆی بێ، واتە بیەوێ لەسەر هەر کارێ کە بیکا خەڵك مەدحی بکەن، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕیاکردن. خۆ ئەگەر لەسەر شتێ بێ کە نەیکردووە، بۆ نموونە: کابرا نانبدە نییە کەچی حەز دەکا خەڵکی پێی بڵێن: پیاوێکی خاوەن نان و خانەدانە ئەوە زۆر خراپترە، خوای گەورە فەرموویەتی: «وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ» واتە: ئەوانە کە حەز دەکەن مەدح و سەنایان بکرێ لەسەر شتێ کە نەیانکردووە، گومان مەبە کە لە سزای دۆزەخ ڕزگار ببن. بۆ نموونە: کابرا پیاوچاك نییە و حەز دەکا پێی بڵێن: پیاوچاك... یا وەلی نییە حەز دەکا پێی بڵێن: وەلی. تەنانەت لە هەندێ کتێبدا باس کراوە کە ئەم سیفەتە هۆی عاقیبەت شەڕییە، پەنا بەخوای گەورە.

بەڵام کاتێ حەز بەمەدحکردن خراپە کە ئینسانەکە ئەو مەدحەی پێ خۆش بێ بۆ پەیداکردنی ماڵی دنیا. بەڵام ئەگەر لەبەرئەوە پێی خۆش بێ مەدحی بکەن کە دەستی بڕوا و شۆرەتێ پەیدا بکاو بتوانێ بەو شۆرەت و دەسەڵاتە زۆرلێکراوێ لە ستەم ڕزگار بکاو حەقێ بۆ داماوێ بسێنێتەوەو، مەبەستە ئاینییەکانی پێ جێبەجێ بکا، ئەوە حەرام نییە، بەڵکو بەپێی ئەنجامەکانی یا واجیب یا سوننەتە.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان (اتباعی هوا) واتە دوای ئارەزووی نەفس کەوتنە کە ئینسان وای لێ بێ، ئەوەندە هەواپەرست بێ هەرچی نەفسی داوای لێ بکا

هەوڵی بۆ بداو پەیدای بکا. جا کاتێ ئینسان گەیشتە ئەم پایە ناشیرینە هەر گوناهێ لە وڵاتدا باو بێ دەیکاو، لە هەموو ڕوویەکەوە فەرقی حەڵاڵ و حەرامی لا نامێنێ.

دیارە مەبەس لە دوای ئارەزووی نەفس کەوتن، ئەوە نییە کە ئینسان هەندێ ئارەزووی دنیایی لە دڵدا بێ، چونکە کەس نییە خاڵی بێ لە ئارەزووی نەفس.

لە حەدیسی شەریفایە: هیچ گوناهێ نییە، غەیری بت پەرستی، زیانی لە دوای ئارەزووی نەفس کەوتن زیاتر بێ، ئینسانی هەواپەرست ئەگەر خوا تەوفیقی نەداو لەو حاڵە نەگەڕێتەوە، بێجگە لەوە کە کافر دەبێ ئەنواعی مسیبەتی بەسەردادێ.

ڕیوایەت کراوە: کە خوای گەورە وەحیی کرد بۆ حەزرەتی داوود (د.خ): بڵێ بەو عەبدانە کە دینیان هەیە ڕووی خۆیان لە من وەرنەگێڕن، بەهۆی هەواپەرستییەوە، چونکە ئەگەر ئەوان ڕووم لێ وەرگێڕن، من بەندەی زۆرم هەیە ڕووم تێ بکەن بەڵام ئەوان غەیری من خوایان دەست ناکەوێ کە بۆ پەرستن و عیبادەت بۆ کردن بشێ، بەخشش و خەڵاتی من زۆر زۆرە وەکو بەشی ئەوان دەکا، بەشی خەڵکی تریش دەکا، بەڵام غەیری من کەس خاوەنی هیچ نییە.

جا لەبەرنەوە کە نیعمەتەکانی خوا زۆرن و دواییان نایێ و هەر نیعمەتێ بەهەرکەسێ بگا هەر لە خواوەیە و، لەبەرئەوە کە خوای گەورە حەزی لەوەیە سوپاسی نیعمەتەکانی بکرێ، موژدەی بەخاوەن سوپاسەکان داوەو فەرموویەتی : «لئن شكرتم لأزيدنكم» واتە: سوێنتان بۆ دەخۆم ئەگەر نیعمەتی منتان لە بەرچاو نەبێ و کوفرانی بکەن، تووشی سزای ناهەموارو نابار دەبن، بەڕاستی سزای من سەخت و تیژە.

حەزرەتی پێغەمبەریش (د.خ) تەرغیبی ئوممەتەکەی کردووە لەسەر ئەوە کە هەرکەسێ چاکەی کرد، لەگەڵیاندا پاداشی چاکەکەی بدەنەوە، هەتا خوو بگرن بەسوپاسەوە و شوکری نیعمەتی خوداش بکەن، لەم ڕووەوە فەرموویەتی: «من لم يشكر الناس لم يشكر الله» واتە: هەر کەس سوپاسی ئادەمیزاد نەکاو چاکەی لە بەرچاو نەبێ، ئەوە سوپاسی چاکە و نیعمەتی خوای گەورەیش ناکات.

یەکێ لە گوناهە گەورە نادیارەکان، ئەمین بوونە لە مەکری خوا، پەنا بەخوا، نیشانەی ئەم ئەمین بوونەش ئەوەیە لە گوناهکردندا خۆی بەرەڵا بکا و بێ باکانە دەست بداتە گوناهکردن و بەدەم بڵێ: خوا غەفوور و ڕەحیمە و ئیحتیاجی بەخۆماندووکردنی من

نییەو، بەم جۆرە خەیاڵە پڕوپووچە هەیبەتی ئەمرو نەهیی خوای لە دلدا نەمێنێ.

لە حەدیسدا هەیە: کاتێ کە خوای گەورە شەیتانی لەعینی لە قاپیی ڕەحمەتی خۆی دەرکرد، جیبرائیل و میکائیل کە لە فریشتە هەرە سەربەرزەکانی بارەگای خوان لە ترسی غەزەبی خوا دەستیان کرد بەگریان. جا خوای گەورە لەگەڵ ئەوەشدا کە بەهەموو شتێ دەزانێ لێیانی پرسی: بۆچی وا بەکوڵ دەگرین؟ عەرزیان کرد: لە تۆ ئەمین نین و دەترسین وەکو شەیتان لە قاپیی کەرەمت دەرمان بکەی، ئینجا خوای گەورە پێی فەرموون: «هکذا کونا خائفین» واتە: هەروەها لە من بترسن. هەر لەسەر ئەم بناخە بوو کە حەزرەت (د.خ) هەمیشە لە دوعادا دەیفەرموو: «یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك» واتە: ئەی خوای هەڵسووڕێنی هەموو دڵان! دڵی من لەسەر دینی خۆت دابمەزرێنە. بەڵێ دڵی هەموو خاوەن دڵێ لە ژێر هێزی ئەوادایە و ئەو دەتوانێ بەباری چاکە و خراپەدا هەموو دڵێ هەڵسووڕێنێ. کەواتە هەرگیز نابێ و ڕەوا نییە کە ئینسان لە مەکر و توانا و دەستەڵاتی خوای گەورە ئەمین بێ و پشتێنی لێ بکاتەوە. پێویستە ئێمەش هەمیشە ئەم دوعایە بخوێنینەوە بەڵکو خوای گەورە دڵ و دەروونمان لە سەر کاری خێر و باوەڕی چاك دابمەزرێنێ.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان یەئس و بێ هیوا بوونە لە ڕەحمەتی خوا. هەندێ لە زاناکان ئەم گوناهەیان بە (اکبر الکبائر) ژماردووە، خوای گەورە فەرموویەتی: «وَلاَ تَيْأَسُواْ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ» واتە: بێ هیوا مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونکە بێجگە کافران کەس لە ڕەحمەت و میهرەبانیی خوا نائومێد نابێ. هەروەها فەرموویەتی: «يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ» واتە: ئەی بەندەکانی من لەوانە کە لە ئەندازەبەدەر دوای ئارەزووی نەفس کەوتوون! لە میهرەبانیی خوا نائومێد مەبن، خوا دەتوانێ لە هەموو گوناهێ خۆش ببێ، خوا لێبووردوو، سرپۆش و میهرەبانە. دیارە پاش ئەم ئایەتە پیرۆزانە مەعنای نییە ئینسان لە ڕەحمەتی خوا نائومێد بێ. ڕێگای ئیسلامەتی و سەلامەتی ئەوەیە کە ئینسان هەمیشە لە بەینی ترس و ئومێدا بێ. نیشانەی ئەم ڕێگایەش ئەوەیە ئەگەر ڕۆژێ سەد جار تووشی گوناه ببێ هەموو جارێ ترسی بەسەرا غاڵب دەبێ و لەو گوناهە پەشیمان دەبێتەوەو دڵی خۆی بەوە ئارام دەکا کە خوا لە هەموو میهرەبانان میهرەبانترە و لەوانەیە لێی ببوورێ و چاوپۆشیی لێ بکا.

لە حەدیسا هەیە کە بەدگومانی بەخوا یەکێکە لە گوناهە گەورەکان. واتە: ئینسانی

گوناهبار نابێ گومانی وابێ که خوا عەفووی ناکا، بەڵکو دەبێ هەموو کاتێ هیوای بەعەفووی خواو لێبووردنی زۆر بێ.

نیشانەی ئەم بەدگومانییە ئەوەیە ئەگەر کابرا موسیبەتێکی بەسەردا بێ، ئارامی لێ هەڵدەگیرێ و زۆر پەرێشان دەبێ و هاواری لێ هەڵدەسێ و خراپیی حاڵی خۆی بۆ خەڵك دەردەخا، بێ گومان ئەگەر گومانی بەخوا باش بێ لە کاتی ئەو موسیبەتەدا دەڵێ: خوا بۆیە ئەم دەردەی داوە بەسەرمدا کە بیکاتە کەفارەتی گوناهەکانم و تاوانەکانم بسڕێتەوە.

شایانی زانینە: جەزەع و فەزەع، واتە خۆ نارەحەت کردن، وەختێ گوناهە کە لە دڵدا لەو قەزای خوایە عاجز و ناڕازی بێ، بەڵام ئەگەر لە دڵدا باوەڕی وابێ ئەو موسیبەتە لە لایەنی خواوە نێردراوە و دەبێتە کەفارەتی گوناه یا دەبێتە هۆی بەرزیی پایەی لە لای خوا، ئەوە قەیناکا. هەروەها ئەگەر گریانەکەی ئەنجامی جۆشی دەروون بێ و دەنگ بەرز نەکرێتەوە ئەوە بەهیچ جۆر گوناه نییە، تەنانەت گوناهی بچووکیش نییە.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان شاردنەوەی حوکمی شەرعە، واتە: لە شوێنێکا ڕوونکردنەوە و بەیانکردنی حوکمی شەرع پێویست بێ، لەوێدا قسە نەکردن و بێ دەنگ بوون گوناهێکی گەورەیە. لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە هەڕەشەی لەوانە کردووە کە حوکمی ئاین دەشارنەوە، ئەوەتە دەفەرموێ: «إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ». واتە: ئەو کەسانە کە ئاگاداری حوکمە ئاینییەکانن و لە کاتی پێویستدا دەیشارنەوە، ئەوانە خوای گەورە لە ڕەحمەتی خۆی دووریان دەخاتەوەو، ئەهلی ڕەحمەت، موسڵمانان و فریشتە و پێغەمبەرانیش، نەفرینیان لێ دەکەن. جا لەبەر ئەهەمییەتی دەرخستن و بەیانکردنی حوکمی شەرع من دەربارەی ئەمر بەچاکەو نەهی لە خراپە نامەییەکی تایبەتیم نووسیوەو هیوادارم، ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ، سوودی لێ وەربگرن.

یەکێ لە گوناهە گەورە نادیارەکان بەسووك تەماشاکردنی زانایانی ئاینە. زانای ئاینی کە ڕەفتار بەزانینەکەی بکا دوو پایەی هەیە: یەکەم پایەی زانستە ئاینییەکەی، دووەم ڕەفتارە باشەکەی. ئەم دووانەیش هەردووکیان هۆی ڕێز و قەدر لێگرتنن. جا ئەگەر ئەو زانا ئاینییە ڕەفتاری باش نەبوو، ئەوە هەرچەند پێویستە ڕەفتارە ناهەموارەکەی ببوغزێنرێ، دەبێ ڕێز لە زانینەکەی بگیرێ و بەجۆرێ ئازار نەدرێ کە ئەهلی عیلمی پێ سووك ببێ.

هەروەها لە گوناهە گەورە نادیارەکانە بوغزاندن و دوژمنایەتی لەگەڵ ئاڵی حەزرەتی پێغەمبەردا (د.خ) کەنەوەی حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمەی زەهران لەگەڵ باقیی موسڵمانانی بەنی هاشم و بەنی موتەلیب کە پێوەندییان بەحەزرەتەوە (د.خ) هەیە. لەم بابەتەوە چەند حەدیسی شەریف ڕیوایەت کراون و بەدرێژی لە نامەییەکی تایبەتیدا نووسیومن.

یەکێ لە گوناهە گەورە نادیارەکان حەزنەکردنە بەکۆمەڵەی ساڵحان. جا ئەگەر ئەو حەز لێ نەکردنەیان لەبەر نەفسی خۆیان بێ، ئەوە گوناهی گەورەیە و بەس. خۆ ئەگەر لەبەر پیاوچاکی و لە خواترسییەکەیان ڕقی لێیان بێ، ئەوە دەبێ بەکوفر (والعیاذ باللە).

یەکێکی تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان خۆشویستنی فاسقان و زۆردارانە. نیشانەی ئەم خۆشویستنەش ئەوەیە کە لێیان نزیك بنەوەو لە ساڵحان دووربکەونەوە، لە حەدیسدایە: «وهل الدین إلا الحب للە أو البغض للە؟» واتە: دین بریتییە لە خۆشویستنی ئەهلی دین لەبەر خوا و بوغزاندنی پیاوخراپ و ئەهلی بیدعەت لەبەر خوا. هەروەها لە حەدیسایە: «تقربوا إلی اللە ببغض أهل المعاصي والقوهم بوجوه مکفرة، والتمسوا رضا اللە بسخطهم، وتقربوا إلی اللە بالتباعد منهم»، واتە: ئیتاعەی خوای گەورە بکەن و لێی نزیك ببنەوە لە ڕێی خۆشنەویستن و بوغزاندنی ئەهلی گوناهەوە و بەڕووییەکی گرژ و تاڵەوە پێیان بگەن و، بەعاجزبوونی ئەوانە لێتان داوای ڕەزامەندیی خوا بکەن و بەدوورکەوتنەوە لەوانە لە خوای گەورە نزیك ببنەوە.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان عاجزبوون و ڕەق هەڵگرتنە لە کەسێ کە بزانرێ خوا خۆشی دەوێ. نیشانەی ئەمەش ئەوەیە کە کابرا بەهەرجۆرێ بۆی بلوێ ئازاری دڵی ئەم جۆرە کەسانە بدا. لە حەدیسی قودسیدا هەیە: «من أهان ولیاً لي فقد بارزني بالمحاربة. واتە: هەرکەسێ ئازاری دۆستێکی من بدا، ئەوە بەڕاستی هاتووەتە مەیدانی شەڕ لەگەڵ مندا.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان ئەوەیە ئەگەر موسڵمانێ گیرۆدەی مسیبەتێ بوو یەکێ شادەکامیی پێ ببا، مەگەر ئەو موسڵمانە ستەمکار بێ، ئەوە لە لایەنی ستەمکارییەکەیەوە ڕەوایە شادەکامیی پێ ببرێ لە کاتی تووشی کارەسات بوونیدا تا یەکێکی تر پەند وەربگرێ.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان، تەرکی سەڵەواتدانە لەسەر حەزرەت (د.خ) لە کاتێکدا کە ناوی موبارەکی ببیسێ.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە: کە ڕۆژی حەزرەت (د.خ) سەرکەوتە سەر مینبەرو هەر پلەیەك سەر دەکەوت دەیفەرموو: ئامین.

عەرزیان کرد: بۆچی ئەم سێ جارە ئامینی فەرموو؟ ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: جیبرەئیل لە پلەی یەکەمدا هات و وتی: هەرکەس ناوی تۆی بیست و سەڵەواتی لێ نەدای یاخوا بکەوێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە. منیش وتم: ئامین. واتە: سەڵەوات نەدان لە حەزرەت (د.خ) لە کاتی ناوهاتنیدا نیشانەی بێ مەحەببەتییە لەگەڵیدا، دیارە بێ مەحەببەتی لەگەڵ حەزرەتدا (د.خ) لە ناهەموارترین نەخۆشیی دڵی موسڵمانانە.

لە گوناهە گەورەکان فەرامۆشکردنی کەلیمەییەك یا ئایەتێ لە قورئانی کەریم، چ جایێ سوورەتێ. واتە: ئینسان میقدارێ لە قورئانی کەریم بخوێنێ و فێری ببێ یاخۆ بیکاتەبەرو لە پاشان بەبێ بەهانەیێکی شەرعیی وەکو نەخۆشی یا کۆششی بۆ ژیانی ماڵ و مناڵ یا هەر، بۆی ڕێك نەکەوێ دەوری بکاتەوە و، ئەو میقدارە قورئانەی لە بیر بچێتەوە یا لەبەری نەمێنێ. لە حەدیسی شەریفدا هەیە:

«من تعلم القرآن ثم نسيه لقي الله وهو أجذم» واتە: کەسێ قورئانی پیرۆز فێر ببێ و لە پاشان بەبێ بەهانەی شەرعی لە بیری بچێتەوە، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەئەجزەمی دەگاتە خوای گەورە. جا کەلیمەی ئەجزەم لەم حەدیسەدا بە سێ جۆر مەعنای لێ دراوەتەوە، یەکەم: (گول؟)، پەنا بەخوا، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا بەگولی حەشر دەکرێ. دووەم: دەست بڕاو، واتە:لە ڕۆژی قیامەتا دەستی خاڵی دەبێ لە خێر و چاکە. سێیەم: زوبان بڕاو، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا زوبانی نابێ عوزرێ بۆ خۆی بهێنێتەوە.

کەوابێ بۆ ڕزگاربوون لەم موسیبەتە هەرکەسێ ئەندازەیێ قورئانی خوێندبێ و لەبەر دەورنەکردنەوە لە بیری چووبێتەوە پێویستە دەوری بکاتەوەو بەڕەوانی فێری ببێتەوە، هەروەها ئەگەر لە وەختی خۆیا لەبەری کردبێ و لە دواییدا لەبەر گوێ پێ نەدان لە بەری نەمابێ، پێویستە بیکاتەوەبەر.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورە نادیارەکان دڵڕەقییە. نیشانەی ئەمەیش ئەوەیە کە دڵی بۆ ئینسانی هەژار و کەمدەست ناسووتێ و لە ئامۆژگاریی زانایانی ئاین سوود وەرناگرێ، تەنانەت ئەگەر لای کەسێکدا بێ گیانی دەربچێ، هیچ مەبەستی نییە و ئەو گیان دەرچوونەی بەلاوە شتێکی سووك و بێ نرخە، هەروەها دڵی بەهەتیوی ڕووت و برسی و تینوو ناسووتێ و ئەگەر ئینسانی داماوی برسی داوای نانێکی لێ کرد، نایداتێ! لە

حـەدیسی شەریـفدا هـەیـە: «أبـعـد الـنـاس من اللـه ذو القلب القـاسي». واتـە: دوورتـریـن ئادەمیزاد لە خواوە کەسێکە خاوەنی دڵی ڕەش و ڕەق و بێ بەزەیی بێ. لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: داوای خێر بکەن لە خاوەن بەزەییەکانی ئوممەتی من نەك لەوانە کە دڵیان ڕەقە، چونکە ئەو دڵڕەقانە لە لایەنی خواوە لەعنەتیان دێتەسەر. لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: ڕەحمەتی خوا دوورناکەوێتەوە مەگەر لە ئینسانی خاوەن شەقاوەت و بەدبەخت.

یـەکێکـی تـر لـە گـونـاهـە گـەورەکـان جـەسـارەت و چـاوقـایـمییـە لـەسـەر تـاوان کـردن، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەندە تاوانکاری بکا کە ترس لە دڵیدا نەمێنێ.

یـەکێکی تر لـە گونـاهـە گـەورەکـان ئـەوەیـە ئینسان پێی خۆش بێ، هـەجوی پـیـاوی گەورەی ئاینی بکرێ یا پێی خۆش بێ کە ئەو پیاوە گەورە ئاینییە تووشی زەللەیە ببێ و نـوشوستـی بێنـێ. نیشانـەی ئـەم سیفـەتـەش ئـەوەیـە کـە یـارمـەتیـی ئـەو کـەسانـە بدا کـە هـەجوەکەی دەکەن یـا دەستـی بڕوا مـەنعیـان بکـا لـەو هـەجوە کـەچی مـەنعیـان نـەکا. پوختەی قسە: یارمەتیی ئەو جۆرە کەسانە کە ئازاری پیاوی گەورەی ئاینی دەدەن لە گوناهە گەورەکانە.

یەکێکی تر لە گوناهە گەورەکان ئیسرار و دەوامکردنە لەسەر گوناهی بچووك، واتە: قەستی وابێ کە بەردەوام بێ لەسەر کردنی گوناهە بچووکەکان، ئەگەرچی ناوەناوە ئەو گوناهە بچووکانەی لێوە ڕوویدا. کەواتە هەر کاتێ ئینسان بەم قەستەوە گوناهی بچووك بکا، کە دەوام بکا لەسەری ئەوە ئەو گوناهە بچووکە بەگوناهی گەورە دادەنرێ، مەگەر لە بەینی گوناهە بچووکەکاندا تەوبە بکاو لە کردەوەکەی پەشیمان بێتەوە، ئەوە مادام تەوبە بکەوێتە بەینی گوناهەکان بەئیسرار و دەوام کردن دانانرێ.

لەبەرئەمەیە حەزرەت (د.خ) فەرمانی داوە بەئوممەتی خۆی کە هەموو ڕۆژێ حەفتا جار تەوبە بکەن.

(والسلام على من اتبع الهدى)

شەوی جومعە چوارەمی (ذی الحجە)ی ١٣٩٦ی کۆچی، ڕێکەوتی ١٩٧٦/١١/٢٦ی زاینی، لە تەرجەمەکردنی ئەم نامەیە بوومەوە.

## نامەی چل و پێنجەم

# باسی خوو و ڕەوشتی خراپ دەکا

بسم الله، والحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه وأتباعه بأحسان إلى يوم الدين.

پاش ئەمە برادەران! بزانن وا چاکە لە سەرەتای هەموو نامەییەکەوە ئەم فەرموودە بخوێننەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لە گەورەترین خوو و ڕەوشتی موسڵمان ئەوەیە کە هەرگیز لە بیستنی قسەی خێری ئاینی تێر نەبێ. کەوابێ نابێ برادەران گوێ نەدەن بەم نامانەو لێیان وەڕس ببن. جا ئەگەرچی هەموو گوناهە گەورەکانم بەکورتی لە پێنج نامەدا نووسیوە بۆ خزمەتتان، هەرچی زیانی زۆرتر و پڕ مەترسیتر بێ و بەشێوەییەکی گشتی هەرەمەی موسڵمانان گیرۆدەی بووبن، بەپێی توانا عەرزیان دەکەم و بۆیان دەنووسم، هەتا برادەران ئاگایان لە عەیبی خۆیان ببێ و بەپێی توانا هەوڵ بدەن لێی ڕزگار ببن.

فەرموودەی پێغەمبەرە: «إذا أراد الله بعبده خيراً بصره بعيوب نفسه»، واتە: کە خوای گەورە نیازی خێری بە بەندەی خۆی هەبێ لە عەیبەکانی خۆی ئاگاداری دەکاو وای لێ دەکا خۆی بناسێ و چاك و خراپی خۆی بزانێ. برا خۆشەویستەکان! هەتا عەیبەکانی خۆتان نەزانن ناتوانن خۆتان پاك بکەنەوە لێیان، یا ئەگەر بەقەزاوقەدەر ئەو عەیبەتان لێوە دەرکەوت تەوبەی لێ بکەن.

لەم نامەدا تێکڕا باسی خووڕەوشتی چاك و خراپی موسڵمانتان بۆ دەکەم تا بەرچاوتان ڕوون و لە کاروباری خۆتان ئاگادار بن. جا ئەگەر خووڕەوشتی تاك چاك بوو ئەوا هەزار سوپاسی خوای گەورە بکەن، بەڵام لە خۆتان بایی مەبن و خۆتان بەباش مەزانن. خۆ ئەگەر خوو و ڕەوشتتان چاك نەبوو ئەوا خۆتان بناسن و لە خۆتان ڕازی مەبن و بە هەموو جۆر تێ کۆشن بۆ ئەوە کە ئەخلاقی خۆتان چاك بکەن و کردەوەکانتان بەرەو شەرع بەرن. فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) کە شەیتانی لەعنەتی وتوویە: ئەی پێغەمبەری

خوا! من پشتی بنیادەمم بە گوناهـ شکاند و ئەوانیش پشتی منیان بەپەشیمان بوونەوە و لە خوا پاڕانەوە و تکای لیخۆشبوون شکاند، دووبارە من گەڕامەوە سەریان و بەوە پشتم شکاندن کە هەر کەسێکم لە خۆی ڕازی کرد و وەزعێکی وەهام بەسەردا هێنان کە لە خۆیان بایی بوون، ئیتر ئەمجارە نەیانتوانی پشتی من بشکێننەوە.

من بەم نامەی خووورەوشتی بەدە بەڵکو بەنامەکانی گوناهە گەورەکان بەرچاوی نێوەم ڕوون کردووتەوە، سا بەڵکو خوای گەورە هیدایەتی برادەران بدات، هەتا ڕزگار ببن.

دەگێڕنەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «اللهم جنبني منكرات الأعمال و الأخلاق و لأهواء و الأدواء» واتە: ئەی خوای میهرەبان! لە کەرەم و بەخششی تۆ دەلالێمەوە کە دوورم بخەیتەوە لە کردەوەی نابار و ناهەموار و ناشەرعی وەك پیاوکوشتن و دزیکردن و ماڵی خەڵك خواردن و زیناکردن. هەروەها تکا لێ دەکەم کە لە خووورەوشتی ناپەسەند دوورم بخەیتەوە وەك کینەو دڵپیسی و ئاژاوە نانەوە. دوورم بخەیتەوە لە ئارەزووی ناپەسەند وەکو ئارەزووی کردەوەی خراپ و ستەمکاری و کاری ناشەرعی. دوورم بخەیتەوە لە دەرد و بەڵای خراپ وەکو گولی و نەخۆشیی ناشیرینی وەها خەڵکی ترێزم لێ بکەن. دیارە حەزرەت (د.خ) لەو ڕووەوە ئەم دوعای دەکرد کە دەیزانی گەلێ لە ئەفرادی ئوممەت گیرۆدەی هەندێ لەم شتانە بوون بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن و ڕوویکەنە خوای گەورە، بەڵکو خوا بیانپارێزێ.

جا کردەوە هەرە ناشیرینەکانم لە پێنج نامەدا نووسیوە. خووورەوشتە ناپەسەندەکانیش وەك داخ لە دڵی و حەسوودی بە خەڵك بردن و خۆ بەگەورە زانین و فیزکردن و وێنەی ئەمانە. ئارەزووبازییە ناپەسندەکانیش وەك (زیغ) و لادان لە بیروباوەڕی ئیسلامی و بێ هێزیی باوەڕ. نەخۆشییە ناشیرینەکانیش وەك نەخۆشیی ئیسقا کە نەخۆشییەکە هەرگیز تینوویەتیی ناشکێ، یا سیل، یا (ذات الجنب) و وێنەی ئەمانە کە یەك لە یەك پڕ مەترسیترن.

مین جوملە غەیبەت کردن، واتە: بەخراپی باسی خەڵك کردن، لە بەدخووییەوە پەیدا دەبێ. هەروەها ڕق و کینە و داغ لە دڵی لەگەڵ موسڵمانان و نەخۆشییە نادیارەکانی تر وەك فیزکردن و خیسسەت. زۆربەی زیانی ئەمانەش لە زمانەوەیە و کەم جار بەئیشارەت دەبێ. جا لەبەر ئەمە لەم نامەدا باسی خراپیی تێکڕای بەدخوویی دەکەم بۆ برادەران. حەدیسەکانی زەممی غەیبەتیش لە نامەییەکی تایبەتیدا باس کراون.

وە هەرکەسێ لەم بابەتەوە ئامۆژگاریی موسوڵمانان بکا، پێویستە لە پێشا زەممی بەدخوویی بکاو پاشان زەممی غەیبەت.

براکان! بزانن کە خوا پاکە و پاکیی دەوێ، لە بەندەکانی خۆشی کردەوەو وتاری پاك نەبێ، هیچ قبووڵ ناکا. لەبەر ئەمە ئینسانی خووورەوشت باش پایەی لای خوای گەورەیە وەك پایەی ئەو کەسانەی کە بەڕۆژدا بەڕۆژوون و بەشەودا خواپەرستی دەکەن. نیشانەی ئینسانی پاك ئەوەیە کە حەز لە هاوڕێیەتیی ئینسانی پاك دەکا. نیشانەی ئینسانی ناپاکیش ئەوەیە کە مەیلی لەسەر هاوڕێیەتیی ئینسانی ناپاکە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ». ئەم ئایەتە پیرۆزە عامە و زات و سیفەت دەگرێتەوە، واتە: وەکو ئینسان چاك و خراپی هەیە، کردەوە و ڕەوشتیش چاك و خراپی هەیە. جا ئەوانە کە خووڕەوشتیان هەر لەسەر ناپاکی بێ بەدەگمەن بەر عەفووی خوا دەکەون، بەڵکو بەپێی دادی خۆی سزایان دەدا. ئەوانەیش کە خووڕەوشتی باش و خراپیان هەیە حاڵیان لەوانەی پێشوو گەلێ باشترە و ئەنجامیان زۆر ڕووناکترە.

لە فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) ئەگەر بیستتان کێوێ لە شوێنی خۆی هەڵکەنراوە، باوەڕ بکەن. بەڵام ئەگەر بیستتان ئینسانێکی بەدخوو لە وەزعی خۆی لای داوەو خووڕەوشتی باش بووە، باوەڕ مەکەن. ئەم فەرموودە بەرزە کینایەیە لەوە کە لاچوونی خووی بەد گرانە و پێویستە خاوەنەکەی بۆ چارکردنی گەلێ هەوڵ بداو بچێ بەگژ نەفس و ئارەزووی خۆیدا هەتا ئەو خوویە کەمێ ڕام ببێ و ڕوویکاتە وتار و کرداری چاك.

لە فەرموودەییەکی تردا هەیە: خووی بەد نەگبەتە. لە یەکێکی تردا دەفەرمووێ: بەدخوو لە هەرە خراپەکانی ئوممەتی من حسێب دەکرێ و، خووی بەد کردەوەی چاك خراپ دەکا. واتە: وەکو چۆن کە سرکە بکەوێتە ناو هەنگوینەوە تامە شیرینە خۆشەکەی تێك دەدا، کردەوەی خراپیش کرداری چاك و ڕێکوپێکیی ئینسان تێك دەدا و دەیفەوتێنێ و تەوبەی نایەت، واتە: ئەگەر تەوبەیش بکا لەسەر ئەو تەوبەیە دەوام ناکا.

ڕیوایەت کراوە: «أن لكل شخص توبة إلا صاحب سوء الخلق فأنه لا يتوب من ذنب إلا وقع في شر منه». واتە: بۆ هەموو کەس تەوبە لە گوناه هەیە و لەوانەیە باش بگەڕێتەوە، ئینسانی بەدخوو نەبێ، ئەو زەحمەتە باش ببێ و، هەر کاتێ لە کردەوەییەکی خراپ تەوبە بکا، پاش ئەوە دەکەوێتە ناو کردەوەییەکی خراپترەوە.

براکان! بزانن کە ئادەمیزاد خاوەنی دوو شتە: یەکەم ڕواڵەت، دووەم خوو و ڕەوشت. ئەم دووانەش هەردووکیان چاك و خراپیان هەیە، بەڵام نابارى و ناشیرینى ڕواڵەت و دیمەن زیانێکی کەمی هەیە، کەچی ناشیرینیی خوو لەو دەردانەیە کە ئینسان لەناو دەباو خراپییەکی زۆری لێ پەیدا دەبێ.

دەگێڕنەوە یەکێ لە خواپەرستەکان لە شەیتانی پرسی: کام خوو لە خووەکانی ئادەمیزاد زۆرتر یارمەتیی تۆ دەدا؟ ئەویش وتی: حیددەت، واتە: توندوتیژی تەبیعەت. هەر کەس تەبیعەتی توندوتیژ بێ لە ڕێگەی ڕاست لای دەدەم، وەك چۆن منداڵان لە یاریدا تۆپ فڕێ دەدەن و یاریی پێ دەکەن.

هاوڕییەکانی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویانە: سەرى هەموو بێ عەقڵییەك توندوتیژی و هەڵچوونە. ئەبوو دەرداء (ر.خ) ڕیوایەتی کردووە: کاتێ خوای گەورە ئیمانی دروست کرد، ئیمان عەرزی بارەگای خوای کردو وتی: خوایە هێز و توانام پێ بدە، خواش هێزی پێ دا بە خووی باش و سەخاوەتیشی تێدا دروست کرد. هەروەها کاتێ کوفری دروست کرد عەرزی بارەگای خوای کردو وتی: خوایا هێز و توانام پێ بدە، خوایش هێزی پێ دا بە بەدخوویی و ڕژدی، واتە: لە هەر دڵێکدا کوفری دروست کرد بەدخوویی و ڕژدی و بەرچاوتەنگیی تێدا دروست کرد. دیارە ئەو کەسەی بەدخوو بێ، کردەوەی ناشیرینی لێ دەوەشێتەوە وەکو بوختان و غەیبەت و قسەهێنان و بردن.

پرسیاریان کرد لە یەکێ لە زانایانی ئیسلام کە ئینسان چەند عەیبی هەیە؟ لە وەڵامدا وتی: عەیبی ئینسان ئەوەندە زۆرە لە ژماردن نایێ بەتایبەتی عەیبی زمان کە دەگاتە هەشت هەزار. هەندێ لە عەیبەکانی نەفسم لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسیون.

لە حەدیسدایە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ قسەییەك بکا قازانجی تێدا بێ، یا بێ دەنگ بێ و لە ئافەت دوور بێ. هاوڕییەکانی عەرزیان کرد. ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ئێمە بەهۆی زمانەوە تووشی سزا دەبین؟ فەرمووی: هیچ شتێ نییە کە بەتوندی ئینسان بەسەر دۆزەخدا ڕاکێشێ زمان نەبێ. حەدیسێکی تر دەفەرمووێ: پاراستنی زمان لە وتاری ناهەموار لە باشترین کردەوەکانی ئینسانە لای خوای گەورە. لە حەدیسێکی تردایە کە هاوڕێیەکانی حەزرەت (د.خ) عەرزیان کرد: چی دەبێتە هۆی ڕزگاری؟ فەرمووی: زمانت لە وتەی نالەبار بگرەو لە خانووی خۆتدا دانیشەو بۆ گوناهی خۆت بگری.

هەروەها لە حەدیسێکی ترا فەرموویەتی: وا دەبێ کەسێ وتارێ بەدەمیدا دێ و نرخی بۆ دانانێ و نازانێ خێری گەیشتووەتە کوێ؟ کەچی خوای گەورە بەهۆی ئەو وتارەوە ڕەزای خۆی بۆ دەنووسێ هەتا قیامەت. هەروەها وادەبێ کەسێ وتارێ بەدەمیدا دێ و ئەهەمییەتی پێ ناداو نازانێ چەندێ گوناهی هەیە؟ کەچی خوای گەورە بەهۆی ئەو وتارەوە نارەزاییی خۆی بۆ دەنووسێ، هەتا ڕۆژی قیامەت. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: بەهۆی ئەو وتارەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەکەوێتە دۆزەخەوەو، بەناخیدا بەقوولاییی ڕێڕەوی حەفتا پایز دەچێتە خوارەوە.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: کەسێ قسەیەك دەکا بۆ ئەوەی خەڵکی پێ بکەنن، ئەو قسەیە دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی پایەی لە ئاسمانەوە هەتا زەوی. لە ڕیوایەتێکی ترا دەفەرمووێ: وەیل بۆ ئەو کەسەیە کە قسە دەکا بۆ ئەوەی خەڵکی پێ بکەنن.

خوای گەورە فەرموویەتی: «مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ» واتە: ئینسان هەر قسەیەکی لە دەم دەرچێ خوای گەورە دوو فریشتە دەکاتە ڕەقیبی ئاگایان لەو قسەیەی دەبێ، ئیتر باش بێ یا خراپ. جا براکان! وردبنەوە و بزانن کە لە کاتی باڵغ بوونەوە تا مردن ئێمە قسەمان چەندە زۆرە؟ کە لە ژمارە نایێ، کەچی خێری زۆر کەمە و شەڕی زۆر زۆرە. لە حەدیسێکی تردا دەفەرمووێ: خراپترین ئادەمیزاد لە جیهاندا یەکێکە خەڵك لە زمانی بترسن. لە حەدیسێکی تردا دەفەرمووێ: ئینسان ناگاتە حەقیقەت هەتا زمانی نەپارێزێ لە زیان گەیاندن بەخەڵك. لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: ئەو کەسە کە خوای گەورە لە شەڕی مابەینی دوو شەویلەی و شەڕی مابەینی دوو ڕانی بیپارێزێ ئەوە دەیخاتە بەهەشتەوە.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: هەموو قسەیەکی ئادەمیزاد بە زیان لەسەری ساغ دەبێتەوە مەگەر ئەمر کردن بەچاکە و نەهی کردن لە خراپە و ناوی خواهێنان بێ. دیارە هەر قسەیەك کە سوودی تێدا بێ بۆ موسڵمانان یا ببێتە هۆی ئولفەت و دۆستایەتی لەگەڵ میوانا یا ئامۆژگارییەکی خێری تێدابێ ئەوانە هەموویان دەکەونە بەر ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپە و حەدیثە پیرۆزەکە دەیانگرێتەوە.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: «أعظم الناس خطايا أكثرهم خوضاً في الباطل» واتە: گەورەترین ئادەمیزاد لە لایەنی تاوانەوە ئەوانەن کە زۆرتر دەچنە ناو وتاری پڕوپووچەوە بەتایبەتی ئەگەر وتارەکانیان هۆی زیانی خەڵك بن. هەروەها لە حەدیسێکی تردا دەفەرمووێ: «أربى الربا أستطالة الرجل في عرض أخيه» واتە: سوودی

له هەموو سوودیٚ خراپتر و ناهەموارتر ئەوەیە کە ئینسان زمان درێژی لە نامووسی برای خۆی بکا. واتە: هەر تەنیا ڕیبا و سوودخواردن حەرام نییە، بەڵکو لە ڕیبا و سوودخواردن حەرامتر ئەوە ئینسان نامووسی برای ئاینی خۆی ببا. ڕیوایەت کراوە: کە گوناهی سوودخواردن حەفتا پایەی هەیە، نامووس بردنی خەڵك لە هەموویان نابارتر و ناهەموارترە. هەروەها یەکیٚ لە زیانی زمان درۆکردنە. لە حەدیسی شەریفدایە: درۆکردن هۆی ڕووڕەشیی خاوەنەکەیەتی لە قیامەتدا و زۆربەی سزای گۆڕ بەهۆی غەیبەت کردن دووزمانییەوەیە. لە حەدیسی پیرۆزدا: کاتیٚ کە ئادەمیزاد درۆییەکی کرد فریشتەکانی ڕاست و چەپی لەبەر بۆگەنیی ئەو درۆیە ماوەی میلیٚ دوور دەکەونەوە. هەروەها: دوارۆژی درۆزن لاتی و گەداییيە.

یەکێکی تر لە زیانی زمان ئەوەیە کە هەموو کاتیٚ گەلیٚ تاوانی پیٚ دەکریٚ وەکو درۆ و غەیبەت و دووزمانی و بوختان و ئیشاندنی دڵی خەڵك و جنێودان و فیتنەیی کردن، بەلاّم ئەندامەکانی تری لەشی ئینسان هەر یەکێکیان جۆریٚ تاوانی لیٚ دەوەشێتەوە، یا ئەگەر زیاتر بیٚ، زۆر نییە. زمان لە دوور و نزیکەوە زیانی بەهەموو سووچێکی جیهان دەگات، بۆیە لەسەر ئینسانی هۆشیار پیویستە زۆر گویٚ بداتە ڕاگرتنی زمانی خۆی و لە ڕێبازە خراپەکان بیپارێزیٚ. هەرچەند پێغەمبەران (د.خ) مەعسووم و بیٚ گوناهن و ئەولیاکانیش مەحفووزن و خوای گەورە پاراستوونی، بەلاّم سیرەکە لەوەدایە کە ئەنبیا و ئەولیا لە غروور دوورن و لە خۆبایی نابن و خاکینەن و خاوەن شەرمن. کە ئینسان ئەم هەمووە خووە باشانەی بوو شەیتان ناتوانیٚ زاڵ ببیٚ بەسەریداو، ئەگەر جاریٚ شتیٚ بخاتە دڵیەوە بەهۆی هێزی سیفەتە چاکەکانییەوە پاکی دەکاتەوە.

دەگێڕنەوە لوقمانی حەکیم، لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر خاوەن حیکمەت و وریا و ژیر بوو، هەر خۆی بەناتەواو دەزانیٚ، بۆیە ویستی بڕواتە لای حەکیمیٚ کە نەیناسیٚ بەڵکو زانیاری و ژیریی لیٚ وەربگریٚ. بەڵیٚ ڕۆیشت بۆ لای حەکیمێکی گەورە. ڕۆژیٚ حەکیمەکە ئەمری کرد و پێی فەرموو: بڕۆ بۆ بازاڕی گۆشت فرۆشەکان لەو گۆشتەی کە لە هەموو گۆشتیٚ خراپترە هەندێکم بۆ بکرە.

ئەویش ڕۆیشت بۆ بازاڕ و دڵ و زمانی حەیوانێکی بۆ کڕی و بۆی هێنا. ڕۆژێکی تر پێی وت: بڕۆ لەو گۆشتەی کە لە هەموو گۆشتیٚ چاکترە هەندێکم بۆ بکرە.. ئەوەیش وەك جاری پێشوو دڵ و زمانی حەیوانێکی بۆ کڕی و بۆی هێنا! حەکیمەکە وتی: مەعنای چییە کە من داوای گۆشتی خراپترین ئەندامی حەیوانم لیٚ کڕی دڵ و زمانت بۆ هێنام، کە داوای

گۆشتی چاکترین ئەندامی حەیوانیشم لیّ کردی هەر دڵ و زمانت بۆ هێنام؟ لوقمان عەرزی کرد گەورەم! لە ئادەمیزاددا لە دڵ و زمانی باشتر نییە، ئەگەر باش پەروەردە بکریّ، لە دڵ و زمانیشی خراپتر نییە ئەگەر خراپ پەروەردە بکریّ. ئینجا حەکیمەکە وتی: بابە! تۆ ئوستادی من بە و من شاگردی تۆ، بەڕاستی من لەم پەندە زۆر سوودم وەرگرت.

یەکێکی تر لە زیانەکانی زمان ئەوەیە کە خێر و پاداشی ڕۆژوو دەفەوتێنیّ. لە حەدیسی شەریفدا هەیە: «ما صام من ظل يأكل لحوم الناس»، واتە: بەخاوەن ڕۆژوو حسێب ناکریّ کەسیّ کە گۆشتی خەڵکی بخوا، واتە: غەیبەت بکاو ناوی خەڵکی ببا، چونکە بەهۆی ئەو غەیبەتەوە پاداشی ڕۆژووەکەی نامێنیّ.

لە حەدیسێکدا دەفەرمووێ: گوناهە وردە گەورەکانی[1] ئینسان بە تەوبە چار دەکرێن غەیبەت نەبیّ، چونکە لە غەیبەتدا پێویستە کابرای غەیبەتکراو گەردنی غەیبەتکەر ئازاد بکاو ئەگەر ئازادی نەکا ئازاد نابیّ.

هەروەها زیانی غەیبەت هاوڕیّ و هاومەجلیسیش دەگرێتەوە. لە حەدیسێکی شەریفدا هەیە: کەسیّ غەیبەتی کەسێکی لای کەسیّ کرد ئەگەر کابرای قسە لاکراو دەستی بڕوا و مەنعی غەیبەتکەرەکە نەکا، دەبێتە هاوبەشی غەیبەتەکەی و لە ڕۆژی قیامەتا خوای گەورە لە ناو ئەهلی عەرەساتا سووکی دەکا.

براکان! لەمەوپێش عەرزم کردن کە غەیبەت کردن لە خووی خراپەوە پەیدا دەبیّ، وەکو ڕق و کینە و داغ لە دڵی و حەز لە خەڵك نەکردن. دیارە کابرای غەیبەتکەر دەیەویّ دەردی دڵی خۆی بەناوهێنان و غەیبەتکردنی خەڵك چاك بکاتەوە و تەسکینی بداتەوە، بەڵام خۆی گیرۆدەی دەردیّ دەکا هەتا ماوە لە ژیاندا چاك نابێتەوە، چونکە هەتا غەیبەتەکە بکا تاریکیی دڵی زیاتر دەبیّ و، هەتا دڵیش تاریکتر بیّ حیقد و کینە زیاتر دەبیّ. لە حەدیسی پیرۆزدایە: دۆزەخ دەرگایێکی هەیە کەسی پیادا ناڕواتە ژوورەوە ئەو کەسانە نەبیّ کە دەیانەویّ شیفای ڕقی دڵی خۆیان بەگوناهـ کردن بدەن. فاسقەکانیش دەڵێن: غەیبەتکردن دەرمانی نەخۆشیی دڵە، بەڵام بێگومان بەهەڵەدا ڕۆیشتون؛ چونکە نەخۆشی بەنەخۆشی دەرمان ناکریّ، بەڵکو دەرمانی ئەو نەخۆشییە عەفووکردنی ئەو کەسەیە کە ڕقی لیّ هەستاوە. جا ئەگەر زۆری لە خۆی کرد و ئەو کەسەی عەفوو کرد ئەوا دڵی سارد دەبێتەوە و ئەو جۆش و خرۆشەی نامێنیّ و بەنووری خوای میهرەبان ڕووناك دەبێتەوە و ئەو تاریکییە پێشووەی دەرەوێتەوە و لەو دەردە ناهەموارە ڕزگار دەبیّ.

---

(١) گوناهی گەورە سیّ جۆرن: زۆر گەورە، مامناوەندی، وردە گەورە– وەرگێر.

براكان! ئەگەر نازانن غەیبەت چییە؟ بزانن غەیبەت ئەوەیە باسی برای خۆت یا خوشكی خۆت بكەی بەعەیبێ كە تیایدا نەبێ. بەمەرجێ باسكراوەكە پێی ناخۆش بێ، كە لە پاشملە ئەو عەیبەی باس بكرێ، ئیتر فەرقی نییە ئەو عەیبە لە بابەتی عەیبی لەش بێ یا هیی خووورەوشت یا هیی ژن و ماڵ و منداڵ یا ڕشتەی باوباپیر و داوداپیری، لە بابەتی ئاینی بێ یا بابەتی دنیایی، تەنانەت عەیبەكە پێوەندیی بەپۆشاكەوە بێ وەكو ئەوە كە بڵێت: مێزەرەكەی بچووكە یا كەواكەی كورتە یا كەوشەكانی ناشیرینن، یا باسی هەستان و دانیشتنی ئەو كەسە بێ، وەكو ئەوە بڵێ: ڕۆیشتنی لە لۆقەی گورگ دەچێ، یا باسی ئەوە بكا كە عەبووس و ڕووگرژە. جا ئەم دەربڕینە هەروەكو بەشێوەی قسەكردن حەرامە بەشێوەی ئیشارەو نووسین و هەر جۆرە هۆو ڕێگاییەكی تێگەیاندنیش حەرامە. لە هەموو ئەو شێوە و حاڵانەدا كە باسمان كردن ئەگەر ئینسانە باسكراوەكە عەیبەكەی تێدا بوو ئەوە كارەكە غەیبەتە. خۆ ئەگەر تێیدا نەبوو، ئەوا بوختانە و گوناهی لە غەیبەت گەورەترە و لە هەندێ شوێندا دەبێتە هۆی لێدانی داری حەدد.

ئەوەیش بزانن هەروەكو غەیبەتكردنی موسڵمان حەرامە، غەیبەتی ئەهلی زیممەیش وەكو جوولەكە و گاورێ كە لە ئیدارەی ئیسلامدا بن هەر حەرامە.

بەئیجماع غەیبەتكردن گوناهی گەورەیە، بەڵام هەندێ لە ئیمامەكان غەیبەتیان كردووە بەدوو جۆر، واتە: غەیبەتكردنی ئینسانی ئاین نەزان و قورئان لەبەر نەبوویان بەگوناهی بچووك داناوەو، غەیبەتكردنی زانای ئاینی و قورئان لەبەریان بەگوناهی گەورە داناوە. بەڵام ئەمانە زۆر كەمن.

براكانم! هەروەكو باسی هەندێ خووورەوشتی خراپم بۆ كردن، پێویستە هەندێ خوو و ڕەوشتی چاكیشتان بۆ باس بكەم. باسكردنی ئەو خووورەوشتە چاكانە زۆر بەئەهەمییەتە؛ چونكە پێغەمبەر (د.خ) موژدەی داوە و فەرموویەتی: ئەوانە كە خاوەنی خووورەوشتی چاكن پایەی ئەوانەیان بۆ دادەنرێ كە ڕۆژ بەڕۆژوون و شەو خەریكی شەو نوێژن، ئەگەرچی عیبادەتیان كەم بێ. جا لەبەر پیرۆزیی وەرگرتن بەوتنی لەفزەكانی ئەو حەدیسە شەریفە كە لەم بابەتەوە وارید بووە، من نەفسی حەدیسەكە نەقڵ دەكەم. ئەی خۆشەویستەكانم بەختیاری و ڕزگاریی ئینسان ئەوەیە كە لەسەر ئەو خووورەوشتە بێ لەم حەدیثەدا نووسراوە. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «خیار الله في ما أنبأني الملأ الأعلى قوم یضحكون جهراً من سعة رحمة ربهم و یبكون سراً من خوف عذاب ربهم» واتە: هەروەك كۆمەڵی مەجلیسی بەرز پێیان وتووم باشترین ئادەمیزاد ئەوانەن كە لە خۆشیی گوشادی و فراوانیی ڕەحمەت و میهرەبانیشی خوای گەورە وە

بەئاشکرا پێ دەکەنن و، لەترسی سزای خوا لە پەنامەکیدا و بێ ئەوەی کەس بزانێ بەکوڵ دەگرین، بەیانی و ئێوارە لە خانووە پیرۆزەکانا کە پێیان دەڵێن مزگەوت، ئەمە حاڵیانەو، لە خوای گەورە دەپارێنەوە بەرەغبەت و رەهبەت واتە: بەهیوای میهرەبانیی خواو ترسی سزای رۆژی قیامەت. ئەم کۆمەڵە ئادەمیزادە بەزاهیر وان لە دنیادا، بەلاّم بەدڵ وان لە عالەمی ئاخیرەتا. پەژارەیان نییە، پاشەرۆژیان نەبێ. پێویستیی قەبریان ئامادە کردووە. جەوازیان وەرگرتووە بۆ رێگەیان و ئامادەن بۆ ئەوەی لە رێگەیاندایە. لە پاش بەیانی ئەم فەرموودەیە حەزرەت (د.خ) خوێندییەوە: «ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ». ئەم ئایەتیش ئیشارەیە بۆ ئەوە ئەگەر کەسێ ترسی لە خوا نەبێ دەوامی تاعەت و عیبادەتی بۆ خوا دەست ناکەوێ؛ چونکە ترس لە خوا ئینسان هەڵدەسورێنێ بۆ لای خوا.

یەکێك لە خوو و رەوشتە جوانەکانی موسڵمان ئەمەیە کە لە کاروباری دینا بەساغی هێز و تەعەسسوبی هەبێ و دینی خۆی بەقایم بگرێ لەگەڵ ئەمەیشدا پەلە پەل و ناسازی و نارێکی لەگەڵ کەسدا بەکارناهێنێ بەڵکو هەتا لەتوانایدا بێ هەر بە لەسەرخۆیی و میهرەبانی و ئارامی لەگەڵ خەڵکدا رابوێرێ و ئاینیان بۆ روون بکاتەوە. ئەگەر خۆی شتێکی نەزانی حیرسی ببێ لەسەر ئەوە کە فێری ببێ و زۆر حەز بکا لە فێربوونی ئادابی ئیسلامییەت و، وەختی خۆی بە بێ سوود لەناو نەبا. نەك ئەگەر حیکایەتی بێ هوودەی بۆ بگێرنەوە باش گوێ رابگرێ، بەلاّم ئەگەر باسی ئاینی بۆ بکەن موبالات نەکا و سستی نیشان بدا لە کاروباری ئاینیی خۆیدا؛ چونکە ئاین بە مەحەببەت بۆ ئینسان تەواو دەبێ.

ریوایەت کراوە لە حەزرەتەوە (د.خ) کە گەورەترین خووورەوشتی جوانی موسڵمانە ئەمە کە هەرگیز لە بیستنی ئامۆژگاریی ئاینی تێرنەبێ و، هەمیشە لەسەر ئەوە بێ کە مەنعی نەفسی خۆی بکا لە ئارەزووی خراپ و لەگەڵ داماوان و هەژاراندا میهرەبان و خاوەن چاکە بێ.

من ویستم کە هەر شەوێ مەلاییەك بۆ ئامۆژگاری رەوانە بکەم بۆ قاوەخانەیێ کە شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکە بۆ ئەوە کە ئامۆژگاریی موسوڵمانان بکەن هەتا لە کاروباری ئاینیی خۆیان ئاگادار بن. ئەگەر ئەمە جێبەجێ بکرایە و هەر شەوێ لە قاوخانەییەکا حەدیس بخوێنرایەتەوە بەپانزە بیست شەو جارێ نۆرەی قاوەخانەیێ دەهات، کەچی بەداخەوە بۆمان جێبەجێ نەبوو.

شەوێ مەلایێ رۆیشتبوو بۆ قاوەخانەیێ، کە داستانی رۆستەمیان تیا دەخوێندەوە، بۆئەوەی ئامۆژگارییان بکات بەڵکو واز لەو شتە هیچ و پووچانە بێنن، کەچی مەلاکەیان

مەنع کردبوو و ماوەیان نەدابوو حەدیسیان بۆ بخوێنێتەوە! دوای ئەوە بۆ یارمەتیی ئەو مەلایە من کوڕی خۆمم لەگەڵا نارد بۆ قاوەخانەکە، ئەمجارە کوڕەکەیشم و و مەلاکەشیان دەرکردبوو، جا ئەم حاڵەتە لەگەڵ خووڕەوشتی جوانی موسوڵماندا چۆن رێك دەبێ و دەگونجێ؟!

خووڕەوشتی ئینسانی موسڵمان وەهایە ئەگەر کەسێ نامەردی و ناپیاوی لەگەڵدا بکا و عاجزی بکا، ئەو هەر چاوپۆشی لێ دەکا و بەرامبەری ئەو نامەردییە کردەوەی ناشەرعیی لەگەڵ ناکا.

ئینسانی موسڵمان بۆ جێبەجێ کردنی کارێ کە حەزی لێ بکا و بەتاسەوە بێ بۆی هەرگیز گوناه ناکا.

ئینسانی موسڵمان بەخیلی بەکەس نابا، رقی لە خەڵك نابێ، تانە و تەشەر لە موسڵمانان نادا و بەخراپی ناویان نابا.

لە گەورەترین خووڕەوشتی موسڵمانە ئەمە کە لە نوێژکردندا لە خواترسی بەسەر دڵ و دەروونیدا دێ، لە بەجێهێنانی کاروبارە پێویستەکانی ئایندا هەوڵ دەدا و کۆتایی ناکات وەك زەکات و سەرفیترە و کفن و دفنی مردووی موسڵمانان و یارمەتیی دراوسێ گەدا و نەدارا و بێ کەس و دەستەوەستان.

هەر کەسێکتان بەم سیفەتانە چاوپێ کەوت و لە جێبەجێ کردنی واجیباتدا گورج و گۆڵ بوو، موژدەی بدەنێ و پێی بڵێن کە تۆ خاوەنی خووڕەوشتی چاکی.

ئینسانی موسڵمان لە کاتی کارەسات و ناخۆشیدا خۆگری نیشان دەداو، لە کاتی خۆشحاڵی و زۆربوونی رزق و رۆزیدا شانازی ناکا بەسەر کەسداو لە خۆی بایی نابێ و خۆپەرستی لێ دەرناکەوێ سوپاسی ناز و نیعمەتی خوای گەورە دەکا. هەروەها ئینسانی موسڵمان قەناعەت دەکا بەوەی خوا پێی داوە و، هەر رزقێ بۆی دەست بدا بەخیلی و چرووکی تیا ناکا، ئینسانی موسڵمان هەمیشە پرسیار دەکا لە زانایانی ئاین و راوێژ دەکا بەژیران، ئەگەر ستەمی لێ بکرێ خۆی دەگرێ تا خوا دەروویەکی لێ دەکاتەوە. ئینسانی موسڵمان خزمەتی ئارەزووی نەفسی ناکا و هەر خواردەمەنییەك هاتە پێشەوە دەیخوات و چاوی لە خواردەمەنیی زۆر خۆشەوە نییە.

ئینسانی موسڵمان بەچاوی برایەتی دەڕوانێ بۆ موسڵمانان و هەمیشە لەگەڵیاندا ئولفەت و پێوەندیی دەبێ و خەڵکیش لەگەڵ ئەوا ئولفەت دەگرن و، بەپێی توانا قازانج بە

موسوڵمانان دەگەیێنێ و خۆی ناکاتە داری بێ بەرو، لەبەر دڵپاکی و گومان باشی بەموسوڵمانان زوو فریو و تەفرە دەخوا بەقسەی خەڵك وەكو لە حەدیسی شەریفدا هەیە: المؤمن غر كريم، والفاجر خب لئيم». هەروەها ئینسانی موسڵمان بەزیانی موسڵمانان دڵگیر دەبێ و بەخێر و خۆشییان دڵشاد دەبێ و بۆ خەڵکی ڕەحمەتی زۆر دەبێ و هەتا بتوانێ نابێتە هۆی ئازار و ناخۆشی ناهێنێتە ڕێیان، ڕۆح سووك و بێ مەینەت دەبێ و ئەرکی ژیانی ناکاتە بار بەسەر خەڵکەوە و، هەرگیز تەرکی نەسیحەت و ئامۆژگاریی برای موسڵمانی ناکا و بەقەدەر توانا لەگەڵیاندا دڵسۆز دەبێ و، ئەوەندە لەگەڵیانا قسەی نەرمە کە هەندێ کەسی نەفام دەڵێن: ئەم کابرایە بێ عەقڵە.

ڕیوایەت کراوە: «أول ما يوضع في الميزان حسن الخلق والسخاء» واتە یەکەمین چاکەی ئینسان کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەخرێتە تەرازوو خوورەوشتی جوان و سەخاوەتییە. ئینسانی موسڵمان هەرکەس دۆستی بکات لەگەڵیا قازانجی پێ دەگەیێنێ، پرسپێ کردنی قازانجی هەیە، هەرکەس هاوبەشی لەگەڵدا بکا سوودی دەست دەکەوێ. موسڵمانی خووڕەوشت باش لە حەدیسی پیرۆزدا بە عەترفرۆش تەشبیە کراوە کە ئەگەر عەتریش نەدا بەکەس، خەڵك لە بۆنە خۆشەکەی قازانج دەکەن.

لە حەدیسایە: ئینسانە موسوڵمانەکان سەهل و ئاسانن نابنە باری گران، وەك وشتری فێرکراوی ڕام وانە، واتە: داوای هەر جۆرە یارمەتییەکیان لێ بکرێ، بەپێی توانای خۆیان تێ دەکۆشن و یارمەتی دەدەن مەگەر شتێکی ناشەرعی بێ.

یەکێکی تر لە خووڕەوشتە گەورەکانی موسڵمان ئەوەیە کە هەر کاتێ مەبەستێکی ئاینی هاتەدی زۆر دڵشاد دەبێ و ئەگەر ئەو مەبەستەی نەهاتەدی غەمبار دەبێ و هەرکاتێ تووشی گوناهێ دەبێ گەلێك بێزار دەبێ و زۆری پێ ناخۆشە. ئینسانی موسڵمان هەمیشە غەم و پەژارەی زۆرترە لە ناموسڵمان چونکە غەمی دینی خۆی و دینی خەڵکیش دەخوا. ئینسانی موسڵمان لە مامەڵە و کڕین و فرۆشتن و قەرزدان و قەرز وەرگرتنەوەدا ئارام و خاوەن کەرەم و چاوپۆشییە.

ئینسانی موسڵمانی ساغ زۆربەی کات چوار دوژمنی هەیە، یەکەم ئەوانەی بەخیلیی پێ دەبەن. دووەم مونافقەکان کە ڕقیان لێیەتی. سێیەم شەیتان کە هەمیشە دەیەوێ گومرای بکا. چوارەم کافرەکانیش دەیانەوێ بیکوژن. موسڵمانی ساغ ئەغلەب وادەبێ دراوسێیەکانی ئازاری دڵی دەدەن هەتا سەبری لەسەر بکا و پاداشتی چاکی دەست بکەوێ.

لە گەورەترین خوو و ڕەوشتی موسڵمانە ئەمە کە لە گەڵ موسڵمانانا بەڕەحم و بەزەییە

و یەك دڵ و هاودەردە و هەر موسڵمانێ دەردێکی تووش بێ، ئەم هاویەشی ئەو دەردەیەتی.

لە خووورەوشتی موسڵمانە ئەمە کە خزمەتی خێزانی خۆی دەکا و، تێکەڵی و هاوڕێیەتی هەژاران و داماوان دەکا و، لەگەڵ خزمەتکاری خۆیا نان دەخوا. لە حەدیثی شەریفدایە: ئەم نیشانانە هی موسڵمانانن و، وەك قورئان دەفەرمووێ: «أولئك هم المؤمنون حقاً».

لە خووورەوشتی موسڵمانە ئەمە کە خواردەمەنی و چێشت و نانیماڵی لەسەر ئارەزووی خێزانی دەکرێ، نەك لەسەر ئارەزووی خۆی. ڕیوایەت کراوە: «أفضل المؤمنين كل محموم القلب صدوق اللسان. قالوا: يا رسول الله! ما محموم القلب؟. قال: ألتقي ألنقي الذيلاأثم فيه ولابعغي ولاغل ولا حسد. قالوا: ومن يليه؟ قال: الذين نسوا الدنيا وأحبوا الآخرة. قالوا: فمن يليه؟ قال: مؤمن في خلق حسن». واتە: گەورەترینی موسوڵمانان کەسێکە (محموم القلب) بێ. عەرزیان کرد (محموم القلب) کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە کە دڵی پاکە لە خراپە و خاوەن ترسە و خۆی لە گوناه دەپارێزێ و دڵی گوناهی تێدا نییە و ستەم لە کەس ناکات و بەخیلی و خیانەت لە دڵیدا نییە. ئینجا عەرزیان کرد: ئەی پاش ئەمانە کێیە؟ فەرمووی: ئەوانەن کە دنیایان لە بیرچووەتەوە و قیامەتیان خۆش دەوێ. عەرزیان کرد: ئەی پاش ئەمانە کێیە؟ فەرمووی: ئەو موسڵمانەیە کە خووورەوشتی باش بێ.

لە حەدیسدایە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئایا دەزانن موسڵمان کێیە؟ عەرزیان کرد: فەرموو. ئەویش فەرمووی کەسێکە نامرێ هەتا خوا گوێچکەکانی پڕ دەکا لە مەدح و تەعریفی خەڵکی بۆی. خووورەوشتی ئینسانی موسڵمان ئەوەیە لە بەینی دوو ترسدایە، یەکەم ترسی لەو گوناهانە هەیە کە زوو کردوونی و نازانێ خوای گەورە چی لێ دەکا دەیبەخشێ یانا؟ دووەم ترس ڕۆژانی داهاتوو تا کاتی مردنی، نازانێ ئایا بۆی ڕێك دەکەوێ کردەوەی باش بکا یان نا؟ لە بەلاّ و نەگبەتیی گوناه ڕزگار دەبێ یا گیرۆدە دەبێ؟ پوختەی قسە: خووورەوشتی چاکی موسوڵمان زۆرن و من بەکورتی هەندێکم باس کرد. دیارە بەرامبەر هەموو خوویەکی باش خوویێکی خراپیش هەیە. من لەم نامەدا چل و نۆ خووی باشم لە ناو خووە باشەکانا هەڵبژاردن و نووسیمن. (والسلام على ذوي الأخلاق الحسنة ومتجنبي الأخلاق السيئة). جا ئەی خۆشەویستم هەر کاتێ باسی خوویەکی باشت خوێندەوە، لە ئاخرەوە بڵێ: «موسڵمان دەبێ وابێ» بەڵکو لە دڵی موسوڵمانانندا کار بکا. (والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته).

شەوی یەکشەممەی سیانزەهەمی مانگی (ذی الحجە)ی ساڵی (١٣٩٦)ی کۆچی ڕێکەوتی ١٥– ١٢– ١٩٧٦ی زاینی لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە.

## نامەی چل و شەشەم

# باسی عەیبەکانی نەفس دەکا

بسم الله الرحمن الرحيم

بسم الله والحمد الله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه المجاهدين في الله.

براکان! لە نامەی خووورەوشتی خراپدا نووسیم کە لە یەکێ لە زانایانی ئیسلامیان پرسی: نەفسی ئینسان چەند عەیبی هەیە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: نازانم و نەمتوانیوە بیانژمێرم، بەڵام لە زماندا هەشت هەزار عەیب هەیە. خۆشەویستەکانم! ئەگەر عەیبەکانی نەفس نەزانن ناتوانن خۆتان بپارێزن لێیان و خۆتان لەو کەموکوڕییانە پاك بکەنەوە. لە حەدیسی شەریفدا هەیە: «إذا أراد الله بعبده خيراً بصره بعيوبه» واتە: کاتێ کە خوای گەورە ئیرادەی خێری بە بەندەییەکی خۆی هەبێ لە عەیبەکانی خۆی ئاگادار دەکا، واتە: وای لێ دەکا بەعەیبەکانی خۆی بزانێ، کەوابێ پێویستە ئەم نامەی دڵسۆزی خۆتانە بخوێننەوە با لە عەیبەکانی خۆتان ئاگادار ببنەوە، بەڵکو خۆتانیان لێ بپارێزن. دیارە ئەگەر بیانخوێننەوە ئەوە مەعنای ئەوەیە کە خوای گەورە ئیرادەی خێری پێتان هەیە. خۆ ئەگەر بەتەواوی نامەکە لەبەر بکەن ئەوە زۆر باشترە. جا لەبەرئەوە کە تا ئەو عەیبانە نەزانن ناتوانن خۆتان بپارێزن لێیان، پێویست بوو هەموو ئەو عەیبانە بنووسم، بەڵام بۆم نەگونجا هەموویان بنووسم و برادەرانیش تاقەتی خوێندنەوەی نامەی درێژیان نییە. بۆیە وەك وتوویانە «مالا يدرك كله لايترك كله» منیش ئەو عەیبانەم بۆ نووسین کە زۆر کەس پێیانەوە گیرۆدە بوون، بەڵکو خۆتانیان لێ بپارێزن و خۆتان عەیبەکانتان بناسن و، لە عەیبی خۆ بەباش زانین و خۆ بەگەورەگرتن بەسەر خەڵکدا و بەدگومانی بەسووکی تەماشای خەڵك کردن، دوور بکەونەوە؛ چونکە ئەم عەیبانە لەوانەن کە ئینسان لە جەزای کردەوەی باش نائومێد و تووشی گەلێ پاداشی نابار و ناهەمواری بکەن.

قال تعالى: «وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّيَ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ».

بێگومان نەفسی ئینسان زۆر زۆر ئەمر بەکردار و وتاری نابار و نارێکی وەها دەکا کە هەرگیز لەگەڵ ڕێ و شوێنی دیندا ناگونجێ ئەو نەفسە نەبێ کە خوا ڕەحمی پێ بکا. جا کە مادام نەفس هەمیشە هێزی ئەندامی لەش و هەستەکانی ئینسان بەباری ئارەزووی خۆیدا هەڵسووڕێنێ و ئەمەش ڕاستەو جێی گومان نییە، چونکە خوا فەرموویەتی، ئەوا زۆر پێویستە لەسەر هەر هۆشیارێ کە ئیمانی بەخوا هەیە و باوەڕی بە ئاینی پاکی ئیسلام هەیە خۆی بۆ چارەکردن و بەربەرەکانی کردنی ئەم فەرمانداره نەگریس و نابارە ئامادە بکا. دیارە ئەگەر خۆی بۆ شل بکا تووشی زیانی جۆراوجۆر دەبێ. خوای گەورە فەرموویەتی: «أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ». واتە ئەی محەمەد! ئەو کەسەت دی کە نەفسی خۆی کردە خوای خۆی و پەرستی و، لە ئەنجامی ئەو ئارەزوو پەرستییەدا، لەگەڵ ئەوەشدا وریا و هۆشیار بوو، خوا سەری لێ تێك داو دڵ و گوێی مۆرکرد و لێڵاییی هێنا بەسەر چاویا، نە دڵی لە شتی بەسوود تێ گەیی و، نە گوێی وتەی خێری بیست و، نە چاوی ڕێگای ڕاست و ڕەوانی دی!! کێ بێ بێجگە خوا بتوانی بیخاتەوە سەر ڕێ؟.. بۆ بیرناکەنەوە لە حاڵی خۆتان و لە پاشەڕۆژی خۆتان؟!.

دەگێڕنەوە: ئەبوویەکری وەڕاق، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەیفەرموو: «من أرخي عنان الجوارح فقد غرس شجرة الندامة» واتە: ئەوەی جڵەوی بۆ ئەندامی تری لەش و ئارەزووی نەفسی شل کرد، ئەوە داری پەشیمانی دەنێژێ. مەبەس ئەوەیە کە چاو و گوێچکە و دڵ و زمان و ئەندامەکانی تری لەش هەریەك دەبنە هۆی جۆرە لێپرسیاوییەك بۆ خاوەنەکانیان؛ کەواتە پێویستە هەمیشە چاودێرییان بکرێ و ماوەی بەکارهێنانیان نەدرێ لە کاری ناشەرعیدا و، لەو شوێنانەدا کە شوێنی زیانن، ئاگا لێبوونیان پێویستە، ئەگینا خاوەنەکانیان نوقمی چاڵی پەشیمانی دەبن و پەنجەی حەسرەت دەگەزن.

یەکێ لە زانا تابیعییەکان، ڕەزای خوای لێ بێ، فەرموویەتی: هەرکەسێ هەمیشە دوای ئارەزووی نەفسی بکەوی، ئەوە پێی دەڵێن: خۆت ئامادە بکە بۆ پەشیمانی؛ واتە: بەهۆی دواکەوتنی ئارەزووی نەفسەوە، گیرۆدەی ڕیسوایی و زیانی دونیا و قیامەت دەبێ و دیارە کەسێ وەهابێ، بەشی هەر پەشیمانی دەبێ، ئەگەرچی پەشیمان بوونەوەکەی هیچ سوودی پێ ناگەیێنێ.

شایانی باسە کە لە زەممی نەفسدا چەند ئایەت نازڵ بووە، هەروەها لە مەدح و سەنای ئەو کەسانەشدا کە نەفسی خۆیان دادەمرکێنن، چەند ئایەت هاتووە؟ بۆ نموونە: خوای گەورە فەرموویەتی: «قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا[٩] وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا» واتە بێگومان ئەو

کەسە کە نەفسی لە ڕەوشتی ناشیرین پاك کردووەتەوە لە سزاو ئازاری ڕۆژی پاداش ڕزگار بووە. ئەوەیش کە نەفسی خۆی فێری ڕەوشتی بەد کردووە ناهومێدو بێ بەشە لە جەزای چاك و ئەنجامی پاك. هەروەها فەرموویەتی: «وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى[٤٠] فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى». واتە: بێ گومان ئەوەی لە بارەگای بەرز و بێ باکی خوا ترسا و ڕێگای لە نەفسی گرت و، نەیهێشت کردەوەی خراپ بکا و دوای ئارەزووی پڕوپووچ بکەوێ، ئەوە بەڕاستی بەهەشت جێگایەتی.

حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) فەرموویەتی: لەسەر دەرگای دۆزەخ نووسراوە: هەرکەس بچێ بەگژی هەوا و ئارەزووی نەفسیدا ئەوە بەهەشت جێگا و ئارامگایەتی و، هەرکەس فەرمانی ئارەزووی نەفسی بەجێ بێنێ، ئەوە دۆزەخ ئارامگایەتی. هەروەها لەسەر دەرگای بەهەشت نووسراوە: تۆ حەرام کراوی لەسەر هەموو بەخیلێ و لەسەر هەموو ڕیابازێ، واتە: ئەوانەی لەبەر چاوێنی کردەوەی باش دەکەن. هەروەها لە هەموو ڕۆڵەییەك ئازاری دڵی باوك و دایکی بداو، لەسەر هەموو کەسێ کە قسە بێنێ و قسە ببا بەناو خەڵکدا، واتە: ئەوانەی کە فیتنەیی و قسەچینی دەکەن. تۆ حەرامی لە هەموو دەییوسێك، واتە: ئەو کەسەی ڕازییە بەوە بێگانە بێتە سەر شوێنی ژنەکەی.

یەکی لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە هەرکەسێ ماوەیێ بە زیکر و فیکر و خواپەرستییەوە خەریك بوو، نەفسی داوای (فتح البابی) ئیلاهی دەکا، واتە داوای کردنەوەی دەرگای ڕەحمەتی خوایی دەکات. ئەم داوایە لەو ڕووەوە عەیبە کە دەرگای ڕەحمەتی خوایی هەمیشە کراوەیە؛ کەوابێ داواکردنەکە داواکردنی شتێکە کە هەیە و داواکردنی ناوێ، بەڵام ئەو کەسانە کە بەڕاستی بە عەیبی خۆیان نەزانیوە، دەرگای گەڕانەوەیان بۆ لای خوای گەورە لەسەر خۆیان داخستووە؛ چونکە ئینسان هەرچەند زیکر و فیکر و خواپەرستی بکا هەتا دەستبەرداری ئارەزووی نەفس نەبێ و لە حەزەکانی نەفس دوور نەکەوێتەوە، ماوەی ئەوەی نادرێ بگاتە ئەو دەرگای ڕەحمەتی خوایە کە هەمیشە کراوەیە. دەگێڕنەوە (صالح مری) کە یەکێ بووە لە (أولیاء الله) فەرموویە: هەرکەسێ هەمیشە لە دەرگای ڕەحمەتی خوا بدا، نزیکە دەرگاکەی بۆ بکەنەوە. ئینجا ڕابیعەی عەدەوییە پێی فەرموو: ئەی ساڵح! تۆ بەهەڵەدا ڕۆیشتووی، دەرگای ڕەحمەتی خوا هەمیشە کراوەیە، بەڵام دەرگای گەڕانەوە بۆ لای خوا لەسەر نەفس داخراوە و قایم کراوە.

یەکێکی تر لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە، هەر کاتێ داماوی یا کۆسپێکی گەورە هاتەڕێی ئەو ئینسانە لەباتی ئەوە کە پەنا بەخوا بەرێ و، داوای لابردنی ئەو کۆسپە و

چارکردنی ئەو داماوییەی لەو بکا، دەچێ داوای چاری ئەوانە لە بەندەکانی خوا دەکا و زۆریش پشت بەو کەسانە دەبەستێ! بێگومان ئەم حاڵە شتێکی ناحەق و نارەوایە؛ چونکە ئەگەرچی ئەم جیهانە جیهانی ئەسبابە و، پێویستە ئینسان تێ بکۆشێ بۆ پەیداکردنی ئەسباب، دەبێ بیروباوەڕی وەهابێ کە مەبەست لەگەڵ ئەسبابدا دەبێ نەك بە ئەسباب؛ چونکە ئەسبابەکانیش دروستکراوی خوان و هەر خوا ڕێکیان دەخات و موسەببەبەکەیش هەر خوا ڕێکی دەخات. خوا خۆی لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «وأن يمسك الله بضر فلا كاشف له الإ هو وأن يردك بخير فلا راد لفضله» هەروەها فەرموویەتی: إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ». کەوابێ دەبێ باوەڕی وەهابێ کە ئەسبابی هەرشتێ بەعادەتی خوا دەبن بەهۆی ئەو شتە و لە واقیعا تەئثیریان نییە لە پەیدابوونی موسەببەبەکەدا و تەنیا خوای گەورە بەخواستی خۆی دروستی دەکا.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە تاعەتی بێ ڕۆح و بێ هێزیی خۆی دەبینێ و تەقسیر و نادڵسۆزی و بێ نرخی خۆی تەماشا ناکا، جا نەفس لەم حاڵەدا کەموکوڕیی خۆی ون دەکا و کردەوە خراپە ناشیرینەکانی بەباش دەزانێ. خوای گەورە دەفەرمووێ: «أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَناً فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ».

چاری ئەم نەفسە بەوە دەکرێ کە هەمیشە بیربکاتەوە لە عەیبەکانی خۆی و شەرمەزاری خۆی بێنێتە پێش چاو و ذیکری خوا زۆر بکات و ڕێز لە موسوڵمانان زۆر بگرێ و خۆی بەبچووك تەماشا بکات بەڵکو خوای گەورە لەو خووە خراپە ڕزگاری بکات.

یەکێ لە عەیبە گەورەکانی نەفس ئەوەیە کە هەر هیچ ئیخلاسی نییە یا هەیەتی و زۆر کەمە و، لەبەر ئەم حاڵە لەزەت لە تاعەتی خۆی کەم دەبینێ، بەڵکو جار جار ئەو تاعەت و عیبادەتەی لەبەرچاو ناشیرین دەبێ و هەر ئەوەتە کە بەدیمەن دەیکا، ئەگینا لە ناوەرۆکدا وەك نەیکردبێ وایە. خوا فەرموویەتی: «وَإِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى» واتە کاتێ کە ڕاست دەبنەوە بۆ نوێژ کردن بە تەمەڵی و تەوەزەلی و نابەدڵی و بەخاو و خلیچکی ڕاست دەبنەوە!. دیارە بەهۆی ئەم کەم ئیخلاسییەوە ڕیا و بەرچاوێنی و ڕووپامایی تێدا پەیدا دەبێ و دەبێتە خووی و بەجارێ ماڵی وێران دەبێ. چاری ئەم بێ ئیخلاسییەش ئەوەیە کە هەمیشە بیر لە گەورەیی خوا بکاتەوە و، بیر لەوە بکاتەوە کە خوای گەورە بێ باکە و موحتاجی کەس نییە و بەهێز و توانایە و، هیچ کەس نییە بتوانێ بەقەدەر باڵی مێشولەیێ قازانج بەکەس بگەیێنێ، ئەگەر خواستی خوای لەسەر نەبێ! کەواتە عیبادەت هەر شایانی ئەوە و دەبێ هەر بۆ ئەو بکرێ.

ئینسانی ژیر ئەگەر کەمێ بیر لەوە بکاتەوە کە کەس ناتوانی قازانج بەکەس بگەیێنێ و کەس ناتوانێ زیان لە کەس بدا بەئیرادە و خواستی خوای گەورە نەبێ و، ئەم جیهانە هەمووی وا لە ژێر توانا و دەستەڵاتی ئەودا، دڵی نوورانی دەبێ و یەکلایی دەبێتەوە بۆ خوا؛ بۆیە زاناکانی ئیسلام فەرموویانە: تێفکرین و بیرکردنەوە لە ئاساری توانای خوا بۆ ماوەی سەعاتێ لە عیبادەتی شەست ساڵ چاکترە.

لە عەیبە گەورەکانی نەفسە لە خۆ ڕازیبوون بەهۆی ئەوەوە کە هاوتەمەنەکانی بە گوناهـ کردنەوە خەریکن و ئەم وا نییە. ئەم حاڵە دەبێتە هۆی خۆپەسندی و زوو خاوەنەکەی ماڵوێران دەکا؛ بۆیە پێویستە خاوەنی ئەم نەفسە تەماشای عەیبەکانی خۆی بکا و، لە بێ هێزی و ناتوانایی و ناتەواویی خۆی وردبێتەوە و، لە حاڵی خۆی بێزار بێ و پەنا بەخوا بگرێ لەم خووە ناشیرینە بەڵکو ترسی خوا زاڵ بێ بەسەریدا.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێ شەیتانی لەعنەتی لە خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەردا (د.خ) خۆی دەرخست و عەرزی کرد: من پشتی ئادەمیزادم بەوە شکاند کە گوناهم لەپێش چاویان جوان کرد و دەستیان دایە گوناهـکردن و پێیەوە خەریك بوون. بەڵام ئەوان پشتی ئێمەیان بە تەوبەکردن و لە گوناهـ پەشیمان بوونەوە شکاند. ئەمجارە هاتمەوە سەریان و وام لێ کردن کە لە خۆیان ڕازی بن؛ بەم لەخۆ ڕازیبوونە بەتەواوی زاڵ بووم بەسەریاندا و پشتم شکاندن.

یەکێ لە عەیبە گەورەکانی نەفس ئەوەیە کە هەمیشە ئارەزووی ئەوەیە سەرکێشی بکا لە فەرمانی خوا و لە تاعەت دوور بکەوێتەوە؛ بۆ نموونە: کاتێ پێی دەڵێی هەستە نوێژێ بکە، وەکو کەوان دێتەوەیەك و گرژدەبێتەوە و خۆی دوور دەخاتەوە. چاری ئەم عەیبە ئەوەیە کابرا نەفسی خۆی گیرۆدەی برسیەتی و تینوێتی بکا و دەرگای ئارەزووبازی لە خۆی تەنگ بکاتەوە.

یەکێکی تر لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە ئولفەت دەگرێ بەخەیاڵاتی نابار و ناهەموارەوە کە هیچ قازانجیان تیا نییە، بەڵکو هەندێکیان زیانیشیان زۆرە، چاری ئەم خەیاڵاتە بەردەوام بوونە لەسەر ناوی خواهێنان و یادکردنی بەجۆرێ لەسەرخۆی فەرز بکا لەباتی ئەو خەیاڵە بێ سوودانە خەیاڵی باش بکات وەك خەیاڵی کردەوەی چاك و گوناهـ و سەرپێچی لە فەرمانی خوای گەورە. هەروەها چاری ئەم عەیبە بەوەش دەکرێ کە ئەو کەسە بیر لەوە بکاتەوە کە خوای گەورە ئاگاداری هەموو خەیاڵێکییەتی، بەم جۆرە شەرم بێ بەسەریدا و لەم خەیاڵە بگەڕێتەوە بۆ سەر خەیاڵی باش.

یەکێکی تر لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە ئولفەتی گرتووە بە فەرامۆش کردنی عەیبی خۆی و تەماشاکردنی عەیبی خەڵکی و تانەلێدان و ڕق لە خەڵك هەستان و بەسووکی تەماشاکردنیانەوە. چاری ئەم دەردە ئەمەیە کە ئینسان بەیەکجاری واز لە عەیبی خەڵکی بێنێ و تەماشاکردنی عەیبی خۆی بکاتە خوو، هەتا بەدگومانییەکەی بگۆڕێ بە گومانی باش دەربارەی خەڵك. لە حەدیثایە: «من تتبع أعورة خيه المسلم تتبع الله عورته ثم يفضحه في جوف بيته». واتە: هەرکەس بکەوێتە شوێنی عەیبی برای ئاینیی خۆی، خواش دەکەوێتە شوێن عەیبی ئەو و هەر لە ناو ماڵەکەی خۆیدا زەنگی دەزرێنێ و ئابرووی دەبا.

یەکێکی تر لە عەیبەکانی نەفس دەوامی غەفڵەت و سووربوونە لەسەر گوناهکردن و هیوای دوور و درێژ لە جێبەجێ کردنی شتی دنیایی ڕووتدا، کە بەهۆی ئەو هیوا درێژییەوە بە خەیاڵی خۆی ئەجەل لە پێش چاوی دوور دەکەوێتەوە و وادەزانێ کە زۆر درەنگ دەمرێ و هەروا دەژی و ڕادەبوێرێ. چارکردنی ئەم عەیبە بە بیرکردنەوە دەبێ لە سەفەری پاشەڕۆژ و وەزعی قەبر و بیرکردنەوە لە ئاگری دۆزەخ و تۆڵەسەندنەوەی خوای جەببار و قەهھار، هەروەها لە بیرکردنەوە دەبێ لە بەسەرهاتی خەڵك و مردنی پیر و لاو و دارا و نەدارا و شا و گەدا.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) سوێندی خواردووە و فەرموویەتی: نازانم ماوەم دەبێ ئەم پارووە وا لە ناو دەممدا قووتی بدەم یاخۆ لەپێش ئەوەدا دەمرم؟!.

هەروەها لە عەیبەکانی نەفسی ئینسانە ئەمە کە حیرسی زۆرە لەسەر ئەوە کە خۆی بمرێنێ و پەیڕەوی ئارەزووی پڕوپووچی نەفسی بکا؛ چونکە بەدواکەوتنی ئەمانە ئینسان بەتەواوی وەك مردووی لێ دێ چونکە سوود لە ژیانی خۆی وەرناگرێ.

چاری ئەم عەیبە ئەوەیە کە ئینسان تێ بکۆشێ بۆ مەنعکردنی خۆی لەم ئارەزووانە هەتا نەفس بەتەواوی نائومێد ببێ لەم جۆرە ئارەزووە خراپانە و بەڕاستی دڵنیا ببێ لەوەی کە ناگەڕێتەوە بۆ سەر شتێ خیلافی شەرع بێ.

لە عەیبەکانی نەفسە نەفامی و نەزانی و کەودەنی، بەڕادەیێ دڵی لە فێڵ و حیلەبازیی شەیتان هێمن بێتەوە و ئەوجار شەیتان بەهەموو بارێ تەفرەی دەدا و گیرۆدەی گوناهی دەکا، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیان ئایەت لە لایەنی خوای گەورەوە هاتووە بۆ ترساندن و دوورخستنەوەی ئینسان لە پەیڕەویی شەیتان. چاری ئەم دەردە ئەوەیە ئینسان هەمیشە پەنا بگرێ بەخوا لە مەکری شەیتان.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە هەمیشە باسی چاکیی خۆی دەکا بەڕادەییەك کە

زیاتر بێ لە ئیخلاسی خۆی. چاری ئەم عەیبە ئەوەیە کە تا بۆی دەکرێ چاکیی ون بکا و باسی نەکا یا بەقەدەر ئیخلاصەکە خۆی دەری بخا.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس تەرکی عیبرەت و کەم ترسییە ؛چونکە دەبینێ هی وا هەیە هەزار گوناهـ دەکا کەچی خوای گەورە مۆڵەتی دەدا و دەڵێ: ئەگەر خوا ئەم زەلامەی خۆش نەویستایە ئەوەندە مۆڵەتی نەدەدا و ئەم هەمووە کەرەم و بەخششەی لەگەڵ نەدەکرد. چاری ئەم عەیبە ئەوەیە کە نەفسی خۆی ئاگادار بکاتەوە کە ئەم مۆڵەتە لەبەر رەحمەتی تایبەتی نییە و لەم مۆڵەت دانەدا خێر نییە، ئەگەر خاوەنەکەی خەریکی خواپەرستی نەبێ و، ئەم جۆرە ئینسانانە لە رۆژی خۆیدا پرسیاریان لێ دەکرێ. لە حەدیسی شەریفدا هەیە ئەحمەقترین کەس یەکێکە کە رووی لە گوناهـ بێ و داوای عەفوو لە خوا بکا، واتە: داوای عەفو بەبێ پەشیمان بوونەوە لە گوناهـ.

شێخ ئەحمەدی ئیبنوحەجەر فەرموویەتی: شیددەتی نەگبەتی و بەدبەختیی ئەمە کە ئینسان سووربێ لەسەر تاوان و کردەوەی خراپ و کەچی بڵێ: خوا غەفوور و رەحیمە، دوورە لە عەقڵەوە ئینسان بەم دوو کەلیمەیە ئیکتیفا بکا و ئیتر دوور نەکەوێتەوە لە گوناهـ و تاوان. پێویستە ئینسان هەمووجارێ و هەموو ساتێ لە بەینی ترس و ئومێدا بێ؛ چونکە هەروەکو خوا غەفوور و رەحیمە (شدید العقاب) و تۆڵەسێن و تێژهەڵمەتیشە؛ کەواتە دەبێ ئینسان هەر لە بەینی ترس و ئومێدا بێ، واتە هەمیشە: هیوای چاکە و ترسی سزا و ئازاری هەبێ.

ریوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەر کاتێ خوای گەورە نیعمەتێکی بە بەندەی خۆی بەخشی و ئەو بەندەیە دەسبەرداری گوناهـ نەبوو چووە ناخی گوناهـ و تاوانەوە، بزانن ئەو نیعمەت پێدانەی ئیستیدراجە و بەرزکردنەوەیە هەتا چاك بیخاتە خوار و ملی بشکێنێ. جا لەو کاتەدا حەزرەت (د.خ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: «فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ». واتە: لە کاتێکا ئەو کافرانە پەند و ئامۆژگاریی رەهبەرانیان فەرامۆش کردو گوێیان پێ نەدا دەرگای هەموو رزق و رۆزییەکی دنیاییمان لێ کردنەوە و، کەوتنە ناو ناز و نیعمەتەوە و دڵشاد بوون بەوەی پێیان درا، لە ناکاودا داگیرمان کردن و کەوتنە نێو خەم و خەفەت و حەسرەتەوە.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس بێ مویالاتی کردنە بەفەرمانی خوا؛ دەڵێ: ئێستا جوانم و هێشتا خۆشیی ژیانم نەچەشتووە، با رابوێرم هەر پیر دەبم ئەوسا دەست دەکەم بە

عیبادەت و خواپەرستی! ئا بەم فێڵە شەیتانییە تەفرە دەخوا و دەخەڵەتێ!. چاری ئەم عەیبە بیرکردنەوەیە لەوە کە هەر فەرمانێ لای خواوە هاتووە هەمووی قازانجە و خێری ئادەمزادی تێدایە؛ بۆیە فەرمانبەرداری خوای گەورە و پەرەستن و بەگوێ کردنی بەختیارییە و نافەرمانبەرداریی خوا و بەگوێ نەکردنی بەدبەختی و ماڵوێرانییە. گەنجەکان لە پیرەکان زۆرتر دەمرن. بەکام نیشانەدا دەزانی کە تۆ جوانی نامری؟ کەوابێ چاك وایە ماوەی لە کیس چوونی وەختت نەدەی و هەر کاتێ ئەمرێکی خوایی هات، گورج قۆڵی لێ هەڵماڵی و بەقەدەر توانا جێبەجێی بکەیت. وتوویانە: «الوقت سیف قاطع أن لم تقطعه قطعك». واتە: کات وەك شیری بڕندەیە نەیبڕی، دەتبڕێ، واتە: ئەگەر تۆ بەسەرخۆتدا زاڵ نەبی و لە کاتا تاعەتەکەت نەکەی ئەو کاتەت لەکیس دەچێ و بەخۆڕایی دەڕوا.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە ئینسان خۆی بە ئینسانی چاك و کردەوەباش نیشان دەدا، کەچی بیروباوەڕی دەروونی و خەیاڵاتی دڵی باش نییە. ئەم جۆرە ئادەمیزادانە لە لای خوا ناشیرینن. چاری ئەمەش ئەوەیە کە ئینسان واز لەم جۆرە خۆ دەرخستنانە بێنێ، واتە: بەشێوییەکی ڕاستی بژی و شتی زیادە بەخۆیەوە نەلکێنێ. لە حەدیسی شەریفدایە: «كفى بالمرء شراً أن يرى الناس انه يخشى الله تعالى وقلبه فاجر». واتە: بۆ خراپیی ئادەمزاد ئەوە بەسە کە خەڵکی وەهای سەیر بکەن کە لە خوا دەترسێ، کەچی دڵی تاوانبار و لە حەق لادەر بێ!

یەکێکی تر لە عەیبە گەورەکانی نەفس ئەوەیە عاشقی لەکیسدانی وەختی خۆیەتی، بەهۆی خۆخەریك کردنەوە بەشتی هیچ و پووچ و بێ نرخەوە. چاری ئەم دەردە ئەوەیە کابرا بیر لەوە بکاتەوە کە ژیان و ماوەی ژیانی شتێکی زۆر کەم و سنووردارە و لە هەموو شتێ خۆشەویستترە، کەوابێ حەق وایە لە شتێکدا سەرف بکرێ لە لای خوای گەورە بەنرخترین شت بێ، وەك ناوی خوا بردن و بیرلێکردنەوەی و پەرستن و بەگوێکردنی. بێگومان هەموو بازرگانێ کە سەرمایەکی بەنرخی هەبێ لە ماڵێکدا سەرفی دەکا کە لەو ڕۆژەدا لە هەموو شتێ بەنرختربێ، لە شتێکدا سەرفی ناکا دووربێ لەوەدا ئاخۆ بەقیمەتە یان نا؟ چونکە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «دع ما يريبك إلى مالا يريبك» واتە: واز لەو شتانە بێنە کە دەتخەنە دوو دڵییەوە و ڕووبکەرە ئەو شتانە کە ڕاست و ڕەوان و بێ پێچ و پەنان و ناتخەنە دوو دڵییەوە. یەکێ لە عەیبەکانی نەفس تەبیعەت گەرمی و تووڕەییە. خاوەنی ئەم عەیبە بە گەلێ دەردی کوشندە گیرۆدە دەبێ و هەمیشە لە بارەگای خوا و بەندەکانی خوا ناشیرینە.

حەدیسی شەریفە: کەسێ هاتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) عەرزی کرد: وەسیەتم بۆ بکە چی

بکەم و چی نەکەم؟ فەرمووی «لا تغضب» واتە: ڕق مەگرە و تووڕە مەبە، ڕق ئینسان لە فەوتانەوە نزیك دەکاتەوە و، لە کاتێکدا ئینسان تووڕە ببێ و ڕقی هەڵسێ شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ. چاری ئەم عەیبە بیرکردنەوەیە لە توانا و دەستەڵاتی خوا کە بەو هەمووە دەستەڵاتەوە چۆن چاوپۆشی دەکا لە بەندەی خۆی و بەخێوی دەکا؟. لە حەدیسێکی تردا پێغەمبەر (د.خ) زەممی ڕق و تووڕەیی کردووە و فەرموویەتی: کەسێ ئاگای لە خۆی بێ کە ڕقی بەسەردا هات ئەگەر ڕاوەستابوو با دابنیشێ و، ئەگەر دانیشتبوو با ڕاست بێتەوە یا دەستنوێژ بگرێ تا ئەو حاڵەی لەسەر دەردەچێ و لە شەڕ ڕزگار ببێ.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس حەز لە درۆ کردنە. بێگومان ئەم حەز لە درۆکردنە، بێجگە لە زیانە ئاینییەکان و زیانی ناو کۆڕ و کۆمەڵانی خەڵك، هۆی لاتی و داماوی و گەداییشە. من باسی ئەم زیانەم لە نامەییەکی تایبەتیدا نووسیوە. هۆی درۆکردن زۆرن، بەڵام سیانیان کە زۆر باون ئەمانەن: یەکەم ڕازیکردنی خەڵك. دووەم داواکردنی حورمەت و ڕێز لەلایەنی ئەوانەوە. سێیەم زۆرکردنی دەسکەوت. لە حەدیسی شەریفدایە: «أن الصدق يهدي إلى البر والبر يهدي إلى الجنة. والكذب يهدي إلى الفجور والفجور يهدي إلى النار». واتە: ڕاستی و ڕاستگۆیی ئینسان بەرەو کاری باش دەباو، کردەوەی باشیش بەرەو بەهەشت. هەروەها درۆ و درۆزنیش بەرەو کار و کردەوەی خراپی دەباو، کردەوەی خراپیش بەرەو دۆزەخ. دیارە ڕاستی دڵ ڕووناك دەکاتەوە و دڵی ڕووناکیش بۆ کاری باش هەڵدەسووڕێ، هەروەها درۆ دڵی ئینسان تاریك دەکات و دڵی تاریکیش زۆرتر کاری ناشیرینی لێوە پەیدا دەبێ. ئاشکرایە ئەنجامی یەکەم بەهەشتە و هی دووەم دۆزەخ.

هەروەها لە عەیبەکانی نەفسن (بخل) و (شح) و (خسه). مەعنای بوخل، ڕژدی و شوح چرووکی و پیسکەیی و خیسسە، دوونییە. ئەمانە هەموو لە دنیاخوازییەوە پەیدا دەبن و، لە هەموو جۆرێکی، کە هەموویان شتێکی وەختین و بێ دەوامن و ناپایەدارن و، ئەگەر لە ژیانیشدا پایەدار بن، بۆ پاشەڕۆژ سوودیان نییە. دیارە شتێ کە سوودی هەر تەنیا بۆ دنیا بێ ئەو نرخەی نییە کە ئینسان خۆی بۆ خراپ بکا. بەڵێ سامان و کەش و فشی دنیا بۆ کەس پایەدار نییە، بەڵام ئاین و بەختیارییەك لە ئاینەوە پەیدا بێ، نابڕێتەوە. بێگومان شتی کاتی و بڕاوە و شتی هەمیشەیی و نەبڕاوە، هەر خوایان یەکە. مەشهوورە: ئەم دنیایە حەرامەکەی عەزابە و حەڵاڵەکەی حیسابە و ئینفاقی، واتە سەرفی لە ڕێی خوادا، سەوابە. کەوایە ئەوەی بێ زیانە لە سامانی دنیا، پەیداکردنیەتی لە ڕێگەی حەڵاڵەوە و لەگەڵ سەرف کردنیدا بۆ ڕەزای خوا. پێویستە ئینسانی هوشیار باوەڕی وەهابێ کە خوای گەورە، خاوەنی هەموو ڕزق و ڕۆزییەکە و خەزینەی خوا هەرگیز تەواو

نابێ و ئینسان دەبێ بەچاونەترسی و دڵ فراوانییەوە ماڵی دنیا سەرف بکا وەکو حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أنفق يا بلال ولاتخش من ذي العرش إقلالا». واتە: ئەی بیلال ئەم ماڵە سەرف بکە و لەوە مەترسە کە خوای گەورە کەمی بکاتەوە.

شێخ ئەحمەدی ئیبنوحەجەر، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە لاتی و گەدایی ترسانی بەیەکێ لە گوناهە گەورەکان ژماردووە. من لە نامەی سەخاوەتدا باسی ذەممی بەخیلیم زۆر کردووە. هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا لە نزیکەی سەد و پەنجا ئایەتدا زەممی بەخیلی و ڕژدی کراوە و بەعەیبی ئادەمیزاد دانراوە.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس توولی ئەمەلە، واتە: ئاوات و تەمای دووردرێژ کە ئەنجامەکەی هەڵپەی بێجێ و لە ئەندازە بەدەرە بۆ کۆکردنەوەی سامانی دنیا. چاری ئەم عەیبە ئەوەیە ئەو ئینسانە بیر لە نزیکی ئەجەلی بکاتەوە. لە حەدیسی شەریفدایە کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: بەخوا قەسەم ئەو پاروە نانە کە لە دەممایە نازانم بۆم قووت دەدرێ یا لەپێش قووتدانیدا دەمرم؟.

خۆشەویستم! ئینسان دەڵێ: ساڵێکی تر ئەمە ئەکەم ئەوە دەکەم و دوو ساڵی تر تەوبە دەکەم و ڕێگەی خواپەرستی دەگرم، کەچی بەئەمری خوا ئەوەندەی پێ ناچێ دەمرێ، نە بەمرازە دنیاییەکەی دەگا و نە تەوبەکەشی دەکات! جا لەبەر ئەم جۆرە ڕووداوانە نابێ ئینسان بەتەمای درێژ مەغروور ببێ و، پێویستە بەپەلە هەر کارێکی خێری هەیە زووبەزوو جێبەجێی بکات و دوای شەیتان نەکەوێ و بەفرۆفێڵی ئەو بایی نەبێ و هەڵنەخەڵەتێ؛ چونکە بەڵێنی شەیتان هەمووی درۆیە؛ خوای گەورە فەرموویەتی: «يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُوراً».

یەکێکی تر لە عەیبەکانی نەفس بایی بوونە بەمەدحی خەڵك، تەماشا دەکەی ئینسانی عادەتی وەها هەیە، خەڵکی ئەوەندە تەعریفی دەکەن و بەباڵایدا هەڵدەدەن خۆی لێ دەگۆڕێ و خووڕەوشتی نابار و کردەوە و تاری ناهەمواری خۆی لێ ون دەبێ و مەدح و تەعریفەکەی خەڵکی لەلا دەبێتە شتێکی ڕاست!. چاری ئەم جۆرە عەیبە ئەوەیە بیربکاتەوە لە حاڵی خۆی هەتا بۆی دەردەکەوێ کە خۆی عەیبدارە و، خەڵکی یا لەبەر نەزانین یا لەبەر بەجێهێنانی ئارەزووی خۆیان ئەوجۆرە مەدحەی دەکەن. جا کە بەدڵ و بەڕاستی بیری لە حەقیقەتی حاڵی خۆی کردەوە، شەرم دەیگرێ و خەجاڵەت دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕاستە ڕێگە و بۆ چاککردنی خۆی و خزمەتی خەڵك تێ دەکۆشێ.

یەکێ لە عەیبە گەورەکانی نەفس حەسەدە ، یەکێ لە هۆیەکانی حەسەدبردن کەم

شەفەقەتییە دەربارەی موسڵمانان. بێگومان ئەم حەسەدە کابرا ڕادەکێشێ بەرەو دوژمنایەتی لەگەڵ خوای گەورە (أعاذنا الله)! دەڵێ: بۆچی ئەو نیعمەت و پایەتە داوە بەفلانەکەس. دیارە مەعنای دوژمنایەتی لەگەڵ خوا ئەوەیە ئەو نیعمەتە کە خوا بەوی داوە، نرخ و گرینگیی نییە و ئەنجام بەو نیعمەت و بەشی خوایە ڕازی نابێ کە بە لوتف و میهرەبانیی خۆی پێی بەخشیوە!.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس داوای عەفوو و چاوپۆشییە لە خوا لەگەڵ دەوامکردن لەسەر گوناه و وازلێ نەهێنانی! شێخ ئیبنو حەجەر، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: سووربی لەسەر گوناه و داوای لێبووردن و چاوپۆشی نیشانەی نەگبەتییە. ڕیوایەت کراوە لە عەقەبەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «إذا رأيتم الله يعطي عبده من الدنيا على معصيته ما يحب فإنما هو إستدراج. ثم تلا: فلما نسوا ماذكروا به فتحنا أبواب كل شيء حتى إذا فرحوا بما أخذناهم بغته فإذا هم مبلسون» يعني: آيسون من كل خير. «رواه أحمد بن حنبل». چاری ئەم دەردە ئەوەیە ئەو کەسە، بیرلەوە بکاتەوەکە خوای گەورە، (جل جلاله) بەڵێنی داوە بەعەفوی گوناهی ئەو کەسانە کە بەدڵ و زمان لە خوا دەپاڕێنەوە و تکای لێبووردن دەکەن و خۆیان بەتاوانبار دەزانن، نەك بۆ ئەوانە کە بەردەوام نوقمی گوناهن. بەڵێنی لێبووردنی بەوانە داوە کە تەوبە دەکەن، نەك بەوانە کە خەریکی شەقاوەتن. خوای گەورە دەفەرموێ: «وَاسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ».

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس حیرسە لەسەر کۆکردنەوەی ماڵی دنیا و پاش کۆکردنەوەی مەنعکردنی لە خەڵك. چاری ئەم عەیبە ئەوەیە کە بەدڵ بیربکاتەوە ئەگەر ئەو ماڵە مەنع بکا لە خەڵك بەجارێ خوا و خەڵقی خوا عاجز دەکا لە خۆی و، ئەگەر بەشی خەڵقی لێ بدا بەجارێ خوا و خەڵقی خوا لە خۆی ڕازی دەکا. بێجگە لەمە ئەوەی کە نایدا بەخەڵق و بۆ خۆشی سوودی نابێ، چونکە هەروا دەفەرمووێ یا ئەگەر بمێنێتەوە بە میراتبەرەکانی دەگا و سوودێکی لەوانەوە دەست ناکەوێ. لە حەدیثایە کە حەزرەت (د.خ) بەهاوڕێیەکانی فەرموو: «أيكم مال وارثه أحب إليه من ماله؟ قالوا: ليس منا أحد إلا وماله أحب إليه من مال وارثه. فقال، صلى الله عليه وسلم: ماقدمت مالك، ومال وارثك ما أخرت» واتە: ئەوەی کە لەپێش مردنی خۆتدا بەدەستی خۆت دەیدەی بەفەقیران لە ڕێگای خوادا ئەوە ماڵی خۆتە و، ئەوەی کە سەرفی ناکەیت و دەمێنێتەوە هەتا دەمری ئەوە ماڵی میراتبەرەکانتە. خۆشەویستەکەم! لەو حەدیثە شەریفە وردبەرەوە کە چەند بەلاغەتی تێدایە؛ لە جوملەی دواییدا دەبووا بیفەرموایە: «وما أخرت مال وارثك» لەسەر تەرتیبی جوملەی پێشەوەی، کەچی فەرمووی «ومال وارثك ما أخرت» هەتا ئیشارەت بێ

بۆ ئەوە ئەو ماڵەی کە نایبەخشێ و ناشیخۆی، ئەوە بەماڵی میراتبەر حسێب دەکرێ؛ چونکە نە لە کاتی ژیانتدا و نە لە کاتی مردنتا و نە لە پاش مردن سوودی بۆ تۆ نابێ!

یەکێ لە عەیبە گەورەکانی نەفس، بەردەوام هاوڕێیی کردنی ئەو کەسانەیە کە لە خواپەرستی و عیبادەتەوە دوورن و پشتیان کردووەتە ئاین و هەمیشە لەگەڵ گوناهـ دان. هاوڕێیەتیی ئەم جۆرە کەسانە گەلێ زیانی هەیە؛ یەکەم دەبێتە هۆی گومانی ناشرین بەو کەسانە کە ڕەفاقەتی خراپان دەکەن. دووەم ئەوەیە ئەو هاوڕێیەتییە دەبێتە هۆی ڕازیبوون بە کردەوەی ئەوان؛ چونکە وەك تاقی کراوەتەوە هەتا کەسێ هەڵسوکەوت و ڕەوشتی یەکێکی بەلاوە جوان نەبێ ناتوانێ بە بێ ناچاری و بەدەوام هاوڕێیەتی و برادەریی پەسند بکا.

لە کتێبی (أنيس المتقطعين)دا حەدیسێ ڕیوایەت کراوە دەفەرمووێ: یەك سەعات هاوڕێیەتیی ئادەمیزادی خراپ، زیانی لەوە زیاترە کە سەد گورگی برسی بەرەڵڵای ناو مەڕ و ماڵاتی فەقیر و هەژار بکرێ. چاری ئەم عەیبە بیرکردنەوەیە لە ئەنجامی ئەم هاوڕێیەتییە؛ ئایا بێجگە لە گوناهـ سوودی تری هەیە یا نە؟ بێگومان ئەگەر سوودێکی هەبێ بریتییە لە ڕابواردن و پایە بەرزییان لە ماوەییەکی زۆر کەم و بێ نرخدا و، لە هەمان حاڵدا دەبێتە هۆی خواردنی ماڵی حەڕام و ڕەشبوونەوەی دڵ و دوورکەوتنەوەی لە عیبادەت و خواپەرستی.

یەکێکی تر لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە بەدەوام غافڵ بێ لە خوای گەورە. بەڵێ خوای گەورە زەممی کافرانی بەوە کردووە کە بەدەوام لە خوا غافڵن. چاری ئەم عەیبە بیرکردنەوەیە لەوە ئەو خوایە کە ئاگای لە ئەحواڵی هەموو کەس هەیە کە تەماشای ئەو غەفڵەتە بکا کە خاوەنەکەی لە ژمارەی غافڵاندا دەنووسێ و، ئەم غەفڵەتەی دەبێتە هۆی ئیقدام کردن لەسەر گوناهـ و تاوان.

براکان! تەماشای حاڵی خۆتان بکەن کە بێ ئاگایی هۆیە بۆ گوناە و هۆییەکی بنەڕەتییە بۆ نزیك بوونەوە لە کوفر و ئینکار و شتی تر؛ تەماشا بکەن خوای گەورە ئەهلی غەفڵەتی لەگەڵ کافراندا باس کردووە واتە: بێ ئاگایی لە کافربوونەوە نزیکە.

براکان! باش وردببنەوە لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە ئەوەی دەرخستووە کە پێویستە ئینسان بیپەرستێ و عیبادەتی بۆ بکا کە هەندێ عیبادەت لە عومرا تاقە جارێکە و هەندێکی ساڵی جارێکی هەندێکی تری لە چەند کاتی تایبەتیدا دەکرێ. بەڵام زیکر و یادی خوا و لێ غافڵ نەبوونی لە هەموو کاتێکی عومردا و لە هەموو حاڵێکدا لە ئینسان داوا کردووە: لە

ڕاوەستاندا، لە دانیشتندا، لە ڕاکشاندا، واتە: نابێ بەندەی خوا هەرگیز لە یاد و باسی خوا غافڵ بێ و، پێویستە هەمیشە لە دڵیدا جێگیر بێ و ویردی سەر زمانی بێ. جا من بەخوای گەورە سوێندتان دەدەم ئەمە عاقڵ و ئینسافە کە لەگەڵ ئەم هەموو ئامۆژگاری و بێدارکردنەوەدا لە لایەنی خواوە هێشتا ئێوە ئەوەندە لە خوا بێ ئاگابن و، بەدرێژایی شەو و ڕۆژ ئەم ژیانە بەنرخەی خۆتان لەناویەرن و لە واتەی پڕوپووچ و کرداری ناهەموارا سەرفی بکەن؟! بۆ لەم خەوی بێ هۆشییە خەبەر نابنەوە؟ دە ڕوو بکەنە خوای خۆتان و یادێك و زیکر و فیکرێ بۆ خۆتان جێبەجێ بکەن و هۆیەکانی بەختیاریی دواڕۆژتان ئامادە بکەن. من لەم بابەتەوە ئەوەندە حەسرەتم هەیە کە بەچەند تەبەق کاغەز نەنووسرێ! جا نازانم ئاخۆ ئێوە هەر لەسەر خووورەوشتە عادەتییەکەی خۆتان دەبن، یاخۆ دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ذیکر و یادە کە خوای گەورە حەزی لێ دەکا و بۆ خۆتان بەسوودە و هۆی بەختیاری نەبڕاوەیە؟.

یەکێکی تر لە عەیبە گەورەکانی نەفس ئەوەیە هەندێ کەس تەرکی کاسبی دەکا یا لەبەرئەوە کە خۆی گەورە کردووە! یا لەبەرئەوە کە بەسواڵکردن ڕازی دەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە توانای کاسبیی هەیە! نازانێ سواڵکردن بۆ ماڵ زۆرکردن گوناهە و بەقەدەر گوناهە گەورەکانی تر گەورەیە! حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەرکەسێ تاقە دەرگاییەك لە خۆی بکاتەوە بەهۆی سواڵ و دەرۆزەکردنەوە، خوای گەورە حەفتا دەرگای فەقیری و لاتی لەسەر دەکاتەوە، واتە: گیرۆدەی هەژاری و نەدارایی دەبێ.

یەکێکی تر لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە کاتێ شتێ بەداماوێ بدا، ئەو شتە بەزۆر دەژمێرێ و دەیکاتە منەت بەسەر ئەو داماوەوە. چاری ئەم عەیبە ئەوەیە ئینسان بیربکاتەوە کە خالیق و ڕازق هەر خوایە و، ئەوەی بەدەستیەوەیە موڵك و ماڵی خوایە و، ئەوەی بەفەقیر و داماوی دەدا هەر هی خوایە. کەواتە ئەو ماڵە خوا پێی داوە نەك ئەو، ئەوەندە هەیە کە لەسەر دەستی ئەودا گەیاندوویە بەو، هەتا ببێ بەهۆی پاداشتی چاکی ڕۆژی قیامەتی؛ کەوابێ پێویستە گەلێ سوپاسی خوا بکا کە دەستی ئەوی کردووە بەهۆی کردنی ئەو خێرە و پاداشتی چاکی ڕۆژی دوایی پێ بەخشیوە. کە مادام کارەکە ئاوابوو ئەوا ڕەوا نییە منەت بەسەر ئەو داماوەدا بکا کە شتی پێ داوە!.

فەرموودەی حەزرەتە (د.خ): «من لم یشکر الناس لم یشکر الله» ئەم فەرموودە جوانە دوو مەعنای هەیە. یەکەم: هەرکەس بەرامبەر بەندەکانی خوا حەق نەناس بێ ئەوە دەربارەی خوای گەورەش هەر حەق نەناسە و هی ئەوە نییە پیاوی گەورە یا خانەدان گلەیی لێ بکا. دووەم مەعنای ئەوەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بەفەرمانی خوا بەندەیێ حازر دەکرێ و خوای گەورە پێی دەفەرمووێ: ئەرێ فلانی! خۆ فلان کەس گەلێ خزمەتی

تۆی کرد، ئەی تۆ بۆ جارێ لە جاران سوپاسێکت نەکرد؟! بەندەکە لە وەلاما عەرزی دەکا و دەڵێ: خوای گەورە! ئەو ماڵە ماڵی تۆ بوو نەك هی ئەو ئیتر چ حەقی ئەوەی هەیە سوپاسی بکرێ؟ جا خوای گەورە دەفەرمووێ: وا منیش سوپاسی تۆم ڕەت کردەوە، چونکە تۆ سوپاسی یەکێکت تەرك کردووە کە بەهۆی ئەوەوە ئەم بەرەکەتەت پێ گەیشتووە.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە کە هەمیشە حەز دەکا لە کەیف و خۆشیدابێ، کەچی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزا فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ». هەروەها لە حەدیسی شەریفدایە: «کان رسول الله، صلی الله علیه وسلم، دائم الأحزان متواصل الفکرة». حەدیسێکی تریش هەیە دەفەرمووێ: «أن الله یحب کل قلب حزین». چاری ئەم دەردە ئەوەیە مرۆڤ بیربکاتەوە لە مردنی خۆی و تەماشای کەموکوڕی و ناتەواویی تاعەت و عیبادەتی خۆی بکا و، سەرنجی ئەوە بدا کە ئەنجام و چارەنووسی نادیارییە، ئاخۆ بە بەدبەختی دەڕوا، پەنابەخوا، یا بە بەختیاری؟ جا مادام بەڕاستی ئەمانە بێنێتە پێش چاوی خۆی ئیتر ئەو شادی و خۆشییەی لە دڵدا نامێنێ و کەمێ ترس پەیدا دەکا و لە سەرکێشی و لە خۆبایی بوونەکەی دەگەڕێتەوە.

یەکێ لە عەیبە گەورەکانی نەفس ئەوەیە ئەگەر هەزار عەیب لەخۆیدا ببینێ و سەد جار هەڵخلیسکێ پینەیێ بۆ خۆی دەدۆزێتەوە و تەئویلێکی دەکا و چاوی لێ دەپۆشێ هەروەك هیچ ڕووی نەدابێ! چاری ئەمەیش ئەوەیە کە ورد ببێتەوە لەو کارە خراپەی کردوویەتی، ئەگەر یەکێکی تر بیکردایە بێگومان بەگوناح دەزانرا کەوابێ بۆ ئەویش گوناحە، ئەمجار دەست بکا بەتەوبە و لە خوا پاڕانەوە و پەشیمانی لە تاوان؛ چونکە نەفس هەر لەسەر چاوپۆشی بڕوا دەفەوتێ و بەهیلاکدا دەچێ. شێخە گەورەکان فەرموویانە: ئەم بەڵایە بەڵاییەکی گشتییە و گەلێ کەس پێیەوە گیرۆدە بووە.

یەکێ لە عەیبەکانی نەفس ئەوەیە هەندێ حاڵی قودسی بۆ هەندێ لە ساڵحان پەیدا دەبێ لە هەندێ کاتی تایبەتیدا و ئەو ئینسانە پێی بایی دەبێ و وادەزانێ بووەتە وەلی و مەغروور دەبێ، بۆ نموونە لە حاڵی تایبەتیدا کەسێ دێتە لای دەڵێ، من حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی، یا شاهی نەقشبەندم و من لە تۆ ڕازیم! ئەمانە زۆر مسیبەتن.. خوای گەورە لەم عەیبانە بمانپارێزێ (بفضله ورحمته). بێجگە لەمانەیش عەیبەکانی نەفس زۆرن (أعاذنا الله تعالی منها).

سوپاس بۆ خوای گەورە، ڕۆژی سێشەممە (٢٩)ی مانگی (ذي الحجة)ی کۆچی، ڕێکەوتی ٢١- ١١- ١٩٧٦ی زایینی لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە.

## نامەی چل و حەوتەم

# باسی تەوبە و لە گوناه پەشیمانبوونەوە دەکا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد الله. والصلاة والسلام على رسول الله. وعلى آله وأصحابه وأتباعه إلى يوم لقاء الله.

لەپاش ئەمانە ئەی برادەران! ئەی موسڵمانان! ئەی موریدانی ڕێبازی قادری و نەقشبەندی! بزانن یەکەم هەوار لە هەوارەکانی ڕێڕەوانی ئاین و یەکەم پلە لە پلەکانی ئەوانەی بەدوای ئایندا دەگەڕێن، ئەوانەی کە دەیانەوێ لە سزای خوا ڕزگار بن، تەوبەکردن و پەشیمان بوونەوەیە لە گوناه. ڕێڕەوی موریدەکان بەبێ تەوبە هەرگیز نابێ. ئەی خەڵکی زانا و خوێنەوار! ئەی هەرەمەی موسڵمانان! زۆر چاك بزانن کە پەروەردگاری جیهان لە گەلێ ئایەتی قورئانی مەزندا فەرموویەتی کە هەر دەرد و بەلایێ بێتە سەر ئادەمیزاد هەموو لە گوناهکردن و تاوانبارییەوە ڕووی تێ دەکا. ئەوانەی تاوانبارن، تۆڵەی تاوانەکانیان لە دنیای ڕۆشندا ئەوەتە کە بەدەرد و نەخۆشی و بەلا و ئازاری دەنیاییەوە گیرۆدە دەبن وەك ئێش و نەخۆشی و گەدایی و بێ پیت و بەرەکەتیی ڕزق و ڕۆزی و بێ بەروبوومیی کشتوکاڵ و باغ و بێستان.

لە حەدیسی پێغەمبەردا هەیە (د.خ) کە هەر کۆمەڵێك و هەر چینێ لە ئادەمیزاد زیناکردن و بێ نامووسی لەناویاندا پەیدابێ و پەرە بستێنێ خوای گەورە بە بەلای گرانی وەك وەبا و تاعوون و ئێش و نەخۆشی و بێ بارانی گیرۆدەیان دەکا. بەتایبەتی لە حەدیسی شەریفدا هەیە کە لە نەدانی زەکا و لە خیانەتی کێشانە و پێوانەوە بێ بارانی و قاتوقڕی پەیدا دەبێ و پیت و بەرەکەت لە زەویدا نامێنێ. هەروەها بەهۆی بێ شەرمیی ئەولاد لەگەڵ دایك و باوکدا و بەهۆی بڕینی پێوەندیی ڕەحم و خوێشایەتی عومریان کورت دەبێ و بەرەکەت لە ڕزق و ڕۆزیاندا نامێنێ و ژیانیان لەسەر تەنگ دەبێ و، ستەمکاران بەسەر خەڵکدا زاڵ دەبن و کۆمەك و یارمەتیی ئەهلی ستەم و زۆردار دەدرێ دژی حەق ڕەوان و پیاوچاکان.

له حەدیسی شەریفدا هەیە کە پاداشی گوناهکردن و تاوانکاری سێ شتە، یەکەم: سستی لەتاعەتکردندا. دووەم: تەنگیی گوزەران. سێیەم: لەزەت لێ تێکچوون واتە: هەر لەزەت و خۆشییەك بۆ ئینسانی گوناهبار هەڵکەوێ شتێکی لێ تاین دەبێ و ئەو خۆشی و لەزەتەی لێ تاڵ دەکا.

ئەم سێ شتە تەنیا جەزای دنیایە و بێجگە لەمەش لە ڕۆژی دوایشدا چەندەها جۆری سزا و ئازار و پەریشانی هەیە سەرباری سزای گۆڕ.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: ئەگەر لە حەق سەندنا بەپێی لوتف و میهرەبانیی خۆم موعامەلەم نەکردایە و پەلەم بکردایە گیانلەبەرم لەسەر زەویدا نەدەهێشت، یا بەهۆی گوناهەوە، یاخود بەهۆی شووم و نەگبەتیی گوناهەوە عالەمەکەم وێران دەکرد. هەروەها حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «الذنب شؤم على غير صاحبه». واتە: گوناهکردن بۆ غەیری خاوەنەکەشی نەگبەتییە و، هەروەکو دەبێتە هۆی سزا و ئازاری خاوەنەکەی، دەشبێتە هۆی نەگبەتی و ماڵوێرانی بۆ خەڵکی تریش. بێجگە لەمانە ئینسانی تاوانبار و خراپ (زۆرجار) (غالبا) دڵتەنگە و ناوچاو تاریکە و لە ناو کۆمەڵی موسڵمانانندا سووك و چرووکە و، لە دادگای شەرعدا شایەتیی قبووڵ ناکرێ و شەیتان بەسەر دڵیدا زاڵ دەبێ و دەیخاتە دڵیەوە کە گوایا ئیتر تەوبەی لێ قبووڵ ناکرێ! ئینسان خاوەن هیمەت بوو و تەوبەی کردو لە گوناه پەشیمان بوویەوە، ئەوە بەهۆی پیرۆزیی تەوبەکەیەوە خوا تەوفیقی دەدا، بۆ خواپەرستی و تاعەت و نووری دین لە ناو چاوانیدا دەدرەوشێتەوە و هەموو ئەندامەکانی حیسس و ئەندامەکانی تری لەشی هێزیان تیا پەیدا دەبێ بۆ عیبادەتکردن و، لە دادگای شەرعیدا لە کاتی پێویستی شایەتیدااندا شایەتی لێ قبووڵ دەکرێ. دیارە ئەم جۆرە سەربەرزییە بەسە بۆ موسڵمان.

لە حەدیسی شەریفا دەفەرموێ: خوای گەورە غەیوورە و بەغیرەتە لەسەر ئەهلی گوناه و تاوانباران وەعدەی داوە بەوانە کە تەوبە دەکەن بەڕزگاری، وەکو فەرموویەتی: «وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ» واتە: ئەی خاوەن باوەڕەکان هەمووتان بەشێوەییەکی گشتی بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە، بەڵکو لە ئازاری پاشەڕۆژ ڕزگار بن. دیارە هیچ شتێ نییە مەنعی گوناهباران بکا لە تەوبە مەگەر دڵڕەشی و ڕۆچوون بەناو ئارەزووی نەفسدا، یا پاڵدانەوە لەسەر میهرەبانیی خوا و چاوپۆشی لە گوناه (واتە: تەنیا ڕجا بە بێ خۆف).

ریوایەت کراوە: چەرخێ دێ بەسەر ئوممەتدا لەبەر پێنج شت، پێنج شت فەرامۆش دەکەن؛ لەبەر حەز لە گوناهکردن تەوبەیان لەبیر دەچێتەوە. لەبەر خۆشویستنی سامان، حیسابی ڕۆژی قیامەتیان لەبیر دەچێتەوە. لەبەر حەز لە ژیانکردن، مردنیان لەبیر دەچێتەوە. لەبەر حەز لە ڕابواردنکردن وەزعی ناو گۆڕیان لەبیر دەچێتەوە. لەبەر خۆشویستنی خەڵق، خۆشویستنی خالقیان لەبیر دەچێتەوە. شێخ ئیبنو حەجەر فەرموویەتی: ئەو کەسە کە ڕووی لە گوناه بێ و دەستبەردار نەبێ، ئەوە خوا غەزەبی لێ گرتووە و بۆ نەگبەتی و ماڵوێرانیی داناوە و ئەو کەسە لە هەموو بێ هۆشێ بێ هۆشترە. لە حەدیسی شەریفدایە: کاتێ دڵ بەم نەخۆشییانە وێران بوو، هەموو ئەندامی لەشی ئینسان خراپ و بێ کەڵك دەبێ؛ چونکە دڵ سەرداری لەشە و دیارە کە سەردار ساغ بوو، سوپا ساغ دەبێ و کە سەردارێش ناساغ بوو، ئەوا سوپاکەش ناساغ دەبێ، واتە: ئیشوکاری نارێك دەبێ. بۆچی نەتانبیستووە: «الناس على دين ملوكهم»؟!. بۆیە زۆر پێویستە ئینسان هەمیشە خەریکی دەرمانی دڵی خۆی بێ.

وتوویانە: بەدبەختی و ماڵوێرانیی شەیتانی لەعنەتی لە پێنج شتەوە بوو؛ یەکەم پێی لە تاوانی خۆی نەنا. دووەم لەبەر ئەو پێ لێ نەنانە پەشیمان نەبوویەوە لە تاوان. سێیەم هەر لەبەرئەوەیش سەرزەنشتی خۆی نەکرد. چوارەم تەوبەی نەکرد. پێنجەم نائومێد بوو لە ڕەحمەتی خوای گەورە. بەڵام حەزرەتی ئادەم (د.خ) بەپێچەوانەی ئەم پێنج سیفەتانە ڕەفتاری کرد بۆیە بەختیار بوو.

خوای گەورە فەرموویەتی: «وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ عِندَ رَبِّهِ». واتە: ڕێزگرتن لەو سنوورانە خوا دای ناون و دوورکەوتنەوە لەو شتانە حەرامی کردوون، چاکترین شتە لای بارەگای خوا بۆ ئینسان و باشترین پاداشتی لەدوایە. لە ڕاستییدا نرخ دانان بۆ گوناه و بۆ لێ دوورکەوتنەوە و لێ ترسانی، دەبێتە هۆی واز لە گوناه هێنان، بەڵام بەسووکی و بێ نرخی تەماشاکردنی دەبێتە هۆی پێوە گیرۆدەبوونی.

براکان! نەخۆشییەك پەیدا ببێ هەمووکەس تێ دەکۆشێ بۆ چارەکردنی بەهۆی دکتۆری خاوەن فام و دەرمانی بەسوود. زۆر جێی سەرسووڕمانە کە هەموو لایێ گیرۆدەی دەردی ناهەموار و سیفەتی نابار و کردەوەی ناشیرین کەچی کەس نییە بێدار بێتەوە و هەوڵێ بدا، بۆ دەرمانی ئەم دەردە بەهۆی تەوبەکردن و تەرکی ئەو کردەوە کە هۆی بەدبەختیی ئینسانە.

براكان! نەخۆشی و ناساغیی لەش وەكو نەخۆشیی نەفس نییە؛ چونكە نەخۆشیی لەش هەموو كاتێكی دەبێتە كەفارەتی گوناهەكان، كەم یا زۆر، تا لە ئەنجامدا كابرا دەمرێ یا ڕزگار دەبێ. كەوابێ دەرد و نەخۆشییەك كە زۆر نابار بێ دەردی نەخۆشیی نەفسە بەهۆی خوووڕەوشتی ناپەسندەوە وەكو كوفر، پەنابەخوا، یا خۆ بەگەورە زانین و لەخۆبایی بوون یا حەسوودی یا فتنەیی و ڕژدی. هەروەها دەردی گوناهە گەورەكانە وەكو ئینسان كوشتن و زیناكردن و حەرام خواردن و تەركی واجیبەكان و تێكەڵ بوون لەگەڵ حەرامدا. ئەمانە یەكەم: ئیمانی ئینسان دەفەوتێنن یا وەكو تاڵی شاری، كە تەنانەت بكرێتە هەنگوینیش تاڵی دەكا، پاداشی عیبادەت لادەبەن. دووەم: تاوان بەرەكەت و جوانی لە ڕزق و ڕۆزی و ژیان و ژیوار هەڵدەگرێ.

براكان! وەك چۆن دەوڵەمەندەكان كاتێ گیرۆدەی ناساغی ببن گورج دەڕۆن بۆ لای دكتۆر بۆ چاری ناساغییەكەیان، هەروەها پێویستە ئینسان كە تووشی نەخۆشیی ئاینی بوو، هەوڵ بدا دەرمانەكەی پەیدا بكا كە تەوبەی ساغ و پەشیمان بوونەوە و دانەوەی حەقی خەڵكە هەتا لە سزای قیامەت ڕزگار ببێ.

دەگێڕنەوە: شێخی شیبلی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ڕۆژێ بە بەردەرگای خانوویەكدا تێ پەڕی و دیی دكتۆرێ خەریكی دەرمانكردن و چاركردنی شێتێكە. شیبلی فەرمووی: دكتۆر! دەرمانی گوناهت لایە؟ ئەویش وەڵامی نەدایەوە. شیبلی پێی فەرموو: وەرە بۆ لای ئێمە هەتا دەرمانی گوناهت پێ بڵێم. عەرزی كرد: دەرمانەكەی چییە؟ شیبلی فەرمووی: برۆ تۆوی تەوازوع و خاكینەیی و گەڵای پەشیمانی و ڕیشەی لە خوا پاڕانەوە بكەرە ناو هاوەنی تەوبەوە و بەدەسكە هاوەنی «ربنا ظلمنا أنفسنا» كە بریتییە لە پێ لێنان و داننان بە گوناها بیانكوتەو بە ئاوی دڵسافی و دڵسۆزی حەلیان بكە و بیانكەرە قاپلەمەی دڵەوە و بەئاگری تیژ و بەتینی خۆشویستن بیانكوڵێنە و بە كەوچكی تاعەت تێكیان بدە و بەكەتانی زیكری (سبحان الله وبحمده سبحان الله العظیم) بییان پاڵێوە و ئەمجار بیانكەرە ناو پیاڵەی عەشق و لە سێبەری (الحمد الله)دا دای بنێ و لە بەرەبەیانی (الله أكبر) واتە خوا بەگەورە زانیندا بیانخۆرەوە، هەتا لە شیفاخانەی (وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ)ەوە شیفاتان بۆ بێ. ئەی دكتۆر! ئەگەر ڕزگاریت دەوێ تۆ خۆت نەخۆشی. چاری نەخۆشییەكەی خۆت لەو شێتە داوا بكە؛ چار و عیلاجی ئەو بە تۆ نییە.

ئەی برای خۆشەویست! چاری گوناهباری بە پەشیمانی و بەداوا و تکای لێخۆشبوونە لە خوای گەورە وەکو حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «ألا أنبئكم بدائكم ودوائكم؟ قلنا: بلیٰ. قال: أن داءكم الذنوب ودواءكم الأستغفار». واتە: دەردی ئێوە گوناهە و دەرمانتان داوای عەفوو پاڕانەوەیە لەخوا. ئەی خۆشەویست! بۆ ئەم دەرمانە ئەجزای تر هەیە کە بریتییە لە دەستبەردار بوون لە گوناهـ بەیەکجاری.

ریوایەت کراوە: «الإستغفار بلا إنقلاع توبة الكذابين» واتە: بەزمان داوای لێ خۆشبوون کردن، بێ دەسبەرداربوون لە تاوان تەویەی درۆزنانە!. ئایا نازانن کە خوای گەورە فەرموویەتی: (وأستغفره أنه كان تواباً)؟ واتە: داوای لێبووردن لە خوای گەورە بکە؛ خوای گەورە زۆر زۆر تەویە قبووڵ دەکا. واتە: ئەگەر لەگەڵ ئەوەدا کە بەزمان داوای لێبووردن لە خوای گەورە دەکەن، بەراستیش تەویە بکەن و، بگەڕێنەوە بۆ لای بارەگای، ئەوە بەراستی تەویەتان لێ قبووڵ دەکات و لاتان لێ دەکاتەوە و لە گوناهتان دەبووری. بەڵام ئەگەر هەر بە زمان داوای لێ خۆشبوون بکەن و، بەدڵ پەشیمان نەبنەوە و نەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەوە خوای گەورە عەفوتان ناکا و چاوپۆشی لە گوناهەکانتان ناکا.

خوای گەورە وەحیی بۆ حەزرەتی داوود نارد، بە بەنی ئیسرائیلی بڵێ: چەندجار شەو دەستتان کرد بەگوناهکاری و بێ پەردە تاوانتان کرد، کەچی سبەینێیان بەفێڵ دەستتان دەکرد بەداوای لێ خۆشبوون بێ ئەوەی دەستبەرداری گوناهەکان ببن؟ وادەزانن ئێوە لەگەڵ کەسێکدا مامەڵە دەکەن کە فڕوفێڵی ئێوەی لێ ون دەبێ!.

هەروەها لەپێشدا عەرزم کردن کە شێخ ئیبنو حەجەر فەرموویەتی: نیشانەی بەدبەختی و شەقاوەتی ئینسان ئەوەیە کە دەست بکا بەگوناهکردن و بڵێ: خوا غەفوور و ڕەحیمە! لە حەدیسی شەریفیشا هەیە کە ئەحمەقترینی ئەحمەقەکان و گومڕاترینی گومڕاکان ئەو کەسەیە ڕوو بکاتە گوناهـ و تاوانکاری و بەردەوام بێ لەسەر ئەو حاڵە، کەچی داوای عەفوو و چاوپۆشی لە خوای گەورە بکا بێ ئەوەی لە گوناهەکان دەسبەردار ببێ. بەڵێ ئەم کابرایە ئەحمەقە، چونکە زیانی زۆریی گوناهـ لە قیامەتدا دەبینرێ و لە دنیا نابینرێ، جا کە کابرا لەمانە بێ هۆش و بێ ئاگا بێ، دیارە عەقڵی سووکە. زیادە ئەحمەقییەکەشی لەبەرئەوەیە کە لەگەڵ دەوامی داوای لێ خۆشبوونا هەر گوناهـ دەکا و خۆی ناخاتە ڕیزی چاکانەوە!. بەکورتی یەکەم حومقی گوناهکردنەکەیە و دووەم

حومقی بەدەم داوای لێ خۆشبوونەکەیەتی، کە لە گاڵتە بەگوناهکردن دەچێ!! چونکە تکای لێخۆشبوونی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بەدڵ خۆی بەتاوانبار بزانێ و تاوانەکەی بەهۆی سزای خوا بزانێ. هەروەها لەگەڵ داوای بەخشینی گوناهە پێشووەکانی ئەوەندە ئەو گوناهە پێشووانە بەناشیرین و نارەوا بزانێ بەتەبیعەت بێزار بێ لە گەڕانەوە بۆیان.

جا براکان! بە ڕووناکی بزانن کە مەعنای تەوبە ئەوەیە لەو گوناهانە کە لەمەوپێش کردوونی پەشیمان ببێتەوە و عەزمی جەزمیشی ببێ کە لەمەوپاش ناگەڕێتەوە بۆیان و، ئەگەر ئەو گوناهە کە تەوبەی لێ کردووە لەوانەبێ کە لە کاتی تەوبەکەدا شتێکی پێوەمابێ، بەگورجی لێی دوور بکەوێتەوە. بۆ نموونە: کە تەوبەی کرد لە پۆشاکی حەرام وەکو ئاوریشم و لەو کاتەدا سەرپێچێکی ئاوریشمی بەسەرەوە بوو، دەبێ گورج فرێی بدا. یا کە تەوبەی کرد لە بەناحەق خواردنی ماڵی خەڵك و لەو کاتەدا حەقێکی خەڵکی لەسەر بوو، گورج بیداتەوە بە خاوەنەکەی یاخۆ داوای ئازادکردنی لێ بکا، وە ئەگەر توانای نەبوو بیداتەوە داوای عەفووی لێ بکا.

پوختەی قسە تەوبە چوار ڕوکنی هەیە، یەکەم پەشیمان بوونەوە لە گوناه. دووەم عەزم لەسەر ئەوە کە نەگەڕێتەوە بۆ سەری. سێیەم دانەوەی حەقی خەڵکی. چوارەم: ئەگەر نەیتوانی حەقی خەڵك بداتەوە و نەیشیتوانی داوای عەفووی لێ بکات، ئەوە هەر تەوبە بکات و دەست بکات بە عیبادەت و خواپەرستی تا خوای گەورە دەستی پێ دەدا و حەقەکەی خەڵك جێبەجێ دەکا.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسانە کە حەقیان بەسەر خەڵکەوە هەیە، چ حەقی ماڵ و چ حەقی نامووس وەکو غەیبەت و زیناکردن و هەمووی لەسەر کابرای تاوانبار کۆبووەتەوە، ئەوە لەو کاتەدا خوای گەورە بەقودرەتی خۆی کۆشکی زۆر جوان و نایاب دروست دەکات و پیشانی ئەو کەسانەی دەدا کە خاوەن حەقن و پێیان دەفەرمووێ: ئێوە دەتوانن ئەم کۆشکانە بکڕن. ئەوانیش عەرزی دەکەن: خوایە! تۆ بەو گەورەیی و توانایی خۆتەوە بۆچی گاڵتە بەئێمە دەکەی؟ ئەویش دەفەرمووێ: نەخێر گاڵتەتان پێ ناکەم. جا لەو کاتەدا خوا دەفەرمووێ: دەی ئێوە بێن ئەو کابرای ستەمکارە عەفو بکەن منیش لە پاداشی ئەوەدا ئەو کۆشکە جوانانە دەدەم پێتان. بەم جۆرە خوای گەورە ئەو ستەمکارە ئازاد دەکا کە تەوبەی کردووە و نەیتوانیوە لە دنیادا حەقەکە بداتەوە بەخاوەنەکەی و، لە باتی گوناه و ستەمەکانی پاداشی خاوەن حەقەکان

دەداتەوە و ئەو ڕزگار دەبێ؛ چونکە تەوبەی کردووە و نەیتوانیوە حەقەکە بداتەوە بە خاوەنەکەی (والحمد لله على ذلك).

ئەم سوڵحی قیامەتە لە بەینی ستەمکاران و خاوەن ماڵدا، بۆ ئەو کەسانە کە بەئیخلاس حەجی ماڵی خوایان کردووە ڕاستە و بێگومان دێتەجێ. بەڵام بۆ ئەو کەسانە کە تەوبەی عورفییان کردووە بەشێوەی قەتعی مەعلووم نییە؛ لەوانەیە ببێ و لەوانەیە نەبێ، بەڵام بوونەکەی غاڵبترە. ئەگەر بەختیاربن ئەم سوڵحە بۆ ئەوانیش دەکرێ و ئەگەر بەختیار نەبن ناکرێ. بەڵام ئەگەر ڕوویان کردە عیبادەت و تێکۆشان بۆ خواپەرستی و کردەوەی چاك ئەوا بەو کردەوە چاکانە دەوڵەمەند دەبن و بەکردەوە چاکەکانی خۆیان کە بە خاوەن حەقەکان دەدرێن، هەموو ڕازی دەبن و ئیتر پێویست ناکا گوناهی خاوەن حەقەکانیان بخرێتە سەرشان و بەقەدەر گوناهی خۆیان و گوناهی ئەوان لە دۆزەخدا ئازار بدرێن چونکە ئەو ستەمکارانە کە حەقی خەڵکیان لەسەرە ئەگەر چاکەیان زۆر نەبێ و حەقی حەقدارەکان تەواو نەکا، ئەوە گوناهی حەقدارەکانیان بەسەرا دەدرێ، کەوابێ دەرکەوت بۆ ئەهلی تاعەت و عیبادەت تەوبەی عورفیش بەسوودە بەمیهرەبانی خوای گەورە. یەکەم لە پاش تەوبەکەی ئیتر گوناهناکات. دووەم ڕوو دەکاتە تاعەت و عیبادەت. سێیەم لە میهرەبانی خواوە ئیستیحقاقێکی بۆ پەیدا دەبێ بۆ ئەوەی سوڵحەکە بکرێ لە بەینی ئەوان و حەقدارەکاندا. چوارەم ئەگەر پاش تەوبەکەی عیبادەتی زۆری کرد، دەبێتە دەوڵەمەندی قیامەت و بەو عیبادەت و خواپەرستییانە حەقی حەقدارەکان دەداتەوە و تاوان و گوناهی ئەوانی ناخرێتە سەرشان؛ کەوابوو تەوبەی عورفی قازانجێکی زۆر گەورەی هەیە، ئیتر با نەڵێین ماوەی تەوبەمان نییە، چونکە ناتوانین مەرجەکانی تەوبە جێبەجێ بکەین.

پیری فەرتووتی ناتوانا و بێ دەستەڵاتیش وەك ئەو زاڵمەیە کە لێ کەوتبێ و لات بووبێ و حەقی زوڵم لێکراوی نەدابێتەوە. واتە: تەوبەی پیری فەرتووتیش وەك تەوبەی ئەو زاڵمە لێ کەوتووە تەوبەی عورفییە و قازانجی هەیە؛ کەواتە ئەو پیرە فەرتووتە کە بەتەواوی دواکەوتووە و ناتوانێ گوناح بکا با نەڵێت: من تەوبەی چی بکەم خۆ من لێ کەوتووم و ناتوانم زینا بکەم و ناتوانم کەس بکوژم و دار لە کەس بدەم، ئیتر چۆن عەزمی نەکردنی گوناه بۆ من دێتەجێ؟ تەوبەی من هەر بەدەمە و شتێکی بێ قیمەت و درۆیە؛ چونکە تەوبەی ئەم پیرەیش تەوبەی عورفییە. خۆ دەتوانێ لە پاش تەوبەکەی

عیبادەت و خواپەرستی زۆر بکا و ببێتە دەوڵەمەندی قیامەت، دەتوانێ بەدڵ و بەجۆش لە گوناهە پێشووەکانی پەشیمان بێتەوە و دەتوانێ لە شوێنێکی چۆڵدا بەتەنیایی ڕوو بکاتە قیبلە و زیکری خوا بکا و لە ترسی خوا بگری، کە ئەم حاڵەتە گەورەترین پایەی تەوبەیە بەتایبەتی بۆ پیری لێکەوتوو، وەکو حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «التوبة الندم» وە فەرموویەتی «الحج عرفة».

کەوابێ پێویستە ئاگادار بێ، وەکو زوو شەیتان تەفرەی دا و گوناهەکانی پێ کرد، ئێستاش دەستی نەبڕێ و بڵێ: تۆ لە کوێ و تەوبە لە کوێ؟ چونکە دەرگای تەوبە هەمیشە کراوەتەوە و هەتا سەرەمەرگ خوا قبووڵی دەکا. هەروەها تەوبە، هەرچەند ئەرکەکانی تەواو نەبن و تەوبەی عورفی بێ، وەکو قازانجی بۆ ئەو ستەمکارە هەیە کە حەقی حەقداری پێ نەدرێتەوە نەفعیشی بۆ پیاوی فەرتووت و پیری لێکەوتوو هەیە.

برادەرەکان! عەرزتان دەکەم: حەدیسەکانی حەزرەت (د.خ) وەکو مەنتووق و مەفهووم و تەئویلیان هەیە ئیشاراتیشیان هەیە. حەدیسی (التوبة الندم) دەرحەق بەوانە کە دەتوانن گوناه بکەن، بەوە تەئویل دەکرێ کە ڕوکنی هەرە گەورەی تەوبە، نەدەم و پەشیمانییە. وەکو (الحج عرفة) وا تەئویل دەکرێ کە ڕوکنی گەورەی حەج ڕاوەستانی عەرەفەیە. کەواتە بۆ خاوەن دەستەکان پێویستە هەموو ڕوکنەکانی تەوبە جێبەجێ بکەن. بەڵام دەرحەق بەپیرانی فەرتووت و بێ دەسەڵات کە ناتوانن گوناه بکەن مەبەست لە (التوبة الندم) مەنتووقەکەیەتی بەبێ تەئویل؛ چونکە پیری فەرتووت بێجگە لە پەشیمانی هیچ دەستەڵاتێکی نییە و، عەزمی نەگەڕانەوە بۆ سەر گوناه لەلایەن پیری فەرتووتەوە تەنیا شتێکی زمانییە و هیچی تر، ئەگینا ئەو هیچ گوناهێکی پێ ناکرێ، هەتا عەزمی وەهابێ کە نەیکا. کەوابێ لە ئیشارەی ئەم حەدیسەوە دەردەکەوێ کە پیری بەڕاستی لە گوناه پەشیمان، حوکمی جوانی تەوبەکاری هەیە و لە قیامەتدا وەك ئەو پایە بەرزە.

بۆ پیرە پەککەوتووەکان شتێکی زۆر موناسب و بەجێیە کە هەر وەکو بەدڵ پەشیمانن لە گوناهی ڕابووردوو، زۆر داوای لێخۆشبوون بکەن لە بارگای خوا، بەڵکو بەهۆی ئەو داوای لێخۆشبوونەوە بەدەوڵەمەندی قیامەت بژمێردرێن یا خوا لە قیامەتا لەگەڵ خاوەن حەقەکاندا ئاشتیان بکاتەوە و لە سزای دۆزەخ ڕزگاریان بکا.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی بەندەی من! ئەگەر پڕی

مابەینی ئەرز و ئاسمان گوناهت ببێ کە بەچاوی تەڕ و دڵی پەشیمانەوە ڕووت لە قاپیی من کرد، عەفووت دەکەم و گوێ نادەمە ئەوە کە گوناهت زۆرە. هەروەها ڕیوایەت کراوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا نامەیێ بەوانە دەدەن کە لە دنیادا تەوبەیان لە گوناه کردووە، پێیان دەڵێن پاش ئەوەی لە پردی سیرات دەپەڕنەوە کاغەزەکە دەکەنەوە و تەماشا دەکەن نووسراوە: ئەی عەبدی من! فڵانە گوناهت کردو من نەمداوە لە ڕووت، هەتا شەرمەزار نەبی.

براکان! کەسێ خزمەتکاری گەورەیێ بێ، هەمیشە ورد دەبێتەوە بزانێ ئەو گەورەیە مەیلی بە چییە و حەز لە چی دەکا هەتا بۆی جێبەجێ بکات. ئێوە دەزانن کە خوای گەورە حەز لەوە دەکا کە بەندەکانی گوناه نەکەن و، ئەگەر گوناهیان کرد تەوبەی لێ بکەن و پەشیمان بنەوە و، تەماشای ئەو نیعمەتانە بکەن کە خواپێی داون و کە ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن، وەکو نیعمەتی ئیمان و تەندروستی و سەلامەتی و ڕزق و ڕۆزی و ماڵ و منداڵ و حورمەت و پایە و شتی تر. کەوابێ پێویستە هەموو لایێ تێ بکۆشین بۆئەوەی گوناه نەکەین و ئەگەر بە قەزا و قەدەر گوناهێ هات بەسەرماندا تەوبەی لێ بکەین و بەرامبەر بەم نیعمەتە زۆر و بێ شومارەی خوا سوپاسگوزاریمان لەبیر نەکەین.

لە حەدیسێکدا حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: بەخوا قەسەم خوای گەورە بە پەشیمانی و تەوبەی بەندەی زیاتر لە سروری عەبدێکی بێ دەستەڵات مەسروور دەبێ، کە سواری وشترێ بووبێ و هەموو ئاو و نان و تۆشەییەکی بەسەر پشتی ئەو وشترەوە بێ و لە بیابانێکدا بڕوا بەڕێدا و لە شوێنێکدا دابەزێ. لەپڕ وشترەکەی ڕابکا و گوم ببێ. ئەویش زۆر بەشوێنیدا بگەڕێ و نەیدۆزێتەوە و بەنائومێدی سەر بنێتەوە و چاوەڕوانی مردن بێ و خەوی لێ بکەوێ. کاتێ خەبەری بێتەوە تەماشا بکا وشترەکەی لەلایدا وەستاوە و هەموو توێشەکەی ڕێگای بەساغی بەسەریەوە ماوە و ڕەشمەکەی بەسەر ملیا شۆڕ بووەتەوە بۆ نزیکی دەستی ئەم و، ئەمیش گورج دەست بباو ڕەشمەکە بگرێ و لەو تەنگانییە ڕزگار ببێ و سوپاسی خوا بکا کە ئەم جارەش نەفەوتا. جا لەو کاتەدا لە خۆشییاندا سەری لێ تێك بچێ و لەباتی ئەوەی بڵێ: خوایا تۆ خوای منی و من بەندەی تۆم بڵێ: ئەی خوا! تۆ بەندەی منی و من خوای تۆم!.

براکان! بەخ بەخ لەم بەختیارییە و لەم دەوڵەتە کە بەهۆی تەوبەوە دەستی بەندەی خوای گەورە دەکەوێ. بەڕاستی خوا بێ باك و بێ پەروایە لە عالەم، نە تەوبەی بەندەکانی

سوودی هەیە بۆی نە تەوبە نەکردنیان زیانی هەیە بۆی. هەر تەنیا بە میهرەبانیی خۆی پەشیمان بوونەوە و تەوبەکردنی بەندەی گوناهباری کردووە بەهۆی عەفووکردن و لێبووردنی گوناهەکانی و بەرزکردنەوەی پایە و پاداشی لە ڕۆژی قیامەتدا. کەوابێ بەندەییەکی گوناهبار ئەگەر هەلی تەوبەی لە کیسی خۆی دا ئەوە نامەردی شەرعییە و بێ هۆش و بەدبەختە و زیان لە خۆی دەدا.

ڕیوایەت کراوە: کە پلە و پایەبەرزیی بەندەیێ کە تەوبە بکاو، خۆی لە گوناهەکان بپارێزێ و، بەگوێی نەفس و شەیتان نەکا و، عومری بەم جۆرە ڕابوێرێ، نۆ سەد پایەیە مابەینی هەر پایەیێك و دواینی بەقەدەر مابەینی ئەرز و ئەوپەڕی عەرشە. جا ئەم پایە بۆ ئینسانێکە کە تەقوا و تاعەت و دوورکەوتنەوە لە گوناهـ ببێتە موڵك و ماڵ بۆی.

ڕیوایەت کراوە: کەسێ تەوبەی نەسووح بکا، خوای گەورە دەیپارێزێ لە شەڕ و لە بیری فریشتەی لای چەپی دەباتەوە کە نووسەر و ڕاگری گوناهانە. هەروەها گوناهەکانی لە بیری دەست و پێ و ئەندامەکانی تری دەباتەوە هەتا لە ڕۆژی قیامەتدا شایەتیی لێ نەدەن. مەعنای تەوبەی نەصووح پەشیمان بوونەوییەکە پاك و بێگەرد بۆ خوا بێ و هیچ نیاز و خەیاڵێکی تری تێکەڵ نەبێ. لەبەر ڕووناکی ئەم حەدیثە شەریفەدا تەوبەی نەسووح و خالیص گەلێ قازانجی زۆرە، بەڵام دەبێ بزانن کە تەوبەی نەسووح کۆکەرەوەی هەموو خواپەرستییەکە، واتە: کەسێ تەوبەی نەسووحی کرد بە هەموو مەعنایێ ڕوو دەکاتە خوای گەورە و تەرکی هەموو گوناهێ دەکا، بەتایبەتی گوناهی گەورە و، لەسەر کردنی گوناهی بچووکیش سوور نابێ.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئینسانێکی فاجیری ئەهلی زینا دێنن بۆ مەیدانی موحاسەبە بە کۆت و زنجیرەوە. لەوێدا کە زاتی خوای پەروەردگار بەرقەوە بۆی دەڕوانێ، پێست و گۆشتی ڕووی دادەڕزێتە خوارەوە. کابرای گوناهبار ئینکاری کردەوەی ناباری خۆی دەکا و دەڵێ زینام نەکردووە. لەوێدا خوای گەورە زمانی ئەو کابرایە دەبەستێ، جا دەستی کابرا دێتە جواب و بانگ دەکا دەڵێ: من ئەو شتانەم پێ گرتووە بۆی. پێشی دەڵێ: من هەنگاوم بۆ ئەو شتانە ناوە و ڕۆیشتووم. تەنانەت عەورەتی بانگ دەکا و دەڵێ: من فلانە ئیشم کردووە. بەم جۆرە کابرا لە ناو ئەو هەمووە حەشامەتەدا ئابڕووی دەچی. بەڵام یەکێ کە تەوبەی نەسووح و خالیس بکا لەم ڕیسوایی و ئابڕووچوونە دەپارێزرێ و، لەو ڕۆژەدا لە کاتی لیقای خوای گەورەدا ئابڕووی ناچێ.

له حەدیسی شەریفدایە: سێ شت لەگەڵ سێ شتدا ناکەونە یەك، گوناهکردن لەگەڵ تەوبەکردندا و، دەوڵەمەندی لەگەڵ زیناکردندا و، دەروێشی و فەقیری لەگەڵ نوێژی چاشتەنوێژا.

هەروەها له حەدیسی شەریفدایە: من أحسن في مابقي غفر له في ماقضي. ومن أساء في مابقي أخذ في ما مضي وبقي» واتە: هەرکەس لە باقیمەندەی ژیانیدا چاکە بکا خوای گەورە لە گوناهی پێشووی چاوپۆشی دەکا. بەڵام هەرکەس لە باقیمەندەی ژیانیدا کردەوەی خراپ بکا و بەد بێ ئەوە حەقی لەوەپێش و لەوەپاشی لێ دەسەنرێ. لە حەدیسێکی ترا فەرموویەتی: تەوبە گوناهەکان دەشۆرێتەوە. بەڕاستی خوا دەرحەق عەبدەکانی خۆی فەرموویەتی، دوو ئەمین بوون و دوو ترس لە عەبدێکمدا کۆ ناکەمەوە؛ ئەگەر لە دنیادا ئەمینی بکەم لە قیامەتدا ئەمینی ناکەم و، ئەگەر لە دنیادا بیترسێنم لە قیامەتدا نایترسێنم.

براکان! تەوبە سیفەتی موسڵمانانە و ئەنجامەکەی ڕزگاربوونیانە لە سزا. خوای گەورە فەرموویەتی: «وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ». بەڵام ئینابە سیفەتی موقەڕەبینە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «وَجَاء بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ» واتە: بەدڵێکەوە هاتووە کە ڕووی کردووەتە تاعەت. بەڵام (أوبة) سیفەتی ڕەهبەرانە واتە: پێغەمبەران. خوا فەرموویەتی: «نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ» کەوابێ کەسێ لە ترسی سزا و تۆڵە تەوبە بکا، ئەوە ساحێب تەوبەیە. ئەگەر کەسێ لەبەر تەمای پاداش و ڕەزای خوا تەوبە بکا، ئەوە ساحیبی (أنابة)یە. بەڵام ئەگەر نە لەبەر ترس و نە لەبەر تەماع، بەڵکو هەر لەبەر ڕەزای خوا تەوبە بکا، ئەوە لە ئەووابینەو صاحیبی ئەوبەیە واتە: گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە.

لە حەدیثی شەریفدایە: ئەگەر بەندەیێ گوناهێ بکا و لە پاشان بڵێ: خودایا عەفووم بکە، خوا بەفریشتەکانی بارەگای خۆی دەفەرموێ: ئەو بەندەی منە زانیویەتی کە خوای هەیە بۆیە داوای تەوبەی لێ دەکا؛ جا بەشاهید بن وا من عەفووم کرد.

لە پاش ماوەیێ گوناهێکی تر دەکا، ئەمجارەیش هەم هاوار لە خوا دەکا و دەڵێ: خوایا گوناهم کردووە، عەفووم بفەرموو. دووبارە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەو بەندەی منە زانیویەتی کە خوای هەیە، بۆیە داوای عەفو دەکا، وا عەفووم کرد. لە دوا دوایی ئەو حەدیسەدا دەفەرموێ: (فليعمل ماشاء) واتە: ئەو بەندە کە لەپاش هەر گوناهێ تەوبەیێ دەکا با هەرچی ئارەزووی لێیە بیکا. جا هەندێ زانای پێ نەگەیشتوو وتوویانە: مەعنای

ئەو حەدیسە ئەوەیە لەپاش ئەوە کە ئینسان چەند جار گوناهی کرد و تەوبەی لێ کرد، ئیتر هەرچی ئارەزووی هەیە لە گوناهـ با بیکا! بەڵام ئەم مەعنایە هەڵەیە، چونکە ئەمە دەڕواتە سەر (أباحە) واتە: حەڵاڵکردنی گوناهـ بۆ هەر کەس مەیلی لەسەربێ، ئەمەیش لەگەڵ ڕێ و شوێنی ئایندا ناگونجێ. بەڵام مەعناکەی ئەوەیە: مادام کە هەر گوناهێکی کرد تەوبەی لێ دەکا و، ئەم حاڵە بووەتە خوو و عادەتی، هەر گوناهێ بکا زیانی نابێ چونکە تەوبەی بەشوێندا دێنێ و تەوبەکە تاوانی ئەو کردەوە نالەبارە دەشۆرێتەوە.

دەگێڕنەوە موسڵمانێ بوو گەلێ جار تەوبەی دەکرد و لەپاشاندا تەوبەکەی دەشکاند. لە ئەنجامدا جارێ گوناهێکی کرد ڕووی نەبوو تەوبەی لێ بکا و بێ دەنگ دانیشت. لەو کاتەدا هاتیفێ بانگی لێ کردو وتی: «یا فلان! أطعتنا فشکرناك، ثم ترکتنا فأمهلناك، وأن أتیتنا قبلناك». واتە: فلان کەس! وەختی خۆی بەگوێت کردین، کردەوەی چاکت زۆر بوو، منیش ئەو کردەوە چاکانەتم قبووڵ کرد. پاش ئەوە ماوەییەك وازت لە تاعەت هێنا و دەستت دایە بێ گوێیی کردن، ئێمەش مۆڵەتمان دای و زوو بەزوو ئازارمان نەدای. ئیستەش ئەگەر بێیتەوە وەرت دەگرینەوە؛ دەرگای تەوبە و پەشیمان بوونەوە لەسەر پشتە.

ڕیوایەت کراوە: خوای گەورە جارێ لەگەڵ یەکێ لە بەندەکانی گفتوگۆ دەکا و دەفەرمووێ: ئەی بەندەی من! گوناهەکانت بژمێرە و زۆر چاك بزانە کە من زانای ڕاز و نهێنیم و بەهەموو شتێکی پەنامەکی دەزانم. ئینجا بەندەکە لەبەر خەجاڵەتی و شەرمەزاریی خۆی باسی گوناهە گەورەکانی ناکا و بەژماردنی گوناهە بچووکەکانیەوە خەریك دەبێ. لەوکاتەدا خوای گەورە بەفریشتەی نووسەری کردەوە دەفەرمووێ: ئەم بەندەی منە تەوبەکار بووە و گەلێ جار لەپاش گوناهەکان تەوبەی کردووە، تۆ ئێستا هەر گوناهێکی گەورەی هەیە و شەرم دەکا ناویان ببا بۆی بنووسە بەکردەوەی چاکە. جار جار بەندەی گوناهبار لە ترسی ڕقی خوای گەورە، ناوی گوناهەکانی نابا و، خوای گەورە دەفەرموێ: مادام ئەم بەندەیە لە دنیادا باوەڕی بە من بووە و ئێستا لە ترسی من هەندێ لە گوناهەکانی خۆی دەشارێتەوە بۆی بکە بە کاری باش؛ چونکە وەکو ئەو شەرم لە من دەکا و لێم دەترسێ منیش شەرم دەکەم گوناهەکەی دەربخەم و لەناو کۆمەڵی مەحشەرا ڕیسوای بکەم.

لە حەدیثی شەریفدا هەیە: «کل بني آدم خطاء وخیر الخطائین التوابون» واتە: هەموو بنیادەمێ گوناهـ دەکات و باشترین گوناهبار ئەو کەسەیە کە زۆر تەوبە دەکا و لە گوناهەکانی پەشیمان دەبێتەوە.

هەروەها لە حەدیسێکی ترا دەفەرموێ: «أن الله يبسط يده بالليل ليتوب مسيء النهار ويبسط يده بالنهار ليتوب مسيء الليل، حتى تطلع الشمس من مغربها». واتە: خوای گەورە لە شەوا دەستی بەخشندەیی خۆی دەکاتەوە هەتا تاوانبارەکانی ڕۆژ بێن تەوبە بکەن. لەڕۆژیشدا دەستی بەخشندەییی خۆی دەکاتەوە، هەتا گوناهبارانی شەو بێن تەوبە بکەن. مەبەست ئەوەیە کات لای ئادەمیزاد یا شەوە یا ڕۆژە، گوناهیش لە یەکێ لەم دوو کاتەدا دەکرێ. جا هەر تاوانبارێ هەر کاتێ لە تاوان کردن پەشیمان ببێتەوە خوای گەورە چاوپۆشی لێ دەکات و دەیبەخشێ. خۆ ئەگەر تاوانبار لە شوێنی تایبەتیدا غوسلێکی تەوبە بکا یا دەستنوێژێکی تەوبە بگرێت و دوو ڕکات نوێژی سوننەتی تەوبە بکا، ئەمجار تەوبە بکا و لە کانگای دڵیەوە لە خوای گەورە و میهرەبان بپاڕێتەوە و داوای لێبووردنی لێ بکا، بەتایبەتی ئەگەر ئەم کارە لە سێیەکی دوایی شەوی جومعەدا بێ، ئەوە زۆرتر لە عەفوی خوای گەورەوە نزیکترە. ئەم حەدیسە پیرۆزە ئەوەمان تێ دەگەیێنێ کە پێویستە ئادەمیزاد بەپەلە بگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە و گورج پەشیمان بێتەوە، ئەگەر لەشەودا لێی قەوما و تووشی گوناه بوو بۆ سبەینێ تەوبە بکات و ئەگەر ڕۆژ دووچاری بوو، بۆ شەوەکەی تەوبە بکات. هەروەها ئەوەمان تێ دەگەیێنێ کە خوای گەورە و میهرەبان هەمیشە حازرە بۆ چاوپۆشی لە گوناهی بەندەی خۆی، لە شەو و لە ڕۆژا. حەدیسەکە بەپێشخستنی تاوانباری ڕۆژ ئەوەشمان تێ دەگەیێنێ کە گوناه لە ڕۆژدا زۆر دەکرێ و گوناهی ڕۆژ نابارترە، چونکە خەڵك پێی دەزانن، بەڵام گوناهی شەو بەشی زۆری خەڵك پێی نازانن. لەم ڕووەوە گوناهی شەو باری سووکترە لە هی ڕۆژ. هۆشیارەکان فەرموویانە: حوقووقی خوا لەسەر بەندەکانی زۆرن و ناژمێردرێن وەکو نیعمەتەکانی زۆرن و ناژمێررێن. دیارە حوقووقی خوا بەکەس نادرێتەوە هەر وەکو کەس ناتوانێ سوپاسی هەموو نیعمەتەکانی خوا بکا و، بەهۆی ئەمەوە ئینسان هەمیشە لە کەموکووڕیدایە. جا ئەگەر تاوانبار کە شەو داهات تەوبە لە گوناهی ڕۆژ بکا و کە ڕۆژ بوویەوە تەوبە لە گوناهی شەو بکا زۆر نزیکە خوای گەورە چاوپۆشی لێ بکا و وەهای دابنێ کە حەقەکانی خوای جێبەجێ کردوون و سوپاسی هەموو نیعمەتەکانی کردووە. لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ «أن الله يحب الشاب الذي يفني شبابه». لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێ: «أن الله يحب الشاب التائب». واتە: خوای گەورە ئەو جوانەی خۆش دەوێ کە جوانیی خۆی لە پێناوی ئەودا دەفەوتێنێ. بێ گومان خوای گەورە ئەو جوانەی خۆش دەوێ کە تەوبە دەکا و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە. هۆی ئەم خۆشویستنەیش

ئەوەیە کە ئەسبابی تاوان لە جواندا زۆرن وەك تیژیی ڕەوشت و ئارەزووی نەفس و هێزی لەش و زۆریی حیرص و زاڵبوونی ئارەزووی نەفس و بێ هێزیی عەقڵ و کەمیی زانست و درێژیی هیوا. جا مادام ئینسانی گەنج پێ بەسەر ئەم هەموو شتانەدا بنێ کە هۆ و هاندەرن بۆ گوناه و، ڕوو بکاتە خوا و لە گوناه پەشیمان بێتەوە، ئەوە حەقە کە خوای گەورە خۆشی بوێ. هەر لەم بابەتەوە هەندێ لە زانایان وتوویانە: جوانی وەکو ئەسپی سواری وەهایە بۆ سواربوونی نەزانی و، جێ گومانی گوناهکردن و تاوانی نابارە. یاخۆ وتوویانە: «سکر الشباب أشد من السكر الشراب» واتە: سەرخۆشییێ کە لە جوانییەوە پەیدا دەبێ بەهێزترە لەو سەرخۆشییەی کە لە خواردنەوەی شەرابەوە پەیدا دەبێ؛ چونکە شەرابەکە لە هەموو کاتێکدا بۆ ئینسان دەس نادا، بەڵام گەنجی و هێزی ئارەزوویازی لە گەنجدا هەمووکات هەیە. جا لەگەڵ ئەم هەمووە هۆی تاوانەدا ئەگەر گەنجێ لەبەر خۆش ویستن و دڵسۆزی بۆ خوای خۆی لە گوناه پەشیمان بێتەوە و، خواستی بێتە سەر ئەوە داوای ڕەزامەندیی لێ بکا؛ بێگومان خوای میهرەبان خۆشی دەوێ و زۆر نزیکە نزای قبووڵ بکا و لە تاوانەکانی خۆش ببێ. هەروەها ئەگەر کەسێ بیەوێ ڕێنومایی ئادەمیزاد بکا با ئومێدی بەئینسانی گەنج زۆرتر بێ؛ چونکە گەنجەکان لەسەر دڵپاکیيان زۆرتر حەز بەئامۆژگاریی باش دەکەن و زووتر وەری دەگرن. بەڵام ئینسانی پیر، وشك بووەتەوە و کەمتر قابیلییەتی ئەوەی هەیە ئامۆژگاری بکرێ و ئەغلەب بێ گوێیی دڵسۆزان و ئەو پیاوچاکانە دەکا کە خەڵك بۆ خواپەرستی بانگ دەکەن. هەر لەبەر ئەمەیە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أوصيكم بالشبان خيراً فأنهم أرق أفئدة». بعثني الله بشيراً ونذيراً فحالفني الشبان وخالفني الشيوخ». ثم تلا: فطال عليهم الأمد فقست قلوبهم». واتە: من ئامۆژگاریتان دەکەم کە لەگەڵ گەنجەکانا باش بن؛ ئەوان دڵیان نەرمترە. خوای گەورە منی ڕەوانەکرد بەموژدەدەر و ترسێنەر، جوانەکان پەیمانیان لەگەڵ بەستم بەڵام پیرەکان دژم وەستان و ناجۆر بوون لەگەڵما. جا ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: «فطال.... الآية» واتە: زۆریان خایاند و ماوەیێکی دێژ ڕایان بوارد و دڵیان ڕەق و بێ باوەڕ بوو. ئەوانە زۆربەیان فاسق و لەڕێ لادەرن چونکە ڕوویان نەکردە حەقیقەت و گیانی ئیسلام.

لە حەدیسی شەریفا هەیە: «إذا أحب الله عبداً لايضره ذنب» واتە: کاتێ خوای گەورە بەندەییەکی خۆش بوێ گوناه زیانی پێ ناگەیێنێ. مەبەست ئەوەیە کە خوا بەندەی خۆش ویست ئیتر گوناه ناکات و لێی دوور دەکەوێتەوە. یاخۆ هەر گوناهێکی کرد

ئەوەندە شەرمەزار دەبێ کە هەمیشە تەماشای گوناهەکانی دەکات و بیری لێ دەکاتەوە و لەبەرچاوی ون نابێ؛ بۆیە بەگەرم لە خوای گەورە دەپارێتەوە کە لێی خۆش ببێ و چاوپۆشی لێ بفەرموێ، بەڵکو موستەحەقی بەهەشت بێت. بەڵێ لەسەر ئەم بەیانەیە زاناکان فەرموویانە: گوناهێ کە ببێتە هۆی زەلیلی و دڵشکاوی چاکترە لە تاعەت و عیبادەتێ کە ببێتە هۆی شانازی و خۆ بەگەورە زانین. بەم جۆرە دەرکەوت کە هەرکەسێ خوا لێی ڕازی بێ، گوناهـ زیانی پێ ناگەیێنێ.

لە حەدیسێکدا حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أن العبد ليذنب، الذنب فيدخله الجنة. قيل: كيف يارسول الله؟. قال: لايزال نصب عينيه تائباً عنه». واتە: وادەبێ یەکێ لە بەندەکانی خوا گوناهـ دەکا و ئەو گوناهە دەیخاتە بەهەشت. عەرزیان کرد: چۆن گوناهـ ئینسان دەخاتە بەهەشت؟ فەرمووی: لەبەرئەوە هەمیشە ئەو گوناهە دەخاتە پێش چاوی و تەوبەی لێ دەکا، لە خوای گەورە دەپارێتەوە و داوای چاوپۆشیی لێ دەکا. ئەویش لێی دەبوورێ و عەفووی دەکا.

ڕیوایەت کراوە: کە ئینسان گوناهێکی کرد، خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ. جا ئەگەر تەوبەی کرد لە گوناهەکە ئەوا دڵی سپی دەبێتەوە و بەهۆی ئەوە مەیلی دەچێتە سەر تاعەت و خواپەرستی. خۆ ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەسەر گوناهەکە و تەوبەی نەکرد ئەو وەختە خاڵێکی تری ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ و هەروا دەڕوا هەتا هەموو ڕووی دڵی ڕەش دەبێتەوەو ڕووناکیی. ئەم چڵکە ڕەشە لەسەر دڵی ئینسان پێی دەڵێن (ڕەین) وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: «كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ». دیارە ئەم حاڵە حاڵێکی خەتەرناکە بۆ دڵی موسڵمان و دەبێتە هۆی مەیل پەیداکردنی بەشیددەت لەسەر گوناهـ. هەروەها دەبێتە مانیع لە بیستنی ئامۆژگاریی موسڵمانان و دەبێتە هۆی ئەوە کە خێر و نوور و پیرۆزی ڕوونەکاتە ناو دڵی. ئاشکرایە ئەم حاڵە کوێریی دڵە، پەنابەخوا، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: «فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ». لە حەدیسی شەریفدا هەیە: «أن أبعد الناس من الله القلب القاسي». واتە: دوورترین ئادەمیزاد لەخوا دڵێکە کە ڕەش بێ و دووربێ لە ڕەحمەت و میهرەبانی. هەروەها لە حەدیسایە کە تەوبە و لە گوناه پەشیمان بوونەوە زاخاوی دڵ دەداتەوە و لە ژەنگ پاکی دەکاتەوە. لە حەدیسی شەریفدایە: وا ڕێك دەکەوێ بەندەیێ گوناهێ دەکا و لەپاشان کە بیردەکاتەوە لە گوناهەکەی دڵ بریندار و غەمبار دەبێ.

خوای گەورە تەماشای حاڵی ئەو بەندەیە دەکا کە چۆن لەبەر ئەو گوناهـ و کردەوە نابارەی خۆی عاجز و غەمگینە. جا لەبەر ئەم حاڵە پێش ئەوەی ئەو بەندەیە کردەوەیەکی چاك بکا کە ببێتە کەفارەتی گوناهەکەی، هەروەها لەپێش ئەوەی کە تەوبە بکا لەو گوناهە خوای گەورە عەفووی دەکا و بەمیهرەبانی تەماشای ئەو بەندەیە دەکا. دیارە ئەم عەفووە تەنیا بەهۆی بەرەکەت و پیرۆزیی ئەو غەمباری و خەفەتەوەیە کە لەبەر گوناهەکە هاتووە بەسەریدا. لە حەدیسدایە: «التوبة الندم» واتە: تەوبە پەشیمان بوونەوەیە لە گوناهـ. ئەم پەشیمان بوونەوەیش دەبێتە هۆی نەگەڕانەوە بۆ سەر ئەو گوناهە؛ جا لەبەر ئەمە تەوبە وەها تەعریف کراوە کە پەشیمان بوونەوەیە لە گوناهـ. وا لەم قسانەوە بۆمان دەرکەوت کە غەم و پەژارە لەسەر لەدەست دەرچوون و کردنی گوناهـ دەبێتە تاعەت و پاداشی خێر، هەروەك لەبیرچوونەوەی گوناهـ دەبێتە هۆی شەرمەزاریی ڕۆژی قیامەت و، بێ باکیی لە گوناهـ و لەخۆبایی بوون و لە خوا غافڵبوون هۆی بەفەتەراتدا چوونە لەو ڕۆژە سەختەدا.

شێخی ئەنتاکی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: تەرکی یەك گوناهی گەورە لە سەدهەزار حەجی سوننەت خێری زۆرترە و، تەرکی گوناهی بچووك لە ئازادکردنی عەبد خێری زیاترە و، پایەی ئەو کەسە کە تەرکی هەموو گوناهەکان دەکات لە پایەی ئەو کەسە باشترە کە شەو شەونوێژ دەکا و ڕۆژ بەڕۆژووە. یەحیای کوڕی مەعاز، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، بەوانەی گوناهـ دەکەن و لێی پەشیمان نابنەوە و تەوبە ناکەن دەفەرمووێ: ئەگەر باوەڕت نییە ئەوە مونافقی. خۆ ئەگەر باوەڕت هەیە بەڵام هەر بەچاوقایمی لەسەر گوناهـ دەوام دەکەی، ئەوە بزانە وای لە زیاندا و لە دیندا زەرەرت کردووە، نەك لە دنیا و، ئەوەی دینی لەکیس بچێ وەك ئەوە نییە دنیا بدۆڕێنێ.

لە خالیدی کوڕی میعدانەوە (ر.خ) ڕیوایەت کراوە: کاتێ کە تەوبەکارەکان دەچنە ناو بەهەشت دەڵێن: سەیرە؛ خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا هەڕەشەی کردووە و فەرموویەتی: کەس نییە لە ئێوە کە نەڕواتە ناو دۆزەخەوە، وا ئێمە هاتین و بەهیچ جۆر دۆزەخمان نەدی و یەکسەر بۆ بەهەشت. لەوێدا کەسێ لەلایەن خوای گەورەوە وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێ: لەو کاتەدا ڕابووردن بەسەر سیراتدا کە کاتی ئەوە بوو ئاگری دۆزەخ ببینن ئێمە ئاگر و گڵپەی دۆزەخمان کوژاندەوە تا چاوتان بەو جێگە نالەبارە نەکەوێ و دڵتان تێك نەچێ. ئەگینا ئێوە بەڕاستی بەسەر دۆزەخدا ڕابووردن. هەروەها

حەزرەتی لوقمان (د.خ) ئامۆژگاریی ئەولادەکانی دەکرد و دەیفەرموو: ڕۆڵەکانم! پەلە بکەن لە تەوبەو پەشیمان بوونەوەدا، تەوبە دوامەخەن؛ چونکە مردن لە پارێزدایە و خۆی مەڵاس داوە و کەس نازانێ کەی دێ و مەترسیی ئەوە دەکرێ لە کتوپڕدا بێ و ئینسان ماوەی نەمێنێ و بەتەواوی تەنگاو بکرێ. بێگومان شەیتان زۆر هەوڵ دەدا کە ئینسان تەوبە دوابخا، بەڵکو بمرێ و لە پیرۆزیی تەوبەکاری نائومێد ببێ.

ئوبەیی کوڕی کەعب دەڵێ: ئەو کەسەی حەز لە تەوبە نەکا ئەوە شەرم لە خوا ناکا؛ چونکە ئەگەر شەرمی بکردایە خۆی بەحاڵی بێ تەوبەیی و بێ ئیخلاصییەوە نەدەهێشتەوە. ڕیوایەت کراوە: بەزمان داوای عەفوو و لێخۆشبوون کردن و بەکردەوە لەسەر گوناهـ بەردەوام بوون گاڵتەکردنە بەئاین و وەکو ئەوە وایە کەسێ بەزمان بڵێ: «أستغفر الله وأتوب إليه» کەچی لە گوناه تەوبە نەکا. بەڵێ ئەگەر بڵێ: «أللهم أغفر لي» ئەوە درۆ نییە؛ چونکە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە پاڕانەوەیە و کەس ناڵێ ئەو قسەیە درۆیە.

مالیکی کوڕی دینار (د.خ) دەفەرمووێ: لە خۆمەوە ڕۆیشتم بۆ لای دراوسێیەکم لە کاتی ناساغییدا و وتم پێی: واجیبە لەگەڵ خوا پەیمان ببەستێ و لە هەموو گوناهەکان تەوبە بکەی؛ بەڵکو (إن شاء الله) لەم ناساغییە شیفا بدا. ئەویش وتی: حازرم لەگەڵ خوای گەورە پەیمان ببەستم لەسەر ئەوەی باست کرد بۆم. لەوێدا هاتیفێ بانگی کرد: چەندجار پەیمانت کرد و بەڵێنت دا و ئەنجام بەدرۆزن دەرچووی؟!. ئیمامی موجاهید، کە لە تابیعینە، دەفەرمووێ: هەرکەس هەموو سبەینێیەك و هەموو ئێوارانێ تەوبە نەکات ئەوە ستەم لە نەفسی خۆی دەکا. هەروەها ئیمامی عەلی (کرم الله وجهه) فەرموویەتی: هەڵبژێرراوی ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ) کەسێکە: ئەگەر بەقەزا و قەدەر گوناهێکی کرد، گورج تەوبەی لێ بکا و ئەگەر سبەینێ گوناهێکی تری کرد دیسان لەویش تەوبە بکا. بەکورتی دەمی لە تەوبە خاڵی نەبێ؛ چونکە خوا فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ». یەکێ لە هۆشیارە زاناکان فەرموویەتی: ئەگەر ئینسان بڕوات مەجلیس بە مەجلیس داوای گەردن ئازادی لە خەڵك بکات لەوە باشترە کە ئینسانێکی خاوەن قابیلییەت بڕوا مەجلیس بە مەجلیس داوای پارە و ماڵی دنیا لە خەڵك بکا.

ئەبوو ئەییووب، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: نیشانەی ڕاستی ئینسانی

دامەزراو دوو شتە، یەکەم ئەوەیە کە زۆربەی کاتی غەمبار بێ و کەمتر خۆشی و شادیی هەبێ. دووەم ئەوەیە دڵی لە خۆشی و ڕابواردنی دنیا سارد بێ. هەروەها ئیمام فەرموویەتی: عومر لای ئینسانی بەختیار نرخی هەیە؛ چونکە هەمیشە دەیەوێ ئەوەی لە کیسی چووە لە خواپەرستی زیندووی بکاتەوە بە گێڕانەوە و بەقەزاکردنەوەی و، ئەوەی ماویەتی لە تەمەنی لە گوێڕایەڵی و خواپەرستیدا سەرفی بکا. ئینسانێ وەها نەبێ ژیانی مردنە و بوونی نەبوونە. لە حەدیسی شەریفدا هەیە کە تەمەنی درێژ و گەڕانەوە بۆ لای خوا بەختیاریی ئینسانە. هەروەها لە حەدیسی تردا هەیە: خۆتان لە گوناهە بچووکەکان بپارێزن؛ چونکە ئەم گوناهانە کە کۆبوونەوە دەبنە گوناهێکی گەورەی وەها کە خاوەنەکەی دەفەوتێنی. وەکو کۆمەڵێ کاروانی کاتێ لە دەشتێکا باریان خست هەریەك لەوان کەمێ دار و چیلکە دەهێنێ و ئەوەندە دار کۆدەبێتەوە کە ئاگریان پێوەنا دەبێتە ئاگرێکی قەبەی وەها کە ئینسان ناوێرێ نزیکی بێتەوە. لە حەدیسێکی ترا دەفەرموێ: ئادەمیزاد نافەوتێن هەتا ئەوەندە گوناهـ نەکەن کە لەبەر زۆریی گوناهـ ماوەی عوزریان نەمێنێ و شایانی سزای خوا بن. لە حەدیسێکی ترا دەفەرموێ: تەوبە دواخستنی ئادەمیزاد لە شەیتانەوەیە؛ واتە: شەیتان دێ ئینسان دەخاتە سەر ڕێگای خراپەکاری و گوناهەکەی پێ دەکاو کاتێ گوناهبارەکە ویستی لەو گوناهە پەشیمان بێتەوە و تەوبە بکا جارێکی تر شەیتان دێتە ڕێگای و بەخەیاڵات تەوبەکەی پێ دوادەخا و شایانی سزای خوای گەورە دەبێ.

ڕیوایەت کراوە: کە شەیتان هاتووەتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی کردووە کە من بە گوناهـ و تاوان پشتی بنیادەمم شکاندووە و ئەوانیش بەتەوبەکردن و لە خوا پاڕانەوە پشتی منیان شکاندووە. لە ئەنجاما جارێکی تر ڕۆیشتمەوە بۆ سەریان و بەهۆی لەخۆبایی بوون و بەخورازی بوون بەسەریاندا زاڵ بووم، واتە: وەها خەیاڵاتم خستە دڵیانەوە کە ئێوە ئینسانی باشن و خاون عیبادەتن هەتا لە خۆیان بایی بوون و لە کار و کردەوەی خۆیان ڕازی بوون؛ ئیتر ئەوان نەیانتوانی پشتم بشکێننەوە.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: هەرکەس تەوبە بکات و لە گوناهـ پەشیمان بێتەوە پێش ئەوەی خۆر لە خۆرنشینەوە هەڵبێ، کە نیشانەی ئاخرزەمانە، خوای گەورە تەوبەی لێ قبووڵ دەکا.

لە حەدیسێکی ترا دەفەرموێ زۆر کارێکی جوان و شایستەیە کە ئینسان لەکاتی

بەتەنیا دانیشتنی خۆیدا بیر لە گوناهەکانی خۆی بکاتەوە و داوای لێبووردن لەو گوناهە لە خوای گەورە بکا؛ بێگومان ئەگەر ئینسان لە کاتی تایبەتیدا تەوبە بکا، خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی عەفووی دەکات.

ئەی برادەرینە! حەزرەت (د.خ) ڕێگەی بەئەدەبی پیشانی ئوممەتی خۆی داوە، بۆ داواکردنی عەفوو لە گوناهەکان لە خوای گەورە: یەکەم تەوبە کە لە شوێنێکی خەڵوەت و تەنیاییدا بێ؛ چونکە لە خەڵوەتدا دڵ نەرمی و لە خواترسی و هەیبەت ڕوو دەکاتە ئینسان. دووەم: دووربکەوێتەوە لەو ڕێ و شوێنە کە گوناهەکەی تێدا کردووە. سێیەم دان بنێ بەو گوناهەدا کە کردوویەتی و داوای چاوپۆشی لە خوای گەورە بکا. بەم شێوە ئینسان لە عەفوی خواوە نزیك دەبێتەوە. خوای گەورە حەز دەکا بەوە کە بەندە دان بە گوناهەکەیا بنێ و ئینجا داوای لێبووردن بکا. بەم جۆرە زۆر نزیکە خوا بیبەخشێ.

لە حەدیسێکی ترا دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ ستەمێکی لە خەڵك کردبێ و حەقی خەڵکی لەسەربێ خوا، حەزدەکا لەوە کە بڕواتە لایان و گەردەنی خۆی ئازاد بکا پێیان و عوزرخوازییان لێ بکا؛ چونکە کاتێ کە خوا ستەمکاری گرت بەری ناداو، لە ڕۆژی قیامەتدا درەم و دینار نییە. بەڵێ لەو ڕۆژەدا ئەگەر ستەمکار خێرات و کردەوەی چاکەی ببێ ئەوا بەقەدەر ئەو حەقەی بەسەریەوەیە لێی دەدرێتە خاوەن حەقەکە. خۆ ئەگەر خێراتی نەبوو ئەوا بەقەدەر حەقەکە لە گوناهی خاوەن حەق دەدەن بەسەر ئەم ستەمکارەدا و لەباتی ئەو سزا دەدرێ. بەڵام ئەگەر لە دنیادا ستەمکار گەردنی خۆی بەوان ئازاد بکا، ئەوا لەم هەموو دەردەسەر و ئازارانە ڕزگار دەبێ. جا بڕوانن مادام کابرای ستەمکار خۆی گوناهی زۆربێ و لە گوناهی ستەم لێکراوانیشی بەسەردا بدرێ و بەقەدەر هەردوو بەشە تاوانەکان سزا بدرێ، دەبێ ئەم ستەمکارە چارەڕەشە کەی لە سزای دۆزەخ ڕزگار ببێ؟. دەبێ ئەوەش بزانن بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) غەیبەت و بوختان و جنێودان و گاڵتە بەخەڵك کردن و بەسووك تەماشاکردنیان، هەموو بە (حق الناس) حسێب دەکرێن و پێویستن بەعەفووی خاوەن حەقەکان ئەگینا عەفوو ڕوویان تێ ناکا.

لە حەدیسی شەریفا هەیە کە خوای گەورە فریشتەی لای ڕاستی کردووەتە گەورە بەسەر فریشتەی لای چەپدا و کاتێ کە فریشتەی لای ڕاست، ئاگای لە کردەوەییەکی چاکەی بەندەی خوا بێ یەك بەحەوسەد یا زیاتر بۆی دەنووسێ. هەروەها ئەگەر نییەتی

کردەوەییەکی چاکە لە دڵی بەندەکەدا بوو بەقەدەر کردەوە چاکەکەی بۆ دەنووسێ. بەڵام کە کردەوەییەکی ناڕەوای کرد ئەم فریشتەی لای ڕاستە نایێڵێ فریشتەی لای چەپ گورج ئەو کردەوەیە لەسەر بەندەکە بنووسێ هەتا ماوەی شەش سەعات؛ بەشکو ئەمە خوایە ئەو بەندەیە پەشیمان بێتەوە و تەوبە بکا یا داوای لێبووردن لە خوای گەورە بکا، جا ئەگەر ئەمانە نەبوون ئەو حەلە هەر بەتاقە خراپەیێ لەسەری بنووسێ.

لە حەدیسی شەریفدایە: گەلێ مۆر بەعەرشی خوای گەورەدا هەڵواسراون، کاتێ کە هەتکی حورمەتی گوناهەکان کرا، واتە: خەڵکی بەبێ شەرم دەستیان دایە تاوان و گوناهـ و جەسارەت کرایە سەر ئەو سنوورانەی خوا دای ناون، فریشتە ئەمر پێکراوەکان دێن بەو مۆرانە دڵی خاوەن گوناهەکان مۆر دەکەن، بەجۆرێ ئیتر هەستی تیا نامێنێ، فەرقی چاکە و خراپە ناکا و دەکەوێتە شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆی و وای لێ دێ کە بەسووکی گوناهکردن دەکا و خواپەرستی لا ناشیرین دەبێ یا سست و کەمتەرخەم دەبێ دەربارەی. من خاوەنی ئەم سێ حاڵەم لە ناو خەڵکا چاو پێ کەوتووە.

لە حەدیسدایە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەریەك لە ئێوە پێویستە ترس و بیمی لە کەمترین گوناهـ ببێ، واتە: نابێ ئینسانی موسڵمان لە گوناهـ بێ موبالات بێ و پێویستە تەنانەت ئەگەر گوناهـ بچووکیش بێ خۆی لێ لادا و نزیکی نەکەوێتەوە. هەروەها لە حەدیسایە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەروەکو ڕقی خوا لە پاڵ گوناهی گەورەدا خۆی دەشارێتەوە لە پاڵ گوناهی بچووکیشدا خۆی دەشارێتەوە، واتە: ئینسان نازانێ لەسەر کام گوناهـ ڕق و تووڕەیی خوای گەورەی تووش دەبێ؟ واتە: وا ڕێك دەکەوێ کە ئینسان چەند گوناهیی گەورە دەکا و دووچاری ڕقی خوای نابێ چونکە نەگەیشتووەتە ئەو گوناهەی کە ڕقەکەی خوای گەورە لەپاڵیدا پەنهان بووە. کەچی وا ڕێك دەکەوێ چەند گوناهێکی بچووك دەکا لە پاڵ یەکێکیان تووشی ڕقی خوای گەورە دەبێ، پەنا بەخوا.

لە حەدیسی شەریفدایە: کە ڕەحمەتی خوا لەگەڵ تاعەتی بچووکیشدا دەبارێتە سەر بەندە وەکو لەگەڵ تاعەتی گەورەدا دەبارێ. من چەند ساڵ بوو مەعنای ئەم حەدیسەم لا موشکیل بوو هەتا بەهۆی خەوێکی دایکمەوە ئیشکالەکەم نەما، گوێ بگرن با ڕووداوەکەتان بۆ بگێڕمەوە: خوا لێخۆشبوو مەلا مەحموودی غەزایی مودەڕڕیس و دەوڵەمەند بوو لە ماڵی خۆی نانی سی چل فەقێی دەدا و، هەر لە بەیانییەوە هەتا عەسر خەریکی دەرس وتنەوە و خواپەرستی بوو، پیاوێکی بەدەهەنە و چاکەکار بوو. ئەم زاتە،

ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کۆچی دوایی کرد. دایکم فەرمووی: مەلا مەحموودم لە خەودا دی لێم پرسی: حاڵت چۆنە؟ وتی: خوای گەورە بەخشیمی. وتم: بەهۆی چ چاکەیێ؟ وتی: لە (قەڵاچوالان) فەقێ بووم، جارێ بە کۆڵانێکدا ڕابووردم ئافرەتێکم لەگەڵ منداڵێکی هەتیوا بەرچاو کەوت، منیش لەوێدا دەستم برد یەك (جلق)م پێدا (جلق نرخی وەك چوار فلسییە) لەبەرئەوە خوا عەفووی کردم. بەڵێ بەهۆی ئەم خەوەی دایکمەوە موشکیلەم نەما و لە مەعنای فەرموودەکەی پێغەمبەر گەیشتم (د.خ).

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: «کفی بالمرء نصراً أن ينظر إلي عدوه في معاصي الله» واتە: ئەوەندە بەسە بۆ سەرکەوتنی ئینسان و زاڵبوونی بەسەر دوژمنیدا کە ببینێ دووچاری گوناهـ بووە. واتە: گیرۆدەبوون بە گوناهەوە لە گیرۆدەبوون بە هەموو بەڵاییەکی تر ناهەموارترە و، کە ئینسان دووچاری گوناهـ ببێ وەك ئەوەتە دووچاری بەڵاییەکی دنیایی گەورە بووبێ. لە ڕاستیدا مسیبەتی دینی و بە گوناهەوە گیرۆدە بوون لە بەڵای دنیایی زۆر خراپترە. کەواتە گیرۆدەبوونی دوژمنی ئینسانی موسڵمان بەگوناهەوە چاکترین سەرکەوتنە بۆ ئینسانە موسڵمانەکە. هەروەها لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: قەسەم بەو خوایە کە گیانی منی لە دەستی توانا و دەستەڵاتی ئەوایە ئەگەر ئێوە گوناهـ نەکەن خوای گەورە ئێوە دەفەوتێنێ و گەلێکی تر دروست دەکا بۆئەوەی گوناهـ بکەن و تەوبە بکەن و بەهۆی تەوبەکەیانەوە لێیان خۆش بێ.

لە حەدیسدا هەیە: لەگەڵ تەوبە و داوای لێخۆشبووندا گوناهی گەورە نییە و لەگەڵ دەوام و ئیسرارا گوناهی بچووك نییە. واتە: گوناهی ئینسان هەرچەند گەورە بێ، مادام خاوەنەکەی دەستی کرد بە تەوبەکردن و لە خوا پاڕانەوە ئەو گوناهە لەناو دەچێت و خوای گەورە چاوپۆشیی لێ دەکا. لە لاییەکی تریشەوە گوناهـ هەرچەند بچووك بێ، مادام ئینسان بەسووکی تەماشای دەکرد و سەرومڕ دەیکرد، ئەوە خوای گەورە لە خاوەنەکەی تووڕە دەبێ و دەیکاتە گوناهی گەورە بەسەریەوە.

لە حەدیثی شەریفایە: ئەو کەسەی دەیەوێ لەو خواپەرستانە پێش بکەوێ کە خۆیان بۆ عیبادەت کردن ئازارداوە با گوناه نەکات، واتە ئینسانێ گوناهی کرد و تەوبەی لێ کرد یاخۆ هەر لە ئەساسا گوناه نەکات ئەوە پایەی لەپێشی پایەی ئەو خواپەرستانەیە کە لە خواپەرستیدا زۆر ماندوو بوون. بەکورتی پاداشی لە گوناه دوورکەوتنەوە زۆرترە لە پاداشی تاعەتی زۆر.

لە حەدیسی شەریفا هەیە: هەر واتەیێ بەزمانی ئینساندا بیێ لەسەری دەنووسرێ. جا کاتێ ئینسان گوناهێکی کرد واجیبە تەوبەی لێ بکا بەمجۆرە کە بڕوات بۆ شوێنێکی دوور لە خەڵك و دەست بەرز بکاتەوە بۆ لای خوا و بڵێ: خوایە! تەوبە بێ لەو گوناهە کە کردوومە و من هەرگیز ناگەڕێمەوە سەری، کە وای وت خوای گەورە لێی خۆش دەبێ و عەفووی دەکا.

ڕیوایەت کراوە: «من أصاب في الدنيا ذنباً فعوقب به الله أعدل من أن يثني عليه عقوبته. ومن أصاب في الدنيا ذنباً فستره الله وعفا عنه فالله أكرم من أن يعود في شيء قد عفا عنه.. الحديث». واتە: هەرکەس لە دنیادا تووشی تاوانێ بوو و تۆڵەی ئەو تاوانەی لێ کرایەوە، ئەوە ئیتر خوا لە قیامەتا تۆڵەی لێ ناسێنێتەوە؛ چونکە دادپەروەریی خوا دوورە لەوەی کە دووجار لەسەر یەك گوناه سزای بەندەی خۆی بدا. هەرکەس لە دنیادا گوناهێکی کرد و خوای گەورە بۆی پۆشی و لێی خۆش بوو ئەوە ئیتر لە قیامەتیشدا عەفووە؛ چونکە خوا لەوە بەخشندەترە کە لە دنیادا چاوپۆشی لە گوناهێ بکات و لە قیامەتدا بگەڕێتەوە سەری و سزای بەندەکەی لەسەر بدا.

لە حەدیسێکدا حەزرەت (د.خ) بە یەکێ لە هاوڕییەکانی فەرمووە کە ناوی حەبیب بووە: ئەی حەبیب! هەرجارێ گوناهێکت کرد تەوبەییەکی لێ بکە. ئەویش عەرزی کرد: کەوابێ گوناهەکانم زۆر دەبن. فەرمووی: هەرچەند گوناهەکانت زۆر بن عەفووی خوا لەوان زۆرترە. لە حەدیسێکی تردا حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: خوای گەورە هەموو ڕۆژێ نەسیحەتێ نیشانی بەندەی خۆی دەدا. جا ئەگەر ئەو بەندە ئەو نەسیحەتەی وەرگرت ئەوا بەختیارە و، ئەگەر تەرکی کرد و بەگوێی نەکرد ئەوا بەدبەختە. خوای گەورە بەشەودا دەستی کەرەم و عەفووی درێژ دەکا بۆ ئەو کەسانە کە بەڕۆژدا گوناهیان کردووە هەتا تەوبە بکەن و خوا تەوبەکەیان قبووڵ بکا، هەروەها دەستی کەرەم و عەفووی بەڕۆژدا درێژ دەکا بۆ ئەوانەی کە بەشەودا گوناهیان کردووە هەتا تەوبە بکەن و خوا تەوبەکەیان قبووڵ بکا. بزانن کاری حەق و ڕاست لە دنیادا قورسە و لە تەرازووی قیامەتیشدا قورسە، بەڵام کردەوەی بەتاڵ لە دنیادا سووکە و لە قیامەتیشدا هەر سووکە. زۆر باش بزانن بەهەشت بەسزا و ناڕەحەتی و ئازار دەورەدراوە؛ واتە: ئەو کەسەی بیەوێ بڕواتە بەهەشت دەبێ بەسەر کاری ناڕەحەت و پڕ لە ئازاردا بڕوا و خۆی لەبەر باری ناخۆشیدا بگرێ و ڕۆح و ماڵی خۆی بەخت بکا، هەتا دەگاتە بەهەشت. هەروەکو دۆزەخ بە ئارەزووەکانی

نەفس دەورە دراوە؛ واتە: ئەو کەسەی کە دەخرێتە دۆزەخەوە لە ڕێگای ئارەزووی بەتاڵی نەفسەوە دەڕوا هەتا دەگاتە دۆزەخ.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: «الفقراء أصدقاء الله والمرضى أحباء الله. فمن مات على التوبة دخل الجنة». واتە: هەژار و بێ ماڵە قانیعە موسڵمانەکان دۆست و ئاشنای خوان و نەخۆشە خۆگرەکان خوا خۆشی دەوێن. ئەمانە لەسەر ئەو دۆستی و ئاشناییە و لەبەر ئەو خۆشەویستییانە لای خوا هەموویان یا گوناه ناکەن یا ئەگەر گوناه بکەن خوا تەوفیقیان دەدا بۆ تەوبەکردن لە تاوان و، گوناهیان عەفو دەکرێ. بەڵام خەڵکی تر، غەیری فەقیر و هەژار و نەخۆش، ئەگەر لە گوناهەکانیان تەوبە بکەن ئەوە خوا عەفوویان دەکا و ئەگەر تەوبە نەکەن خوا چاوپۆشییان لێ ناکا. جا لێرەدا میهرەبانی خوای گەورە دەردەکەوێ کە ئینسان هەرچەند گوناه بکا و تاوانبار بێ مادام لەپێش غەرغەرەی گیان دەرچووندا تەوبە بکا خوای میهرەبان عەفووی دەکا. هەروەها لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی هەر بەندەیێ لەپێش مردنیدا بەساڵێ تەوبە بکا خوای گەورە تەوبەکەی لێ قبووڵ دەکا و ساڵێ زۆرە. هەر بەندەیێ لەپێش مردنیدا بەمانگێ تەوبە بکا، خوای گەورە تەوبەکەی لێ قبووڵ دەکا و مانگێ زۆرە. هەر بەندەیی لەپێش مردنیدا بەحەفتەیێ تەوبە بکا خوای گەورە تەوبەکەی لێ قبووڵ دەکا و حەفتەیێ زۆرە. هەر بەندەیێ لەپێش مردنیدا بەڕۆژێ تەوبە بکا خوای گەورە تەوبەکەی لێ قبووڵ دەکا و ڕۆژێ زۆرە. هەر بەندەیێ لەپێش مردنیدا لەپێش حاڵی غەرغەرەدا تەوبە بکا، خوای گەورە تەوبەی لێ قبووڵ دەکا. براکان! تەماشای ڕەحمەتی خودا بکەن چەندێ زۆرە و چۆن تەوبە لە تەوبەکار قبووڵ دەکا چ بە ساڵ یا بە مانگ یا بە حەفتە یا بەڕۆژی ئەو تەوبەیە بکەوێتە پێش مردنیەوە بەڵکو ئەگەر لەپێش حاڵی غەرغەرەیشا بێ هەر قبووڵی دەکا. ڕیوایەت کراوە: کاتێ ئیبلیس تەماشای ئادەمی کردووە بۆی دەرکەوت کە دڵی هەیە سوێندی خواردو وتی: خوایە! بەعیزەت و جەلالی تۆ قەسەم دەڕۆمە ناو دڵی ئینسان و هەتا گیانی تێدا بمێنی لێی دەرناچم. خوای گەورە لە ڕەددی ئەوا فەرموویەتی: بەعیزەت و جەلالی خۆم قەسەم منیش هەتا گیانی تیدابێ تەوبەی لێ قبووڵ دەکەم. هەروەها ڕیوایەت کراوە: کە ئیبلیس عەرزی بارەگای خوای کردو وتی: یارەبی! تەماشا دەکەی ئەم بەندانە چەند تۆیان خۆش دەوێ کەچی بێ گوێیت دەکەن؟ تەماشا ناکەی چەند ڕقیان لە منە کەچی لە گوناهکردنا بەگوێم دەکەن؟ خوای گەورەش فەرمووی: ئەی فریشتەکانی من! بەشاهید بن مادام ئەو بەندانەم مەحەببەتی منیان لەدڵدایە وا

هەرچەند بێ گوێیم دەکەن عەفووم کردن و چاوپۆشی لەوە دەکەم کە بەگوێی شەیتان دەکەن؛ چونکە لە دڵەوە زۆر ڕقیان لێیەتی.

براکان! لە حەدیسدا هەیە کە خوای گەورە زۆر بەغیرەتە و، لەبەرئەو هەڕەشە و تانەی شەیتانە بڕیاری دا کە بەندەکانی خۆی عەفوو بکا. هەروەها لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: خوای گەورە لە هەموو کەس غیرەتی زیاترە و، لەم تانەیە کە ئیبلیس دای لە ئادەم و ئەولادەکانی غیرەتی خۆی دەربڕی و فەرمووی: مادام ئیبلیس دەڕواتە ناو دڵیانەوە و گوناهیان پێ دەکا، منیش هەتا ئەو بەندە تەوبە بکا عەفووی دەکەم. جا براکان! بەڕاستی بزانن کە خوای گەورە زۆر میهرەبانە و دەیەوێ عەفووی خۆی بگەیێنێتە هەموو گوناهبارێك و شەیتانی لەعنەتیش، بەهۆی فراوانکردنی ئەم میهرەبانیی خۆیەوە، دەربکا.

برادەرەکان! ڕێگەی سەلامەتی بۆ ئینسان ئەوەیە کە هەمیشە لە بەینی ترس و هیوادا بێ و، بەئیعلانی ئەو لوتفانەی خوای گەورە نابێ پشتوێنی لێ بکاتەوە و خۆی بگەیێنێتە پایەی ئەمن و ترسی لە دڵدا نەمێنێ. هەروەها نابێ خۆیشی لە مەقامی ڕەحمەتی خوای گەورە دوور بخاتەوە و ڕێگای نائومێدی بگرێتەبەر، بەڵکو دەبێ هەمیشە لە بەینی ئەم ترس و هیوایەدا بێ.

لە حەدیسی شەریفدایە کە لەمەوپێش جارێ عابیدێ بەلای کەللەی سەری ئینسانێکی مردووا ڕابوورد، لەو شوێنەدا نەفسی هەندێ بیری کردەوە و گورج وریابوویەوە و وتی: خوایە! تۆ بێگومان خواییەکی سرپۆش و بەدەهەنە و چاکەکاری و، ئێمە هەرچەند گوناه بکەین کە گەڕاینەوە بۆ قاپی ڕەحمەتی تۆ و تەوبەمان کرد، تەوبەمان لێ قبووڵ دەکەی. تکاکارم لێت کە بەڕەحمەت لێم ببووری و عەفووم بکەی. ئیتر لەم نزا و پاڕانەوەدا وەجد گرتی و نوقمی دەریای لە خواترسی بوو و کەوت بەڕوودا و کڕنووشی بۆ خوا برد. لەوێدا هاتیفێ بانگی لێ کردو پێی وت: فڵانەکەس! سەر بەرزکەرەوە؛ بەڕاستی من خواییێکی گوناهبەخش و سرپۆش و تەوبە وەرگرم، لە گوناه خۆش دەبم، عەیب دەپۆشم، تەوبە قبووڵ دەکەم. تۆیش بەندەییێکی دڵسۆز و تەوبەکاری، وا تەوبەکەتم قبووڵ کرد و لەو گوناهەی کردووتن عەفووم کردی. ئەویش سەری بەرز کردەوە و گەلێ شوکر و سوپاسی خوای گەورەی بەجێ هێنا.

لە حەدیسی شەریفدایە: هەرکەسێ داوای عەفوو و لێ خۆشبوون نەکا لە خوا بۆ خۆی

و بۆ خەڵك خوای گەورە گوێی پێ نادا و دەفەرموێ: مادام ئەم شەخسە ڕەحم بەخۆی و بەخەڵك ناكا، ئێمەش گوێ بەو نادەین. لە حەدیثێكی ترا هەیە: نابێتە خاوەن ئیمان كەسێ ڕەحم بەخەڵك نەكا. جا هاوڕێیەكانی عەرزیان كرد: سوپاس بۆ خوا ئێمە لە ناو خۆماندا یەكترمان خۆش دەوێ. فەرمووی : مەبەست تەنیا ئەمە نییە؛ بەڵكو پێویستە ڕەحم بە عاممەی خەڵك بكەن.

براكان! خوای گەورە فەرموویەتی: «وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً ثُمَّ اهْتَدَى» وە فەرموویەتی: «إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً».

لە ئایەتی یەكەمدا دەفەرموێ: بەڕاستی من گوناهی ئەو كەسە دەبەخشم كە تەوبە لە گوناهەكانی بكا و باوەڕی بەخوا هەبێ و كاری باش بكا. لە ئایەتی دووەمدا دەفەرمووێ: ئەو گوناهبارانەی تەوبە دەكەن و باوەڕیان بەخوا هەیە و كرداری باش دەكەن خوای گەورە بەجۆرێ ڕەحمیان پێ دەكا كە تاوانە پێشووەكانیان دەگۆڕێ بەچاكە و پاداشی باشیان دەداتەوە بێگومان خوا گوناه بەخش و میهرەبانە. هەروەها لەم بابەتەوە حەدیسێكی قودسی هەیە مەعناكەی ئەمەیە: كێیە لە ڕووی كەرەم و سەخاوەتەوە لە من گەورەتر بێ، من ئەم نادەمیزادانە لە جێگە نووستنیاندا بەخۆشی دەپارێزم بەجۆرێ دەڵێی دۆستی منن و هەرگیز بێ گوێییان نەكردووم. دەهەندەیی و سەخاوەتم بەجۆرێكە هەركەس تەوبە بكا تەوبەكەی وەها قبووڵ دەكەم دەڵێی هەمیشە تەوبەكار و ڕوو لە خوا بووە و هەرگیز گوناهی نەكردووە. كێیە داوای شتێكی لە من كردبێ و من نەمدابێتێ؟! ئەوە كێیە لە دەرگای منی دابێ و من دەرگام لێ نەكردبێتەوە؟! ئایا من ڕژد و بەخیلم، هەتا یەكێ بە بەخیلم دابنێ؟!. خوای گەورە كە لەم حەدیسە قودسییەدا ئەم پرسیارانە بەشێوەی پرسیاری ئینكار ئامێز دەكا؛ واتە: كەس نەبووە داوای شتێ لە من بكا و من نەمدابێتێ و، كەس نییە لە دەرگای منی دابێ و من دەرگام لێ نەكردبێتەوە. بەڵام دەبێ ئەوە بزانن كە ئەم داوایە دەبێ لەسەر ڕێ و شوێنی (سنة الله) بێ واتە لەگەڵ بوونی ئەسبابی عادەتی شتە مەقسوودەكەدا بێ، ئەگینا هەزار هاوار بێ سوود بە با دەڕوا.

هەروەها لە حەدیسێكا دەفەرموێ: ئەی تاوانبار ئەمین مەبە لە ناشیرینیی عاقیبەت. كە گوناه دەكەن و تەوبەی لێ ناكەن، ئەو تەوبەنەكردنەش دەبێتە تاوانی لەسەر تاوان

و، ئەم حاڵەت لە گوناهەکەت گەورەترە. هەروەها پێکەنین و خۆشحاڵیت لە پاش گوناهەکە ئەویش لە گوناهەکەت گەورەترە، کە خەم و پەژارەییەکت پیشان نەدا لە گوناهەکەت گەورەترە، کە ترست لە خەڵك هەیە بە گوناهەکەت بزانن، ئەوە لای خوا لە گوناهەکەت گەورەترە؛ چونکە پێویستە لە خوا بترسی نەك لە خەڵك.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) بەلای کۆمەڵێکدا ڕابووررد کە دەورەی شتێکیان دابوو، فەرمووی: ئەم قەرەباڵغە چییە؟. عەرزیان کرد: تەماشای ئەو شێتە دەکەن. فەرمووی: ئەمە شێت نییە بەڵکو نەخۆشە؛ شێت ئەو کەسەیە لەسەر گوناه دەوام دەکا و بەهۆی تەوبە خۆی ڕزگار ناکا.

ڕیوایەت کراوە: «ما أکرم العباد أنفسهم بمثل طاعة الله، وما أهان العباد أنفسهم بمثل معصية الله. بحسبك من عدوك أن تراه عاصيا لله ويحسبك من صديقك أن تراه طائعا لله». واتە: بەندەکانی خوا بەهیچ شتێ قەدری خۆیان ڕاناگرن، بەقەدەر ئەوەندەی بەفەرمانبەرداریی خوا ڕای دەگرن و، بەهیچ شتێکیش خۆیان بێ نرخ و سووك ناکەن بەقەدەر ئەوەندەی بەگوناه و بێ گوێیی خوا دەیکەن. بەسە بۆ نوشوستیی دوژمنەکەت کە ببینی بێ گوێیی خوا دەکا و خەریکی گوناهە. بۆ سەربەرزیی دوژمنیشت ئەوەندە بەسە کە ببینی بەگوێی خوای گەورە دەکات و خۆی لە گوناه دەپارێزێ.

هەروەها ڕیوایەت کراوە: «النادم ينتظر الرحمة والمعجب ينتظر المقت. وأحذروا التسويف فأن الموت يأتي بغتة ولايغرن أحدكم بحلم الله.. الحديث». واتە: ئەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوە و تەوبە دەکا و لە ناو خەڵکدا خۆی بەشەرمەزار دادەنێ چاوەڕێی میهرەبانیی خوایە، بەڵام ئەوەی لە خۆی ڕازییە و پەشیمان نییە چاوەڕوانی ڕق و قینی خوایە. خۆتان لە تەوبە دواخستن و ئەمڕۆ و سبەی بپارێزن، چونکە مەرگ کوتوپڕ دەدا بەسەر ئینساندا. بەحیلم و حەوسەڵەی خوای گەورە بایی مەبن؛ چونکە خوا ئاگاداری هەموو گوناهێکە و دڵگیر و سەختگیرە.

لە حەدیسێکدا دەفەرموێ: «من أحسن في ما بقي غفر له ما بقي وما مضى. ومن أساء مابقي أخذه في ما بقي وما مضى». واتە: هەرکەس لەوەی کە ماویە لە ژیاندا کردەوەی باش بێ، گوناهی تازە و کۆنی عەفوو دەکرێ. بەڵام ئەوەی لەوەی کە ماویە لە ژیانا کردەوەی خراپ بێ، حەقی بەروداوی لێ دەسێنرێ.

ڕیوایەت کراوە: خوای گەورە وەحیی کرد بۆ حەزرەتی ئادەم (د.خ) و وتی: ئەی ئادەم! تۆ نارەحەتی و پەرێشانیت لە ژیاندا کرد بە بەشی نەتەوەی خۆت و بووی بەهۆی ئەم وەزعەی ئەوان؛ لەبەرئەوە من رەحمیان پێ دەکەم و هەر گوناهبارێکیان تەوبە بکا تەوبەی لێ قبووڵ دەکەم و لە ڕۆژی قیامەتدا بەخۆشی و شادی حەشریان دەکەم.

براکانم! ڕیوایەت کراوە: کە خوا ئادەمی خستە خوارەوە لە خوا پاڕایەوە و وتی: «اللهم إنك تعلم سري وعلانيتي فاقبل معذرتي. وتعلم حاجتي فأعطني سؤلي. وتعلم ما في نفسي فاغفر لي ذنوبي». واتە: خوایە! تۆ بەحاڵی ئاشکرا و پەنهانی من دەزانی، عوزرم لێ قبووڵ بکە. بەنیازی من دەزانی؛ دڵخوازم بێنەدی، دەزانی چی لە نەفسی مندایە؛ دەی گوناهەکانم عەفوو بفەرموو.

ڕیوایەت کراوە: کاتێ حەزرەتی ئادەم (د.خ) کەوتە خوار، تەماشای کرد لەسەر ساقی عەرش نووسراوە «لا إله إلا الله محمد رسول الله». وتی: خوایە! ئەو خاوەن ناوە کە ناوی لە بەرامبەری ناوی خۆتەوە نووسراوە کێیە؟ خوای گەورە وەڵامی دایەوە کە ئەو زاتە خاتەمی پێغەمبەرانە. ئەویش وتی: خوایە! لەبەر خاتری خاوەنی ئەو ناوە کە لەگەڵ ناوی خۆتدا نووسراوە، تەوبەم لێ قبووڵ بکە. جا خوای گەورە تەوبەی لێ قبووڵ کرد و عەفووی کرد و لە زەحمەت ڕزگار بوو و بەمیهرەبانی خوا شاد بوو.

سوپاس بۆ خوای گەورە، شەوی یەکشەممە (٤)ی سەفەری (١٣٩٧)ی کۆچی ڕێکەوتی (٢٣)ی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٧)ی زاینی لە تەرجەمەی ئەم نامەیە بوومەوە.

## نامەی چل و هەشتەم

# باسی سەفەری قەبر و قیامەت دەکا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه
وأتباعه الحافظين لحدود الله.

لە پاش ئەمانە لە خوا دەپارێمەوە کە بە بەخشندەیی خۆی بتانکاتە خاوەنی ئیمان و باوەڕی دامەزراو و سامانی دنیا و قیامەت. ئامین.

براکان! خوای گەورە ئەو دنیایەی کردووەتە مەنزڵ بۆ موسافیر و ڕێڕەوی جیهانی دوایی نەبراوە. واتە: بۆ ئەوە لەم دنیایەدا دروستی کردووین هەتا بەقەدەر حاڵ خوا بناسین و بەوەی ئەمری پێ کردووین ڕەفتار بکەین و لەپاشان بڕۆین بۆ ئەو جیهانە کە بڕانەوەی بۆ نییە. هەروەها ئەم دنیایەی کردووە بەجێگای کشتوکاڵی ڕۆژی پاشەڕۆژ هەتا بەبێ توێشوو ڕوونەکەینە ئەو دنیایە و بەئازادی و دڵشادی بگەینە دوامەنزڵ و لەوێدا بحەسێینەوە. براکان! ئەو نامانە کە من ڕەوانەیان دەکەم بۆتان لەبەر ڕووناکی فەرموودەی پێغەمبەردا، باشترین دیارییەکن کە دۆست بۆ دۆستی خۆی بنێرێ. هەروەها ڕەفتار کردن بەو نامانە گەورەترین کرەوەییەکە کە ئادەمیزاد لە ژیانی خۆیدا بیکا.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «ماأهدى مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى أو يرده بها عن ردى» واتە: هەرگیز موسڵمان دیارییەکی نەناردووە بۆ برای موسڵمانی خۆی چاکتربێ لە کەلیمەییکی ڕاستی وەها بێتە هۆی زیادکردنی شارەزایی لە ئاینی ئیسلامدا یا ببێتە هۆی پاراستنی لە ناهەمواری و بەڵاییەکی دینی یا دنیایی.

حەزرەتی عومەر (د.خ) زۆرجار لە سەلمانی فارسی و ئەبووزەڕی غەفاریی دەپرسی (ر.خ) کە هەر عەیبێکی هەیە پێی بڵێن تا خۆی لێ بپارێزێ. هەروەها دەیفەرموو: «رحم الله أمرء أهدى إلي عيوبي» واتە: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ کە عەیبەکانم بەدیاری بۆ دەنێرێ. ئەمجا دەیفەرموو: ئەم جۆرە دۆستانە لە کوێن؟ بەخوا قەسەم من ئیستە دۆستی

ڕاستەقینەی ئێوەم و پێویستە لەسەرتان هەر دیارییەك كە من بۆتانی بنێرم بەدڵ وەری بگرن و گوێ ڕاگرن بۆ ئەوانەی دەیخوێننەوە بەسەرتاندا.

زاناكانی ئاین ئینسانی بێ ئاگایان بەنووستوو داناوە و، پێویستە یەكێ هەبێ كە ئەوانە لە خەوی بێ ئاگایی خەبەر بكاتەوە. هەروەها فەرموویانە: ئەگەر ئەهلی ئیرشاد نەبن ئادەمیزاد وەكو كوێرن و نازانن ڕوو لەكوێ بكەن؟ لەبەرئەوە لەم نامەدا بەشێوەیەكی كورت باسی چەند سەفەرێكتان بۆ دەكەم كە لەبەردەم ئینساندان هەتا لە شوێنی ئێجگاریی خۆیدا دامەزرێ، واتە: هەتا دەگاتە بەهەشت، خوا بەنسیبی هەموومانی بكا، یا هەتا دەگاتە دۆزەخ، خوا بمانپارێزێ لێی. بەڵێ ئەم دوو جێگە جێگەی ئیقامەتی ئەبەدین؛ چونكە ئیتر مەرگ نامێنێ و بەئیقامەتی یەكێ لەم دوو شوێنە سەفەرەكان دەبڕێنەوە. سەفەرەكانی قەبر تا دەگەنە سەفەرەكانی قیامەت لەم نامەیەدا بۆتان باس دەكەم، سەفەرەكانی قیامەتیش كە مەنزڵی ئەبەدییە، لە نامەییەكی تایبەتیدا دەنووسم، براكان! ئەگەرچی زاناكان خەبەردارن لەو شتانەی من دەیاننووسم، بەڵام لە دوو ڕێگاوە عەرزكردنی ئەوانە قازانجیان هەیە: یەكەم بیستنی عەریزە لە غەیرەوە خۆشترە. دووەم ئەم عالەمە غافڵن بەڵكو بەم مەوعیزە ئاگادار ببنەوە، كەواتە ئیشەڵڵا زاناكان وەعز و نەسیحەت دەكەن و عەوامەكان گوێ دەگرن. وا ئەم تەنبیە نامەیەم بەشێوەی نەسیحەت نارد بۆتان و كردم بە لوقمەییەكی حازر و ئامادە تا بە بێ زەحمەت زاناكان بیكەنە هۆی بێداركردنەوەی غافڵەكان. جا ئەگەر برادەران حەز لە بیستنی ئەم نامەیە بكەن، ئەوە مەعنای بەهێزیی ئیمانە؛ چونكە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: گەورەترین سیفەتە چاكەكانی موسڵمان ئەوەیە لە بیستنی قسەی خێر تێر نەبێ.

خۆشەویستەكان! خوای گەورە دەتوانێ ئەم جیهانە بە(كن فیكون)ێ دروست بكا؛ تەماشا دەكەین لەسەر فەرموودەی حەزرەت (د.خ) لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو پیاو و ژنەی ئارەزووی منداڵ بكەن لە ماوەی سەعاتێكا ژنەكە سكی پڕ دەبێ و منداڵەكە بەبێ ئازار دەبێ و وەك ئینسانێكی گەورە هاتوچۆ دەكا. بەڵام حیكایەت زۆر هەیە لەم جۆرە دروستكردنەدا كە خوا وردە وردە و بەتەدریج دەیكا؛ بۆ نموونە: لەوەدا كە خوای گەورە هەشت یا نۆ مانگ منداڵ لە سكی دایكیدا دەهێڵێتەوە ئەو حیكمەتە هەیە كە تێی بگەیێنێ خوا دەتوانێ لە قەبریشدا ئینسان بەزیندوویی بهێڵێتەوە. هەروەها هەتا پاش ئەوەی لە دایك بووین ئەو حاڵ و ئەحواڵەی خۆمان ئاگادار بین و بزانین لەسەر هەر نیعمەتێ

پێویسته شوکرێکی خوای گەورە بکەین. ئەگەر لە کاتی ژیاندا بەهۆی ئارەزووی نەفسەوە گوناهێکمان کرد، لەبەرئەوە کە ئاگامان لە حوکمی خوا هەیە و دەزانین تەوبە دەبێتە چاری نەگبەتی گوناهەکان، تەوبە بکەین و بەهۆی ئەو تەوبەوە پاك ببینەوە. حیکمەتێکی تریشی تێدایە ئەویش ئەوەیە سەعاتێ تێ فکرین لە گەورەییی خوا، لە خواپەرستیی شەست ساڵ چاکترە، دەی کەواتە هەتا ئینسان بمینێتەوە و تێ فکرێ لە گەورەییی خوا و خۆی بۆ یادی ئەو تەرخان و خالیس بکا، خێری زۆرتر و چاکتر دەبێ.

دەبێ ئەوەیش بزانین کە کاتێ لەم دنیایە دەرچووین و لەم سەفەرە دوور و درێژەدا مەسافەی دنیامان پێچایەوە و چووینە دنیای قەبری تار، دنیاییەکی تازە دێتە پێشمان. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «القبر إما روضة من رياض الجنان وإما حفرة من حفر النيران». واتە: گۆڕ یا باخێکە لە باخەکانی بەهەشت یا چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ. لەم حەدیسە شەریفەوە دەردەکەوێ کە ئینسان پاش مردن لە قەبردا زیندوو دەبێتەوە، ئەگینا بەردێ بخرێتە ناو باغچەییەکی پڕ لە مێوە و گوڵی ڕەنگاوڕەنگی بۆن خۆشەوە، هیچ مەدح و سەنایێ بۆ ئەو بەردە پەیدا نابێ. هەروەها ئەگەر بەردێ بخرێتە ناو تەنوورێکی پڕ لە ئاگر هەرگیز زەممێ بۆ ئەو بەردە پەیدا نابێ، بێگومان حەزرەتیش (د.خ) لە قسە و وتاری عەبەس و بێ سوودەوە دوورە. کەواتە لە حەدیسەکەوە دەرکەوت کە ئینسانی مردوو کاتێ خرایە قەبرەوە زیندوو دەبێتەوە. دیارە ڕوح خۆی شتێ نییە کە مەحو بێتەوە. ئەو شوێنەش کە لە دوادوایی بڕبڕەی پشتی ئینسانەوەیە و پێ دەڵێن (عجب الذنب) هەرگیز نارزێ و، هەر بەشێ لە بەشەکانی لەشی ئینسان و هەر زەرەیێ لە زەڕاتی وجوودی ڕۆحی پێوەندییی پێوە هەیە، بۆ نموونە وەکو مشتێ شیر ئەگەر بیشیکەی بەهەزار زەڕەوە هەمووی کەرەی تیا هەیە زەڕاتی لەشی ئینسانیش بەقەدەر خۆی ڕۆحی پێوەندیی پێوە هەیە، واتە: ئەگەر ئەهلی سزا بێ سزا دەدرێ و ئەگەر ئەهلی نیعمەت و لەزەت بێ شاد و کەیف خۆش و دڵ ڕەحەتە. (سبحان الذي في القبور قضاؤه).

خوای گەورە بەتوانا و دەستەڵاتی خۆی گیانی پیاوچاکانی لە شوێنی کەرامەتدار و بەشەرەفدا داناوە و گیانی پیاوخراپانیشی لە شوێنی خراپ و پیس و بێ شەرافەتدا داناوە و، لەگەڵ ئەمەش هەموو پێوەندییان بەهەموو زەڕاتی لەشی ئینسانی مردووەوە هەیە. زاناکانی ئاین بەپێی وەرگرتن و تێگەیشتنی تایبەتییان لە ئایەت و حەدیسەوە پایە و ئارامگایان بۆ ئەرواح دیاری کردووە؛ بۆ ئەرواحی پێغەمبەران و شەهیدان و پیاوچاکان ،خوای گەورە پەلەوەرێکی زۆر لە بەهەشتا دروست دەکا کە تێیاندا ئارام دەگرن و لە

بەهەشتدا سەیران دەکەن و کاتێ مەیلیان لێ بوو بەدەوری عەرشدا ئارام دەگرن و عەرش دەبێتە شوێن و ماوایان. موسڵمانەکانی تریش کە بەپایەی تەکلیف نەگەیشتوون هەر بەم جۆرەن. موسڵمانەکانی تر کە خوا لێی خۆش بوون و قبووڵکراوی بارەگای خوان لە ئاسمانی حەوتەمدا بەپێی دەرەجە و پایەی خۆیان ئارام دەگرن. ئەو موسڵمانانەیش کە گوناهبارن و گوناهیان عەفوو نەکراوە وان لە شوێنێکی زۆر ناپوخت و ناهەمواردا و لەو شوێنانەدا بەوجۆرە سزایە کە بۆیان بڕیاردراوە سزا دەدرێن.

ئەم ڕوحانە چ ڕوحی پێغەمبەران (د.خ) و چ ڕوحی سیدیقین و شەهیدان و پیاوچاکان، هەروەکو لە شوێنی بەرزی وەك بەهەشت و عەرش و ئاسماندا ئارام دەگرن و سەیران دەکەن و لە خۆشی و شادیدان، پێوەندییان بەقەبرەکانەوە هەیە، ئەم پێوەندییەش بێگومان بەپێی پایە و پلەی ڕووناکی و بەرزیی ئەو ڕۆحەیە.

لە لایەکی ترەوە ئایەتەکەی سوورەتی یاسین کە دەفەرموێ: «قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ[٢٦] بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ»، دەلیلێکی ڕوون و بەهێزە بۆ ئەو تەقریرەی لەپێشەوە باسمان کرد. هەروەها ئەرواحی ئەهلی سزایش هەرچەند لە شوێنی خۆیاندا سزا دەدرێن پێوەندییان بەقەبرەکانیانەوە هەیە؛ بۆیە حەزرەت (د.خ) بانگی کرد لە کافرە کوژراوەکانی جەنگی بەدر و وتی: «یافلان... و یافلان... و یافلان أنا قد وجدنا ما وعدنا ربنا حقاً، فهل وجدتم ما وعدکم ربکم حقاً؟!» واتە: ئێمە ئەو بەڵێنەی، خوای گەورەمان پێی دابووین دەستمان کەوت، ئاخۆ ئێوەش بەڵێنی خوای خۆتانتان دەست کەوت؟! لەوێدا هەندێ لە هاوڕێیەکانی حەزرەت عەرزیان کرد: ئەمانە لەکوێ دەبیسن؟ ئەوەتە بۆگەنیان کردووە. ئەویش فەرمووی: «والله ما أنتم بأسمع منهم ولکنهم لایطیقون الجواب». واتە: بەخوا قەسەم ئێوە لەوان باشتر نابیسن، بەڵام توانای وەڵامدانەوەیان نییە.

پوختەی قسە: جیهانی قەبر جیهانی پەنامەکییەکانی خوای گەورەیە، ئەوانەی بەختیارن هەریەکێکیان بەجۆرێ لە خۆشی و ئیستراحەتان و، ئەوانەی بەدبەخت و چارەڕەشن هەریەکێ بەجۆرێ لە ئازار و سزادان، مەگەر هەر خوا خۆی بزانێ چۆنە، تا خۆمان نەمرین و نەگەینە ئەو کاتە نازانین وەزعمان چۆن دەبێ، بەڵام وەکو حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: قەبر یا وەکو باخی بەهەشتە یا وەك چاڵی دۆزەخ. هەروەها لامان سابت بووە کە سزای ئەهلی سزا، چەند جۆرێکە و خۆشیی ئەهلی خۆشییش چەند جۆرێکی جیا جیایە.

لە پێش باسی سەفەری قەبرا باسی سەفەری مردن دەكەم، لەم سەفەرەدا یا شادی و خۆشی دێ بەسەر ئینساندا یا ترس و لەرز و ناخۆشییەكی توندوتیژ. لە كاتی گیان دەرچوونا بەختیاری ئینسان یا بەدبەختیی دەردەكەوێ. لەم كاتەدا پەشیمانی و پەنجەگەزتن و خەم و پەژارە وەكو كێوێكی گەورە ئینسانی بەدكرداری بەدبەخت دادەگرێ، بەڵام بێ سوودە. ئەوەی كاتی خۆی كردەوە چاك بووە لەم ساتەدا دەڵێ: بۆچی خێراتم زۆر نەكرد. ئەوەی كاتی خۆی بەدكار بووە، لەم ساتەدا دەڵێ: بۆچی بەم جۆرە خۆمم فەوتاند؟!

ئەی برای خۆشەویستم! وردبەرەوە لەو كاتەدا ئەگەر فریشتەی سزا ئینسان بترسێنی چ جۆرە ئازار و پەژارەیێ سەر و دڵی دەگرێ.

هەروەها ئەگەر فریشتەی خێر مژدەی ئاسایش و شادی بدات بە ئینسان دەرگای بەهەشتی بەرینی لێ بكاتەوە چ جۆرە خۆشییەك دەرژێتە ناخی دەروونی و چۆن شادمان دەبێ؟.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: وەختێ فریشتە دێ بۆ گیان كێشان، ئەگەر ئینسانەكە باش بێ، پێی دەڵێ: فلانی! خوای گەورە لێت ڕازییە و موشتاقی ڕۆحی تۆیە و ئیتر نۆبەی ئەوەیە بڕۆی بۆ خانووی ئاوەدانی خۆت. خۆ ئەگەر ئینسانەكە فاسق و فاجر بێ، زۆر بەزبری قسەی لەگەڵ دەكا و پێی دەڵێ: خوای گەورە لێت عاجزە و چەند سزا لەبەر ڕێتایە. بێجگە لەوە گەلێ قسەی نابار و ناهەمواری پێ دەڵێ و شوێنی خۆی لە دۆزەخدا پیشان دەدات.

پوختەی قسە ئەم بارودۆخی گیان دەرچوونە بەتەواوی لێرەدا باس ناكرێ و ماوەییەكی تایبەتی دەوێ.

لە عومەری كوڕی عەبدولعەزیزەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) فەرموویەتی: نامەوێ گیان كێشانم بەئاسانی بێ؛ چونكە ئەم گیان كێشانە ئاخر ڕووداوێكە لە دنیادا دێ بەسەر ئینساندا پاداشی لێوە دەست دەكەوێ، واتە: تا گرانتر بێ خێر و پاداشی زۆرتر دەبێ بۆ مردووەكە.

ڕیوایەت كراوە كە ئێشی گیان كێشان لە ئێش و ئازاری لێدانی هەزار شمشێر زیاترە. لەم ڕیوایەتەوە دەردەكەوێ كە ئینسان بەتێنوێتی دەمرێ و بەتینوێتی لە قەبردا دەمێنێتەوە، بەڵام ئەو حاڵە بۆ ئەوانەیە كە خوای گەورە لێیان عاجزە، ئەگینا ئەو كەسانە كە خوا لێیان ڕازییە بە ئاسانی تێ دەپەڕن و، فریشتە لە سەرەمەرگا مژدەی بەهەشتیان دەدەنێ و، بەهۆی ئەو مژدەوە ئەگەر ئازارێكیشیان ببێ فەرامۆشی دەكەن و ئاگایان لێی نابێ، وەكو بێ ئاگایی ئەو ژنە میسرییانە كە سەرزەنشتی زولەیخایان دەكرد لە

خۆشەویستیی حەزرەتی یوسفدا (د.خ) و زولەیخاش بانگی کردن و دای نان سەر و نارنج و سەر و چەقۆی دایە دەستیان و فەرمانی دا یوسف بە بەردەمیاندا تێ پەڕێ. کە چاویان پێ کەوت، ئاگایان لە خۆیان نەما و لەباتی نارنجەکە دەستی خۆیان بڕی و هاواریان کرد: ئەمە ئادەمیزاد نییە بەڵکو فریشتەیەکی گەورەیە.

دەگێڕنەوە: پیاوێکی چاك لە خەودا چاوی بەفریشتەی گیان کێشان کەوت و لێی پاڕایەوە کە بەئاسانی گیانی بکێشێ و، لە بارەگای خوادا بۆی بپاڕێتەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بەئاگری دۆزەخ نەیسووتێنێ. فریشتەکە لە وەڵامیا فەرمووی: ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخ بەوەیە کە زۆر داوای لێبووردن لە خوای گەورە بکەیت، بەزەییی منیش لە کاتی گیان کێشاندا بەسەڵەواتدانە.

ئینجا پاش باسی گیان کێشان باسی سەفەری ئینسانە بۆ قەبر. ئەم سەفەرە گەلێ موسیبەتی لەڕێدایە؛ یەکەم مسیبەت گوڕەوشاری قەبرە؛ هاوار و فغانی بنیادەم لە کاتی گوڕەوشاری قەبردا هەموو گیانلەبەرێ دەیبیسێ ئینسان و جیننی نەبێ.

سەعدی کوڕی مەعاز، خوای گەورە لێی ڕازی بێ، لە کاتی مردنیدا لە شادی و خۆشیی بەرزبوونەوەی ڕۆحی بۆ ئاسمان، عەرش لەرییەوە، هەروەها حەفتا هەزار مەلائیکە حازری جەنازەی بوون. لەگەڵ ئەمەشدا لە گوڕەوشاری قەبر ڕزگار نەبوو.

دەگێڕنەوە: کردەوەی چاکەی ئادەمیزاد بەقودرەتی خوا دەچێتە شێوەی فریشتەییەکی جوانەوە و، کردەوەی خراپەشی دەچێتە شێوەی جانەوەرێکی دڕندەی ناشیرینەوە، ئینجا دەستەی کردەوە چاکەکان لەگەڵ مەلائیکەی ڕەحمەتدا لەلای ڕاستەوە و دەستەی کردەوە خراپەکان لەگەڵ مەلائیکەی سزادا لەلای چەپەوە حازر دەبن. دەستەی کردەوە چاکەکان لەگەڵ قەبردا دەکەونە گفتوگۆ و دەڵێن: ئەم زەلامە لە دۆستانی خۆی براوە و کەسی لەلا نەماوە، ئێمە نەبێ. قەبرەکە وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ: «مرحباً وأهلاً» وەختی خۆی کە لەسەر پشتی من دەگەڕای لەبەر کردەوە باشەکانت لەلای من خۆشەویست بووی. ئێستاش کە خوای گەورە تۆی بەمن سپاردووە بزانە چیت لەگەڵ دەکەم؟ لەوێدا قەبرەکە بە ئەندازەی چاو بڕ بکات پان و درێژ دەبێ و دەبێتە دەشتێکی گوشاد و بەربەرەڵا. هەروەها لە نزیکی جێگەی مردووەکەوە دەلاقەیێ دەکرێتە قەبرەکە و لەوێوە کە تەماشا دەکا بەهەشت دەبینێ و جێگەی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێ و لەوێوە بۆنی خۆشی بەهەشتی بۆ دێ. ئیتر لەم حاڵە جوانەدا دەمێنێتەوە و بەئەنواعی لەزەت و خۆشی ڕادەبوێرێ. بێگومان

بێجگە خوای گەورە کەس بەتەفسیلاتی ئەم شەخسە نازانێ لەم جیهانی قەبرەدا، کە پێی دەڵێن جیهانی بەرزەخ، هەتا ڕۆژی قیامەت دێ.

دەستەی کردەوە خراپەکانیش، ئەگەر کردەوەی مردووەکە بەشی زۆری خراپ بێ و هۆی ئازار و سزا بێ، لەگەڵ قەبرەکەدا بەبێ ئیحتیرام دەربارەی ئەو مردووە قسە دەکەن و لێی دەبنە شایەت. قەبرەکەش بانگی دەکات و دەڵێ: من مەنزڵ و ماواییەکم پڕ لە جانەوەری ژەهراوی وەك مار و دووپشك و شتی وەك ئەمانە، من شوێنی سزا و گێچەڵ و زەحمەتم بۆ تۆ بەرامبەر بەو کردەوە خراپانە کە لە دنیای ڕۆشندا کردووتن. هەروەها پێی دەڵێ: ئەی بەدبەخت! تۆ بەچی لە دنیادا بایی بوویبووی کە ئەوەندە کردەوەی خراپت دەکرد و پەشیمان نەدەبوویتەوە؟! ئایا نەتدەزانی لە ئەنجامدا دێیتەوە بۆ لای من؟ ئایا نەتدەزانی پرسیارت لێ دەکرێ لە کردەوەکانت؟ ئەو کەسانە کە ئەهلی سزان دراوسێیەکانیان لێیان دێنە جواب و پێیان دەڵێن: کاتێ ئێمە مردین ئێوە ئاگادار بوون، لە پاش ئێمە لە دنیادا دەژیان، بۆچی بەمردنی ئێمە عیبرەتگیر نەبوون؟ نەتاندەزانی کە پاش مردنتان دەستتان لە کردنی خێر و چاکە دەبڕێ، وا ئێمە مردین و دەستمان لە چاکە بڕا، خۆ ئێوە بەسەر زیندوو بوون و دەستتان لە کاردا بوو بۆچی هیچتان نەکرد؟

بێجگە لەم موسیبەتانە پرسیاری مونکەر و نەکیرە کە دوو فریشتەی زۆر بەسام و هەیبەتن و مردووەکە لە قەبرەکەیدا دادەنیشێنن و پرسیاری لێ دەکەن: خوای تۆ کێیە؟ ئەگەر ئەهلی سەعادەت بێ دەڵێ: (الله). پاشان لێی دەپرسن: پێغەمبەرت کێیە؟ ئەگەر بەختەوەر بێ دەڵێ: «محمد رسول الله». لێی دەپرسن: ئیمامت کێیە؟ ئەگەر ئاخر خێر بێ دەڵێ: قورئانە. لێی دەپرسن. قیبلەت کوێیە؟ ئەگەر پیاوچاك بێ دەڵێ: کەعبەیە لە شاری مەککەی موکەڕەمە. دیارە کە وەڵامەکانی بەم جۆرە بن ئەوان زۆر ڕێزی لێ دەگرن و پێی دەڵێن چۆنت دەوێ بحەسێرەوە.

خۆ ئەگەر ئەهلی شەقاوەت یانێ کافر یا فاسق بێ ئەوە لە ترسی ئەو دوو مەئموورە کە لەوێ دێنە سەری تێك دەچێ و بێجگە «ها، ها؟» هیچ نازانی. دەگێڕنەوە ئەو دوو مەلائیکە هەر یەك کوتەکێکی وایان بەدەستەوەیە ئەگەر هەموو بنیادەم و جینێی کۆببنەوە و لێی بنەون ناتوانن بەرزی بکەنەوە. جا بەو کوتەکانە لێی دەدەن. دیارە ئەگەر موسڵمان بێ، هەتا گوناهی بەسەرەوە بمێنێ و ئەگەر کافر بێ هەتا دەدرێتە دەستی ڕۆژی حەشر، ئەوجا خوا خۆی دەزانێ چۆن سزای دەدا.

براکان! وەك عەرزم کردن ئینسان لەو ڕۆژەوە دروست دەکرێ هەر لە سەفەرا دەبێ و

سەقامگیر نابێ هەتا لە بەهەشتا یا لە دۆزەخا بەگوێرەی کار و کردەوەی خۆی جێگای تایبەتی خۆی دەگرێ.

بێگومان ئادەمیزاد لەم سەفەری قەبرەدا گەلێ خۆشی و ناخۆشیی لەبەردەمایە. لە حەدیسی شەریفدا دەفەرموێ: «مارأیت منظراً إلا والقبر أفظع منه» واتە: هیچ دیمەنێکم نەدیوە لە قەبر ناشیرینتر بێ. هەروەها لە حەدیسدا دەفەرموێ: قەبر یەکەم مەنزڵی ڕۆژی قیامەتە؛ ئەگەر ئینسان لەم ڕزگار ببێ، ئیتر باقیی سەهل و ئاسانە. هەرجارێ کە حەزرەت (د.خ) لەگەڵ جەنازەدا دەڕۆیی بۆ قەبرستان دەگریا و دەیفەرموو «لمثل هذا فلیعمل العاملون». واتە: با ئینسان بۆ ئاسانی کاری قەبری لە دنیادا کار بکا.

دەگێڕنەوە کە ئیمامی عەلی (د.خ) ڕۆژێ تەشریفی برد بۆ گۆڕستانێك سڵاوی کرد لە مردووانی ئەو گۆڕستانە، ئینجا پێی فەرموون: ماڵەکەتان کەوتە دەستی خەڵکی، خانووەکانتان بوونە ماوای خەڵك و، ژنەکانتان شوویان کرد بەخەڵك، ئەمە باس و هەواڵی ئێوەیە لای ئێمەوە، ئیتر نازانم ئێوە لە ناو خۆتانا دەنگ و باستان چییە بۆ ئێمە و چیمان پێ دەڵێن؟ ئینجا ئاوازێکی بیست وتی: «وعلیك السلام». ئەوەی کە خواردتان بوو بەخێر و، ئەوەی ناردتان بۆ ئەم جیهانی قەبر و قیامەتە دەستتان دەکەوێتەوە و، ئەوەی بەجێی بێڵن زەرەرتان لێ دەکەوێ.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) جارێکیان بەئەبووزەڕی غیفاریی فەرموو: ئەبووزەڕ! بێگومان ئەگەر ویستت سەفەرێ بکەیت توێشوو و پێویستی سەفەرەکەت ئامادە دەکەی ئەگەرچی سەفەرەکەت کەموکورت بێ، دەی چۆن توێشووی سەفەری قیامەت ئامادە ناکەی؟ ئینجا پێی فەرموو: ئەبووزەڕ! ناتەوێ پێت بڵێم بۆ ئەو ڕۆژە چی بەسوودە؟ عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا حەز دەکەم پێم بڵێیت و ئاگادارم بکەیت. فەرمووی: لە ڕۆژێکی گەرما بەڕۆژوو بی دەبێتە هۆی ئاسایشت لە کاتی تینوێتیی قیامەتدا. دوو ڕکات نوێژ لە شەوێکی تاریکا کە دەبێتە (تهجد) بۆ تۆ بەسوودە لە کاتی وەحشەتی قەبرا.

دەگێڕنەوە: قەبر هەڵکەنێ هەبوو وتی: دوو قەبرم هەڵکەند و دەستم کرد بەهەڵکەندنی قەبری سێیەم. کات کاتی گەرما بوو شتێکم کرد بەچەتر و لە ژێریدا نووستم. لە خەودا چاوم کەوت بەدوو سوار هاتنە سەر قەبری یەکەم ڕاوەستان. یەکێکیان بەوی تریانی وت: بنووسە. وتی: چی بنووسم؟ وتی: «فرسخ في فرسخ» پاش ئەوە چوونە سەر قەبری دووەم و وتی: بنووسە. وتی چی بنووسم؟ وتی: «مد البصر». ئینجا هاتنە سەر قەبری

سێیەم و وتی بنووسە. وتی چی بنووسم؟ وتی: «فتر في فتر». (فەتر: پانیی ئەنگوستی گەورە و ئەنگوستی شەهادەتە). کە لە خەو خەبەرم بوویەوە تەماشام کرد وا جەنازەییەکیان هێنا و کۆمەڵێ ئادەمیزادی لەگەڵدا بوو، چوونە سەر قەبری یەکەم. وتم: ئەمە گوشادی و فراوانیی قەبرەکەی بەقەدەر درێژی و پانی یەك فرسەخە (درێژیی هەر فرسەخێ ۱۲۰۰۰هەنگاوە). پرسیارم کرد: حاڵی ئەم شەخسە چۆن بووە؟ وتیان: ئینسانێکی باش بووە، بەڵام ئەوەندە فەقیر بووە کە موسڵمانان بەخێری خۆیان حەقی تەجهیزیان بۆ جێبەجێ کردووە و هێناومانە بۆت. وتم: منیش حەقەکەی خۆم وەرناگرم و بیبەنەوە بیدەن بەخێزانەکەی. لە پاشا جەنازەییەکی تریان هێنا کە چوار کەس هەڵیان گرتبوو ئەمانە هاتنە سەر قەبری دووەم وتم: ئەمەش ئەویانەیە کە قەبرەکەی تا چاو بڕیکا پان و درێژ و بەربڵاوە. پرسیم: ئەمە چۆن پیاوێك بووە؟ وتیان: ئاوارە بووە و لەسەر سەلوێنك (مزبلە) گیانی دەرچووە! ئێمە بەخێری خۆمان حەقی قەبرەکەمان کۆکردووەتەوە. وتم: منیش حەقم ناوێ. پاش ئەمانە هەر لەو شوێنەدا مامەوە چاوەڕێی جەنازەی سێیەم بووم، هەتا لە پێش مەغریبدا جەنازەییەکیان هێنا و بردیانە سەر قەبری سێیەم. لە دڵی خۆمدا وتم: ئەمەیان (فتر في فتر)ەکەیە. بۆم دەرکەوت ئەو جەنازەیە هی ئینسانێکی بەدکردار و بێ شەرەفە. وتم: قەبر من هەڵم کەندووە بەخۆڕایی نایدەم و کرێم دەوێ، کە ئەمەم وت خەڵکەکە بێ یەك و دوو هاتن بۆم و گەلێکیان لێ دام و بەزۆر مردووەکەیان هاوێشتە ناو قەبرەکە و شاردیانەوە و گەڕانەوە!. براکان! دیارە دوو مردووە پێشووەکە لە وانە بوون کە لە قەبردا دەحەسێنەوە و خوا لوتفیان لەگەڵ دەکا و دەرووی ڕەحمەتیان لێ دەکاتەوە، مردووی دواینیش لەوانە بووە کە لە قەبردا سزا دەچێژن و گۆڕیان لێ دەبێتە دۆزەخ. پەنا بەخوای میهرەبان.

مەسەلەی نیعمەت و خۆشی و ئاسایش و نەقمەت و ناخۆشی و بێ ئیستیراحەتی قەبر شتێکە سابیتە بەدەلیلی کیتاب و سوننەت. واتە: لە قورئانی پیرۆزدا و لە حەدیسی شەریفا دەلیلیان لەسەر هەیە. هەروەها گەلێ قسە و نەقڵ و بەسەرهاتی عەجایەبیش لەسەر ئەم بابەتە ڕیوایەت کراوە. شێخ (جەلالەدین عەبدورەحمان)، کە مەشهوورە بە(سیووتی) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کتێبێکی لەسەر بابەتی سزا و خۆشی و عەزاب و ثەوابی قەبر تەئلیف کردووە. لەو کتێبەدا دەفەرمووێ: لەسەر موسڵمان پێویستە باوەڕی ببێ بەسزای قەبر و ئینکاری ئەم سزای قەبرە کوفرە؛ چونکە ئەو حەدیثانە ئەوەندە لەلایەنی زانایانی حەدیثەوە نەقڵ کراون کە مقداری موشتەرەك کە لە مەعنایان

گەیشتووەتە ئەندازە و پایەی تەواتور. هەروەها بەئاشکرا مەعلوومە کە لە دینی ئیسلامە. ئەو گوناهانەش کە دەبنە هۆی سزای قەبر لە حەدیثەکانا بەیان کراون. بەڵام زۆربەی ئەو سزایانە لە غەیبەتکردن و دوزمانییەوە پەیدا دەبن، واتە: لە باسکردنی خەڵك لە پاشملە و لە قسە هێنان و قسە بردن بەناو خەڵکدا، وە لە خۆ پاك نەکردنەوە لە کاتی تارەتدا، واتە: لە کاتی شۆردنی پاش و پێشدا، لەدوای میز و پیسی کردن؛ چونکە ئینسان کە لە تارەتدا کەموکوڕیی هەبوو غوسڵ و دەستنوێژ و نوێژکردنی چ فەرز چ سوننەت فائیدەیان نابێ و هەموویان بەتاڵ و بێ سوود دەردەچن. هەروەها ئەو عیبادەت و حەسەناتە کە هۆی ڕووناکیی قەبرن لە ساغی و تەواویی تاعەتەوە پەیدا دەبن.

شێخی سیوتی (ر.خ) فەرموویەتی: هەرکەسێ ڕۆژی سەد جار بڵێ: «لا إله إلا الله الملك الحق المبين» لە گەدایی و لە سزا و بێ کەسیی ناو قەبر ڕزگار دەبێ. براکان! ئەم پاداشانە کاتێ دێنەجێ کە ئینسانەکە تەرکی نەکا و بەئاگاداریی دڵەوە بیخوێنێ و ئاگای لە مەعنایشی بێ. بۆ نموونە: مەعنای ئەم زیکرە ئەوەیە کە هیچ کەس نییە شیاوی ئەوە بێ عیبادەتی بۆ بکرێ و بپەرسترێ ئەو ذاتە نەبێ کە ناوی (الله)یە و پادشاییەکە عالەم هەموو لە ژێر هێزی توانایی و خواستی ئەودایە. دەبێ ئەوەیش بزانن: ئەو کەسانە کە لەسەر ئەم زیکرانە بەئیخلاس دەوام دەکەن، خوا تەوفیقیان دەدا و کاریان بۆ ئاسان دەکا کە خواپەرستی بکەن و واز لە گوناهـ و کردەوەی نالەبار بێنن. کە ئینسانیش وا بوو ئەنجامی کاری باش دەبێ.

حەزرەت (د.خ) دەفەرمووێ: «اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر» واتە: خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە سزای قەبر. بێگومان ئەم فەرموودەیە دەلیلە لەسەر بوونی سزای قەبر. واتە: سزای قەبر هەیە بۆیە حەزرەت (د.خ) لە خوا دەپاڕێتەوە لەو سزایە پەنای بدات و بیپارێزێ.

شێخ (جەلالەدینی سیوتی) حەدیسێکی درێژی نەقڵ کردووە، لەو حەدیسەدا گەلێ کردەوەی چاکی باس کردووە کە هەر کام لەوانە بوونەتە هۆی لابردنی جۆرێ لە سزای ڕۆژی قیامەت. بەڵام دوو گوناهی باس کردووە لە بەرامبەریانەوە هیچ کردارێکی چاکی وەهای ناونووس نەکردووە کە ببێتە هۆی لابردنی سزای ئەو دوو گوناهە، واتە: ئەو دوو گوناهە زۆر بەشیدەتن و زۆر ناهەموارن.

حەدیسەکە ئەمەیە: دەفەرموێ: ئیمشەو گەلێ شتی عەجایەبم چاو پێ کەوت، یەکێ لەوانە ئەمەیە: چاوم بەیەکێ لە ئوممەتی خۆم کەوت کە مەلائیکەی گیان کێشان هات گیانی بکێشێ، لەوێدا کرداری چاکی ئەو زەلامە لەگەڵ باوك و دایکیدا هاتن و

مەلائیکەکەیان گەڕاندەوە. لەمەوە دەردەکەوێ کە چاکەکردن لەگەڵ باوك و دایکدا دەبێتە هۆی درێژبوونی تەمەنی ئینسان و ژیانی بەختیارانەی.

یەکێکی ترم لە ئوممەتی خۆم چاو پێ کەوت کە سزای قەبر بەتەواوی دای پۆشیبوو، نوێژکردنەکەی هاتە لای فریای کەوت و لە سزای قەبر ڕزگاری کرد.. هەروەها هەتا شانزە جۆر لە ئەهلی سزای باس کردووە کە هەر یەکێك لەوانە بەجۆرە خواپەرستییەك ڕزگار بووە. لە دوا دوایی حەدیسەکەدا دەفەرموێ: چاوم بەهەندێ کەس کەوت کە لێویان بەمەقەست بڕیبوون، لە جیبرەئیلم پرسی: ئەمانە چ کەسن؟ فەرمووی: ئەمانە ئەو کەسانەن کە دووزمانن و فیتنەیی دەکەن لە بەینی خەڵکدا.

هەروەها حەزرەت دەفەرمووێ: کە لەو شوێنە دەرچووم کۆمەڵە ئینسانێکم چاو پێ کەوت کە بەزماندا هەڵواسرابوون، پرسیارم کرد: ئەی ئەمانە کێن؟ وەڵامیان دامەوە: ئەمانە ئەو کەسانەن کە بوختان دەکەن بۆ موسڵمانان لە پیاو و ژن. پاداشی تاوانەکەیان ئەوەیە کە بەزمانی خۆیاندا هەڵدەواسرێن.

ڕیوایەت کراوە: هەرکەسێ زیارەتی قەبری برای خۆی بکا و ماوەییەك لای دابنیشێ، مردووەکە ئولفەت دەگرێ پێیەوە. جا ئەگەر زیارەتکەر ئینسانێکی باش و لە خواترس بێ، زۆر شادی ڕوو دەکاتە ڕووحانییەتی مردووەکە و، هەرکەسی لە دنیادا ناسیبێ لە قەبریشدا دەیناسێ و، هەرساتێ خەڵك زیارەتی مردوو بکەن، ڕۆحی مردووەکە پێیانەوە خەریك دەبێ، وەکو چۆن یەکێ لە دنیادا ئەگەر میوانی بێ، بەخزمەتیانەوە خەریك دەبێ.

براکان لەم سەفەری قەبرەدا ڕۆحی موسڵمان، ئەگەر قەرزار بێ، لە قەبرەکەیدا حەپس دەکرێ و نایەڵن بگاتە مەقامی خۆی. لە جابیرەوە ڕیوایەت کراوە (ر.خ) دەڵێ: جەنازەییێکیان هێنا کە دوو دینار قەرزار بوو، حەزرەت (د.خ) نوێژی جەنازەی نەکرد (١).

لەوێدا ئەبوو قەتادە (ر.خ) قەرزەکەی گرتە ئەستۆ، ئینجا حەزرەت نوێژەکەی کرد. پاش ماوەییەك حەزرەت (د.خ) لە ئەبوو قەتادەی پرسی: قەرزەکەت دایەوە؟ عەرزی کرد: بەڵێ. لەوێدا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: «الآن برحت جلدته» واتە: مادام کە قەرزەکەی لەسەر نەما پێستی گیانی لە نارەحەتی دەرچوو و لە گەرمای قەبر ڕزگار بوو.

براکان! لە دنیادا گوزەران و ڕابواردنی هەر ماڵ و هەر خانەدانێ بەجۆرێکە. وەکو چۆن

(١) یەکێ لە خاسیەتەکانی حەزرەت (د.خ) ئەوە بووە نوێژی لەسەر جەنازەی مردووی قەرزار نەکردووە، تا قەرزەکەی بۆ دراوەتەوە. وەرگێر

هەر ماڵێ کەم گوزەرانیی بەجۆرێکە و گوزەرانی خۆشیی بەجۆرێکە، هەروەها وەزعی قەبریش، هەرکەس خۆشیی و ناخۆشی بەجۆرێکەوە، حیسابی نیعمەت و زەحمەتی قەبر هەر لە عیلمی خوادایە و کەس نایزانی هەتا کاتی خۆی. (سبحان الذي في القبر قضاؤه).

من خۆم بەسەرهاتێکتان بۆ دەگێڕمەوە: لە دێیەکدا یەکێ لە دۆستانی من قەبر هەڵدەکەنێ، لە شوێنێکدا بەخەیاڵدا نایێ، قەبری تێدابێ. کاتێ دەگاتە ئاستی ئەڵحەد کونێ دەبێتە ئەو لاقەبرە تەماشا دەکا لاشەییەکی ڕەش کەوتووە و حەیوانێکی بەسەرەوەیە کە چاوی وەکو چرا دەگڕێ و، هەرجارێ جانەوەرەکە هەڵمەت دەبا بۆ ئەو لاشە وەکو تۆز بەرز دەبێتەوە! ئا بەو جۆرە ئەو لاشە لە سزادا دەبێ. کابرای گۆڕهەڵکەن دەقیژێنێ و هاوار دەکا لە خەڵك و دەڵێ: وەرن لەم قەبرە دەرم بێنن. کە دەری دەهێنن حیکایەتەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە و نەخۆش دەکەوێ و تا ماوەی مانگێ وەکو شێت پەرێشان دەبێ. ئەو کەسانە کە عەلاقەدار دەبن، ئینکاری ئەم ڕووداوە دەکەن و دەڕۆن ئەو شوێنە هەڵدەدەنەوە بێجگە خاك و خۆڵ هیچی تری تێدا نابینن. کابرایش هەر بەپەرێشانی دەمێنێتەوە. جا ئەمە مەعنای ئەوەیە ئەحواڵی قەبر سیرێکە لە ئەسراری خوا و مومکینە یەکێ ئاگای لێ بێ و یەکێکی تر ئاگای لێ نەبێ؛ وەکو چۆن یەکێ دەخەوێ و خەڵك وان بەدەوریدا، ئەو هەرچی خۆشی یا ناخۆشی لە خەودا ببینێ کەسیان پێی نازانن. مەگەر جاروبار بە(خرق العادة) بۆ پەند وەرگرتنی هەندێ کەس هەندێ ئەحواڵ دەرکەوێ. هەروەها ئەرواحی مردووەکان لەگەڵ ئەرواحی نووستووەکاندا بەیەك دەگەن و گفتوگۆ لەگەڵ یەکە دەکەن. ئەمەش شتێکی دیارییە. دەگێڕنەوە یەکێ لە ئەنصارەکان گەلێ جار دوعای دەکرد کە لە خەودا چاوی بە خەلیفەی دووەم عومەر بکەوێ (ر.خ). بەخواستی خوا پاش دە ساڵ لە وەفاتی عومەر لە خەودا چاوی پێ کەوت عارەق لە ناوچاوانی دەهاتە خوار و خۆی خەریکی وشك کردنەوەی بوو و دەیسڕی. پێی وت: یا ئیمام! چیت بەسەر هات؟ فەرمووی: ها ئێستا ڕزگار بووم؛ ئەگەر ڕەحمی خوا نەبووایە بەهیلاکدا دەچووم و تووش دەبووم.

برادەران! ئەم درێژەدانە بەموحاسەبە و لێپرسینەوە لەبەرئەوە نەبووە کە، خوا نەخواستە، ئەو زاتە حاڵی خراپ بووبێ، بەڵکو لەبەرئەوە بووە کە بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی موسڵمان لە دنیادا لە سەردەمی خەلافەتیدا لەسەر ئەو بووە، لەوانەیە هەندێ لەو خەڵکە قسورێکیان بووبێ و بەهۆی ئەوانەوە حسێبی ئەم درێژەی کێشابێ. لە حەدیسی شەریفدا هەیە: بەڕاستی ئەوەی لە پاش مردن فریای ئینسان دەکەوێ یەکەم: زانستێکە کە ئینسان لەماوەی ژیانیدا بڵاوی کردبێتەوە. دووەم: نەوەییەکی خواناس و کردار چاکە کە لە پاش

مردنی باوکی لە خوای گەورە بپارێتەوە لە باوکی خۆش ببێ و لە گوناهەکانی ببوورێ.
سێیەم: خێرێکی نەبڕاوەی بەردەوام وەکو مزگەوت یا مەدرەسە یا میهمانخانە یا خەستەخانەیێ کە مرۆڤ لە سەردەمی ژیانیدا لە ڕێگەی خوادا دروستی کردبێ.

ئینجا براکان! لەبەرئەوە کە مردن لە هەموو شتێ نزیکترە لە ئینسان پێویستە هەرکەسێ نەخۆش کەوت، نەبادا ئەو نەخۆشییە نەخۆشیی مردن بێ، لەپێش هەموو شتێکا لە گوناهەکانی پەشیمان بێتەوە و لە خوای گەورە بپارێتەوە، لێی خۆش بێ، هەرچی لەسەریەتی، چ حەقی خوا وەك حەج چ حەقی خەڵك وەك قەرز و مامەڵەی دنیایی، وەسیەت بکا بۆ جێبەجێ کردنیان. جا هەر خێری کە بەباشی دەزانێ باسی بکا. ئەگەر توانای نووسینی بوو، بنووسێ: «من العبد الذليل إلى الرب الجليل» خوایە! ئەمە یەکەم هاتنێکە کە بۆ لای قاپی کەرەم و میهرەبانیی تۆیە. خوایە! لەگەڵ ئەم بەندە زەلیلەتدا باش بە و ڕەحمی پێ بکە. خوایە! هەر میوانێ ڕوویکاتە ناو هۆزێ ڕێزی لێ دەگرن. خوایە! لەسەر عادەتی خۆت کە لە ناو بەندەکانی خۆتدا دات ناوە (یا مدبر الخلائق أجمعين!) لەگەڵ ئەم میوانی کەرەم سەرای خۆتدا ڕەحم و میهرەبانی بفەرموو. یا ڕەحیم! تۆی (أرحم الراحمين). یا کەریم! تۆی (أكرم الأكرمين). خوایە! هەتا لە ژیاندا بووم هەمیشە یەك لە دوای یەك چاکەت لەگەڵ کردووم. من هەرچەند گوناهبار بووم، تۆ لوتف و نەوازشت لەگەڵ کردووم. من هەرچەند سوپاسی نیعمەتی تۆم بەجێ نەهێناوە، تۆ نیعمەتی خۆتت لە من نەبڕیوە. ئێستا کە لە حاڵێکدام ناتوانم گوناه بکەم و توانای موخالەفەم نەماوە و، لە هەموو کاتێکیش موحتاجترم بەڕەحمی تۆ و لە هەموو کاتێ زەبوونتر و داماوترم، لوتف و کەرەمت لەم بەندە مەنع مەفەرموو. لە پاش مردن میوانم و داماو و بێ قابیلییەت و موحتاجی چاکەی تۆم و، تۆیش خواییەکی حەز دەکەی بەندەی خۆت عەفوو بکەی، خوایە! عەفووم بکە و لەو سزایانەی لێیان دەترسم بمپارێزە (یا أرحم الراحمين!).

براکان! لەم نامەیەدا کەمێکم لە چۆنیەت سەفەری قەبرم باس کرد. لە نامەکانی دۆزەخ و بەهەشتیشا، ئەگەر خوا مەیلی بێ، حاڵی ئەهلی دۆزەخ و ئەهلی بەهەشتیان بۆ باس دەکەم. ئومێدەوارم سوودیان لێ وەربگرن. (والسلام).

سوپاس بۆ خوای گەورە شەوی شەممە ١٦ی مانگی سەفەری ساڵی (١٣٩٧)ی کۆچی، ڕێکەوتی ٥ی مانگی شوباتی (١٩٧٧)ی زایینی لە وەرگێڕانی ئەم نامەیە بوومەوە.

## نامەی چل و نۆیەم

# باسی دۆزەخ دەکا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد الله. والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه وأتباعه المجاهدين في سبيل الله.

لەپاش ئەمانە بزانن بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) ئەم نامانە کە من بۆ ئێوەیان دەنێرم گەورەترین دیارییەکن کە موسڵمانان بۆ یەکتریان بنێرن؛ چونکە ڕیوایەت کراوە هیچ دیارییەك نییە کە موسڵمان بۆ برای موسڵمانی بنێرێ چاکتر و بەنرختر بێ لە وتارێکی دینی کە خوای گەورە هیدایەتی ئەو برایەی پێ زیاد بکا یا زیانێکی لێ دوور بخاتەوە؛ لەبەرئەوە تکام لە دۆستان ئەوەیە ئەم دیارییە لە دۆستانی خۆیان قبووڵ بکەن، بەجۆرێ کە بیخوێننەوە بۆ موسڵمانان و نوسخەیشی لێ بگرنەوە هەتا بە پاداشتێکی چاکی گەورە شادببن. هەروەها هیوادارم کە نەخوێنەوارەکان گوێ بۆ ئەم نامانە ڕابگرن؛ چونکە گوێ ڕاگرتن بۆ ئامۆژگاریی ئاینی لە گەورەترین خێرەکان حسێب دەکرێ و نیشانەی بەهێزیی ئیمانە؛ چونکە لە حەدیسی شەریفدا هەیە یەکێك لە گەورەترین خوو و ڕەوشتەکانی موسڵمان، ئەوەیە هەرگیز لە بیستنی ئامۆژگاریی خێر تێرنەبێ.

براکان! دەخیلتان بم هەروەکو ڕەوا نییە لە ڕەحمەتی خوای گەورە نائومێد بن نابێ لە مەکر و قینی خواش ئەمین بن، چونکە خوا بێ باکە و ئەگەر بەهۆی یەك گوناهی بچووکەوە، تاوانبار لە میهرەبانی و ڕەحمی خۆی بێ بەش بکا، عەیب نییە و بۆ خواییی خوا عەداڵەتە. خوای گەورە هەروەك غەفوور و ڕەحیم و میهرەبانە (شديد العقاب)یشە و تیژ تاوانبار دەگرێ. ڕیوایەت کراوە غەزەب و قینی خوا لە گوناهی بچووکدا پەنهانە وەك چۆن لە گوناهی گەورەدا پەنهانە. لەبەرئەمە ڕێك دەکەوێ یەکێ سەد جار گوناهی گەورە دەکا، لەگەڵ ئەوەشدا دووچاری غەزەبی خوا نابێ. واش ڕێك دەکەوێ لە کاتی کردنی گوناهێکی بچووکدا غەزەبی خوا دێتە خوار بۆ سەر تاوانبار (أعاذنا الله بلطفه). بەڵام

ئەو سوورەتە زۆر کەم ڕوودەدا؛ چونکە ئینسان زۆرتر لە گوناهی گەورە تووشی غەزەبی خوا دەبێ. جا لەبەرئەمەی کە وتمان پێویستە ئینسانی موسڵمان وەکو لە گوناهی گەورە پارێز دەکا لە گوناهی بچووکیش خۆی بپارێزێ. هەروەها لە عیبادەت کردنیشدا هەروەك بۆ گەورەکانی هەوڵ دەدا، بۆ عیبادەتە بچووکەکانیش هەوڵ بدا.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: نەمدیوە مسیبەتی وەکو ئاگری دۆزەخ کە ئەو کەسانەی لێی دەترسن، لێی غافڵ دەبن، واتە: مادام ئینسان بەهۆی گوناهەوە شایانی سزای ئاگر دەبێ دەبووا موسڵمانان هەموو لە گوناه ڕابکەن و توخنی نەکەون و خۆیان لەو سزا و ئازارە نابارە بپارێزن. هەروەها نەمدیوە نیعمەتی گەورە و نەبڕاوەی تالب زۆری وەك بەهەشت کەچی تالبەکانی هەموو نووستوو و بێ ئاگا بن و زەحمەت نەکێشن بۆ پەیداکردنی، واتە: هەموو موسڵمانێ حەز لە بەهەشت دەکا و، دیارە یەکێ حەز لە شتێ بکا دەبێ هەوڵی بۆ بدا، کەچی موسڵمانان ئەو هەوڵەی پێویستە نایدەن و ئەو عیبادەتەی پێویستە نایکەن و بەتەمەڵی تەمەنی خۆیان ڕادەبوێرن. دیارە سیری تەعەجوب کردنەکەی حەزرەت (د.خ) ئەوەیە کە کێشانی سزای ئاگر لە توانای ئینسان بەدەرە و نیعمەتی بەهەشتی نەبڕاوەیش خۆشییەکەی لە حەد بەدەرە، جێی سەرسووڕمانە موسڵمان خۆی لە ئاگری دۆزەخ نەپارێزێ و هەوڵی چوونە بەهەشت نەدات!.

ڕیوایەت کراوە: «ما مثل الدنيا في الآخرة إلا كما يغمس أحدكم أصبعه في أليم فانظر بم ترجع؟» واتە: دنیا ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ قیامەتدا وەك ئەو ئەندازە ئاوەیە بەپەنجەی ئینسانەوە بێ کە بیژەنێ بەدەریادا.. ئاخۆ ئەو پەنجە چەندێ ئاو لەگەڵ خۆیدا بهێنێ؟ واتە: دنیاکە ئەو ئاوەیە بەپەنجەکەوە هاتووە و قیامەتیش دەریاکەیە. مەبەستی ئەوەیە: خۆشی و سزای دنیا ئەگەر لەگەڵ هی قیامەتدا بەراورد بکرێ، قەترە بەدەریایە؛ بۆ نموونە: شەقەمشار کردنی ئینسان و دەرزی بەژێر نینۆکا کردنی لە دنیادا لەچاو سزا و ئازاری دۆزەخدا، هەروەها خۆشی و ڕابواردنی ئینسان لە دنیادا لەچاو خۆشی و ڕابواردنی قیامەتی نەبڕاوەدا قەترە بەدەریایە. ئێشی نێشی دووپشکی دنیا لەچاو ئێشی نێشی دووپشکی قیامەتدا قەترە بەدەریایە. من لەم نامەدا شتێکی کەم لە سزای قیامەتتان بۆ باس دەکەم و، لە نامەی بەهەشتیشا کەمێ لە خۆشی و لەزەتی قیامەتتان بۆ باس دەکەم بەڵکو (ئنشەڵڵا) لە ئەسبابی سزاکەی دوور بکەونەوە و لە ئەسبابی لەزەتەکەی نزیك ببنەوە.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەرچی جیبرەئیل هاتووەتە، لام هەر بەڕووگرژییەوە چاوم پێ کەوتووە. جارێ لێم پرسی: بۆچی تۆ وەها شێوەت گرژ و مۆنە؟ وتی: لەوکاتەوە دۆزەخ دروست کراوە من پێ نەکەنیوم. وتم: ئەی میکائیل بۆچی وا ڕووی ترشە؟ وتی: ئەویش هەر لە ترسی دۆزەخ و لە ترسی غەزەبی خوایە (جل جلالە).

ڕیوایەت کراوە: کاتێ خوای گەورە دۆزەخی دروست کرد مەلائیکەکان هەموویان دڵیان لە جێگەدا نەما و، وەها حاڵی بوون کە ئەو دۆزەخە بۆ سزای ئەوانە، هەتا ئادەمی دروست کرد ئەوجا دڵیان دامرکا، چونکە بۆیان دەرکەوت کە دۆزەخ بۆ ئەوان دروست نەکراوە، ئەگەرچی مەلائیکەش هەرگیز لە مەکری خوا ئەمین نەبوون و ئەمین نین.

(وروي أنه يدفع الله بمن يصلي عمن لايصلي، وبمن يزكي عمن لايزكي، وبمن يصوم عمن لايصوم، وبمن يحج عمن لا يحج، وبمن يجاهد عمن لايجاهد. ولو أجتمعوا على هذه الأشياء لما أنظرهم الله طرفة عين. ثم تلا: «ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض...» الآية) واتە: خوای گەورە لە دنیادا بەهۆی ئەوانەوە کە نوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن و زەکات دەدەن و حەج دەکەن و لە ڕێگای خوادا جیهاد دەکەن، ئەوانە دەپارێزێ کە ئەم واجبانە جێبەجێ ناکەن، بەڵام ئەگەر هەموویان بەتێکڕا واجیبەکان تەرك بکەن بەقەدەر چاو بەیەکادانێك مۆڵەتیان نادا و تووشی سزایان دەکا. دیارە ئەم ڕزگار کردنی تاوانبارە بەهۆی پیاوچاکانەوە هەر لە دنیادایە. لە قیامەتا سزای خۆیان وەردەگرن مەگەر خوای گەورە بەمیهرەبانیی خۆی لێیان ببوورێ و عەفوویان بکا.

ڕیوایەت کراوە یەکێ لە هاوڕێیەکانی پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: کە لە غەزای ئوحود گەڕاینەوە هەموومان مەدحی هەڵمەتبردن و شەڕکردنی کەسێکمان دەکرد. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: کێیە ئەو کەسە؟ من نایناسم! هەرچەند بەیانمان کرد ئەو دەیفەرموو: نایناسم. تا خۆی دەرکەوت و عەرزمان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو کەسە کە باسمان کرد ئەمەیە. فەرمووی: ئەمە لە ئەهلی ئاگری دۆزەخە. ئێمەش وتمان: ئەگەر ئەمە ئەهلی دۆزەخ بێ، کێ لە ئێمە ئەهلی بەهەشت دەبێ؟ فەرمووی: قەسەم بەو کەسە کە گیانی من لە دەستی قودرەتی ئەودایە ئەم شەخسە نامرێ هەتا موستەحەقی ئاگر نەبێ. پاش ماوەیەك ئەو شەخسە زەخمدار بوو زەخمەکەی ئازارێکی زۆری پێ دەگەیاند، ئەویش خۆی لەبەر ئەو ئێشەدا نەگرت، هات مشتووی شمشێرەکەی لە زەوی قایم کرد و سکی خۆی دا بەسەریدا هەتا نووکی شمشێرەکەی لە پشتیەوە دەرهات و گیانی دەرچوو. (عن

إبن مسعود رضي الله عنه قال: قال الرسول الله صلى الله عليه وسلم: أن الرجل يعمل بعمل أهل الجنة حتى مايكون بينه وبينها إلا ذراع فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل النار فيدخلها) واته: له عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودەوە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: پیاوی وا هەیە هەمیشە کاری وا دەکا کە هی بەهەشتییە و دەگاتە ڕادەییەك کە بۆ بەهەشت بەقەدەر باڵێکی دەمێنێ، لەپڕ ئەوەی خوا بۆی نووسیوە لێی پێش دەکەوێ و کارێکی وا دەکا پێی دەچێتە ئاگری دۆزەخ.

ڕیوایەت کراوە: هەموو ڕۆژێ دوو جار دۆزەخ دەکەوێتە سەدا و ناڵەوە و دەنگێکی وای لێ دەردەچێ جین و ئینس نەبێ هەموو مەخلووقێ دەیبیسێ. براکان! دەخیلتان بم هەموو سەعاتێ بڵێن: خوایە پەنا دەگرین بەتۆ لە سزای دۆزەخ، هیوام وایە بەخوا هەرکەس بەسۆزی دڵ و بەئەدەب و بە تەوبە ئەو قسە بکا خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ دووری دەخاتەوە. لە حەدیثی شەریفدایە: کە لەلایەنی خواوە ئەمر دەردەچێ فلانە بەندە ببەن بۆ دۆزەخ. جا کە ئەو بەندە لە دۆزەخ نزیك دەکەونەوە دۆزەخ خۆی لی دوور دەخاتەوە. لە دۆزەخ دەپرسن: بۆچی خۆتی لێ دوور دەخەیتەوە. لە وەلامدا دەڵێ: ئەم کەسە لە دنیادا چەند جار پەنای گرتووە بەخوا لە ئاگری من و وتوویە: خوایە! پەنام بەتۆ لە سزای دۆزەخ، دیارە پەنای خوایش پەناییەکی گەورەیە، بۆیە منیش لەبەر خاتری پەنای گەورەی خوا لێی دوور دەکەومەوە تا لە منەوە تووشی ئازار نەبێ. لەم کاتەدا لە لایەن خوای گەورەوە ئەمر دەردەچێ کە ئەو بەندەیە ڕزگار بکەن و مەیخەنە دۆزەخەوە؛ چونکە لە دنیادا ناوی منی بردووە و پەنای پێ گرتووم لە سزای دۆزەخ. هەروەها لە دنیادا هەر ڕۆژێ زۆر گەرم بووبێ ئەو بەندەیە وتوویە: ئەمە گەرمای دنیایە، وەها ئازارمان دەدا دەبێ گەرمای دۆزەخ چۆن بێ؟ خوایە! پەنا بەتۆ لە سزای دۆزەخ؛ جا ئەمڕۆ لە پاداشی ئەو پەناهێنانەیدا لە دنیادا پەنای گرتووە بەخوا لە زەمهەریری دۆزەخ، منیش ئیستە بە زەمهەریری دۆزەخ سزای نادەم. برادەران! ئەم پەنا بەخوا گرتنەش لەسەر یارمەتیی خوای گەورە ڕاوەستاوە و هەروا ئاسان نییە؛ زۆرکەس هەن لەفزی (پەنا بەخوا)یان بەدەمدا ئاسان نییە؛ زۆرکەس هەن بەدەم دەیڵێ و بەدڵ نایڵێ و ئاگای لێ نییە. جا پێویستە ئینسانی موسڵمان بەدڵسۆزی و عەزمەوە پەنا بەخوا بگرێ هەتا خوای گەورە لێی قبووڵ بکا. زۆر شتێکی بەجێیە ئینسان ڕۆژێ سەد جار بڵێ خوایە پەنام بەتۆ لە غەزەبی تۆ و لە ئاگری تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا؛ چونکە سزای دۆزەخ زۆر سەخت و گرانە.

ڕیوایەت کراوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەمر، دەردەکرێ دۆزەخ بهێنن، جا حەفتا هەزار مەلائیکە بەحەفتا هەزار لغاوەوە دۆزەخ ڕادەکێشن، هێشتا چەن ساڵە ڕێگا لە ئەهلی مەحشەرەوە دوورە کە بەدەنگێکی زۆر گەورە هاوار دەکا و دەڵێ: «إلي أهلي» واتە: ئەوانەی دۆزەخین و ئەهلی منن بابێن. لەو کاتەدا لە ترسی هەیبەتی بێجگە ئەنبیا و مەلائیکە و مورسەلین کەس ناتوانێ ڕاوەستێ و هەموو بەچۆکا دێن. پێغەمبەرەکان (د.خ) هەرکەس بۆ خۆی دەڵێ: «نفسي نفسي» خوای گەورە لە قورئان دەفەرمووێ: «كل أمة جاثية» واتە: لەو ڕۆژەدا هەمووان لە ترس و هەیبەتی خوادا چۆك دادەدەن و ناتوانن بەقەد تۆزقاڵێ قسە بکەن. جا براکانم! ئەم حاڵە لە بیستنی دەنگەکەیەوە بێ، پەنا بەخوا، لە چاوپێکەوتن و تێکەوتنیەوە دەبێ چۆن بێ؟

براکان! ئەو دۆزەخە کە خوا دروستی کردووە و، کردوویەتی بەجێگای سزادانی کافران و تاوانباران، زۆر گەورەیە مەگەر هەر خوا بزانێ وەزعی چۆنە؟ بەکورتی: نۆ چینە، حەوت قاپیی هەیە، بەرزترین چین ناوی (جهنم)ە تایبەتییە بۆ تاوانبارانی ئوممەتی محەمەد (د.خ). مەلائیکەی سزادان لە (جهنم)دا پێیان دەڵێن (زەبانییە). ئەمانە نۆزدە کەسن و سەرگەورەکەیان ناوی مالیکە.

«قال علي، رضي الله عنه: مكتوب على باب الجنة. من خالف هواه كانت الجنة مأواه. ومن أطاع هواه كانت النار مثواه. ومكتوب على باب الجنة: أنت محرمة على كل بخيل ومراء وعاق ونمام وديوث»

واتە: حەزرەتی عەلی، خوای لێ ڕازی بێ، فەرموویەتی: لەسەر دەرگای بەهەشت نووسراوە: هەرکەس بەپێچەوانەی ئارەزووی نەفسی خۆی بجووڵێتەوە بەهەشت جێگایەتی و، هەرکەس بەپێی ئارەزووی نەفسی خۆی بجووڵێتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخ جێگەیەتی. هەروەها لەسەر دەرگای بەهەشت نووسراوە: ئەی بەهەشت! تۆ حەرام کراوی لەسەر هەموو ئینسانێکی بەخیل و ڕژد و ڕیاباز و بێ ئەدەب لەگەڵ باوك و دایکدا و، لەسەر هەر کەسێ قسە بینێ و ببا لە ناو خەڵکدا بۆ تێکدانیان و، لەسەر هەموو کەسێکی دەویت و بێ نامووس.

لە دۆزەخدا چەند کێو و چەند شیو هەیە کە ناوی هەندێکیان لە قورئانی پیرۆزدا دیاری کراوە. خوای گەورە بە ڕەحمەت و کەرەمی خۆی پەنامان بدا لە هەموویان. جا ئەو کێو و شیوانە کە وان لە دۆزەخدا هەریەکی بۆ جۆرە سزایێ دروست کراون. لەو شیوانەدا

جۆراوجۆری مار و دووپشك و جانەوەری ژاراویی وەها هەیە کە مەگەر هەر خوا بزانێ ئازاریان لە لەشی ئەهلی دۆزەخدا چەند زۆرە؟ لە ناو ئەو شیوانەدا چەند تەنووری سوورەوەکراو هەیە کە ئەهلی سزایان تێ فڕێ دەدرێ و ئازاریان دەدەن، ئاگرەکەیان ئەوەندە توند و تیژە کە دای لە لەشی ئینسان گۆشت و پێست و ئێسقانی دادەڕزێنێ. ئەوەی دەخرێتە ئەو تەنوورانە بە ئەندازەی خراپیی کردەوەکەی تەنوورەکەی لێ تەنگ دەکرێتەوە. ئاگری دۆزەخ لە بەردی کبریتە، واتە: سووتەمەنییەکەی لە ماددەی گۆگردە، چونکە لە بەردی گۆگرددا لە کاتی داگیرساندا چەند جۆرە سزایەك هەیە، یەکەم بۆنی زۆر زۆر بۆگەنە. دووەم کە لکدا بە لەشی ئینسانەوە لێی جیا نابێتەوە هەتا پشت و گۆشت و ئێسقانی دەخوات. سێیەم گەرمای لە هەموو گەرمیێ زیاترە. ئەهلی دۆزەخ جلوبەرگیان لە قەترانە و بەسەر ئەو قەترانەیشدا لێفە دەپۆشن. ئەمەش جۆرە سزاییەکە. پوختەی قسە: کافرەکان بەدەوام و موسڵمانە تاوانبارەکان بەقەدەر تاوانەکەیان بەئەنواعی سزا و ئازار سزا دەدرێن و سەعات بەسەعات سزایان بۆ زیاد دەکرێ، وەکو خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: «فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَاباً» واتە: دەی بچێژن لەم سزایە بەڕاستی لەمەوپاشیش هەر سزاتان زیاد دەکەین. بێگومان هەر پیاوێك و هەر ژنێك جۆرە سزاییەکی تایبەتی هەیە، بۆ نموونە: ئەو ژنانە کە بەبالای مردوودا دەخوێنن و مەجلیسی شین و گریان خۆش دەکەن و باسی شان و باهووی مردووەکە دەکەن و دانیشتووان دەهێننە گریان مادام لەو کردەوەیانە پەشیمان نەبنەوە، ئەوە کراس و ژێرکراسیان لە قەتران دەبێ و تووشی گەڕۆڵی دەبن و زنجیر و تەوق دەکەنە گەردنیان و هەر زنجیرێ چەند کەسی لەسەر مەئموورە و ناوی خاوەنەکانیان لەسەر نووسراوە هەتا سزاکەی دیاری بێ. هەروەها ئەگەر سەد هەزار ئینسانی عادەتی لەشوێنێکدا ڕاوەستن و یەك نەفەری دۆزەخی لەناویاندا ڕاوەستی بە بۆگەنیی پێستی خۆی هەموو ئەو خەڵکە ماندوو دەکا و هەناسەی ئەو هەموویان لە حاڵی تەبیعی دەردەکا.

حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ژیانی ئەبەدی دراوە بە ئەهلی دۆزەخ، بێگومان ئەگەر مردن بووایە چاکتر دەبوو بۆیان، لەم جۆرە ژیانە، لەباتی ئەو جلوبەرگە دەکرێتە بەریان، ڕووت بوونایە باشتر بوو. بەڵام ئەمەش جۆرێکی تایبەتییە لە سزا و ئازار بۆ ئینسان لە دۆزەخدا. ئەو چەکوش و ئاسنەی وان بەدەستی زەبانییەکانەوە، بەهەموو خەڵکی جیهان بەرز ناکرێنەوە. ئەگەر یەکێ لە زەبانییەکان یەکێ لەو کوتەکانە هەڵبگرێ و بیدا بەسەر کێوێکدا ئەو کێوە وردوخاش دەکا. هەروەها هیچ پارچە

گۆشتێ لە لەشی ئەهلی دۆزەخدا نییە کە زەربەی چەکوشی بەرنەکەوتبێ و، هەرجارێ لێیان دەدرێ هەموو جمگەی لەشیان لەیەك جیا دەکاتەوە، پاش ئەوە جارێکی تر ئەو جوگمە و ئەندامانە دەدرێنەوە دەم یەك و سزایان دووبارە و سێبارە دەکرێتەوە. ئەمەش جۆرە سزاییەکە کە بۆ ئەهلی دۆزەخ دانراوە.

خوای گەورە هەورێکی تاریك دێنێ بەسەر ئەهلی دۆزەخدا و لێیان دەپرسن: چیتان دەوێ بباری بەسەرتاندا؟ ئەوانیش هەوری دنیایان دێتەوە یاد و دەڵێن ئاومان دەوێ، بباری بەسەرماندا تا، بیخۆینەوە، کەچی ئەو هەورە تەوقی ئاسن و زنجیر دەبارێنێتە خوارەوە کە بچێتە گەردنیان، ئەمەش جۆرێکە لە سزا کە بۆ ئەهلی دۆزەخ دانراوە.

پوختەی قسە: ئەهلی سزا هەردەمێ بەجۆرێ سزایان بەزیادەوە بۆ دەگۆڕێ وەك خوای گەورە فەرموویەتی: (فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابا).

ڕیوایەت کراوە: ئەو ئەهلی عەزابە هاوار دەکەن و دەپاڕێنەوە و دەڵێن: خوایە! هەر سزایەکمان بۆ دەنێری قبووڵمانە تەنیا غەزەبمان لێ مەگرە؛ چونکە هەرکاتێ غەزەبمان لێ بگری ئەو تەوق و زنجیرانە تەنگتر دەبن و زیاتر ناڕەحەتمان دەکەن. ئەمەش جۆرە سزاییەکە بۆ دۆزەخییەکان.

هەروەها مسی تواوە دەڕێژن بەسەریاندا و دەڕواتە ناو سکیانەوە و ڕیخۆڵەکانیان پارچە پارچە دەکا و لە دەمیانەوە دێنە دەرەوە.

خواردەمەنیی ئەهلی دۆزەخ، جۆرجۆرە؛ هەر یەکێکیان جۆرێکی بۆ دیاری کراوە. جۆرێ لەوانە زەققوومە کە ئەگەر قەترەییەکی بێتە دنیاوە دەبێتە هۆی تاڵبوونی ژیانی خەڵکی سەر زەوی و ئاوەکەیان تاڵ دەکا. (أعاذنا الله منها). جا براکانم! کەسێ زەققوم خواردنی بێ و حەمیم خواردنەوەی بێ دەبێ حاڵی چۆن بێ؟ هەروەها ئەهلی دۆزەخ زەققوم دەگەزن تا بیخۆن، ئەویش لێوی ئەمان دەگەزێ. ئەمەش جۆرە سزاییەکە.

یەکێکی تر لەوانە کە سزای دۆزەخییەکانیان پێ دەدرێ (ضریع)ە. ضەریع دڕکێکە لە ئاگر گەرمترە و لە تاڵی شار تاڵترە و بۆنی لە بۆنی مردارەوەبوو بۆگەنترو پیسترە، کە دۆزەخی دەیخوات لە گەروویدا دەمێنێتەوە، نە پێی قەڵەو دەبێ و نە سوودێکی هەیە بۆی، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: «لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ[٦] لَا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ». دیارە مەبەست لە خواردنی خواردەمەنی یا لابردنی برسییەتییە یا قەڵەوبوونە،

کەچی لە خواردنی زەریعدا هیچ کام لەمانە نایێتەجێ. ئەمەش جۆرە سزاییەکە. خوای گەورە برسیەتی و تینوێتی دەدا بەسەر دۆزەخییەکاندا، کاتێ هاواری برسیەتی دەکەن خوا ئەمر دەفەرموێ زەریعیان پێ دەدەن، کاتێ کە تینوویان دەبێ و هاوار دەکەن بۆ ئاو ئەمر دەفەرمووێ حەمیمیان پێ دەدەن؛ بەزۆر دەمیان دەکەنەوە و حەمیمەکەی تێ دەرژێنن، جا کە ڕۆیشتە ناو دەمیانەوە هەمووی دەسووتێنێ و، کە ڕۆیشتە خوارەوە قورگ و ناوسینگ و گەدە و ڕیخۆڵەیان دادەرزێنێ. ئەمجارە دووبارە لەبەر ئێش و ئازار دەس دەکەن بەهاوار کردن هەتا فرمێسك لە کاسەی چاویانا نامێنێ و دەبێ بەخوێن، بەوجۆرە هاوار بۆ کاربەدەستەکانی دۆزەخ دەبەن کە لە حوزووری خوای گەورەدا تکایان بۆ بکەن ڕۆژێ سزایان لەسەر هەڵگرێ یا سزاکەیان سووك بکا، وەڵامیان دەدەنەوە و دەڵێن: ئایا لە کاتی خۆیا لە جیهانا پێغەمبەران و ڕەهبەران نەهاتبوونە ناوتان کە لە سزای ڕۆژی قیامەت بتانترسێنن؟ دەڵێن بەڵێ وەڵڵا هاتن و ترساندینیان، بەڵام ئێمە بەدبەخت و قیرسیچم بووین و بەگوێمان نەکردن. ئەمجار هاوار دەکەن لە مالیك کە گەورەی زەبانییەکانە و، پێی دەڵێن: لە خوای گەورە و پەروەردگار بپاڕێرەوە بۆمان کە بمانکوژێ. لە پاش هەزار ساڵ، مالیك وەڵامیان دەداتەوە: کە بڕیار دراوە بەم جۆرە لە دۆزەخدا بمێننەوە! ئەمجار لە ناو خۆیاندا دەڵێن: چاك وایە خۆمان هاوار لە خوا بکەین کە (أرحم الراحمين)ە و، دەپاڕێنەوە و دەڵێن: خوایە! لەم شوێنە دەرمان کە، ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ کوفر و بەدکاری ئەوا بێگومان فرە زاڵم و ستەمکارین. ئەمجا خوای (ذو الجلال والأكرام) دەفەرموێ: دووربکەونەوە و ئیتر قسە مەکەن، ئەوانیش بەتەواوی نائومێد دەبن و هیچ هیوای خێریان نامێنێ و دەڵێن: «قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوماً ضَالِّينَ[١٠٦] رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ».

خوای گەورە لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: «قَالَ اخْسَؤُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ». واتە: بڕۆن بەداماوی بکەون و قسەم لەگەڵدا مەکەن. ئیتر مۆر دەنرێ بەسەر زمانیاندا و قسە ناکەن. بێگومان ئائەمە کە لە وان ڕوودەدا هەزاران هەزار سزا و نارەحەتییە. ئەو خواردنەوەی بە دۆزەخییەکان دەدرێ، ئەگەر یەك دۆڵچەی بەسەر ڕووی زەویدا برژێنن، هەمووی بۆگەن دەبێ. کاتێ کە نزیکی دەموچاویاون دەبێتەوە پێست بەڕوویانەوە نامێنێ و هەموو ڕوومەتیان دەبێتە بوریانی، ئەو خوێنەو ئەو ناوە پیسە کە لەڕوویان دەتکێ، دەیکەنە پیالە و دەرخواردیان دەدەن. ئەمەیش جۆرێکی ترە لە سزا. لە دۆزەخدا سەرچاوەیێ هەیە ناوی (آنية)یە وەك خوای گەورە لە قورئانا دەفەرموێ: «تسقي من عين

آنیة». مەعنای (ئانییە) ئەوەیە کە گەرمە و گەرمییەکەی بەنیهایەت دەرەجە گەیشتووە و لە دۆزەخدا ئاوی لەوە گەرمتر نییە لەم ئاوە بەزۆر دەکەن بەقورگیاندا. هەروەها لە دۆزەخدا سەرچاوەییەکی تر هەیە ناوی (غساق)ە. ساردیی ئاوەکەی وەهایە ئەگەر کەسێ بڕواتە ناوی دەیبەستێ و دەبێ بە سەهۆڵ. هەر جارێ کە ئەهلی سزا لەو ئاوە هەڵدەکێشن پێست و گۆشتیان لەسەرەوە هەتا گرێی پاژنەیان دادەماڵێ بۆ خوارەوە وەکو یەکێ بەرگێکی لەبەرابێ و یەکسەر دای کەنێ. ئەمەیش جۆرە سزاییەکە. لەدەوران دەوری دۆزەخدا، گەلێ بیر هەیە پڕن لە ماری ژاراوی، هەرکاتێ دۆزەخییەکان داوای سووك کردنی سزا و ئازار دەکەن، ئەمر دەکرێ بەو مارانە دێنە دەرەوە، کە دۆزەخییەکان چاویان بەو مارە ژاراوییانە دەکەوێ لە ترساندا دەگەڕێنەوە بۆ ناو دۆزەخ و دەڵێن: سزاکەی خۆمان لە سزای ئەم مارانە ئاسانترە. ئەمەش جۆرێکە لە سزای دۆزەخییەکان. دیارە هەر جۆرە حەشەرە و گیانلەبەرێ کە لە دنیادا هەن، بۆ ئازاردانی خەڵکی لە دۆزەخیشدا هەن و ئازاری بێ ئەندازە بەدۆزەخییەکان دەگەیێنن. هەروەها لەشی ئەو داماوانە تووشی گەڕۆڵی دەبێ و ئەوانیش دەست دەکەن بەخوراندنی لەشیان، هەتا خوێنی لێ دێ، بەڵکو هەتا هەموو گۆشتی لادەچێ و ئێسقانەکەی دەردەکەوێ. لەو کاتەدا لێیان دەپرسن: ئایا ئەم گەڕۆڵییە ئازارتان دەدا. لە وەڵامدا دەڵێن: بەڵێ. ئینجا پێیان دەڵێن، ئەمە پاداشتی ئەوەیە کە لە دنیادا ئازاری خەڵکیتان دەدا و موسڵمانان بەدەستتانەوە بێ ئیستیراحەت بوون. ئەمەش جۆرێکە لە سزایان.

کافرەکان لە دۆزەخدا دەئاوسێن و، خوای گەورە لەشیان ئەوەندە گەورە دەکا کە ئێمە لەم حاڵی دنیایەدا عەقڵمان بۆی ناچێ. ئەم گەورە کردنەش لەبەرئەوەیە هەتا لەشیان زۆر ئازار و سزا وەربگرێ؛ چونکە ڕیوایەت کراوە: کاتێ ئاگر بەردەدرێتە لەشیان و هەڵدەگیرسێ یەکەم پێستیان و دووەم گۆشتیان و سێیەم ڕەگیان و چوارەم ئێسقانیان، پاش ئەمانە مێشکیان و مۆخیان ئینجا هەموو ناو سك و دڵیان ئاگری تێ بەردەبێ. جا ئەگەر سزادرا و کافر بێ، ئەوە هەتا هەتایە بەم شێوەیە سزا دەدرێ. خۆ ئەگەر موسڵمانێکی تاوانبار بێ، ئەوە سزا دەدرێ هەتا لە گوناهەکانی پاك دەبێتەوە و شایانی ئەوە دەبێ بگوێزرێتەوە بۆ بەهەشت.

براکان! لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن: مادام وابێ لە ئەنجامدا و پاش تەواوبوونی هەموو جۆرە سزاکان لە دۆزەخ دەردەچین و دەڕۆینە بەهەشت، جا لەمەوە جەسارەت

پەیدا بکەن بۆ گوناهکردن. بەڵام شتێکی ئاشکرایە ئەنجامی کار لای بەندەوە نەزانراوە، بە چ مەعلووم کە لە ئەهلی نەجات دەبێ و بەئیمانەوە دەمرێ؟ بەڵکو بەکافری بمرێ؛ (والعیاذ باللە) دووبارە وەکو لە دنیادا بەرگە ناگرین بۆ هەندێ نەخۆشی وەك گرانەتا، چاوئێشە، دان ئێشە، سەرئێشە، سك ئێشە...تاد، لە قیامەتیشدا لەبەر ئێش و ئازارە نالەبارەکاندا خۆ ناگرین، بەڵکو سزای قیامەت بەچەند پایە لە سزای دنیا گرانتر و ناهەموارتر و تیژترە؛ لەبەرئەمە عەقڵ ئەوە پەسند ناکات کە ئینسان لەبەر خەیاڵ واز لە تەوبە و بۆ لای خوا گەڕانەوە بێنێ و، خۆی بۆ سزای ناباری ڕۆژی قیامەت ئامادە بکا. براکان! هەندێ لە سزاکانی ڕۆژی بەرزەخ و جیهانی پاش مردن و سزای ڕۆژی قیامەت کە لە حەدیسە شەریفەکاندا هەن، من لەم نامەدا یادم نەکردوون، ئەگینا حەدیس دەربارەی سزای قیامەت زۆرە.

ڕیوایەت کراوە: کە ڕۆژێ حەزرەتی جیبرەئیل هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (د.خ). کە حەزرەت تەماشای کرد، زۆر بەپەرێشانی هاتە پێش چاوی. لەوێدا فەرمووی: ئەی جیبرەئیل! چ باسە؟ بۆچی وەها نارەحەت و تێك چوویی؟ ئەویش عەرزی کرد: ئا ئێستا لە دۆزەخەوە دێم، زۆر نارەحەتم. ئینجا حەزرەت (د.خ) هەندێ باسی چۆنییەتیی دۆزەخی لێ پرسی. کاتێ کە حەزرەتی جیبرەئیل دەستی کرد بە باسی سزای دۆزەخ حەزرەت (د.خ) تاقەتی بیستنی ئەو سیفەتانەی نەما و فەرمووی: جیبرەئیل! بەسە ئیتر باسی چۆنییەتیی و ئاساری دۆزەخم بۆ مەگێڕەوە، ئەگینا دەمرم و خۆم ناگرم. جا ئەگەر جیبرەئیل هەموو سیفەتەکانی دۆزەخی باس بکردایە؛ هەموویان لە حەدیسە شەریفەکاندا باس دەکران. کەوابوو ئەوەی عەرزم کردن هەندێك بوون لە سزاکانی دۆزەخ؛ ئیتر نەمتوانی هەموویان باس بکەم؛ چونکە نامەی درێژ ئەمڕۆ بۆ هەمووکەس وەرناگیرێ و گوێی بۆ ڕاناگرن.

ڕیوایەت کراوە: کە ئەهلی سزا هیی وایان هەیە لە ماوەی تاقە سەعاتێکدا چەندین جار دەسووتێن و، هەرجارێ کە سووتان دووبارە خوای گەورە پێستەکەیان دەگۆڕێ و ئەمر دەکا بە کاربەدەستی دۆزەخ کە دووبارە بیانسووتێنن و، بەو سزایانە کە جیبرەئیل باسی کردوون سزا دەدرێن بۆ درێژەدان بەسزایان، ئەمەش جۆرێکە لە سزای موتڵەق. هەروەها جارێکی تر ئاگر ڕوویان تێ دەکا و دەیانسووتێنێ و دووبارە پێستەکەیان تازە دەکرێتەوە و هەر جانەوەرێ دڕندە و بێ قیمەت و زیانکار بێ دەنێردرێتە گیانیان و گۆشتی لەشیان دەگەزن و دەیپچڕێنن. جا ئەگەر سزادراو کافربێ ئەوە سزاکەی هەتا

هەتایە بەردەوام دەبێ. خۆ ئەگەر موسڵمانی گوناهبار بێ، تەنیا بەقەدەر گوناهەکانی سزا دەدرێ و ئەوسا ڕەوانەی بەهەشت دەکرێ، وەکو باسمان کرد.

ڕیوایەت کراوە: هەرکاتێ کۆمەڵێ لە تاوانباران دەبرێنە دۆزەخ لەو کاتەدا دۆزەخ دێ بەپیریانەوە و گەرووی درێژ دەکا، هەتا گەردنی ئەو تاوانبارانە دەگرێ، جا پێستی سەریان دادەماڵێ تا سەر ڕانیان و پێستی ڕانیان ڕادەکێشن تا قوڵاپەیان. ئەمەش جۆرە سزاییەکە.

موسڵمانە گوناهبارەکان لە پاش تەواوبوونی سزایان، بەقەدەر گوناهەکەیان بێهۆش دەکرێن؛ هەتا بەمانەوەیان لە دۆزەخدا سزا نەچێژن، تا حەزرەت (د.خ) چارەی ئەوانە دەکا و دەڕوا بۆ شوێنی تایبەتی خۆی و لەوێ دەست دەکا بەتکاکردن بۆ ئەوەی کە ئەو تاوانبارانە لە دۆزەخ بکرێنە دەرەوە و پاك بشۆردرێن و بڕۆنە بەهەشت. ئینجا پاش قبووڵ بوونی تکاکەی وەك کۆتەرەی سووتاو لە دۆزەخ دەردەکرێن و دەبرێن بۆ جۆگەیێ لە بەهەشتدا و، لەو جۆگەیان هەڵدەکێشن و هەموو ئەندامی لەشیان سپی و جوان دەبێتەوە.

هەموو جار لەلایەن خوای گەورەوە بانگ دەکرێ لە دۆزەخ بەم جۆرە بانگانە: ئەی ئاگر! ئەوانەی وان لەلاتدا بیانسووتێنە. ئەی ئاگر! گۆشت و ئێسقانی ئەوانەی وان لە لاتدا بکوڵێنە. ئەی ئاگر! ئاوی لەشی ئەو خەڵکە وشك بکەرەوە. ئەی ئاگر مەیان مرێنە با هەر سزا بچێژن. ئەم بانگکردنانەیش جۆرە سزاییەکە بۆ ئەهلی دۆزەخ پەنا بەخوا.

جا کاتێ ئەهلی دۆزەخ و ئەهلی بەهەشت هەریەکەیان لە شوێنی خۆیانا دامەزران، (مردن) لە شێوەی گیانلەبەرێکدا دەهێنن و سەری دەبڕن. ئینجا پرسیار دەکرێ لە ئەهلی بەهەشت و دەزانن ئەم سەربڕاوە چییە. هەروەها پرسیار لە ئەهلی دۆزەخیش دەکرێ و ئەوانیش دەیناسن. ئیتر ئەم وەزعە دەبێتە شایی بۆ ئەهلی بەهەشت و بەشیوەن بۆ ئەهلی دۆزەخ.

ڕیوایەت کراوە لەو کاتانەدا کە کافرەکان لە دۆزەخدا دەبن و، موسڵمانی تاوانباریش دەخرێنە دۆزەخەوە، ئەو کافرانە بەشێوەی تانە و تەشەر بە موسوڵمانەکان دەڵێن: ئێوە لای خۆتان موسڵمانن و دەبووا لە دۆزەخا سزا نەدرانایە! خوای گەورە غەزەب دەگرێ لەو کافرانە کە ئەو تانە و تەشەرە لە موسڵمانە تاوانبارەکان دەدەن و، ئیجازەی تکاکردن و شەفاعەت دەدا بۆ ئەو موسڵمانە تاوانبارانە. جا پێغەمبەرەکان و فریشتەکان و چاکانی ئوممەت دەست دەکەن بە تکا و شەفاعەت بۆیان و خوای گەورە لە دۆزەخ دەریان دەکا و ڕەوانە دەکرێن بۆ بەهەشت.

ڕیوایەت کراوە کە سەختترین سزا لە ڕۆژی قیامەتدا هی ئەوانەیە کە لە دنیادا سزای ئادەمیزادیان داوە. ئەوانە کە ئەهلی تەوحیدن، لە حەوت هەزار ساڵ زیاتر لە دۆزەخدا نامێنن و بەرودوا لە دۆزەخ دەردەکرێن بۆ بەهەشت. هەروەها ڕیوایەت کراوە: ئاخر کەس لە ئەهلی تەوحید کە لە دۆزەخ دێتە دەرەوە بۆ بەهەشت ناوی (جهینە)یە و، ئەگەر یەکێ لە ئەهلی بەهەشت لە یەکێکی تر بپرسێ: ئاخۆ کەس لە موسڵمانان لە دۆزەخدا ماوە یان نا؟ وەڵامی دەدرێتەوە: بڕۆ لە جوهەینە بپرسە.

دەگێڕنەوە: جیبرەئیل جارێ بەلای دۆزەخدا تێ دەپەڕی، لەوکاتەدا دەنگی یەکێ لە موسڵمانە سزادراوەکان دەبیسێ و زۆر بەزەیی پێدا دێتەوە؛ لەبەرئەوە زۆر لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە و تکا بۆ ئەو موسڵمانە ئازاودرارە دەکا هەتا لە دۆزەخ دەکرێتە دەرەوە، بەڵام لە لێوارەکەیدا دای دەنێن. پاش ماوەیێ موسڵمانەکە دەگری و لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕووی بکەنە بەهەشت. خوای گەورە دەفەرموێ: ئایا پەیمانم پێ دەدەی ئیتر داوای شتی ترم لێ نەکەی؟ ئەویش لە وەڵام عەرزی دەکا: بەڵێ باشە، ئیتر داوای هیچت لێ ناکەم. جا خوای گەورە ئەمر دەفەرمووێ بیبەنە ئەو شوێنەی دەیەوێ، جا بەپێی داوای خۆی دەیبەنە ناو چەند دارێکی خاوەن سێبەر و لەوێ دای دەنێن. پاش چەند ڕۆژێ پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێ ئەوە بۆچی داوای جێگەییەکی زۆر خۆش و موناسبم نەکرد. هەروەها بەم هۆیەوە پەیمانەکەی دەشکێنێ و داوای جێگەی خۆشتر دەکا، لە خوای گەورە. خوای گەورەش سەرزەنشتی دەکا و دەفەرموێ تۆ پەیمانەکەتت شکاند. بەڵام لە پاش پاڕانەوەییەکی زۆر خوا ئەمر دەفەرمووێ کە بیبەنە جێگایەکی خۆشتر لە جێگاکەی خۆی. پاش ماوەییەکی تر دووبارە دەکەوێتە پاڕانەوە و، خوای گەورەیش ئەمر دەفەرمووێ بیگوێزنەوە بۆ بەهەشت. جا بەندەکە دەڵێت: خوایە جێگە نەماوە لە بەهەشتدا بۆ کوێ بڕۆم؟ خوای گەورە دەفەرموێ: ئەوا بەقەدەر دنیا بەهەشتم پێ دای. بەندەکە باوەڕناکا و وادەزانێ، دووربێ، خوا گاڵتەی پێ دەکا؛ بۆیە دەڵێ: خوایە! تۆ بەو گەورەییەوە کە خۆت دەیزانی گاڵتە بەمن دەکەی؟ خوای گەورە دەفەرموێ: من بەجیددی پێت دەڵێم، من (أرحم الراحمين)م، وا دووجار بەقەدر دنیام پێ دای. ئیتر دەبرێتە ناو بەهەشت و دووجار بەقەدەر دنیا بەهەشتی دەدەنێ و بۆخۆی بەئاشتی جێگەی دەگرێ. (والحمد لله على ذلك). جا باسی گوشادیی شوێنی ئەهلی بەهەشت لە بەهەشتدا و، چۆن کەمترین کەس بەقەدەر دووقاتی دنیای پێ دەدرێ لە ناو بەهەشتدا؟ لەمەوپاش، خوا مەیلی لێ بێ، لە نامەی بەهەشتدا بە درێژی باسی دەکەم.

قاتی سەرووی دۆزەخ کە جێگەی گوناهبارانی ئوممەتی محەمەدە (د.خ)، لەپاش ئەوە کە گوناهبارانی ئوممەتەکە بە تکای حەزرەت (د.خ) لێی هاتنە دەرەوە بەئەمری خوا بایەك هەڵدەکا و دەدا لە دەرگاکانی دەیانجووڵێنێ و بەتەواوی ناوەکەی سارد دەبێتەوە.

تەفسیلی هاتنە دەرەوەی گوناهبارانی ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ) لەو قاتە سەرووە ئەمەیە: کاتێ کە ئەو گوناهبارانە دەچنە دۆزەخ هەزار ساڵ (یا حنان) و هەزار ساڵ (یامنان) و هەزار ساڵ (یا قیوم) و هەزار ساڵ (یا رحیم) دەکەن بەویردی خۆیان بەو ناوە پیرۆزانە هاوار لە خوا دەکەن. پاش ئەوە کە خوای عەلیم و حەکیم حوکمی خۆی بەجێ هێنا بەجیبرەئیل دەفەرموێ: بزانە گوناهبارەکانی ئوممەتی خۆشەویستی من، چییان بەسەرهات؟ جیبرەئیل عەرزی بارەگای خوا دەکا و دەڵێ: خوایە! تۆ لە ئێمە و لە هەموو جیهان گەورەتری و بە هەموو شتێ دەزانی و تۆ ئاگات لێیە چییان بەسەردا هاتووە. جا خوا دەفەرموێ: برۆ تەماشای حاڵیان بکە. کاتێ جیبرەئیل دێ بۆ دۆزەخ تەماشا دەکا (ملك)ی فەرمانداری دۆزەخ وا لەسەر مینبەر دانیشتووە و هەموو زەبانییە و مەلائیکەی سزا دەوریان داوە و مالیك فەرمان دەدا بەسزادانی ئەوانەی ئەهلی سزان. کە جیبرەئیل دەگاتە ئەوێ مالیك رێزی لێ دەگرێ و لە جێی خۆی هەڵدەستێ بۆی و لێی دەپرسێ و دەڵێ: ئەی جیبرەئیل! چی تۆی گەیاندە ئێرە؟ ئەمە شوێنی رق و غەزەبی خوایە و تۆش فریشتەی رەحمەتی. ئەویش دەفەرموێ: ئەی مالیك! چیت کردووە لەگەڵ گوناهبارانی ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ)؟ ئەویش دەڵێ: ئەی جیبرئیل! ئەحواڵیان زۆر خراپە، وان لە جێگای تەنگدا. ئاگر هەموو لەشی سووتاندوون و گۆشتی لەشی خواردوون، بەڵام تەنیا روویان بەسپیەتی ماوەتەوە. جیبرەئیل دەفەرموێ: ئەی مالیك! سەرپۆشی ئەم تەبەقەیە لابە، هەتا هەموو دەربکەون و بیانبینم. کەسەرپۆشی دۆزەخ لادەبا و جیبرەئیل تەماشایان دەکا، ئەوانیش نازانن جیبرەئیلە. جا ئەهلی تەبەقەکە هەموو بانگی لێ دەکەن و دەڵێن: ئێمە دەزانین تۆ لەطەبەقەی فریشتەین و لە مەئموورە بەرزەکانی، بەڵام نازانین کێی؟ مالیك دەڵێ: ئەمە جیبرەئیلی ئەمینە کە مەئمووری خوای گەورە بووە و وەحیی هێناوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری ئێوە کە محەمەدە (د.خ). جا هەموو هاوار دەکەن و دەڵێن: یا جیبرەئیل! سەلامی هەموومان بگەیێنە بە حوزووری حەزرەتی محەمەد (د.خ) و عەرزی بکە: بۆچی ئێمەی لە دڵی خۆی دەرکردووە؟ ئایا مەیدانی ئەوە نییە چارێکمان بکا؟ پاش ئەمە جیبرەئیل دەگەرێتەوە بۆ حوزووری خوای گەورە. کە خوای گەورە لێی دەپرسێ و دەفەرموێ: بە چ حاڵێ ئوممەتی خۆشەویستی

خۆمتان بەجێ هێشت؟ عەرزی دەکات: ئەی خوای پەروەردگار و بەرز! حاڵیان باش نییە و وان لە سزادا. خوا دەفەرموێ: ئەی چ قسەییەکیان هەبوو؟ جیبرەئیل عەرزی دەکا: دەیانوت: سەلامیان بەحوزووری پێغەمبەر محەمەد مستەفا، (صلى الله عليه وسلم) بگەیێنم و حاڵی ناهەمواریان لە خزمەتیدا عەرز بکەم. ئینجا خوای گەورە ئەمر دەفەرموێ بە جیبرەئیل: برۆ بۆ لای خۆشەویستی خۆم کە (محەمەد)ە. جیبرەئیل گورج دەڕوا بۆ خزمەتی حەزرەت (د.خ) و دەست دەکا بەگریان و فیزاع. حەزرەت (د.خ) دەفەرموێ: حاڵت چییە بۆچی دەگریت؟ ئەویش عەرزی دەکا و دەڵێت: من ڕۆیشتم چاوم بەئوممەتی تۆ کەوت حاڵیان زۆر خراپ بوو، کردمیان بەوەکیل باسی حاڵی ئەوان لە خزمەتی تۆدا بکەم، بەڵکو تۆ چارێکیان بکەی، سەلامیان عەرز دەکردی و زۆر سکاڵایان دەکرد. کە جیبرەئیل ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ حەزرەت (د.خ) و بەدرێژی باسی وەزعی ناخۆش و سزای نالەبارییانی بۆ دەگێڕێتەوە، حەزرەت (د.خ) دەستبەجێ دەست دەکا بەگریان و ڕوو دەکاتە عەرش و لەگەڵ هەندێ لە پێغەمبەراندا سوجدەی گەورەیی دەبا بۆ خوای پاك و بێ خەوش و سەنا و ستایشی دەکا بەجۆرێ کە کەس سەنا و ستایشی وەهای نەکردووە. لەو کاتەدا لەلایەنی خوای گەورەوە بانگێ دێتە خوار بۆ حەزرەت (د.خ) دەڵێ: سەرت هەڵبڕە و تکا بکە چیت دەوێ بۆت جێبەجێ دەکەم. ئەویش عەرزی دەکا: ئەی پەروەردگاری جیهان! حوکمی خۆت دەرحەق بەگوناهبارانی بەندەی خۆت و ئوممەتی من بەجێ هێنا و سزادران و سووتان، ئەمجارە نۆرەی عەفوو لێبووردنی تۆیە. تکا دەکەم عەفوویان بفەرمووی.

ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەی خۆشەویستی خۆم! وا شەفاعەتەکەتم قبووڵ کرد؛ دە برۆ هەرکەسێ بەدڵێکی ساغ و ساف وتوویە: «لا إله إلا الله، محمد رسول الله» و لە ناو ئاگردا ماوەتەوە دەری بهێنە. ئینجا حەزرەت (د.خ) دەڕوا بۆ سەر جەهەننەم و، مالیك کە مەئمووری جەهەننەمە دێ بەپێشوازییەوە. لەوێدا حەزرەت (د.خ) دەفەرمووێ: ئەی مالیك! سەرپۆشی تەبەقەی ئەهلی دۆزەخ هەڵبگرە. ئەویش پەردەی ڕووی جەهەننەم لادەبا. کاتێ ئەهلی ئەو تەبەقە چاویان بەحەزرەت (د.خ) دەکەوێ هەموویان بەجارێ هاوار دەکەن و دەڵێن: هاوارمان لەلای تۆیە یا محەمەد! ئاگری دۆزەخ پێست و گۆشت و ئێسقانمانی خواردووە و تۆ ئێمەت لە دڵی خۆت دەرکردووە، بۆیە دۆزەخ بەم جۆرە دەمانسووتێنێ. ئینجا حەزرەت (د.خ) تکایان بۆ دەکا و، هەموو ئەو گوناهبارانەی ئوممەتی کە لە دۆزەخدان دەهێنێتە دەرەوە. (جعلنا الله وأياكم من زمرة الناجين. آمين).

براكان! ئیمانی ساغ بەتەنیا خۆی سوودی ڕاستی ئەوەیە کە خاوەنەکەی ئەبەدی نابێ لە ئاگری جەهەننەما، واتە هەتا هەتایە لە دۆزەخدا نابێ، ئیتر ئەو سوودەی نییە کە موسڵمان هیچ سزا نەدرێ و نەخرێتە دۆزەخەوە، بەڵێ ئیحتیمالی ئەوە هەیە کە موسڵمانێکی گوناهبار خوای گەورە بەمیهرەبانیی خۆی عەفووی بکا و ئازاری نەدا، بەڵام ئەمە تەنیا ئیحتیمالە و شتێکی موحەققەق نییە؛ کەوابێ قسەی ئەو فاسقانە کە دەڵێن ئێمە ئەمڕۆ بەئارەزووی خۆمان دەجووڵێینەوە و خۆ لە گوناهـ ناپارێزین؛ چونکە خوا بەخشندە و میهرەبانە و لە گوناهمان خۆش دەبێ و ڕۆژی قیامەت سزامان نادا و عەفوومان دەکا، قسەییەکی نەفامانە و بێ ئەدەبانەیە؛ چونکە خوای گەورە هەروەك بەحیلم و گوناهپۆش و میهرەبانە هەروەها تۆڵەسێن و سەختگیر و خاوەن ڕق و قینیشە.

لە داوودی تائییان پرسی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە ئیمان چییە؟ وتی: ئیمان ئەوەیە دڵێ کە بەتاریکیی گوناهـ ڕەش بووبێتەوە بە نووری مەعریفەت و خواناسی ڕووناك بێتەوە و، دڵڕەشی و دڵ سەختی بگۆڕێت بە نوورانییەت و شەفەقەت و ڕەحم و، لە بیدعەت لابدا بۆ سوننەتی ئیسلام. ئەگەر نەفس و شەیتان گوناهیان لەپێش چاوی تۆدا جوان کرد تۆ ئەوەندە موجاهەدە و ڕامکردنی نەفست ببێ کە نووری ئیمان هێزی ببێ و زاڵ ببێ بەسەر گوناهەکاندا و بەسەر نەفس و شەیتاندا، نووری ئیمانیش بەپەیڕەوکردنی قورئان و حەدیس دەبێ.

براكان! تەماشا بکەن کە خوای گەورە لە قورئاندا لە هەر شوێنێکدا ناوی ئیمانی بردووە، کردەوەی چاکەشی باس کردووە وەك دەفەرموێ: «وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ.. الآية» تەنیا لە تاقە شوێنێکدا نەبێ.

براكان! لە کەرەمی خوای گەورە ئومێدەوارم کە تەوفیقتان بدا لەسەر ئیمان و ڕەفتار و کرداری چاکە و ڕیازە و موجاهەدەی نەفس (بمنه و فضله و کرمه. آمین).

سوپاس بۆ خوای گەورە شەوی یەکشەممە ٢٤ی مانگی سەفەری ساڵی (١٣٩٧)ی کۆچی، ڕێکەوتی ١٣ی شوباتی (١٩٧٧)ی زاینی لە وەرگێڕانی ئەم نامەیە بوومەوە.

## نامەی پەنجایەم

# باسی بەهەشت دەکا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد الله والصلوة والسلام على رسول الله سيدنا محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

پاش ئەمانە، براکان! خوای گەورە ئەم دنیایەی کردووە بەکێڵگەی ڕۆژی قیامەت، واتە: جێگەی کشتوکاڵ و توێشووی دواڕۆژە بۆ پەیداکردن و کۆکردنەوەی توێشووی پیرۆزی نەبڕاوە. ئەم دنیایەی کردووە بەشوێنی ئەزموون و تاقیکردنەوە: کێ ڕەفتاری باش دەکا و کێ ڕەفتاری خراپ و ناپەسەند دەکا؛ تا دەرکەوێ کێ ئەهلی نەگبەتی و ماڵوێرانییە و کێ ئەهلی سەرفرازی و بەختیارییە. بەڵێ دنیا (دار الجزاء) نییە، واتە: ئەگەرچی هەندێ پاداش لە دنیادا دێتەدی، بەڵام (دار الجزا)ی ئەبەدی ڕۆژی قیامەتە، کەوابێ ئەوانەی کردەوەیان لە دنیادا خراپ بێ لە ڕۆژی قیامەتدا سزای خۆیان وەردەگرن و ئەوانەش کردەوەیان باش بێ و بیروباوەڕیان چاك بێ لە بەهەشتدا بەفەزڵ و ڕەحمەتی خوا شاد دەبن (أن رحمة الله قريب من المحسنين). جا لەبەر ئەمە هەندێ لە ئەوسافی نیعمەتی بەهەشت باس دەکەم بۆ برادەرانی خۆم هەتا بەیارمەتیی خوای گەورە تێ بکۆشن بۆ پەیداکردنی ئەسبابی سەعادەت و، دووریکەونەوە لەو شتانە کە دەبنە مانیعی سەعادەت و نیعمەتی بەهەشت و لەو شتانە کە دەبنە هۆی دووری لە چاکە.

ڕیوایەت کراوە کاتێ کە خوای گەورە بەهەشتی دروست کردو بەجۆراوجۆری نیعمەت ڕازاندییەوە، بەهەشەت عەرزی خوای کردو وتی: تۆ منت بۆچی دروست کردووە، بەم هەموو نیعمەت و خێر و ئەسبابی لەزەتەوە؟ خوای گەورە فەرمووی: بۆ ئەوە تۆم دروست کرد کە بەندەکانی خۆم لای تۆ نیشتەجێ بن. عەرزی کرد: خوایە! مادام من ئەوەندە جوانم و بەناز و نیعمەت ڕازاوەمەتەوە کەس نامێنێ لە دنیادا کە نەیێ بۆ لای من و لای

من دانەنیشێ. خوای گەورە فەرمووی: وامەڵێ؛ چونکە من هەر لە ئێستاوە بەمەشەققەتی نەفس و ڕیازەت کێشان و ماندووبوونی لەش تۆ پەرژین دەکەم، تا هەرکەس ئەوانە قبووڵ نەکا، نەگاتە لای تۆ. جا بەهەشت عەرزی خوای گەورە دەکا: مادام وابێ کەس نایێتە ناو من، گوایا سکاڵا دەکا و نارەحەتیی خۆی دەردەبڕێ لەوە کە کەس نەیێتە ناوی و بەچۆڵی بمێنێتەوە. ئەم سوئال و جوابە کە لە بەینی بەهەشت و خوادا ڕابوورد، لەپاش دروستکردنی دۆزەخ بوو. لە وەختی خۆیا لەپاش دروستکردنی دۆزەخ، دۆزەخ عەرزی خوای گەورەی کرد: تۆ بۆچی منت دروست کردووە. خوای گەورە لە وەڵامیدا فەرمووی: تۆم بۆ (دار العذاب) دروست کردووە. ئەویش عەرزی خوا دەکا و دەڵێ: خوایە! ئەم هەموو ئەسبابی سزای کە لە مندا هەیە هەرکەس ئاگاداریێ لێی هەرگیز گوناهـ ناکات هەتا بۆ سزادان حەواڵەی لای منی بکەن. خوای گەورە فەرمووی: من دەوری تۆ دەگرم بە ئارەزووی نەفس و شتی بەلەزەت و شوێنکەوتنی هەواو شتی خۆش؛ واتە: ئەوانەی کە حەز لەمانە بکەن و بەدوایاندا بگەڕێن لە ئەنجامدا دەکەونە ناو تۆ. جا دۆزەخ عەرزی کرد: کەوابێ کەس نامێنێ لە دنیادا نەیێتە لای من.

ئینجا خوای گەورە فەرمووی بە بەهەشت: ئەی بەهەشت! قسەی خۆت بکە. بەهەشت عەرزی کرد: خوایە! ئەوانەی ئەهلی نەجات و ڕزگارین کە ئیمانیان بەتۆ هێناوە باوەڕیان بە زاتی پاکی تۆ و بەدەستوور و یاسای ئاینی تۆ هەیە. خوای گەورەش دەفەرموێ: بەعیززەت و جەلالی خۆم قەسەم ئەوەی بەخیل بێ، نابێتە دراوسێی من لەناو تۆدا، واتە: ئەو نیعمەتە جوانانەی بەهەشت نادەم بەکەسێ ڕژد و پەست بێ و، ئینسانی وەها نابێ بێتە بەهەشتەوە.

مەبەستی خوای گەورە لە بەخیل ئەو کەسانەیە ئەوەندە دنیاپەرستن لەگەڵ ئەوەشدا کە ماڵی دنیایان هەیە واجیباتی ماڵییەی خۆیان وەك زەکات و سەرفیترە جێبەجێ ناکەن و دراوسێکانیان بەفەقیری و هەژاری سەردەنێنەوە و منداڵیان بەسکی برسی دەنوون و، ئەم ڕژدانە ئەوەندە بێ ڕەحمن لا ناکەنەوە بەلایاندا، تەنانەت هەتیوی بێکەس بە ماڵاندا دەگەڕێ و دەرۆزە دەکا ڕەحمی پێ ناکەن. لە ڕووتوقووتیدا دەلەرزێ و پۆشاکێکی پێ نادەن، موسڵمانێکی بێ حاڵ و ماڵ دەمرێ کفنی بۆ ناکەن، لەگەڵ ئەوەشا کە کفن کردن و گۆڕهەڵکەندن و شاردنەوەی مردوو واجیبە لەسەریان! گەلێ نەناسراو بەمیوانی ڕێیان دەکەوێتە لایان نایانحەسێننەوە، بەکورتی: ئەوەی واجیباتی ئاینە جێبەجێی ناکەن چ

جایێ سوننەت. جا ئەو کەسانە کە ڕژد و بەخیلن بەو مەعنا کە وتمان لە قیامەتا لە حوزووری خوای گەورەدا ئەوەندە چرووك و مەهتووك و بێ نرخن لە هیچ گوناهێ عەفوو ناکرێن و، پێویستە بەقەدەر گوناهەکانیان بسووتێنرێن، ئەگەر بەسووئی خاتیمە گیرۆدە نەبن، (والعیاذ باللە). بەڵێ پاش ئەوەی بەقەدەر گوناهەکانیان سزا دران و لە دۆزەخدا سووتان، ئەوسا دەڕۆنە بەهەشت. بەڵام لە ڕۆژانی جومعەدا کە خوا میوانداریی گەورە بۆ هەموو ئەهلی بەهەشت دەکا و، هەموو دانیشتوانی بەهەشت دەڕۆنە سەر سفرە و حازری نان خواردن دەبن و خواردنی تایبەتی دەخۆن، ئەو ڕژدانە ڕێگا نادرێن حازری ئەو میوانداریيە ببن، بەڵکو لەو پیرۆزی و بەختیاریيە بێبەش دەبن.

هەروەها لە هەموو سبەینێیەکدا دەرگای بەهەشت دەکرێتەوە و خوای گەورە بەمیهرەبانی تەماشای دەرگای بەهەشت و بەهەشت دەکا و دەفەرموێ (تطیبي) واتە بۆن خۆش بە ئەی بەهەشت! لەوکاتەدا هەموو بەشێکی بەهەشت بەتەواوی بۆن خۆش دەبێ. جا بەهەشت ئەوەندە مەوسیمی خۆش وەردەگرێ بەزمانی حاڵی لەو کاتانەدا دەڵێ: «قد أفلح المؤمنین» واتە: بەڕاستی هەموو موسڵمانەکان لە سزای قیامەت ڕزگار دەبن، چونکە ڕزگاربوون لە سزا بەستراوە بەشەهامەت و شێوەی ساغەوە و، ئەم شەهامەتە و ئەم شێوە ساغە تەنیا لە نیشانەی ئەوانەیە کە لەسەر نوێژکردن بەردەوامن و هەموو ڕۆژێ پێنج جار سوجدە بۆ خوای گەورە دەبەن.

ڕیوایەت کراوە: هەموو ڕۆژێ بەهەشت و دۆزەخ هەردووکیان داوا و ڕجایەکیان لە خوا هەیە، بەهەشت عەرزی دەکا: خودایە! من میوە و ئاو سایە و سێبەر و جۆبارم حازرە، فەرش و کۆشك و حۆریم ئامادەن؛ تکام ئەوەیە ئەوانەی کە بۆ من دروست کراون، ڕەوانەیان بکەی بۆم. دۆزەخیش بانگ دەکا و دەڵێ: خوایە! بیر و چاڵی تاریك و پڕ لە دووکەڵ و ئاگرم حازرن و، خواردەمەنی زەقووم و حەمیم ئامادە کراون؛ تکام ئەوەیە ئەوانەی بۆ منت دروست کردوون، ڕەوانەیان بکەی بۆ لام. جا خوای گەورە بانگ دەکا لە بەهەشت و دەفەرموێ: نزیکە مەشەققەت و تەکلیفی خۆم لەسەر بەندە چاکەکانم هەڵبگرم واتە: لەوانەیە بیانمرێنم و بیانهێنم بۆ لات، هەرکەسێ لە دنیادا لە من ترسابێ و تاعەتی منی بەجێ هێنابێ لە قیامەتدا نایترسێنم و سوود و قازانجی تاعەتەکەی دەست دەکەوێ، مەتاعی خوا گرانە و قیمەتەکەی بەهەشتە. هەروەها خوای گەورە وەحیی کرد بۆ حەزرەتی عیسا (د.خ) و فەرمووی: ئەوەی من ئامادەم کردووە بۆ چاکانی

ئوممەت ئەگەر بەچاوی خۆیان بیاندیایە لەوانەبوو لە شادی و ئیشتیاقی بەهەشتدا گیانیان دەرچووایە.

ڕیوایەت کراوە: «مامثل الدنیا في الآخرة إلا کما یغمس أحدکم أصبعه في الیم فانظر بم یرجع؟». واتە: نیسبەتی دنیا و لەزەت و شادی و خۆشییەك تێدایەتی لەچاو لەزەت و خۆشی و شادیی جیهانی دوایی وەك ئەوەیە پەنجەیێك بکرێ بەدەریاییەکدا، ئاخۆ ئەو پەنجەیە چەندێ ئاو لەگەڵ خۆیدا دێنێتە دەرەوە؟! دیارە ئەم ڕیوایەتە ئێش و ئازار و سزا و ناخۆشیی ئەم دنیایە لەچاو ئێش و ئازار و سزا و ناخۆشیی قیامەتیشدا دەگرێتەوە، واتە: ئازاری دنیا لەچاو ئازاری ڕۆژی دواییدا وەك نیسبەتی ئەو ئاوەیە کە بەپەنجەکەوە دێتەدەر. لە ڕاستیدا وەزعی بەهەشت و کۆشکەکانی و ئارایشت و شووشەی کۆشکەکان لە پایەییەکی وەها نین کە ئینسان بەعەقڵی کەموکوڕیی خۆی تێی بگات و زەبتیان بکات، ئەمە تەنیا لە وزەی عیلم و زانینی بێ پایانی خوای گەورەدایە (جل جلاله). وەکو ڕیوایەت کراوە هەموو بەشەکانی کۆشکەکانی بەهەشت وەك بلوورن بەجۆرێ کە بەهەشتییەکان لە کۆشکەکانیانەوە دەتوانن بڕواننە دەرەوە و باخچەی بەردەمی کۆشکەکانیان ببینن، مابەینی کۆڵانەکانی میسك و عەنبەرە، وردەبەردی دەشتەکەی وەك دوڕی ساغە. پێغەمبەر (د.خ) ڕاستی فەرمووە کە فەرموویەتی: بەقەدەر دارێکی دەستی ئینسان لە بەهەشت لە هەموو دنیا و ئەوەی لە دنیادایە چاکترە؛ دیارە دنیا و سامانی دنیا هەمووی لە دەستی ئینسان دەردەچێ و ئینسانەکە فەقیر دەکەوێ، هیچی لەگەڵ خۆی نابا بۆ قەبر و قیامەت، ئینسان کە دەمرێ هەرچی موڵك و دارایی هەیە لێی بەجێ دەمێنێ و دوژمن بەشوێنەکەی شاد دەبێ، بەڵام نیعمەتی بەهەشت هەر دەمێنێ و خاوەنەکەی کۆچ ناکا و بەجێی ناهێڵێ.

ڕیوایەت کراوە: ئەگەر بەقەدەر دڵۆپێ ئاو لە مادەی بەهەشت بکەوێتە سەر زەوی هەموو دنیا جوان دەکا. هەروەها ئەگەر بەقەدەر دڵۆپێ ئاو لە مادەی دۆزەخ بکەوێتە سەر زەوی هەموو دنیا ناخۆش دەکا. هەموو سەعاتێ بۆ ئەهلی دۆزەخ جۆرە سزایەك زیاد دەکا (أعاذنا الله منها). ئایەتی پیرۆزی «فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَاباً» ئەو مەبەستە دەگەیێنێ کە باسمان کرد، چونکە وشەی (لن) مەعنای تەئکیدی نەفی دەدا واتە: هەتا هەتایە هەر سزای ئەهلی دۆزەخ زیاد دەکەم. هەروەها حەزرەت (د.خ) بەشێوەی تەعەجوب فەرموویەتی: یا وەسفی بەهەشت بەوجۆرەی کە هەیە بۆ ئوممەتی من بەیان

نەکراوە، یا نابینم کەسێ عاشقی بەهەشت بێ!! بەڕاستی بەهەشت سەد دەرەجەی تێدایە، واتە سەد چینی هەیە، ئەگەر هەرچی (ماسوی الله)یە هەمووی لە یەك پلەدا دابنرێ، دەیگرێ و، بەینی هەر دوو دەرەجەیێ لەو دەرەجانە پێنج سەد ساڵ ڕێگەیە. دووەم هەموو ئاڵتوونە و، دەرەجەی سێیەم یاقووت و لوئلوئو زەبەرجەدە و، نەوەدو حەوت دەرەجەکەی تریش خوای گەورە نەبێ کەس نازانێ چییە و چۆن دروست کراوە.

ئەو کەسانەی قورئانی پیرۆزیان لەبەرەو ڕەفتاری پێ دەکەن، کاتێ کە دەڕۆنە بەهەشت دەرەجەیان، لەپاش ئەسحابە و شەهیدان و سیدیقین، لە هەموو دەرەجەیەك بەرزترە. هەروەها ئەهلی بەهەشت، ئەوانەی دەرەجەیان لە خوارەوەیە دەڕوانن بۆ ئەهلی درەجەی ژووروو و نووری ئەوان وەکو نووری ڕۆژ دێتە خوارەوە بۆ سەریان بەجۆرێ کە دەرەجەی خواروو داگیر دەکا. ئینجا هاوار دەکەن دەڵێن: خوایە! ئەم نوورە چییە؟ خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە کە ئەو نوورە نووری فلان کەسی برادەری خۆتانە. جا عەرزی دەکا و دەڵێ: خوایە! ئەو کەسە لەدنیادا هاوەڵی من بووە، کاری وا بەرزی وەهای نەبووە کە بەم پایە بگا. وەڵامی دەدرێتەوە کە بەڕاستی عەمەلی ئەو لە عەمەلی تۆ زۆر گەورەتر بووە؛ ئەو لە دنیادا برسی بوو، تۆ تێر بووی، ئەو تینوو بووە تۆ تێراو، ئەو لە شەودا نوێژی کردووە، تۆ نوستووی؛ کەوابێ خوای میهرەبان بەنەوازشی خۆی بەهەشتی پێ بەخشیوە و دڵی بە بەهەشت خۆش کردووە و ڕەزامەندیی داوە بەدڵی؛ تا خەفەت لە دڵیدا نەمێنێ. هەروەها لە بەهەشتدا دەرەجەی وا هەیە کە لەژووریەوە دەرەجە نییە و کەس پێی ناگا، مەگەر حوکمداری دادپەروەر یا ئەو کەسە کە سیلەی ڕەحم بەجێ بێنێ، یا هەژاری کە خێزانی زۆر بێ و بەسەبر بێ، یا ئەوەی قورئانی لەبەربێ و ڕەفتاری پێ بکات. هەرکەس لە دنیادا داوای دەرەجەیێ بەرزی دنیایی بکا، خوای گەورە دەرەجەی قیامەتی دەهێنێتە خوار و ئەو دەرەجەی قیامەتە کە دەیهێنێتە خوارەوە لە دەرمجەی دنیا گەورەتر و بەرزترە. لەم خوسووسەوە حەزرەت (د.خ) ئایەتی «وَلَلآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلاً»ی خوێندەوە.

لە بەهەشتدا ڕێك دەکەوێ بەندەیێ لە خاوەنەکەی دەرەجەی بەرزتر دەبێ. جا خاوەنەکە دەڵێ: خوایە! ئەم شەخسە لە دنیادا بەندەو خزمەتکاری من بوو، چۆن ئەم دەرەجەی هەیە؟ وەڵامی دەدرێتەوە: کە لە دنیادا ئەو بەندە لە تۆ زیاتر ناوی خوای بردووە و بیری لێ کردووەتەوە؛ لەبەر ئەو زیادە زیکرە، دەرەجە و پایەی بەرزی پێ دراوە. هەروەها دەرەجەی بەرز دەبێ بەهۆی لەبەرکردنی قورئانەوە؛ یا بەهۆی تکاکردنەوە لای

پیاوە گەورەکان بۆ داماوان و موحتاجان و بۆ لابردنی فیتنە و ئاشووب و بەڵا لەوانە کە گیرۆدە بوون، یا بەهۆی چاوپۆشییەوە لەو کەسانە کە خراپەیان لەگەڵ چاوپۆشەکە کردووە، یا بەهۆی بەخشش‌ەوە بەو خزم و خوێشانە کە ئەوان بێ ڕەحم و بێ بەخشش بن، واتە بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم لەگەڵ خزمی بێ ڕەحمدا، یا بەهۆی پیاوەتی کردنەوە لەگەڵ ناپیاواندا.

بەهەشت هەشت دەرگای هەیە، هەر یەك لەو دەرگایانە بەتایبەتی هی تاقمێکە لە ئەهلی تاعەت. بۆ نموونە: ئەو قاپییە کە ناوی (ریان)ە بۆ ئەوانەیە کە هۆگرییان بەڕۆژووەوە بووە، بەڵکو ئەوانە لە هەموو قاپییەك لەو قاپییانەوە بانگ دەکرێن. هەروەها بۆ ئەو کەسانە کە سێ منداڵیان مردووە و سەبریان کردووە. وە بۆ ئەو کەسانە کە لەبەر ڕەزای خوا نان و چێشتیان داوە بە خەڵك و ئاویان داوە بەتینووەکان. وە بۆ ئەو کەسانە کە قەرزاری خەڵك بوون و خاوەن قەرزەکە لە بیری نەماوە و ئەمان خۆیان لەبەر ڕەزای خوا حەقەکەیان داوەتەوە. وە بۆ ئەو کەسانە کە قاتیلێکیان لە قیساس عەفوو کردووە. وە بۆ ئەو کەسانە کە لە پاش هەموو نوێژەکان دوانزە جار سوورەتی ئیخلاس، واتە (قل هوالله أحد) دەخوێنن. وە بۆ ئەو کەسانە کە چل فەرموودەی پێغەمبەر لەبەردەکەن (د.خ) و خەڵکی موسڵمان لە ڕێگای ئەوانەوە لەو فەرموودانە، سوود وەردەگرن. وە بۆ ئەو ئافرەتانە کە لە ترسی خوای گەورە نامووسی خۆیان پاراستووە و لە فەرمانی مێردیان دەرنەچوونە، ئەمانە یەکە یەکە لە هەموو دەرگایەکی بەهەشتەوە بانگ دەکرێن کە بڕۆنە ژوورەوە. هەروەها لە بەهەشتدا دەشتێکی بێ پایان هەیە کە خاکی وەك عەنبەر بۆن خۆشە و وردە بەردەکانی مرواری و یاقووتن. فریشتە بەڕێزەکان پیرۆزبایی لە ئەهلی بەهەشت دەکەن و دەڵێن: ئەی بەهەشت! خۆش بەحاڵی تۆ کە بووی بەمەئواو مەنزڵی ئەوانە کە پادشان. لە بەهەشتدا دەشتێکی سپی هەیە ئەوەندە گەورەیە کە جێگەی بەرودوای ئەهلی بەهەشتی تێدا دەبێتەوە، شووراکەی یەك بەردە لە کافوور و، چەند تەپۆڵکەی میسك دەورەی ئەو دەشتەیان داوە. هەموو جۆگە و جۆباری تێدا جاری دەبێ. هەندێ وەخت هەموو ئەهلی بەهەشت لەو دەشتەدا کۆدەبنەوە. خوای گەورە بای ڕەحمەت دەنێرێتە سەریان کە خەوش و خاڵی میسك دێنێ و دەیدا بەڕوویاندا و شۆخی و جوانییان زیاتر دەبێ، کە دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان، حۆرییەکان پێیان دەڵێن: ئێوە کە ڕۆیشتن هەمووتان نارەحەت بوون بۆ ئێمە و گیرۆدەی عیشق بوون، ئێستا ئێمە عیشقمان زیاترە بۆ ئێوە. حەدیسە پیرۆزەکە هەتا ئێرەیە.

من لام وایە ئەو دەشتە دەشتێکە لە ڕۆژانی جومعەدا خوای گەورە بەهەشتییەکان بۆ ئەوێ دەعوەت دەکا و، تەجەللای نوور دەخاتە سەریان و، بەهەرکام لەوانە ئەمرێ دەکا. لەم دەعوەت و بانگ کردنەدا هەندێ کەس لەسەر کورسی و هەندێ لەسەر تەپۆڵکەی میسك دادەنیشن. جا کاتێ خوای گەورە ویستی ئیزنیان بدا و، هەریەك بۆ سەر مەنزڵ و ماوای خۆیان ڕەوانە بکرێنەوە، دەفەرموێ: ئەی ئەهلی بەهەشت! چیتان دەوێ هەتا ئەمر بکەم بتاندەنێ؟. ئەوانیش عەرزی بارەگای خوایی دەکەن: هەرچی نەفسمان ویستوویەتی و ئارەزوومان کردووە تۆ پێت بەخشیوین، نازانین چی ماوە؟. جا خوای گەورە دەفەرموێ: خەزێنەکانی من دواییان نایێ، داوا بکەن چیتان دەوێ بتاندەینێ. ئەوانیش کە تێ گەیشتن خوای گەورە خواستی لەسەر ئەوەیە ئەمان داوای شت بکەن، ئەوانەیان زانان دەزانن داوای چی بکەن و مەبەستی خۆیان لە بارەگای خوای گەورەدا عەرز دەکەن. بەڵام نەزانەکانیان خۆیان نازانن داوای چی بکەن، لە خوای گەورە؛ لەبەرئەوە زاناکان فێریان دەکەن و پیشانیان دەدەن کە چی داوا بکەن، ئەوانیش داوای بەخشش و کەرەمی خوا دەکەن، خوای گەورەش بەپێی ئیحسان و بەخشندەیی خۆی ئەوەی لە باریان بێ پێیان دەبەخشێ.

ئینجا خوای گەورە دەفەرموێ: ئایا ڕازین لێم؟ ئەوانیش عەرزی دەکەن: خوایە! چۆن ڕازی نابین بەم هەمووە کەرەمە بێ پایانە کە لەگەڵ کەسا نەتکردووە؟ ئیتر ئێمە نازانین کەرەمێ لەمە زیاتر بێ، چییە؟ خوای گەورە (جل جلالە) دەفەرموێ: کەرەمێ کە لە هەموو ئەمانە گەورەتر بێ، بریتییە لە ڕازی بوونی من لە ئێوە، وا من لەمەولا هەرگیز لە ئێوە عاجز نابم.

جا بەهەشتییەکان بەم فەرمودە و بەم خەڵاتە خاوەن سوودە کە هۆی بەختیاری و پیرۆزبایی هەتا هەتاییە ئەوەندە دڵخۆش دەبن کە بەهیچ نیعمەتێکی تر ئەوەندە دڵخۆش نەبوون. لەڕاستیدا ڕەزامەندیی خوای گەورە لە هەموو شتێ گەورەترە، وەکو خوا خۆی فەرموویەتی: (ورضوان من الله أكبر).

پاش ئەمانە، خوای گەورە دەفەرموێ داخوازیتان چییە بیڵێن، ئەوانیش هەموویان بەیەك کەلیمە و بە یەك جار دەڵێن: خوایە! بینینی جوانیی تۆمان دەوێ؛ ئینجا خوای گەورە بەگەورەیی و بەخشندەیی خۆی تەجەللا دەکا بەسەر ئەهلی بەهەشتدا، بەو تەجەللایە وەها نوور و وره غاڵب دەبێ، بەسەریانا کە دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان

حۆرییەکانیان ڕوومەتیان نابینن، چونکە نووری تەجەللای خوایی ڕوومەتی داگیر کردوون (والحمد لله علی ذلك).

ڕیوایەت کراوە: ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئایا باسی کۆشکەکانی بەهەشتتان بۆ بکەم؟ عەرزیان کرد: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا!. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: کۆشکەکانی بەهەشت ئەوەندە سافن وەکو بلوورن چ لە ناو و چ لە دەرەوە، واتە: لە ناوەوە، دەرەوە دەردەکەوێ و لە دەرەوە، ناوەوە. لەزەت و ناز و نیعمەت لە ناو ئەو کۆشکانەدا ئەوەندە زۆر و جۆراوجۆرە کە نە چاو دیویەتی و نە گوێ بیستوویەتی و نە بە دڵی بەشەردا هاتووە. لەوێدا عەرەبێکی خەڵکی بادیە هەستا و بانگی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا!. باوك و دایکم بەسەرگەردت بن، ئەم کۆشك و ناز و نیعمەتانە بۆ کێن؟ فەرمووی بۆ کەسانێکن کە سەلام لە ناو خەڵکدا بڵاویکەنەوە و زۆر سەلام لە خەڵك بکەن و، زۆر نان بە خەڵك بدەن و، زۆر بەڕۆژوو بن و، لە شەودا کە زۆربەی خەڵك نووستوون نوێژ بکەن.

براکان! مەبەستی حەزرەت (د.خ) لە سەلامی زۆر ئەوەیە کە دڵی بەرامبەر بەموسڵمانان پاك بێ و لەسەر دڵپاکی سەلامیان لێ بکا. مەبەست لە دەوامی ڕۆژوو ئەوەیە کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ، هەروەها (أيام البيض) کە سیانزە و چواردە و پانزەی مانگە و(أيام السود) کە بیست و هەشت و بیست و نۆ و سییەمی مانگە، لەگەڵ دووشەممە و پێنج شەممە و نۆیەمی مانگی قوربان و نۆیەم و دەیەمی موحەڕەم بەڕۆژوو بێ و، سێیەکی ئاخری شەو بەنوێژ و زیکر و فیکر زیندوو بکاتەوە. دیارە کەسێ حاڵی وەها بێ و دەوام و ئیستیقامەتی هەبێ و ئەهلی جومعە و جەماعەت و ئیحسان و خێرات بێ و لەو گوناهانە پارێز بکا کە دەبنە هۆی ماڵوێرانیی نەبڕاوە، ئەوە ئەهلی بەهەشتە. ئیتر مەبەست ئەوە نییە کە هەموو کات و هەموو ڕۆژەکانی هەر بەڕۆژوو بێ، یا هەموو شەوێ بێدار بێ و نەنوێ؛ چونکە ئەمە بەپێی عادەت لەتوانای ئینسان بەدەرە.

ئەهلی بەهەشت هەریەکی لای کەمی حەفتا حۆرییان هەیە و، هەر حۆرییەك لە کۆشکێکی تایبەتیدایە، ئەو کۆشکە ڕووناکییەکی نەبڕاوی هەیە، لە هەر کۆشکێکدا درەختێ هەیە، بەری ئەم درەختە حەفتا خەڵاتی نایابە، نە لە ڕەنگا و نە لە بۆدا هاوتای نییە. هەندێ لەو کۆشك و هەیوانانە بێ کۆڵەکە و بێ پلەکانە بەئاسماندا هەڵواسراون. هاوڕێیەکانی پێغەمبەر (د.خ) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەهلی ئەو کۆشکانە چۆن دەگەنە شوێنی خۆیان؟ فەرمووی: وەکو باڵندە کە بەباڵ بفرێ. عەرزیان کرد: ئەم

جۆرە کۆشکانە بۆ کێن؟ فەرمووی بۆ ئەوانەن کە خاوەنی دەرد و بەڵان واتە: هەر دەردێ خوای گەورە بیدا بەسەریاندا پێی ڕازین، (والله أعلم).

هەروەها جۆرە حۆرییەك هەیە کە زۆر بەشەوکەت و نەزاکەتە، کاتێ کە هاوڕێیەکەی ئارەزووی بکا، مەئموورێکی غەریبی لە فریشتە خەبەری دەداتێ: کە هاوڕێیەکەت دەیەوێ بێت بۆ لات، ئەویش لەگەڵ کۆمەڵێ لە کارەکەرانیدا دەکەوێتە ڕێ هەتا دەگاتە ئەو هاوڕێ تایبەتییەی. بەڵام ئەو کەسەی بەناحەق خەڵکی کوشتبێ یا دڵی دایك و باوکی ئازاردابێ، یا دەوامی کردبێ لەسەر خواردنەوەی شەراب، ئەو ژنانەی بەرگی زۆر تەنك دەپۆشن و ڕووی خۆیان بۆ نامەحرەم دەردەخەن، ئەو کەسانە کە پێوەندیی خوێشایەتی بەجێ ناهێنن، ئەو ژنەی شووی کردبێ و ئەو پیاوەی ژنی هێنابێ و زینایان کردبێ و، لە دنیادا (رجم)، واتە سەنگەسار نەکرابن، ژنێ بەزۆر تەڵاقی لە مێردی سەندبێ، پیاوێ کە ڕیشی بەوەسمە ڕەش کردبێ، ئەمانە هیچکامیان بەبێ تۆڵە و سزا بۆنی بەهەشت ناکەن و لە بەهەشتدا لەو خۆشییە بێ بەش دەبن.

باخەکانی بەهەشت، وەها دروست کراون، هەر گیاییەکیان تیابێ ساقیان لە ئاڵتوونە و لقیان لە لوئلوئە و بەرگیان لە زمرووتی سەوزە و وەکو گیای دنیا تەڕن. شتی نایاب و جوانی وەهایان تیایە کە خوای گەورە بەهێز و توانا و خواستی خۆی بەتایبەتی دروستی کردوون، بۆ نموونە: بۆڵە ترێی وەهای تێدایە، بەئەندازەی گەزێ درێژە و هەندێکیان لەوەیش درێژترن. باڵندەکانی بەهەشت لەسەر بەرزاییی کۆشکەکان دەنیشنەوە و ئاوازی جۆراوجۆر دەخوێنن، هەرکام لەم باڵندانە ناوێکی لە ناوەکانی خوا کردووە بە ویردی خۆی و دەیخوێنێتەوە، بەجۆرێ کە بەهەشتییەکان دەڵێن: بێجگە لەم لەزەتەی ئێمە خوا لەزەتێکی تری دروست نەکردووە. ڕێك دەکەوێ ئینسانێ باڵندەیێ دەبینێ و لە دڵی خۆیدا دەڵێ: ئاخۆ لەزەتی گۆشتی ئەم باڵندەیە چۆن بێ؟ گورج هەر لەو کاتەدا کە باڵندەکە بەئاسمانەوەیە بەئەمری خوای گەورە، بەشێوەیێ کە لەزەتەکەی بەدڵی ئینسانەکە بێ، دروست دەکرێ و دێتە بەردەستی و دەیخوا. لەپاش ئەوە کە دەیخوا خوای گەورە لە ئێسك و پرووسکی ئەو باڵندەیە باڵندەیەکی تر دروست دەکاتەوە، لەسەر شێوەی جاران و دەفڕێ بۆ سەر شوێنە پێشووەکەی و خەریکی تەسبیح و حەمد و سەنا و تەکبیر و تەهلیلە دەبێ. کاتێ یەکێ لە ئەهلی بەهەشت هێشووێ ترێ یا هەناری ببینێ و دوورە دەست بێ، مادام ئارەزووی خواردنی بکا، ئەو لقەدارە کە ئەو ترێیە یا ئەو هەنارەی پێوەیە دانەوێ بۆ بەردەستی و، میوەکەی لێ دەکاتەوە و دەیخوا.

براکان! خوای گەورە هەر شتێ ئارەزوو بکا، دەتوانێ گورج دروستی بکا، دەتوانێ هەموو ڕۆژێ هەر ئینسانێ چەند نان و ئاوی پێویست بێ، لەپێش ئیحتیاجیدا ئامادەی بکا و بۆی ڕەوانە بکا، بەڵام ئەو عادەتێکی داناوە کە لەسەر ئەو عادەتە ڕەفتار دەکا، لەم کارەی خوادا گەلێ حیکمەت هەیە. (آمنا بعدم إنتهاء علم الله وقدرته، وآمنا بقلة ادراك عباد الله تعالى).

براکان! لە بەهەشتدا هەتا هەتایە تەکلیف لەسەر بەندەکانی خوا هەڵدەگیرێ، لەوێ بەرپرسیاری نابێ؛ حەسانەوەی ئێجگارییە. بەرامبەر ئەوە ئا لەم تەمەنە کورت و کەمەی ئێمەیشدا کەمێ تەکلیفمان لێ داواکراوە، جا ئەگەر ئێمە لەم تەکلیفە کەمە بەجێ نەهێنین، دەبێ چ جۆرە بەندەیێ بن و دڵمان بەچی خۆش بێ!؟

براکان! لە بەهەشتدا گەلێ درەختی میوە هەیە، بەپێی فەرموودەی حەدیسی پیرۆز بەری ئەو دارانە نە بەڕەنگ نە بە بۆ، نە بەتام لەیەك ناچن و، دەڵێن هەرجارێ کە میوەکە بچنن دەنکێکی تر لەو میوەیە لە شوێنەکەیدا پەیدا دەبێتەوە. (سبحان الله) لە توانای بێ سنووری خوای گەورە. هەروەها دارێکی گەلا جوان هەیە لە دواییدا بەری ئەو دارە دەبێ بە بەرگ و پۆشاك و ئەهلی بەهەشت سوودی لێ وەردەگرن. ئەهلی بەهەشت دابنیشن یا بەپێوە ڕاوەستن لەسەر ئارەزووی خۆیان چییان بوێ لە خواردەمەنی بۆیان دێ و لەزەتی لێ وەردەگرن. پێویستە بزانن کە خواردەمەنیی ئەهلی بەهەشت وەکو خواردەمەنی ئەهلی دنیا نییە کە خۆشییەکەی تەنیا لە ژێر زمانیدابێ؛ بەڵکو لە هەرچی خواردەمەنییەك هەیە بەلەزەتترەو، لەزەتەکەی دەڕوا بۆ هەموو بەشێکی لەش و بۆ دەماغ و دڵ و ئەندامەکانی تر و لە پاشاندا بەشێوەی عەرەق لە لەشەوە دەردەچێ و گورج ئارەزووی خواردن دەکەی. دوور نییە لە قودرەتی خوای گەورە: حەزرەتی ئیبراهیم (د.خ) لە شەوی میعراجی شەریفدا بە حوزووری موبارەکی حەزرەتی پێغەمبەر گەیشت (د.خ) و پێی فەرموو: ئەمر بکە بە ئوممەتی خۆت کە داری زۆر لە بەهەشتدا بنێژن؛ چونکە بەهەشت خاکی پیرۆزە و بۆنی خۆشە و درەختی بەرزە و ئاوی وەکو فوراتە. ئەم دار ناشتنەیش کە لە دنیادا دەبێ بەوە دەبێ کە زۆر جار بڵێین «سبحان الله والحمد الله ولا إله إلا الله والله أكبر ولاحول ولاقوة إلا بالله العلي العظيم».

هەندێ میوەی بەهەشت وەکو گومەزی زیوە. ڕۆژێ یەکێکی عەرەبی خەڵکی دەشت هاتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا!، باوکم و دایکم

بەسەرگەردت بن، ئایا لە بەهەشتدا میوە هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ هەیە، درەختی (طوبی) کە بەقەدەر (جنة الفردوس) گەورەیە. عەرەبەکە عەرزی کرد: ئەو دارە لە دنیادا وێنەی هەیە؟ فەرمووی: لە وڵاتی ئێوەدا وێنەی نییە، بەڵام لە وڵاتی شامدا وێنەی هەیە، لە داری گوێز دەچێ. وەك چۆن داری گوێز لەبنەوە یەك ساقی هەیە و لە سەرەوە لقی زۆری لێ جیادەبێتەوە، ئەویش وەهایە. عەرەبەکە عەرزی کرد: گەورەیی ئەو دارە چەند دەبێ؟ فەرمووی: ئەگەر عەرەبێ بەسواریی وشتر بیەوێ بەدەوریدا بسوورێتەوە بەماوەییەکی زۆر نەبێ ناتوانێ. عەرزی کرد: لە بەهەشتدا ترێ هەیە؟ فەرمووی بەڵێ هەیە و دەنکەکانی بەقەدەر دۆڵچەیێ گەورەیە. عەرەبەکە وتی: ئەو دەنکەترێ من تێر دەکات؟. حەزرەت فەرمووی بەشی تۆ و هۆزەکەشت دەکات.

لە بەهەشتدا حۆرییەك هەیە ناوی (عیناء)ە هەر کاتێ بڕوا بۆ شوێنێ لە لای ڕاست و چەپیەوە، هەزار کارەکەر هەیە. ئەم حۆرییە بانگ دەکا: لەکوێن ئەو کەسانە کە لە دنیادا ئەمریان کردووە بەچاکە و نەهییان کردووە لە خراپە؛ واتە: ئەم حۆرییە و ئەم هەمووە کارەکەرانە هیی ئەوانە دەبن کە لە دنیادا خاوەنی ئەو سیفاتانە بوون. حۆرییەکانی بەهەشت، وەها دروست کراون کە هەموو دڵیان بە خاوەنەکەی خۆیانەوە بەستراوە، هەروەکو خاوەنەکانیان عاشقی ئەوانن، ئەوانیش وەهان، لەپێش مردنی خاوەنەکانیان، کە هێشتا لە دنیادان، ئەو حۆرییانە دەیانناسن. وە ئەگەر لە دنیادا ژنەکانیان ئازاری دڵیان بدەن، ئەوان لە بەهەشتدا عاجز دەبن و دوعای شەڕیان لێ دەکەن و، پێیان دەڵێن ئەو هاوڕێیانەتان بەئەمانەت لای ئێوەن و لەپاش مردن هاوڕێی ئێمەن. هەروەها ئەو کورسییانە کە ئەهلی بەهەشت لەسەریان دادەنیشن، لەگەڵ حۆرییەکانیان زۆر بەرزن. لە ناو کۆشکەکاندا حەفتا فەرش هەیە کە لە ئاوریشم و حەریر دروست کراون و، هەر فەرشێ لەسەر فەرشێ داخراوە. خوا خۆی دەزانێ کە چەند نەرم و نیان و ناسکن. لەسەر هەر فەرشێ لەوانەی کە لەسەر کورسییەکان ڕاخراون حەفتا فەرشی سوندس و ئیستەبرەق هەیە. لەو کاتانەدا کە حەزرەت (د.خ) باسی کورسیی دەکرد ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: «مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ...» هەتا دوایی ئایەتەکە. هەروەها حەزرەت (د.خ) دەیفەرموو: مادام بەرەکانیان لە ئیستەبرەق بێ، دەبێ دیوی دەریان لەچی بێ؟ ئەو کورسییانە ئەوەندە بەرزن خاوەنەکانیان وەکو باڵندە دەفڕن بۆ ناویان. ئەم جۆرە بەرزبوونەوەی ئینسانە لە بەهەشتدا وەکو بەرزبوونەوەیە بەهۆی پلەکانەوە لە

دنیادا، یا بەجۆرێکی تر کە هەر خوا خۆی دەیزانێ چۆنە. حۆرییەکان کورسیی تایبەتییان هەیە وەکو بووک لە دنیادا، واتە ئارایش و خۆ ڕازاندنەوەیان لە توانای وەسفی ئێمە بەدەرە. لە ناو کۆشکەکاندا خێوەتی جوان جوان هەڵدراون وەکو دوڕی نایاب و سپی و ورشەدار کە ئینسان لە سەیرکردنیان تێر نابێ، خوای گەورە بیکا بە نسیبمان لەگەڵ هەموو موسڵمانانی تردا.

ئەم کۆشك و کورسی و خێوەت و بارەگا و تاقانە، بەجۆرێ ڕازێنراوەتەوە مەگەر خوا بەعیلمی خۆی بزانێ چۆنە؟

براکان! خۆشەویستەکان! موسڵمانان! هۆشیاران! خاوەن دڵان! تەماشا بکەن و بیر بکەنەوە. دەخیلتان بم، بەقوربانتان بم، ئەگەر کەسێ چوارسەد گەز بە گەزی خۆمان باڵای بەرزبێ، دەبێ ئەو عالەمی بەهەشتەی و ئەو خێوەت و بارەگای بەهەشتەی چۆن بێ؟

بەهەشتییەکان ڕوویان وەکو مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، یاوەکو ئەو ئەستێرەی کە لەپێش شەفەقی ڕاستەقینەدا دەردەکەوێ و دەدرەوشێتەوە. ڕوخساری ئەهلی بەهەشت مووی ڕیش و سمێڵی پێوە نییە. لە هەموو کاتێکدا حەفتا خەڵاتی فاخیریان لە بەردەستدایە کە لە بۆنی خۆش و ڕەنگی هەڵکەوتوو و شێوەی جواندا هەڵبژاردە و نایابن. هەرکاتێ بیانەوێ ئەوانە لابەن حەفتای تر لەبەردەستیاندا حازر دەبێ و، هەروا بەوجۆرە بەردەوامە، هەموو ئەو خەڵاتانە ناسك و نەرم و نیان و موناسبی شان و قۆڵ و قامەتی ئەوانن و، لە کێشانیشدا هەموو ئەو حەفتا خەڵاتە بەقەدەر قاتێ پۆشاکی دنیا قورس نین. ئیتر کۆشك و ڕایەخ و خزمەتکار و کەنیزەك و خواردەمەنیی وەها کە لە پێشەوە باسمان کردن. لەگەڵ ئەم هەموو ناز و نیعمەتی خوایەدا هەرگیز ترسی مردن و نارەزایی خوا نییە؛ چونکە بەهەشت (دار الإستراحة)ە، واتە: شوێنی حەسانەوە و ڕەحەتییە، شوێنی تەکلیف و لێپرسراوی نییە، هەروەها ترسی ئێش و ئازار و برسێتی و دڵ نارەحەتی نییە. لەوێ چڵك و چەپەڵی و لەش و پۆشاکی پیسی نییە، میز و پیسی و خوێن و برین نییە. هیچ جۆرە ئێش و ئازار و ناخۆشییەك لە بەهەشتا نییە. جا سەیر بکەن هەموو دەستەڵاتدارانی جیهان دەوڵەت و عیزەت و حورمەت و ئیستراحەتێکی وەهایان بۆ دەست دەدا؟ هەرچی ئەوان هەیانە بەنیسبەتی دەوڵەتی ئاسایشی نەبڕاوەی بەهەشتەوە، وەکو شتی بڕاوەیە بەرامبەر شتی نەبڕاوە. بەتایبەتی نیعمەتی ڕەزامەندیی خوا و ئەمین بوون لە ڕق و قین

هەڵسانی خوا و شادبوون، بەبینینی زاتی خوای گەورە (جل جلاله).

ڕۆژێ هەندێ لە هاوڕێیەکانی پێغەمبەر (د.خ) عەرزیان کرد کە باسی جوانیی حۆرییەکانیان بۆ بکا. فەرمووی: ئەگەر یەکێ لەو حۆرییانە لە ئاسمان بێتە خوارەوە ئەوەندە جوان و قەشەنگ و لە ئەندازەبەدەر ناسکە، هەموو مەخلوقاتی سەر ڕووی زەوی عاشقی دەبن، بۆنی ئەوەندە خۆشە بەینی خۆرهەڵات و خۆرنشین دەگرێتەوە بەجۆرێ کە خەڵق هەمووی لەو بۆنە خۆشەوە سەرخۆش دەبن. براکان! جا قیاسی وەزعی حۆریی بەهەشت لەگەڵ جوانیی دنیادا بکەن کە چەند فەرقیان هەیە؟. ڕوخساری حۆرییەکان ئاوێنەی ئەهلی بەهەشتە؛ یانێ: ئەگەر ئینسان بۆیان بڕوانێ وێنەی لە ڕوخساریاندا دەردەکەوێ. ئەم حۆرییانە یەکی حەفتا جۆر خەڵاتی پۆشاکیان هەیە، ئەو پۆشاکانە ئەوەندە نازك و جوانن لەوانەیە مەنعی دەرکەوتنی لەش نەکەن. جگە لەمەش ئەندامیان وەك بلووری سافی بێگەردە.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لە شەوی میعراجدا بەجێگاییەکدا ڕابووردم تەماشام کرد، گەلێ خێوەتی زۆر جوانی تیا هەڵدرابوو. ئەوانەی لەنێو خێوەتەکاندا بوون سەلامیان لێ کردم. منیش پرسیم لە جیبرەئیل: ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەمانە حۆریی بەهەشتن کە لە خێوەتی خۆیاندا دامەزراون، بەڵام ئێستا کە تۆ تەشریفت بەم شوێنەدا ڕابوورد ئیزنیان وەرگرتووە بۆئەوەی سەلامت لێ بکەن. جا حۆرییەکان لەپاش سەلامەکەیان وتیان: «نحن الراضيات فلا نسخط أبداً، ونحن الخالدات فلا نظعن أبداً». واتە: ئێمە ڕازین و بەجێگە و خاوەن جێگەی خۆمان، هەرگیز زویر نابین، ئێمە لە شوێنی خۆماندا دامەزراوین و هەرگیز کۆچ ناکەین. جا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: «حور مقصورات في الخيام». واتە چەند حۆرییەکن لە خێوەتدا ڕاگیراون و ناگوێزرێنەوە.

حۆرییەکانی بەهەشت بەدەوامی ڕەفاقەتی خاوەنەکانیان لەسەر یەك وەزعن؛ هەرکاتێ کچێنییان نەما دووبارە دەبنەوە بەکچ. هەروەها ژنە موسڵمانەکانی دنیا کە تێکەڵی حۆریی بەهەشت بوون جەمالیان لەوان زیاتر دەبێ؛ چونکە ئەوان موکەللەف بوون، بە عیبادەت وەکو نوێژ و ڕۆژوو و باقیی هاوڕێکانیان زیاتر دەبێ و، بەمانە دەڵێن: (حور العين) چونکە چاویان گەورە و گوشادە و مووی برژانگیان درێژە و خاوەنی ئەخلاقی جوانن، ئاوی دەمیان ئەوەندە شیرنە ئەگەر بیکەنە ئاوی تاڵەوە شیرینی دەکا. هەندێ لە بەهەشتییەکان کە پایەبەرزترن پێنجسەد حۆرییان پێ دەدرێ. حۆرییەکان

هەموو ڕۆژێکی جومعە لە شوێنێکی گوشاددا کۆدەبنەوە و خەریکی زیکری خوای گەورە و قسەی خۆش دەبن. هەندێ کەلیمەیان بۆ خاترداریی مێردەکانیان دروستە بیڵێن. قسەکە ئەمەیە: «نحن الراضيات فلا نسخط أبداً». بۆ هەندێ لە بەهەشتییەکان وا ڕێك دەکەوێ کە لە کاتی خۆشی و سوحبەتدا نوورێك و ڕووناکییەك لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە بۆ سەر کۆشکەکانیان و بۆ سەر خۆیشیان، ئەو نوورە ئەوەندە بە بەرق و پرتەوداره، نووری جەمالی خۆیان مەحو دەکاتەوە و، نووری کۆشك و دەروبانی شوێنەکەیش مەحو دەکاتەوە. ئەوانیش وا گومان دەبەن کە خوای گەورە دەیەوێ نووری خۆی لەوان دەربخا، بەڵام کە چاو دەگێڕن حاڵی دەبن ئەمە نووری حۆرییەکە کە وا لە ژووری ئەوانەوە سەر و ملی درێژ کردووە و بەسەر ئەماندا دەڕوانێ و بانگ دەکا: ئەی دۆستی حەزرەتی خوای پەروەردگار! ئایا ئێمە مەیدانی سوحبەتمان نییە لەگەڵ تۆدا؟ ئاخۆ لەم دەوڵەتی سوحبەتە ئێمە بەشمان نییە. جا یەکێ لە بەهەشتەوە دەپرسێ ئێوە کێن؟.

جوابیان دەداتەوە و دەڵێ: من لەو حۆرییانەم کە خوای گەورە لە قورئاندا بەئایەتی (ولدينا مزيد) ئیشارەتی بۆ کردوون. جا هەتا خوا مەیل بکا حۆری بەحۆری لە ژمارەی حۆرییان زیاد دەکاو، لە قەراغی ڕووبار و جۆگەی بەهەشتا حۆرییانی زۆر جوانی وەکو داری چنار و سنەوبەر ئیجاد دەکا و خێوەتیان بەسەردا لێ دەدرێ و تەسلیمی خاوەنەکەی دەکرێ و ئەو حۆرییانە لەسەر کورسییەکی بەجەواهیرات ڕازاوە دادەنرێن. ئەم حۆرییە تایبەتییانە بۆ کەسانێکن کە بە شەودا عیبادەت و شەونوێژ دەکەن، و بەڕۆژا بەڕۆژوو دەبن. ئەم شەخسانە کە هێشتا نەمردوون، خوای گەورە پەردەی دووری لەبەیندا لادەبا و ئەم زاتانە نیشان دەدا بەحۆرییەکان لە بەهەشتدا و، چاك دەڕوانن بۆیان و دەیانناسن و زۆر بەئارەزوو و بەسۆزن بۆ پێگەیشتنیان و دوعا دەکەن زووتر پێیان شاد ببن و دوعای تەوفیقیان بۆ دەکەن. پیاوی بەهەشتی لە ئارەزووی نەفسدا زۆر بەهێزە و هەرگیز ماندوو نابێ لە ئارەزوو وەرگرتن لە حۆرییەکان، وە ئەگەر ئارەزووی ئەولاد بکەن بەماوەییەکی زۆر کەم ئەو منداڵە لە سکی دایکی بەپاکی دێتە خوارەوە و زوو بەبێ مۆڵەت دەکەوێتە سەر پێ و دەڕوا بەرێدا.

خوا ئەمر دەکا بەحەزرەتی داود (د.خ) کە بەتەمجید و تەقدیسی خوا دەنگ بەرز بکاتەوە و، بەئاوازی خۆش ستایشی خوا بکا. کە حەزرەتی داود (د.خ) دەنگ بەرز

دەکاتەوە خوا دەنگی دەگەیێنی بەئەهلی بەهەشت و، هەموو دەنگی داود دەبیستن و بەجۆرێ لەو دەنگە لەزەت وەردەگرن کە لە هەموو لەزەتێکی بەهەشت لایان خۆشترە و، لە خۆشییدا لەزەتەکانی تر فەرامۆش دەکەن. هەروەها خوا ئەمر دەکا بەباییەکی شێوە نەسیم کە ناوی (هفافە)یە لە بەهەشتدا هەڵدەکا و دەدا لە وردە لقی باخەکان. ئەو وردە لقانە هەموویان دەنگێکیان لێ پەیدا دەبێ ئەوەندە نەرم و خۆشە ئەهلی بەهەشت دەهێننە خۆشی و شادی. لە بەهەشتدا دارێ هەیە ناوی (سماع)ە، خوا ئەمر دەفەرموێ بەوکەسانە کە لە دنیادا خۆیان لە بیستنی ساز و سەمتوور و دەنگ و ئاوازی حەرام پاراستووە لە بنی ئەو دارەدا دانیشن. بەئەمری خوای گەورە ئەو دارە ئاوازی وەها خۆشی لێ دەردەچێ کە لە هەموو نەغمە و ئاوازەیێ خۆشتر و بەتامترە.

ڕیوایەت کراوە لە بەهەشتدا دوو بازاڕ هەیە؛ یەکەم بازاڕ پڕە لە میوەی هەمەجۆری بەلەزەت و لە وێنەی هەرچی حۆریی جوانە، جا ئەو بەهەشتییانە کەبەو بازاڕەدا تێ دەپەڕن دڵیان لە هەر وێنەیێ بچێ خوای گەورە حۆریی بەو وێنەیان بۆ دروست دەکا. دووەم بازاڕ بەڕۆژی جومعەدا پێدا ڕادەبوون، لەو بازاڕەدا سروەیێ لە ئەهلی بەهەشت دەدا کە ماددەی عەتر و عەبیر و شتی بۆن خۆش هەڵدەگرێ و دەیدا بەڕوویاندا و دەماغیان عەتراوی دەکا و ڕوخساریان پێی جوان دەبێ بەجۆرێ کاتێ کە دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان و حۆرییەکان دێن بەپیرییانەوە، لەبەر زیادە جوانی نایاننناسنەوە، هەروەها هەتا ئەوان دەگەڕێنەوە خوا شێوەی حۆرییەکانیش جوانتر دەکا، بەڕادەیێ خاوەنەکانیان حۆرییەکانیان بەشتێکی تازە و عەجیب دێتە پێش چاو و هەردوولایان جوانییان زیاد دەکا.

جا براکان! تەماشای میهرەبانیی خوای گەورە بکەن؛ کە لە هەموو جومعەییەکدا جوانیی ئەهلی بەهەشت و حۆرییەکان زیاد دەکا، دەبێ ئەم جوانییە بگاتە چ پایەیێ؟ دەبێ ئەوەش بزانین یەکەم جار کە دەچنە بەهەشت جوانییان وەك جوانیی مانگی چواردەیە و، هەندێکیان وەك ئەستێرەی بەرەبەیانن (سبحان الله مأعظم شأنه). عەجەب دەوڵەتێکە، عەجەب پیرۆزی و بەختیاری و سەرفرازییەکە خوا داویە بەئەهلی بەهەشت، هەر لەو ساتەوە کە بەسەر پردی سیراتا ڕادەبوورن. ئەوانەیان گوناهێکیان کردبێ و بەهۆی ئەو گوناهەوە هەندێ لە ئەندامی لەشیان سووتابێ و کێم و زووخی لێ بتکێ، کاتێ کە بەسەر پردەکەدا تێ پەڕین و بەشوورای بەهەشت گەیشتن دوو سەرچاوەی ئاو

دەبینن یەکێ گەرم و یەکێ سارد، پێیان دەڵێن: لە کانییە گەرمەکەیان خۆیان بشۆن، لە کاتی خۆشۆردنا هەر ئێش و ئەلەمێ لە دەرو ناوی لەشیاندا هەبێ هەموو سارێژ دەبێ. هەروەها ئەمریان پێ دەکرێ کە لە سەرچاوە ساردەکەیان دەسنوێژ بگرن و بەدەسنوێژەوە بڕۆنە ناو بەهەشت. یەکەم تاقم کە لەو سەرچاوە سارده دەسنوێژ دەگرێ، نووری جەمالی وەکو مانگی چواردەی لێ دێ، دووەم تاقم وەکو ئەستێرەی بەرەبەیانیان لێ دێ. جا کاتێ کە لە دەرگاوانەکانی بەهەشت نزیك بوونەوە، ئەو دەرگاوانانە دێن بەپیریانەوە و دەڵێن: «سلام علیکم طبتم فادخلوها خالدین». ئینجا غولامان و نۆکەران هەموو دێن بەپیریانەوە و چواردەوریان لێ دەگرن و هەر یەکێ بەجۆرە موژدەیێ موژدەیان پێ دەدەن لەو جۆرە خەلات و پلە و پایانە کە خوای گەورە بۆیانی ئامادە کردووە، لەو شتانە کە ڕێزی ئەهلی بەهەشتی پێ دەگرێ. جا یەکێ لە غولامەکان بەپەلە دەڕوا موژدە دەبا بۆ حۆرییەك لە حۆرییەکانی بەهەشت و پێی دەڵێن فلان کەس هاتووە، حۆرییەکەیش لە غەڵەبەی ئیشتیاقدا پێی دەڵێ: ڕاست بەچاوی خۆت فلان کەست دیوە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، بەچاوی خۆم چاوم پێی کەوتووە. ئینجا ئەو حۆرییە گورج هەڵدەستێ و دەڕوا بۆ پێشوازی لێکردنی. جا دۆستەکانم! بەزاتی خوا سوێندتان دەدەم، ئەم دنیا بێ نرخە و لەزەتی ئەم دنیا بۆ ئەوە دەشێ ئینسان لەپێناویدا ئەم هەموو جۆرە خێر و بەرەکەت و دەرەجەی قیامەتە و ئەم هەموو نیعمەتی بەهەشتە لە کیسی خۆی بداو ئەو گوناهانە کە خوا نەهیی لێ کردوون، بیانکات و خۆی بکاتە موستەحەقی سزا و ئازار؟. بەڕاستی ئێمە خەجاڵەت و شەرمەزارین و حەقی نیعمەتی خوای گەورە نازانین و زۆر نەفامین. لە ئەنجامدا تەنیا ئەم چارەیەم دۆزیوەتەوە کە هەموومان بەجارێ بڵێین: خوایا داوای عەفووت لێ دەکەین و تکات لێ دەکەین گوناهمان بپۆشی.

کاتێ کە ئینسانی بەهەشتی گەیشتە جێگەی خۆی لە بەهەشتدا تەماشا دەکا هەرچەند بەردی سەحرا هەیە هەمووی مروارییە و کۆشکی زەرد و سوور و سەوز و سپی و ڕەنگەکانی تر دێنە بەرچاوی. ئەترافی بان و بەرهەیوان وەك بەرق شەوق دەدەنەوە بەجۆرێ ئەگەر خوای گەورە هێزێکی تەواو نەدا بەچاوی ئینسان نووری ئەوانە چاوی کوێر دەکا. هەروەها کە سەر دادەنوێنێ ئەنواعی دوڕ و گەوهەر دەبینێ. پوختەی قسە بەرزایی و نزمایی کۆشکەکان هەموو یەکسەر لە مەعدەن و ماددەی بەنرخن. ئینجا لە خۆشی ئەم هەمووە شتە باشانەدا کە دەیانبینێ سوپاسی خوای گەورە دەکا و دەڵێ:

«الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا

بِالْحَقِّ وَنُودُواْ أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ».

لەپاش دامەزرانیان لە بەهەشتدا، جۆرە خوتوورە و ئێشێك ڕوودەكاتە دڵیان: ئاخۆ ئەم پایە و مەقامە جوانەیان هەتا هەتایە، یاخۆ لادەچێ؟ جا بۆ لابردنی ئەم دوودڵییە، ئەمر دەكرێ بەجارچی، جاڕ دەداو دەڵێ: ئەی ئەهلی بەهەشت، بزانن هەتاهەتایە ئێوە هەر زیندوون و لەم ناز و نیعمەتەدا دامەزراون و، بەهیچ جۆرێ دەرد و بەڵا و ئازارتان تووش نابێ؛ ئیتر بەئارەزووی خۆتان بەخۆشی و شادی بژین.

نەقڵ كراوە كە یەكێ لە ئەهلی كتاب ڕۆژێ هات بۆ خزمەتی حەزرەت و عەرزی كرد: «یا أبا القاسم» ئێوە ئیددیعا دەكەن كە ئەهلی بەهەشت خواردەمەنی دەخۆن و ئاو دەخۆنەوە، ئەمە چۆن دەبێ؟ ئەمانە بەهەشت پیس دەكەن حەزرەت (د.خ) فەرمووی: قەسەم بەو خوایە كە گیانی من لە ژێر دەستەڵاتی قودرەتی ئەوایە، خوای گەورە بەهەریەك لە ئەهلی بەهەشت هێزی سەد ئینسان دەدا بۆ خواردن و خواردنەوە و جیماع كردن، بەڵام بۆ ئەهلی بەهەشت هەزمی خواردەمەنی بەدەرچوونی عەرەق دەبێ لە لەشیانەوە و، ئەو عەرەقەش كە لە لەشیانەوە دەردەچێ بۆنی وەكو عەتر و عەبیر وایە و، هەر وەخت نزیك بوونەوە لەوە كە ئارەزوویان نەمێنێ، داوای شەرابی تەهوور دەكەن، كە بۆیان هات و خواردیانەوە، هەرچی زیادە مادە لە لەشیاندا هەیە، وەكو عەرەق لە لەشیان دەردەچێ و، دووبارە ئارەزوویان ساف دەبێ و وەكو جاران چی ئارەزوو بكەن دەیخۆن. لە بەهەشتدا شتی ناشیرین و بێ زەوق نییە وەكو بەڵغەم. ئەهلی بەهەشت خەریكی ئاسایش و ڕابواردن و لەزەتی ڕۆحین، هەریەك لە ئەهلی بەهەشت ژمارەیێ زۆری لە غوڵام و خادم هەیە. هەریەك لە ئەهلی بەهەشت دوو قاپی لایە، هەر قاپێ لەوانە خواردەمەنییەكی تایبەتی تێدایە كە لە ڕەنگ و تام و بۆندا لە خواردەمەنیی دنیا ناچێ، یەكێكیان لە ئاڵتوونە و ئەویتریان لە زیو، پوختەی وتار لەشەو و ڕۆژا ئەهلی بەهەشت خەریكی خواردن و خواردنەوە و لەزەتی ڕۆحییەن، بەتایبەتی لە ڕۆژی جومعەدا وان لە میهماندارێی خوای گەورەدا؛ واتە: لەزەتیان وا لە شوهوود و فیوزاتی ڕەحمەتدا.

شایانی باسە كەلیمەی شەو و ڕۆژ كە بەكاردێن بۆ جیهانی بەهەشت لەبەر عادەتە و كینایەیە لە دەوام؛ ئەگەرنا لە بەهەشتدا شەو و ڕۆژ نییە، بەڵكو هەموو كاتەكانی بەتێكڕا بەتەجەللیاتی خوای گەورە ڕووناكە. لەو كاتانەدا كە كاتی نوێژە فەرزەكان بوون لە دنیادا خوای گەورە دیاری و دەهەنە بەفریشتەكاندا ڕەوانە دەكا بۆ بەهەشتییەكان و،

لەسەر ڕوخسەت و ئیجازەی ئەو کەسە کە دیارییەکەی بۆ دەڕوا تەسلیمی دەکات. ئینسانی بەهەشتی لە هەرکاتێکدا ئارەزوو بکا بەحوزووری خوای گەورە شاد ببێ، دەتوانێ بڕوا بۆ ئەو شوێنە کە خوای گەورە بۆی دیاری کردووە و پێی وتووە، هەتا تەجەللای ڕەحمەتی بۆ ڕەوانە بکا، جا لەو شوێنەدا بەتەجەللای ئەنواری خوایی شەرەفیاب دەبن.

ڕووبارەکانی بەهەشت چوارن و بەهەموو کۆشك و شوێنەکانی بەهەشتدا دەگەن، بەڵام ئاوی وەکو ئاوی دنیا نییە کە لە ناو چەم و چاڵدا ڕەوان ببێ بەڵکو لەسەر ئەرزا بەقودرەتی خوا جاری دەبێ، تەنانەت بەقودرەتی خوا بەسەر دیوار و شوێنە بەرزەکانیشدا جاری دەبێ. لەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکاندا، دەرگای زۆر دانراون هەتا بەکاربهێنرێن لەلایەن ئەهلی بەهەشتەوە. ئیتر لە هەر شوێنێ بەهەشتییەك تینووی ببێ لەوێدا کاسەییەك ئامادەیە بۆ ئاوخواردنەوە؛ ئەو کاسەیش لە ماددەی بەنرخ و مەعدەنی نایابە. ئەو چوار ڕووبارە یەکێکیان ئاوە، یەکێکیان شیرە، یەکێکیان هەنگوینی سافە، یەکێکیان لە (شراباً طهور)ە. (اللهم أرزقنا منه بحق رحمتك الواسعة).

دەگێڕنەوە: یەکێ لە ڕێگای حەجی (بیت الله)دا جوانێکی دی کە لە کاتی شیددەتی گەرمادا هەرگیز ئاوی نەدەخواردەوە، هەروەها لە کاتی حەسانەوەیشدا نە ئاو و نە نانی نەدەخوارد. لێیان پرسی: ئەم حاڵەتە چییە کە تۆ نەتینوو دەبی و نە برسی؟. وتی: وەختی خۆی من لە جەنگی کافراندا بووم جیهادم دەکرد، لە سوپای موسڵمانان گەلێ کەس شەهیدکراون، خۆیشم بریندار بووم و بێهۆش کەوتم. کاتێ کە هۆشم هاتەوە بەخۆمدا تەماشام کرد، جەنگ تەواو بووە و سوپای هەردوولا بڵاوەیان لێ کردووە، تەنیا دەنگی چەند کەسێکم دەبیست کە ئاویان دەکرد بەدەمی بریندارانی ئەو جەنگەوە. یەکێ لەوانە هاتە ڕاسەرم و کەمێ ئاوی تکاندە دەممەوە بەلەزەتی ئەو میقدارە ئاوەوە هەستامەوە سەر پێ و چاك بوومەوە. لەو کاتەوە تا ئێستە نە تینووم دەبێ و نە برسی. لەزەتی ئەو میقدارە کە وەرم گرت، هەموو حەواسم بەڵکو زەڕەکانی لەشم وەری گرتووە.

لەلای ژووررووی بەهەشتەوە شەونمێکی موشکین و عەنبەرین بەسەر بەهەشتییەکاندا دەبارێ و بڵاو دەبێتەوە. ئەم وەزعە لە هەموو کاتێکدا بۆ ئەهلی بەهەشت هەیە، بەتایبەتی لە دوادوایی شەودا. هەروەها ئەنواعی میوەیش لە ئاسمانەوە دەبارێ بەسەریانا. بێجگە لەمانە لە بەهەشتدا گەلێ سەرچاوە هەیە، کە دوان لەوانە ناویان،

زەنجەبیل و تەسنیمە، ئەم دوو سەرچاوە خۆشترین سەرچاوەن لە بەهەشتدا. بەڵام حەوزی کەوسەر کە بەتایبەتی هی حەزرەتی (محەمەد مستەفا)یە، (د.خ)، ئەوە بریتییە لە حەفتا هەزار فرسەخ. ئەو کاسە و پیاڵانەی کە لە قەراخیا دانراون بۆ ئاو خواردنەوە ئەوەندە زۆرن مەگەر هەر خوا بیزانێ.

سەرچاوەییەکی تر ناوی (مەعین)ە و یەکێکی تر ناوی (رەحیق)، یەکێکی تریان ناوی (شراباً طهورا)یە. حەزرەت (د.خ) دەربارەی سەرچاوەی (رەحیق) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێ لە ئەهلی دنیا دەست بکات بەو ئاوەدا و بیهێنێتە دەرەوە ئەوە بەو دەستە هەموو ڕووی زەوی بۆن خۆش دەکا. هەریەکێ لە ئەهلی بەهەشت ئەگەر ئارەزووی ئاوی یەکێ لەو سەرچاوانە بکا، ئەو کاسەیە کەوا لەوێ، پڕ دەبێ لە ئاو و خۆی دێت بۆ لای و دەیخواتەوە و کە تێری خواردەوە، کاسەکە لەخۆیەوە دەڕواتەوە جێگەی خۆی. (والله أعلم). ئەو وەزعە جار جار دێتەجێ بۆ هەندێ لە نزیکانی حوزووری خوای گەورە. بەڵام تەسنیم ئەوە لە سەرچاوە موحتەرەمەکانە و، هەرکەس لە دنیا شەرابی خواردبێ و وازی لێ نەهێنابێ، یا بێ تەوبە مردبێ ئەوە لە بەهەشتدا لێی بێ بەش دەبێ. جا لەبەرئەوە کە پادشاهانی دنیا تاجی گەورەییان ناوەتە سەر و فیزیان بەسەر خەڵکدا کردووە، خوای گەورە جەزای ئەهلی بەهەشت بەوە دەداتەوە کە لەم تەسنیم و (شراباً طهورا)نەیان پێ دەدات.

ئەهلی بەهەشت لە هەندێ کاتدا جۆرە پۆشاکێ لەبەردەکەن کە لە سەعاتێکدا بەچەندەها ڕەنگ دەگۆڕێ، هەروەها ئەو پۆشاکەشیان نارزێ و ناشیرین نابێت.

براکان! ئەوەی کە لە حەزرەت بیستراوە (د.خ) لە مەدحی بەهەشتدا عەرزم کردن. ئەوەش بزانن کە فەرموودەی حەزرەت (د.خ) بە موناسەبەی زەمان بووە؛ ئەگەرنا بەیانی ئەوسافی بەهەشت بەتەواوی ناکرێ. بەڵام ئەم ئەندازە کە لێرەدا عەرزم کردن بەسە؛ چونکە مەبەست دڵشادکردنی موسڵمانانە و هاندانیانە بۆئەوەی خەریکی ئەو کردەوە باشانە بن کە دەبنە هۆی گەیشتن بە بەهەشت. ئومێدەوارین بە میهرەبانیی خوا لەسەر کردەوەی چاك تەوفیقمان بدا تا بەدڵی ڕووناکەوە بمرین و بەشادمانییەوە ڕوو بکەینە، دەشتی مەحشەر لە ژێر ئاڵای بەرزی حەزرەتی پێغەمبەری خوادا (د.خ).

سوپاس بۆ خوای گەورە لە کاتی دوادوایی بانگی عەسری ڕۆژی چوارشەممەی شەشەمی مانگی (ربیع الأول) (١٣٩٧)ی کۆچی، ڕێکەوتی ٢٣/ ٢/ ١٩٧٧ی زاینی لە وەرگێڕانی ئەم نامەیە بوومەوە.

# پێرست